

# تەفسیری

# جزء الذّاريات

## لە «في ظلال القرآن»

نوسینی: شەهیدی قورئان سید قطب

وەرگێڕانی: م. بورهان محمد امین

# تەفسیری جوزئی

# ( الذاريات )




# لە

# ( في ظلال القرآن )

نوسینی : شەهیدی قورئان سید قطب

وەرگێڕانی: م/ برهان محمد أمین

١٤٣٧ کۆچی ———— ٢٠١٦ زاینی




بسم الله الرحمن الرحيم

## ( ناسنامەی کتێب )

📖 ناوی کتێب: تەفسیری جوزئی (الذاريات) لە ( في ظلال القرآن )

✍ نوسینی : شەهیدی قورئان سيد قطب

✍ ناوی وەرگێڕ: برهان محمد أمين

✍ تیراژ: ( ١٠٠٠ ) دانە

✍ نۆبەی چاپ : چاپی یەکەم ( ٢٠١٦ )

✍ ژمارەی لاپەڕە : ٤٦٤

✍ نەخشاندنی بەرگ : گۆڤاری بڕیار

✍ نەخشاندنی ناوەوە : کۆمپیوتەری چاپخانەی ڕێ نوێ ( سەرکۆ کریم )

✍ شوێنی چاپ : چاپخانەی ڕێ نوێ

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی (١١٦٥)ی ساڵی ٢٠١٦ ی

پێدراوە

## پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری میهرەبان خاوەنی زەوی و نێرەری قورئان ـ سڵاوو رێزی شایستەش بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری ئیسلام.

دوای ئەوەی خوای گەورە تەوفیقی داین و جوزئی (عمَّ و تبارك)مان لە تەفسیرە ناوازەکەی شەهیدی قورئان خستە بەردیدی خوێنەران ، جارێکی تر مەدەدی ئیلاهی یاوەرمان بوو توانیمان سورەتی (ق)و جوزئی (الذّاريات)یش تەرجومە بکەین و بیخەینە بەردیدی عاشقانی قورئان، بە ئومێدی ئەوەی کە ئەمیش توێشویەکی پیرۆزی تر بێت و شایستەی دەستەبەرکردنی رەزامەندی خوای گەورە بێت، هەروەها داواکارین کە خوای گەورە پاداشتی بێ سنوری سیدی شەهید بداتەوە کە ئەم تێگەیشتنە جوان و تێرو تەسەلەی خستە بەر دیدی لاوانی موسوڵمان، تا هەندێ شارەزایان بکات لە گەورەیی و شکۆمەندی و ناوازەیی ئەم قورئانەی کە بەردەوام لەلایەن ناحەزانەوە هەوڵ دراوەو دەدرێت تا نورو ڕوناکییەکەی لە جیهان بە گشتی و موسڵمانان بە تایبەتی بشارنەوە ..

بەڵام ئاشکرایە کە پەروەردگاری بەدیهێنەری زەوی و ئاسمان، رێزگری نەوەکانی ئادەم تا ئاخر زەمان، هەرگیز نایەڵێت ئەم نورە خامۆش ببێت و پیلان و پلانیان سەربگرێت، ئەوە تەنها ماوەیەکە؛ تا ئوممەت بە تایبەت توێژی لاوان بێدار دەبنەوەو قورئان لە رەوشت و هەڵس و کەوتیاندا پیادە دەکەن و دەبنە نموونەیەکی جوانی شارستانیەتی راستەقینەی ئیسلامی بە شێوازێکی پاک و بێگەردو بە دوور لە هەموو شێوازەکانی توندوتیژی ئەم قورئانە پیادەکەن و

دەبنە رەحمەت نەك زەحمەت، دەبنە خزمەتگوزار لە هەموو بوارێکدا مەبەستی سەرەکیان دەبێتە دەستەبەرکردنی رەزامەندی خوای گەورەو بەهەشتە رازاوەکەی تا لەوێ، بۆ هەمیشە لە سایەی رەحمەتیدا حەساوە بن و بەختەوەر ..

جا لە بەرنامەی تەرجومەکەماندا ئەم خاڵانەمان رەچاو کردووە:

١. تەفسیری ئایەتەکانمان لە تەفسیری رۆشن دەبەزاندووە پاشان چوینەتە سەر تەفسیری ( في ظلال ).

٢. هەندێ جار گەر پێویست بووبێ لە نێوان دوو هێمادا روونکردنەوەی زیاتر کراوە.

٣. هەوڵدراوە کەش و هەوای (في ظلال) بگوێزرێتەوە بۆ قورئان دۆستان وە بۆ ئەو مەبەستە هەندێ جار بە ڕستەیەك، وشەیەك روون کراوەتەوە.

٤. هەندێ جار ئایەت دووجار یان زیاتر هاتووە لە (في ظلال) ەکەدا، ئێمە بە پێویستمان نەزانیوە تەفسیرەکەشی جارێکی تر دابەزێت، هەندێ جاریش تەفسیرەکە هاتووە و بە پێویست نەزانراوە ئایەتەکە جارێکی تر دابەزێنرێت.

٥. لە تەرجومەی هەندێ فەرموودەدا بە پێویست نەزانراوە زنجیرەی ناوی راویەکان بنوسرێت.

ماوەتەوە بڵێین کە (سید قطب) بە ڕەحمەت بێت جگە لەوەی لە چڵەپۆپەی ئیمان و دینداریدا بووەو زۆر بە سەرسامی و رێزەوە باس لە قورئان دەکات، لە هەمان کاتدا (ادیب)و نوسەر و رەوانبێژێکی زۆر کارامە بووە، هەر بۆیە (في ظلال)تام و چێژێکی تایبەتی هەیەو بە وردەکاریەکانی وشە ، ئایەتەکانی قورئان زۆر جوان شی دەکاتەوە .. لە هەمان کاتدا ئەوەی بەرەکەتی زیاتری

خستۆتە تەفسیرەکەوە ئەوەیە کە خوای گەورە بۆی ڕەخساندووە لە گرتووخانە و لە ژێر ئازارو ئەشکەنجەی جەستەییدا ئەم تەفسیرە ئامادە بکاتو سەرەنجامیش شەهید بکرێتو ببێتە شەهیدی قورئان.

خوای میهرەبان پاداشتی خێری بداتەوەو بە بەهەشتی بەرینی شاد بکات لەگەڵ پێغەمبەرانو ڕاستانو شەهیدانو چاکانداو ئێمەش بە دیداری ئەو کەسایەتی یە ڕێزدارانە شادو خۆشنوود بکات، هەر ئەوەش لە پەروەردگاری میهرەبان دەوەشێتەوە.

لەگەڵ داوای لێبووردن لە ڕۆحی سیدی شەهیدو سەرجەم خوێنەرانی ئازیز، گەر کەمو کوڕی یەك لە تەرجومەکەدا بەدی کرا..

دیارە خوای گەورە ئاگادارە بە نیەتو مەبەستەکان .

## ﴿ تەفسیری سورەتی (ق) ﴾

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

پێغەمبەر (ﷺ) لە جەژنەکان و هەینی یەکاندا ئەم سورەتەی دەخوێندەوەو تێهەڵکێشی دەکرد لەگەڵ بابەتی وتارەکەیدا، هەندێ جاریش لە کۆڕ و قەرەباڵغیدا، دیارە کە ئەو سورەتە کاریگەری و گرنگی خۆی هەیە.

لەڕاستیدا سورەتێکی خاوەن هەیبەت و شکۆیە بە توندی راستی یەکان دەگەیەنێت، داڕشتنێکی توندو تۆڵی هەیە، وێنە و سایەکانی، سەدای کۆتایی ئایەتەکانی، بەتەواوی گۆشە و کەناری دڵ و دەرون دادەگرێت، بەشوێن هەست و نەست و خەتەرەو خەیاڵەکانی مرۆڤدا دەڕوات، بەشوێن نهێنی و ئاشکرایدا ، ئەوەی کە شاراوەیە و ئەوەش کە بەدەرەوەیە، بەچاودێری خوایی بەدواداچونی لەگەڵدا دەکات، یەك چرکەسات پشتگوێی ناخات: هەر لە لەدایك بوونەوە تامردنی، تا زیندوبوونەوە و کۆکردنەوە و لێپرسینەوە لێی، چاودێرییەکیش بەهێزو توندو تۆڵ و سامناکە. بە تەواوی ئەم دروستکراوە لاوازە کەناوی مرۆڤە دادەگرێت، چونکە ئەو بەردەوام لەبەردەستی قودرەتی خوادایەو ئەوزاتەش چرکەساتێك لێی بێ ئاگا نیە، لە وردو درشتی کردەوەکانی، هەناسەکانی بەژمارەیە، هەموو خەتەرە و خەیاڵ و نیەتێکی لای ئەو ئاشکرایە، هەموو گوفتارێکی تۆمارە، هەموو جوڵەیەکی حساب بۆکراوە، چاودێری وردو تەواو بەسەر وەسوەسە و خەتەرەو خەیاڵی دڵ و دەرونیەوە هەیە، هەروەکو چۆن بەسەر ئەندامەکانی جەستەیدا هەیە، ئیتر هیچ پەردەو بەربەستێك نیە

کەبەری ئەم چاودێری یە ئەنجامدراوە بگرێت کە ئاگادارە بەسەر نهێنی و چپەکانیدا بەسەر هەموو کردارو جوڵەیەکیدا، لە هەموو کاتو لە هەموو بارودۆخێکدا .

هەموو ئەوانەی کە باسکرا ـ بەتایبەتی لای ئیماندار ـ زانراوە بەڵام بەشێوازێك باسی دەفەرموێت، دەڵێی تازەیە هەستەکان دادەچڵەکێنێ و کوتوپڕ یەخەیان دەگرێت، رایان دەوەشێنێ، دەیات شڵەقێنێ، لەترسا موچورکە بەگیانیدا دێت، سەرسامی دایدەگرێت، لە خەوی غەفڵەت هەڵیان دەستێنێ، چونکە کارەساتێکی ترسناكو هەوڵناك بەرێوەیە!!

ئەمانە هەمووی لەگەڵ دیمەنی ژیانو مردنو دیمەنی هەڵوەشانی جەستەو، دیمەنی زیندو بوونەوەو دیمەنی حەشرو قیامەتدا، لەگەڵ بەتەمابونی بەرپابونی ساتەکانی کۆتایی دنیاو کاریگەرییەکانی لەسەر ناخی مرۆڤو هەستەکانی، هەروەها باسی دیمەنەکانی گەردون لە ئاسمانو زەویدا، لە دابەزینی بارانو گەشەی روەکدا، لە بەروبوم و لقو پۆپی درەختدا، هەروەها باس لەوە دەفەرموێت کە هەموو ئەوانە بۆ بەرچاو رونی ئەو بەندانەیە کە دەیانەوێ بگەڕێنەوە بۆ لای خوای گەورەوسەرنجێك لە دروستکراوانی بێ شوماری بدەن..

لەڕاستیدا کورتکردنەوە و پێناسەی ئەم جۆرە سورەتانە ئاسان نیە، باسکردنی واتاو راستی و وێنەو سایەکانی بەو شێوازەی کە خودی قورئان باسی دەکات، راڤەو باسەکانی ئێمە مافی تەواویان ناداتێ، چونکە هەر قورئان خۆی دێت ئەو راستی و واتاو وێنەو سایانەی باس بکات، راستەوخۆ تیشکیان بخاتە سەر تا کاریگەرییان هەبێ لەسەر هەستو ناخو ویژدان...جا با بە پشتیوانی خوای گەورە با بچینە خزمەت سورەتەکە ولە نزیکەوە سەرنجی بدەین:

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿قٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ (١) بَلۡ عَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٞ مِّنۡهُمۡ فَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا شَيۡءٌ عَجِيبٌ (٢) أَءِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابٗاۖ ذَٰلِكَ رَجۡعُۢ بَعِيدٞ (٣) قَدۡ عَلِمۡنَا مَا تَنقُصُ ٱلۡأَرۡضُ مِنۡهُمۡۖ وَعِندَنَا كِتَٰبٌ حَفِيظُۢ (٤) بَلۡ كَذَّبُواْ بِٱلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمۡ فَهُمۡ فِيٓ أَمۡرٖ مَّرِيجٍ (٥) أَفَلَمۡ يَنظُرُوٓاْ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوۡقَهُمۡ كَيۡفَ بَنَيۡنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٖ (٦) وَٱلۡأَرۡضَ مَدَدۡنَٰهَا وَأَلۡقَيۡنَا فِيهَا رَوَٰسِيَ وَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوۡجِۭ بَهِيجٖ (٧) تَبۡصِرَةٗ وَذِكۡرَىٰ لِكُلِّ عَبۡدٖ مُّنِيبٖ (٨) وَنَزَّلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ مُّبَٰرَكٗا فَأَنۢبَتۡنَا بِهِۦ جَنَّٰتٖ وَحَبَّ ٱلۡحَصِيدِ (٩) وَٱلنَّخۡلَ بَاسِقَٰتٖ لَّهَا طَلۡعٞ نَّضِيدٞ (١٠) رِّزۡقٗا لِّلۡعِبَادِۖ وَأَحۡيَيۡنَا بِهِۦ بَلۡدَةٗ مَّيۡتٗاۚ كَذَٰلِكَ ٱلۡخُرُوجُ (١١)﴾

ژمارەی پیتەکانی زمانی عەرەبی (٢٨) پیتن چواردەیان لە سەرەتای ٢٩ سورەتی قورئاندا هاتوون ، ئەم قورئانە بێ وێنەیەش لەو چواردە پیتەو چواردەکەی تر پێك دێت ، ئەو پیتانە لە ڕواڵەتدا هیچ واتایەك نابەخشن ، بەڵام کە لە لایەن خوای گەورەوە نازڵ کراوە و بۆتە ئەم قورئانە ناوازە (معجزە)یە.

ژمارەی پیتەکانی قورئانیش بە شێوازێکی ژمارەیی هاوسەنگ و حساب بۆ کراون ، جگە لەوەش تحدای سەرجەم خەڵکی دەکەن بە درێژایی زەمان و پانتایی زەمین کە ئەگەر دەتوانن وێنەی ئەم قورئانە ، یان دەدانە سورەتی یاخود تەنانەت سورەتێکی کورتی داڕێژن ، کەچی پسپۆڕان دەسەوسانن ، چ جای خەڵکانی تر .

هەندێ لە موفەسرینیش دەڵێن: ئەو پیتانە بۆ سەرنج ڕاکێشانە ، هەندێکی تریش وتویانە ، هەر خوای گەورە خۆی زانایە بە مەرام و مەبەستیان .

سوێند بەم قورئانەی کە خاوەنی ڕێزو شکۆمەندییە (ئەم قورئانە لە لایەن خوای گەورەو نازڵ کراوە بۆ محمد ﷺ ، تا شوێنکەوتوانی پایەدار و سەرفەرازی هەردوو جیهان بکات).

(٢) کەچی زۆربەی خەڵکی ئەو ڕۆژگارە باوەڕیان نەکردو سەرسام بوون لەوەی کە بێدارکەرەوەیەك لە خۆیان هەبێت ، بۆیە کافرەکان وتیان: ئەم قورئانەو ئەم پەیامە شتێکی سەرسوڕهێنەرە ...

(٣) باشە ، چۆن کاتێك مردین و بوینە خاك و خۆڵ زیندوو دەبینەوە ، ئەوە شتێکی زۆر دوورو ئەستەمە!! (نەفامان بیریان نەکردەوە لە خۆیان کە لە نەبوون هێنراونەتە کایەوە).

(٤ ) بەڵام با ئەو بێباوەڕانە دڵنیابن کە ئێمە بە تەواوی ئاگادارین لە کار کردی خاك لەسەر لاشەیان و چۆنیەتی بونەوە بە خاکیان دوای مردنیان ، هەموو ئەو ڕوداوانە لە دۆسیەیەکی تایبەتدا پارێزراوە ، فایلی ڕوداوەکانی پێش مردن و دوای مردنی هەرکەسێکمان پاراستوەو لەلای خۆمانە .

(٥) ئەوانە هەر لە خۆڕا بۆتە پیشەیان ، بڕوا بەو حەق و حەقیقەتە ناکەن کە بە بەڕێزترین کەسایەتیدا ڕەوانەمان کردووە ، بەو هۆیەوە ئیتر لەسەر گەردانی و سەرلێشواوی یەکی ئاڵۆزدا دەژین...

(٦) باشە ، ئەوانە سەرێك هەڵنابڕن بۆ ئەو ئاسمانەی کە: بەڕا بەسەریانەوەیە ، چۆن دروستمان کردووە و چۆن ڕازاندومانەتەوە؟ بە شێوەیەك کە هیچ کەم و کوڕی و کەلێنێکی نادروستی تێدا نیە (بە تایبەت لەم سەردەمەدا بەهۆی ئەو تەلسکۆبە زەبەلاحانەو ئەو مانگە دەستکردانەی کە ڕەوانەی بۆشایی ئاسمان

دەکرێن زیاتر گەورەیی و زۆری و گرنگی ئەو ئەستێرەو هەسارانە دەرکەوتووە کە زاناکانی توشی سەرسامی و حەپەسان کردووە ، زۆربەیان باوەڕی بەهێزیان بە خوای تاك و تەنها و دروستکار هێناوە).

(٧) هەروەها زەویشمان راخستوەو بڵاومان کردۆتەوەو کەژو چیامان لەسەری دامەزراندووە، لە هەموو جۆرە روەکێکی جوان و رازاوەشمان تیایدا بەرهەم هێناوە .

(٨) باسی هەموو ئەو شتانە بەرچاو ڕونی و یادخستنەوەیە بۆ ئەو کەسانەی کە مەبەستیانە خواناس بن و بەردەوام دڵیان لای خوای خۆیان بێت و مەبەستیانە ئەو زاتەیان لێ نەڕەنجێت.

(٩) هەروەها سەرنج بدەن ، هەر ئێمە لە ئاسمانەوە بارانی بە پیت و بەرەکەت (بەو یاسایانەی کە هەر ئێمە رێکمان خستووە) دادەبارێنین و بەهۆیەوە باخ و باخات و بێستانەکان دەبوژێنینەوەو دانەوێڵەی هەمەجۆریش بەرهەم دەهێنین ..

(١٠) هەروەها دارخورمای قەشەنگ و قەد بڵندو بەرزیش دەبینن چۆن هێشووە خورمای نەرم و شیرین و بەتام و جوان و لەسەریەك ڕیزکراو دەگرێت...

(١١) هەموو ئەوانە دەبنە ڕزق و ڕۆزی بۆ بەندەکانمان ، ئێمە بەردەوام بەو ئاوی بارانە زەوی یە مردووەکان زیندوو دەکەینەوەو (هەمو ساڵێك لە وەرزی بەهاردا دیاردەی بوژاندنەوەی ڕوەکەکان دەبینن) جا هەر بەو شێوەیە لە زەوی دەرتان دێنینەوەو زیندوتان دەکەینەوە . (وەك گژوگیاکانی بەهار) .

ئەمە بەشی یەکەمی سورەتەکەیەو بابەتی زیندوبونەوە باس دەفەرموێت،لە ئینکاری موشریك‌و هاوەڵگەران دەدوێت، لە سەرسامییان لەو باسە، هەربۆیە قورئان تەنها باس لە ئینکاری ئەو دۆزە ناکات لەلایەن ئەوانەوە، بەڵکو هەوڵدەدات دڵ و دەرونە لار و وێرەکانیان بگێڕێتەوە بۆلای حەقیقەت‌و راستی یەکان، لاریەکانی راست بکاتەوە؛ پێش هەموو شتێك هەوڵ دەدات کە دڵەکان بێدار بکاتەوە و بیانهەژێنێ بۆ ئەوەی بکرێنەوە و سەرنجی کرۆك‌و ناوەرۆکی ئەم بونەوەرە بدەن، لەبەر ئەوە دەست ناکات بە موجادەلەو بەڵگە هێنانەوە دەربارەی داکۆکی لەڕۆژی زیندوبونەوە، بەڵکو هەوڵ دەدات کە دڵان بەشێوازێکی زیندوو بیربکەنەوە و باسەکە لێکبدەنەوە، ویژدان‌و دەرونیان داچڵەکێنێ بەبیرکردنەوەیان لە دەوروبەریان قەناعەت‌و باوەڕیان بۆ دروست ببێ ئەمەش وانەیەکە دەبێت ئەوانەی چارەسەری دڵان دەکەن سودی لێ وەربگرن!!

سورەتەکەش بە سوێند خواردن بە پیتی قاف و قورئانی خاوەن پلەو پایە دەست پێدەکات کە لەو جۆرە پیتانە پێکهاتووە، یەکەم پیتیشە لە وشەی (قرآن)دا !!

سوێندەکە لەسەرەتای باسدا، نیشانەی وریاکردنەوە و گرنگیدانە، دیارە کە پێشهاتەکە زۆر گرنگە، بەتایبەت کە بابەتەکە بە سوێند دەست پێدەکات، کەواتە باسەکە مەترسیدارە، رەنگە هەر بە مەبەستیش بەو شێوازە سەرەتاکەی دەست پێدەکات چونکە بەشوێن سوێندەکەیدا دەستەواژەی (بل) دێت، دوای ئەوەی کە سوێندەکە کاریگەریی خۆی لەسەر هەست‌و دڵ دانا تا باس لە بابەتێك بکات کە تازەیە دەربارەی سەرسامی‌و ئینکاریان، باسێك لەلایەن

پێغەمبەرەکەیانەوە لەم قورئانە ڕێزدارو شکۆمەندەدا هاتووە دەربارەی زیندوبونەوە و هاتنە دەرەوەی مرۆڤەگان لەنێو خاك!

کەچی ئەمانە سەرسامن لەوەی کە بێدارکەرەوەیەك لەخودی خۆیان رەوانەکراوە، لەحاڵێکدا نەدەبو سەرسام بونایە، بەڵکو بە ئاسایی وەریان بگرتایە، چونکە ئەوە بابەتێکە فیترەتی ئاسایی بە ئاسانی پێشوازی لێدەکاتو وەری دەگرێت، ئەوەش شتێکی سروشتی یە کە خوای گەورە کەسێکی شایستە لەنێو خەڵکدا هەڵبژێرێ، شارەزایان بێت، هەستو بیرکردنەوەی وەکو ئەوان بکات، زمانو ئاخاوتنی بەشێوەی ئەوان بێت، بەشداری ژیانو چالاکییان بێت، دەرکی هۆکارەکانی هاندانو پاڵنەرەکانیان بکات، توانا و خۆگرییان شارەزا بێت، ئەو خوایە بەلایەوە ئاساییە کەسێکی وا رەوانە بکات تا بێداریان بکاتەوەو تێیان بگەیەنێت، ئەگەر بەردەوام بن لەسەر رێبازو بیروباوەڕی چەوتیان چیان بەسەر دێت، هەروەها فێریان بکات چۆن رێبازی راست بگرنە بەر، وە باسی ئەو ئەركو بەرپرسیارێتی یەیان بۆ بکات کە ئەم ئاراستەو بەرنامە نوێیە دەیخوازێت، خودی ئەو پێغەمبەرەش یەکەم کەسو پێشەنگە لە هەڵگرتنی هەموو ئەرکو داخوازیەکاندا.

موشریکەکانی قورەیش لە پەیامەکەش سەرسام بوون، بەتایبەت لەباسی زیندوبونەوە کە هەر لە سەرەتاوە پەیامئاوەرەکە پێیڕاگەیاندن، چۆن دۆزی زیندوکردنەوەی مرۆڤەکان شتێکی سەرەکیو بنەڕەتی یە لە عەقیدەو بیروباوەڕی ئیسلامیدا.

لەلایەکی ترەوە ئیماندار بەرپرسە ـ کە بە حیکمەت‌و دانایی و ڕەچاوکردنی واقیع ـ حەق رابگەیەنێت‌و بەتاڵ و ناڕەوا کەنار بخات ، هەوڵی پایەدارکردنی حەق بدات تا شەڕ نەمێنێ‌و هەموو چالاکیەکانی لە دنیادا بخاتە چوارچێوەی خواپەرستی یەوە و ئاراستەی بکات تا پاداشتی قیامەتی پێ دەستەبەر بکات، چونکە پاداشت پەیوەندی بەکارو کردەوەوە هەیە، زۆر جار ئیماندار لە گەشتی سەرزەویدا ڕەنگە پاداشتی دەست نەکەوێت‌و دوابخرێت بۆ قیامەت و ئەو جیهان ـ لەوێ نەمردن ، نە پیری، نە نەخۆشی، نە هەژاری، نە گرفت، یەخەی بەختەوەران ناگرێت ـ .

هەر بۆیە دەبێ لەو جیهان زیندوبونەوە و لێپرسینەوە هەبێت ..

جا کاتێ بڕوابوون بە چەمکی ئەو جیهان نامێنێ لە دڵ‌و دەروندا، هەموو بۆچونەکان دەربارەی ئەم بیروباوەڕەو ئەرکەکانی دەڕوخێت‌و دڵ‌و دەرون‌و ناخی مرۆۋ هەرگیز لەسەر ڕێبازی ئیسلام ناوەستێت‌و پابەندی نابێت ..

بەڵام ئەو خەڵکە لەو سەردەمەدا تێڕوانینیان بۆ ئەم بابەتە گرنگە ئاوا نەبوو، بەڵکو بەشێوازێکی زۆر سادە بیریان لێ دەکردەوە، بەدوور لە سەرنجدانی حەقیقەتی ژیان‌و مردن، بەدوور لە ناسینی دەسەلاتی بێ سنوری خوای گەورەو نەخشەکانی لەو بوارەدا بۆیە بەسەرسامی یەوە وتویانە : باشە ئەگەر مردین‌و بوینە ئێسکی رزیو و تەپیو زیندوو دەکرێینەوە؟!

کەواتە بەبۆچونی ئەوان ژیانەوە دوای مردن بەدوور زانراوە، ئەمەش بیرکردنەوەیەکی سادەیە هەروەکو وتمان .. چونکە موعجیزەیەك جارێك رووبدات ئاسایی یە جارێکی تر روبداتەوە .. ئەو موعجیزەیەش بەردەوام

دەبینین کە روودەدات، لەخۆیان و دەروبەرو گەردوندا، هەربۆیە لەم سورەتەدا قورئان هەوڵ دەدات ئەو راستیانەیان بیربخاتەوە.

بەلام ئێمە دەمانەوێت پێش ئەوەی نیشانەو ئایەتەکانی خوای گەورە لە گەردون وژیاندا باس بکەین، هەڵوێستەیەك دەکەین لەبەردەم بابەتی نەمان و هەڵوەشانی جەستەی مرۆڤ ، کەواتە خەڵکی بەئاشکرا دەمرن و دەبنەوە بە خاك .. هەرکەسیش گوفتاری ئەو موشریکانە بەرگوێی دەکەوێت یەکسەر بیر لە خۆی و زیندەوەرانی دەوروبەر دەکاتەوە، ئاوڕ لە مردن و هەڵوەشان وتیاچوون دەکاتەوە، بەڵکو بەتێپەڕبوونی زەمان کە هێشتا زیندوە و لەسەر پشتی زەوی یە، هەست دەکات جەستەی بەرەو هەڵوەشان دەچێت!! ـ چاوەکانی کز دەبێت، گوێچکەی سەنگین و کپ دەبێت، دانەکانی دەکەوێت،تەندروستی تێك دەچێت ـ هیچ شتێکیش نیە وەك مردن زیندو راوەشێنی و دایچڵەکێنێ، تیاچون و هەڵوەشان و ـ دیمەنی گۆڕی قوڵ و تەنگ و تار ـ دەرونی بهێنێتە لەرزە ..

هەر بۆیە قورئان قوڵتر لەم باسە دەدوێت و دەیەوێت کاریگەریی بەهێزتری هەبێت لەسەر دڵ و دەروون، کاتێ کە زەوی وێنا دەکات چۆن بەرەبەرە جەستەیان دەخوات و هەڵیدەوەشێنێت! خوای گەورەش بەتەواوی ئاگادارە بەو گۆڕانکاریانەی کە بەسەر جەستەدا دێت ..

ئایەتەکە زەوی وەکو شتێکی زیندو وێنا دەکات کە بەردەوام هەڵدەوەشێت و دەپوکێتەوە، ئەو زاتەش کە بەدیهێناوە بەتەواوی ئاگادارە بە کاریگەریی زەوی لەسەر جەستەیان و لە تۆمارگەی تایبەت و پارێزراودا تۆمارە، ئەوانە دوای

ئەوەی جەستەیان رزی و بوونەوە بەخاك بەهەدەر ناچن!! بەقەدەر ئەتۆمێکیش لە جەستەیان لەم گەردونەدا ون نابێت!!

گەڕانەوەی ژیانیش بۆ خاك ـ بۆ لایان ئەستەمە؟ ـ خۆ پێشتر خاك بوون، بەردەوامیش لەو خاکە خۆیان و زیندەوەران و لەسەر رزق و رۆزی یەکەی دەژین پەیدا دەبن.

ئابەو شێوەیە خوای گەورە هەوڵدەدات دڵە سەختەکان بتوێنێتەوە وناسکی بکات، تا وای لێ بکات هەستیارو بێدار بێت و چاك پەیامەکان وەربگرێت، ئەمەش پێش ئەوەی هێرش بکاتە سەر خودی بیروبۆچونەکانیان.

پاشان باس لە حەقیقەتی حاڵیان دەکات کە بۆتە هۆی سەرهەڵدانی ئەو بیروبۆچون و رەخنە نابەجێ و پوچانە .. ئەویش بەهۆی وازهێنان و دوورکەوتنەوەیان لە حەقیقەتێکی نەگۆڕ، ئەوکات وەکو ئەوە وایە زەوی لەژێر پێیاندا لار بووبێتەوە وبەهیچ بارێکدا نەسرەون.

بەڕاستی ئایەتەکە دارشتنێکی ناوازەیە بەزەقی وێنای حاڵەتی ئەو کەسانە دەکات کە دەست بەرداری حەقی ڕەواو پایەداردەبن ، ئیتر لەسەر هیچ بەرنامەو بیروبۆچونێك ناسرەون!!

لەڕاستیدا حەق خاڵێکی دامەزراوو نەگۆڕەو ئەوەی باوەڕی پێی هەبێ بە مەحکەمی لەسەری دەوەستێ و پێیەکانی ناخلیسکێ، هەنگاوەکانی نالەرزێ، چونکە لەسەر زەوییەکی دامەزراو وەستاوەو ترسی لەرزین و رۆچون و نقوم بونی نیە، لەحاڵێکدا هەرچی لەو گۆڕەپانەدا هەیە ـ جگە لەو حەق و رەوایەی کە هەیە ـ هەمووی دەلەرزێ، دەجوڵێ، دەخلیسکێ، تێکەڵ و پێکەڵ دەبێت؛ نە

دامەزراوی، نە لەنگەر گرتن، نە بتەوی، نە هیوای چاك بونی هەیە، چونکە ئەوەی لە حەقی پایەدارو رەوا خۆی ببویرێ، هەڵدەخلیسکێ و بەرەو هەڵدێر دەچێت، دامەزراوی و پایەداری لە دەست دەدات، دڵئارامیو سرەوتی نامێنێ، بەردەوام کاروباری تێکەڵو پێکەڵەو بیروهۆشی ئاڵۆزەو بەدوورە لە دامەزراویو پایەداریی! بەڕاستی حاڵەتەکە بەشێوازێکی سەرسوڕهێنەر باس دەفەرموێت خەتەرەو خەیاڵی دڵو دەرون دەخاتە روو، دەڵێی چاودێری دەکرێت!

جا لەگەڵ باسی ئەم حەقە مەحکەمو پایەدارو بەرزو بڵندەدا، وە لە ڕێبازی وەڵامدانەوەی رەخنەکانیان دەربارەی زیندوبونەوە ـ دێتە سەرباسی هەندێ لەو شتانەی کە دیارو ئاشکران لەم گەردونو بونەوەرەدا، بۆیە سەرنجیان رادەکێشێ بۆ سەرنجدانی ئاسمانو زەویو کێوە سەختەکان، هەروەها سەرنجدانی باران بارین لە ئاسمانەوە، تەماشاکردنی دارخورما باڵابەرزەکان، باخو بێستانو روەکەکان بە شێوازێك کە گونجاو بێت لەگەڵ ئەو حەقە رەواو نەگۆڕو پایەدارە جوانو قەشەنگەدا ..

لەڕاستیدا ئەم ئاسمانە لاپەڕەیەکە لە کتێبی گەردوون دەربارەی ئەو حەقە دەدوێت کە ئەوان وازیان لێ هێناوەو فەرامۆشیان کردووە. باشە ئەوە بۆ تەماشای ناکەن، سەرنجی نادەن چەندە گەورەو فراوانو دامەزراوو تۆکمە یە؟ بەڕاستی مەحکەمو کەمالو جەمال بۆتە سیفەتو تایبەتمەندی ئاسمان لەگەڵ رێڕەوی ئایەتەکاندا گونجاوە. لەگەڵ بەڵگەی ئەوەی کە بە حەق و راستی

زاتێکی خاوەن جەمال وکەمال بەدی هێناوە، هەر بۆیە باسی سیفەتی تۆکمەیی و جوانی و بەدوور لە بونی کەلێن و ناتەواوی هاتووە.

هەروەها زەویش لایەرەیەکی ترە لە کتێبەکەی گەردوون کە لەسەر بنچینەی رەواو حەق دامەزراوەو بەرپاکراوە، جوانی و رازاوەیی لەسەری نومایانە..

راخستنی زەوی و دانانی کێوە سەختەکان لەسەری بەشێوازێکی جوان، پەیدابونی روەکی هەمەجۆر لەسەری بەڵگەیە لەسەر دامەزراویی و تۆکمەیی و جوانی و رازاوەیی، کە دەبی ئەویش سەرنج بدرێ، هەروەکو سەنجدانی ئاسمان.

ئینجا لەبەرانبەر دیمەنی ئاسمانی جوان و فراوان و بێ سنورەوە لەلایەکەوە، هەروەها زەوی پان و بەرین و تۆکمەو دامەزراو لەلایەکی ترەوە، سەرنجی دڵەکانیان رادەکێشێ بۆلای حیکمەت لە پەیدابونی ئەم دروستکراوانەدا، لە سەرنج راکێشانیان بۆلای لایەرەکانی گەردوون ..

ئەمانە هەمووی بەرچاو رونی یە، پەردەکان لادەدات بینایی روناك دەکاتەوە، دڵان والآدەکات، رۆحەکان پەیوەست دەکات بەم گەردوونە سەیرەوە، وە بەو دەستی قودرەتە داهێنانکاری کە بەوپەری حیکمەت و دانایی رێکی خستووە .. هەمویشی ئەو کەسانە سوودی لێ وەردەگرن کە خۆیان بە بەندەی خوای گەورە دەزانن و هەوڵ دەدەن بەدڵ بگەرێنەوە بۆلای پەروەردگاری خۆیان وە بە زووترین کات..

ئا ئەمەیە کە دڵی مرۆڤ پەیوەست دەکات بەم گەردونە فراوان و جوان و قەشەنگەوە، ئا ئەم شێوازەیە کە ئاسەوار لەسەر دڵ و دەرونی مرۆڤەکان دادەنێ و نرخ بۆ ژیانی خۆیان دادەنێت.

لەڕاستیدا قورئان دەیەوێت لە ڕێگەی زانستو زانیاری یەوە مرۆڤەکان پەیوەست بکات بە خالقو بەدیهێنەریانەوە، چونکە هەر تاکێکیان دەتوانێ بزانێتو تێبگات .. کەچی بەرنامەکانی لێکۆڵینەوەو توێژینەوە لەم سەردەمەدا ــ ئەو زاتە شکۆمەندە فەرامۆش دەکەن ــ بەناوی زانستەوە !! وە ئەو پەیوەندیە دەبڕن کە لەنێوان خوای گەورەو مرۆڤەکانو ئەو گەردونو بونەوەرەدا هەیە کە تیایدا دەژین، بەمەرجێ مرۆڤ شتێکە لەم گەردونەدا . ژیانیشی ئاسودەو سەقامگیر نابێت هەتا دڵو دەرونی لەگەڵ ئەم گەردونەدا لێ نەداتو پەیوەندی دروستیان پێکەوە نەبێتو هەست بە کاریگەریی ئەم گەردونە فراوانە نەکات، چونکە ناسینی هەر ئەستێرەیەك، یان کاکێشانێك، یان زانینی تایبەتمەندی ڕوەکێك یاخود ئاژەڵێك.. یاخود دەستەبەر کردنی هەندێ زانست دەربارەی ئەم گەرودونە و شارەزابوون لە نهێنی یەکانی ـ بەتایبەت لەم ساڵانەی دواییدا مەگەر خوابزانێ تەلسکۆبی هابل کە لە بۆشاییدا خەریکی وێنەگرتنی گەلە ئەستێرەکانە ـ چی نهێنی لەم گەردونەدا گواستۆتەوە بۆ بنکەی ناسا لە ئەمریکا.. کە دەبو هەموو ئەو زانا و نیوە زانانەشی دابچڵەکاندایە؛ دڵی هەمویانی ڕاوەشاندایە هە ستیان بۆ دروست بوایە کە هاوەڵو هاوڕێی ئەم گەردونەن، پەیوەندییەکانی مرۆڤیان باس بکردایە کە لەنێوان مرۆڤ و دەوروبەریدا هەیە. چونکە گەر بیربکەنەوە هەست بەوە دەکەن کە بەدیهێنەری ئەم گەردونەو هەموان یەکێکە هەر بۆیە هەرچی زانستو باسو لێکۆڵینەوە هەیە بەدوور لە دەستەبەرکردنی ئەو ئامانجە گەورەو گرنگ و کاریگەرە لە ژیانی خەڵکیدا، ئەوە زانستێکی کەمو کورتو ناتەواوەو زانستێکی

پوچەو باسێکی نەزۆکە ـ خۆشبەختانە لەم سالأنەی دوایدا زۆر لە زاناو گەردونناسەکان باوەڕی بتەویان پەیداکردووە، دەکرێ لە وەکالەتی ناساوە گوێبیستی باسەکانیان بین لە تۆڕی ئینتەرنێتدا ـ

لەڕاستیدا ئەم گەردونە کتێبێکی کراوەیە، بە هەموو زمانێ موتالا دەکرێت، بە هۆکاری هەمەجۆر مرۆڤ لێی تێدەگات، کەسی سادەی دەوارو کوخ نشین دەتوانێ بیخوێنێتەوە، هەروەها کەسی شارستانی نیشتەجێی ناو کۆشك‌و تەلاریش .. هەرکەسە دەتوانێ سەرنجی بداتو موتالای بکات بە ئاستی ئامادەیی و تێگەیشتنی خۆی، توێشوی حەق و راستی‌و ڕەوای دەست دەکەوێت، بەتایبەت کاتێ کە بە هەستو نەستێکی بێدارەوە موتالای دەکات، هەمیشە، لە هەموو شوێنێ دیمەنی دروستکراوان شایستەی سەرنجدان‌و تێڕامانە تا بەرچاوڕونی‌و بێداریی ببەخشێت بۆ هەموو بەندەیەکی هۆشیار کە دەیەوێت خوای پەروەردگاری لەخۆی رازی بکات، بەلأم بەداخەوە زانستو زانیاری یەکانی ئەم سەردەمەیان وا لێ کردووە کە گرنگی بەو سەرنجدان‌و هۆشیاری و بێداری یە نەدات، وە ئەو پەیوەندییەی کە دەبوا هەبێ لەنێوان دڵی مرۆڤ‌و گەردون‌و دروستکراوانی خوادا پەردەپۆشیان کردووە، چونکە بەناوی خورافاتی (پەیڕەوی لە زانست) هەرچی پەیوەندی هەیە لەنێوان دروستکراوانی خوادا لەو گەردونەی کە تیایدا دەژین پچڕاندویانەو پساندویانە !!

بە مەرجێ بەرنامەی ئیمان ـ لە ئیسلامدا ـ دژ نیە بەبەرنامە زانستی یەکان‌و شارەزابوون لە زانستی راستو دروست، بەڵکو پەیوەندی یەکانیان پێکەوە گرێ دەداتو هەموی دەبەستێتەوە بە حەقیقەتە مەزن‌و گەورەکەوە و دڵی مرۆڤەکانی

پێوە دەبەستێتەوە، واتە دڵەکان پەیوەست دەکات بە یاساکانی گەردون‌و راستیەکانی بونەوەرەوە . وە هەرچی یاساو بەرنامەو راستی هەیە دەبەستێ بەژیان‌و هەست‌و نەستی خەڵکی یەوە ـ بۆ نمونە ئەم نەوتەی کە ملیۆنەها ساڵە خوای گەورە لە بۆشاییەکانی ژێر زەمیندا ، لە قوڵایی دووهەزار تا سێ هەزار مەتردا هەڵیگرتووە بۆ ئەم سەردەمە کە لە هەموو سەردەمێکی تر زیاتر مرۆڤ پێویستێتی ، وەکو وزەی جۆراوجۆر و دروستکردنی هەزاران جۆر کەرەستە لێی، دەبوا زۆر مایەی سوپاسگوزاری خەڵکی بوایە بۆیە پەروەردگاری بەخشندە، کەچی زۆرکەم بیری لێ دەکرێتەوە، بەتایبەت بۆتە سەرچاوەی رزقێکی فراوان بۆ زۆرێك لە دەوڵەتان، کە ئەگەر دادپەروەرانە داهاتەکەی خەرج بکەن هەموو هاوڵاتیانیان دەحەوێتەوە ـ .

ئەو کاتە زانست‌و دروستکراوانی خوا نابنە شتانێکی وشك‌و بێ گیان تەنها بیرو هۆشەکان پێیانەوە سەرگەرم بێت‌و بیرلە نهێنی‌و وردەکاریەکانی نەکرێتەوە! دەبوا بەرنامەی ئیمان رۆڵی سەرەکی هەبوایە لە بواری باس‌و لێکۆڵینەوەکاندا بۆ ئەوەی زانست‌و زانیاری یە راستەکان ببەستێ بەو بیروباوەڕە پیرۆزو مەحکەم‌و گرنگەوە.

پاشان دوای ئەو سەرنج ڕاکێشانە :

﴿ وَنَزَّلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً مُّبَٰرَكًا فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ جَنَّٰتٍ وَحَبَّ ٱلْحَصِيدِ ﴿٩﴾ وَٱلنَّخْلَ بَاسِقَٰتٍ لَّهَا طَلْعٌ نَّضِيدٌ ﴿١٠﴾ رِّزْقًا لِّلْعِبَادِ ۖ وَأَحْيَيْنَا بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا ۚ كَذَٰلِكَ ٱلْخُرُوجُ ﴿١١﴾ ﴾

خوای گەورە هەندێ لاپەڕەکانی کتێبەکەی گەردون هەڵدەداتەوەو تا بەرەبەرە مرۆڤەکان بەرەو باسی زیندوبونەوە ببات..

دیارە ئەو ئاوی بارانەی کە لە ئاسمانەوە دادەبەزێت پێش ئەوەی زەوی مردو زیندو بکاتەوە حەق وایە دڵە مردوەکان زیندوبکاتەوە، چونکە بەبێ گومان دیمەنەکەی کاریگەریی خۆی هەیە، وەنەبێ تەنها منداڵان خۆشی دەربڕن بە باران و جاری وا هەیە لەخۆشیدا خەریکن باڵ بگرنەوە، بەڵکو دڵی هەستیاری کەسانی گەورەش شادمانە بەدیتنی و لەخۆشیدا خەریکە گەشکە دەیانگرێت وەکو دڵی منداڵە پاك و بێگەردەکان، کە فیترەتیان پاك و بێگەردە ..

قورئان باسی ئاوی بارانیش بەوە دەکات کە بەرەکەتدارە، وە دەستی قودرەتی خوایی وێنا دەکات بەوەی کە دەیکاتە هۆکار بۆ پێگەیشتنی باخی میوەو دەغڵ و دان و بەروبومی دارخورماکە ئاماژە بە باڵای بەرزی و دیمەنی جوانی دەکات بەتایبەت ئەوکاتەی کە هێشووە خورما جوان و ئاڵتونی یەکانی پێدا شۆڕ بۆتەوە کە مایەی سەرنج و تێرامانە بۆ ناسینی زاتی حەق کە بتوەڕ پێی شیرین و جوان و بەتامە وەکو هێشوە خورماکان.

هەمو ئەوانەی باس کرا رزق و رۆزی هەمەجۆرن کە خوای گەورە بەخۆڕایی، وەکو دیارییەکی بەردەوام پێشکەش بە بەندەکانی خۆی دەکات و بە ویست و نەخشەی ئەو زاتە دێنە بەرهەم کەچی زۆربەی خەڵك سوپاس ناپەزێرن، لە هەمان کاتدا بۆتە سەرچاوەی دابین کردنی بژێوی بۆ ژمارەیەکی زۆری خەڵك و جم و جوڵێکی بازرگانی .

ئینجا باسەکان بەرەو ئەوە دەبات کە:

خەڵکینە چۆن زەوی مردومان زیندو کردەوە ، چۆن درەختە وشکەکانمان هێنایە بەرهەم ئاواش ئێوە زیندو دەکەینەوە..

ئەمەش پێشهاتێکی بەردەوامە و دووبارە دەبێتەوە و ئەو خەڵکە بەچاوی خۆیان دەیبینن، بەڵام بەدڵ سەرنجی نادەن و بیری لێ ناکەنەوە، سەرسامن لەوەی چۆن زیندو دەکرێنەوە!! بەڵام بۆخوای گەورە زۆر ئاسانە هەر بەو شێوازە سادەیەی گە بەردەوام دەیبینن زیندوتان دەکاتەوە ولەنێوخاکدا دەرتان دێنێ ..

بەو شێوەیە خاوەن و بەدیهێنەری دڵەکان دەیەوێت ناخ و دڵ و دەرونەکان بێدار بکاتەوە و بابەتی زیندوبونەوەیان لەلا ئاسان وێنا بکات، کە بۆ خوای گەورە هەر زۆر ئاسانە.

* * *

پاشان دوای ئەو باسانە هەندێ لە لاپەڕەکانی مێژوویان بۆ هەڵدەداتەوە دوای ئەوەی کە هەندێ لاپەڕەکانی گەردون و بونەوەری بۆ هەڵدانەوە، کە بە ئاشکرا باسی چارونووسی بێ باوەڕان و بەدڕەوشتان دەکات، کە وەکو موشریکەکانی هەموو سەردەمێك باوەڕیان بە زیندوکردنەوە نیە، بەڵکو باوەڕیان بە پێغەمبەرانیش نەبوەو نیە، ئەوسا ئیتر بڕیار دادەی خوای گەورە و هەڕەشەکانی یەخەی گرتوون و نەیانتوانیوە لە دەستی دەرباز بن، یا خۆیانی لێ لا بدەن :

﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَأَصْحَٰبُ ٱلرَّسِّ وَثَمُودُ ﴿١٢﴾ وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ وَإِخْوَٰنُ لُوطٍ ﴿١٣﴾ وَأَصْحَٰبُ ٱلْأَيْكَةِ وَقَوْمُ تُبَّعٍ ۚ كُلٌّ كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ وَعِيدِ ﴿١٤﴾ أَفَعَيِينَا بِٱلْخَلْقِ ٱلْأَوَّلِ ۚ بَلْ هُمْ فِى لَبْسٍ مِّنْ خَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٥﴾﴾

(١٢) پێش ئەمانیش قەومی نوح و خاوەن بیرەکان و هۆزی (ثمود) پەیام و بەرنامەی پێغەمبەرانیان بە درۆ زانی و بڕوایان پێ نەکرد.

(١٣) هـەروەها قـەومی هـود و فیرعـەون و براکـانی لـوط (واتـە قەومـە بـەد ڕەوشتەکەی) ئەوانیش بڕوایان بە پەیامەکانی خوای گەورە نەکرد .

(١٤) هـەروەها خـاوەن باخـە چـڕەکانیش،وە(قەومی(تبع) کـە یـەکێك بـوو لـە پاشاکانی یەمەن)، هەر قەومێك لەوانە باوەڕیان بە سەرجەم پێغەمبەران نەبوو ، هەر بۆیە هەڕەشەکانی ئێمە یەخەی پێ گرتن و لەناوی بردن.

(١٥) باشە ، ئەو خەڵکە بۆ بیرناکەنەوە ، ئایا ئێمە ماندو بووین کە یەکەم جار دروستمان کردن؟! ئایا هیچ گیرو گرفت هاتە ڕێمان؟! نەخێر.. بەڵکو ئەوانە هەر لە گوماندان بەرانبەر سەر لەنوێ دروستکردنەوەیان ، (ڕۆژانە ئەو هەموو موعجیزەی ژیـان و مردنـە دەبیـنن لـە جیهـانی ئادەمیزادو ئـاژەڵ و باڵنـدەو مێروەکاندا ) کەچی بیر ناکەنەوەو تێنافکرن و هەر لە گوماندان !!

(رس) بە بیرێك دەوترێت کە لەناوەوە هەڵنەچنرابێت.. (أیکە)ش بە درەختی چڕوپڕی لە یەکتر ئالاو دەوترێت کە پێدەچێت مەبەست قەومی (شعیب) بێت .. خاوەنی بیرەکان (رس) تەنها لێرەدا باس کراون .. هەروەها قەومی (تبع)یش مەبەست پاشاکانی یەمەنە، قەومەکانی تریش کە ناوی هێناون لەلای خوێنەر و شارەزای قورئان ئاشکرایە.

بێگومان ئامانج لەم ئاماژە خێرایە ئەوە نیە کە بە درێژی باسی هەڵوێستی ئەو قەومو گەلانە بکات، بەڵکو قورئان دەیەوێت لە ژێی دڵان بداتو سەرنجیان رابکێشی بۆلای هۆکاری تیاچوون و لەناوچوونی دێرینەکان کاتێ کە بڕوایان بە پێغەمبەران نەکرد، ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەیە کە هەر گەلێك لەو گەلانە بڕوایان بە سەرجەم پێغەمبەران نەکردووە: ﴿كُلٌّ كَذَّبَ الرُّسُلَ فَحَقَّ وَعِيدِ ۝١٤﴾ ،

بێگومـان ئەمـەش ئاماژەیەکـە بـۆ سـەلماندنی وێکچـوونی ئـەو پەیامـەی کـە پێغەمبـەران رایـان گەیانـدووە، دیـارە کـە پێغەمبـەران بـرای یـەکترن و بـۆ خۆیـان ئۆمەتێکن، درەختێکن رەگیان بە قوڵایی زەماندا چۆتە خوارەوە، هەر لقێکی ئەو درەختـە هـەموو تایبەتمەندییـەکانی درەختەکـەی لـە خۆیـدا کۆکردۆتـەوە، وێنەیەکی ئەون، ئەوەی دژی هەر لقێکی بوەستێ؟ دیارە دژی هەموو لقەکانی وەستاوە، بۆیە سزای خوایی یەخەیان دەگرێت، هەروەکو گوێبیستان دەیزانن.

جا لەسایەی ئەو هەموو بەڵایانەی کە بەسەر خوانەناساندا هاتووە دەگەڕێتەوە بـۆ باسـی ئـەو دۆزەی کـە ئـەو خەڵکـە بڕوایـان پێـی نیـە، دۆزی زیندوبونـەوەی سەرلەنوێ، بۆیە بەپرسیار دەفەرموێت : ﴿ أَفَعَيِينَا بِٱلۡخَلۡقِ ٱلۡأَوَّلِۚ ﴿١٥﴾ ﴾ ؟! باشە داخۆ دروستکردنی یەکەمجاریان ماندوی کردوین؟ ئەو خەڵکەش ئەوەتە لەبەر چاوە و وەڵامی ناوێت! ﴿ بَلۡ هُمۡ فِي لَبۡسٖ مِّنۡ خَلۡقٖ جَدِيدٖ ﴿١٥﴾ ﴾ ئەوانە سەرنجی دروستکردنی یەکەمجار نادەن!!

باشـە ئـەو کەسـەی کـە ئـەو راسـتیانەی لەبەرچـاوە شایسـتەی چـی تـرە بـۆی بکرێت و بۆی باس بکرێت؟

* * *

بەشی دووهەمی سورەتەکە ، بە درێـژی لـە دۆزی زیندوبوونەوە دەدوێت کە لە بەشی یەکەمدا باس کرا، لەم بەشەدا هەوڵ دەدات چارەسەری دڵـە نەخۆشـەکان بکات ، بەشێوازێکی تازە ، بەڵام ترسناک و سامناک کە بریتـی یە لـەو چاودێری یـەی کـە لـە پێشـەکی سـورەتەکەدا باسمـان کـرد، وە لـەو دیمەنانـەی دوایـن کـە وێنای دەکات و دیاری دەکات..

پاشان دیمەنی مردن و سەختیەکانی، دواتر دیمەنی لێپرسینەوە و نیشاندانی دۆسیەکان، ئینجا دیمەنی دۆزەخ کە وەك گیاندارێکی کێوی دەمی داچەقاندووە و گینگڵ دەدات هەرکات سوتەمەنی تێدەکرێت کە بریتی یە لەو خەڵکە بێ دینە، دەڵێت : ئەی هی تر نەماوە؟ لەپاڵ ئەم باسانەدا بەهەشت و نازو نیعمەتەکانی لەگەڵ ڕێزو پێزانینیدا ئامادەیە.

لەڕاستیدا ئەم حاڵەتە گەشتێکە لە پەیدابونەوە دەست پێدەکات و بە قۆناغی مردندا تێدەپەڕێت و بە زیندوبونەوەو لێپرسینەوە کۆتایی دێت .. گەشتێکە پەیوەستە بە یەکترەوە بەبێ وەستان، نەخشەکە پیشانی دڵ و دەرونی مرۆڤ دەدات کە ناتوانێ لێی دەرباز بێت ، یاخود لێی لابدات، سەرەتا و کۆتایی لەژێر دەسەڵاتی خوادایە، کەس ناتوانێ خۆی لێ بدزێتەوە و خۆی دەرباز بکات، هەمووان لەژێر چاودێری ئەو زاتەدان کە نە ماندوەبێت و نە غەفلەت رووی تێدەکات، بەڕاستی گەشتێکی سامناکە، هەست و نەست پڕدەکات لە بێداری و ترس و بیم، چونکە مرۆڤ لەژێر دەستەڵاتی خواوەندی بەدەستەڵاتدایە، کە ئاگادارە بە هەرچی لە دڵ و دەروون و سینەکاندایە. داخۆ حاڵی مرۆڤ چۆن بێت کاتێ بەخۆی دەزانێ کە ئەو زاتەی کە داوای دەکات و ئامادەی دەکات، خوای پەروەردگاری تاك و تەنهایەکە هیچ لەبیر ناکات، غافڵ نابێت و ناخەوێت؟!.

جاری وا هەیە کەسێك لەرزی لێ دێت و حاڵی تێك دەچێت و هاوسەنگی خۆی لەدەست دەدات، کاتێ هەست دەکات دەستەلاتدارێك لە دنیادا لەڕێگەی جاسوس و سیخوڕەکانیەوە چاودێری جم وجوڵ و هەڵس و کەوتی دەکات .. بێگومان دەسەڵاتدارانی دنیا چەندە جاسوس و چاودێر دابنێن بۆ کەسێك، هەر

دەتوانن جمو جوڵە ئاشکراکانی تۆمار بکەن، کاتێ کە دەگەڕێتەوە ماڵەوە رەنگە ئەوەشیان بۆ نەکرێت، بەتایبەت کە دەرگای ژوور لەسەرخۆی دادەخات، یان کاتێ کە دەمی دادەخات! بەڵام دەستەڵاتی خواوەندی بەهێزو بەتوانا لە هەموو شوێنێکدا بۆ هەرکوێ بچێت ئاگای لیچیەتی، بەڵکو ئاگادارە بە خەتەرەو خەیاڵی ناخ و دڵ و دەروون و سەرجەم نهێنی یەکانی. بەڵێ ئەم مرۆڤە ئاوا لەژێر دوستەڵات وچاودێریدایە ؟! ـ کەچی زوربەی بێ باکەو هەرچی خوای گەورە پێی ناخۆشە دەیلێ و دەیکات!! ـ

*   *   *

﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِ نَفْسُهُ ۖ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ ﴿١٦﴾ إِذْ يَتَلَقَّى الْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ قَعِيدٌ ﴿١٧﴾ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴿١٨﴾﴾

(١٦) لە ڕاستیدا هەر ئێمە ئینسانمان دروستکردوەو چاکیش دەزانین لە هەر چرکە ساتێکدا چ خەتەرەو خەیاڵ و بیرێك بە دڵ و دەرونیدا دێت ، وە ئێمە لە شاڕەگی دڵی ، بەو نزیکترین ...

(١٧) بەردەوام دوو فریشتەی چاودێر دانیشتون لەسەر شانی ڕاست و چەپی (بێ ئەوەی هەستی پێ بکات).(گوفتارو کرداری بە دەزگای زۆر پێشڕەفتە تۆمار دەکەن )...

(١٨) هەر قسەیەك لە دەمی ئادەمیزاد دەربچێت خێرا یەکێ لە فریشتە چاودێرەکان تۆماری دەکات (ئەوەی لای ڕاست چاکەکان و ئەوەی لای چەپیش گوناهو خراپەکان تۆمار دەکات) ...

لەڕاستیدا ئەوە ئاماژەیەکی بەهێزە کە قورئان رایدەگەیەنێت بەوەی کە خوای گەورە ئەم مرۆڤەی بەدی هێناوە، چاکیش لە نهێنی یەکانی ئاگادارە، بەتایبەت چونکە پەروەردگار زاتێکی دروستکارە، سەیر لەوەدایە وەنەبێت مادده هەبووبێت ئەو رێکی خستبێت، بەڵکو خالق و بەدیهێنەری سەرجەم ماددەکانە؟ چونکە بێگومان ئەم مرۆڤە هەر لە بنەڕەتدا دەستکاری ئەو زاتەیە، لەبەر ئەوە هەرچی ناوەرۆك و نهێنی و سیفاتی ئاشکراو پەنهانیەتی لەلای بەدیهێنەری زانای کە سەرچاوەو بنەڕەت و حاڵ و ئەحواڵ و چارەنووسی دەزانێت ئاشکرایە.

لەبەر ئەوە ئاگادارە بە وەسوەسە و خەتەرەو خەیاڵی ناخی .. بەتایبەت مرۆڤی ئیماندار هەست دەکات هەرچی نهێنی و شاراوەکانیەتی ئاشکرایەو هیچ شتێکی پەردەپۆش نیە، هەموو وەسوەسە و خەتەرەو خەیاڵە وردەکانیشی لای خوای گەورە زانراوە، وەکو پێشەکیەك بۆ رۆژی لێپرسینەوە کە زۆربەی مرۆڤەکان ئینکاری دەکەن و بڕوایان پێی نیە!!

لەکاتێکدا کە خوای گەورە نزیکترە لە دەمارەکانی کە خوێنی پێدا هاتوچۆ دەکات، ئەمەش دەستەواژەو دەربڕینێکە وێنای دەسەڵاتی خاوەنداریێتی و چاودێری راستەوخۆ دەکات..

بێگومان کاتێ مرۆڤ باوەڕی بەم حەقیقەتە هەبێت، حەق وایە ترس و لەرز دایبگرێت و لێپرسینەوە لەگەڵ خۆی بکات.. بێگومان ئەگەر ئەم راستی یە لە ناخی مرۆڤدا چەسپا، هیچ کەس ناوێرێ شتێك بڵێ کە خوای گەورە پێی رازی نەبێت، بەڵکو ناوێرێ بیر لە شتێکی ناباش بکاتەوە، لەڕاستیدا ئەو ئایەتە بەسە

بۆ ئەوەی مرۆڤ بەردەوام وریاو بێدار بێتو لێپرسینەوە لەخۆی فەرامۆش نەکات..

بەڵام قورئان بەردەوام دەبێت لەسەر باسی ئەو چاودێری یەی کە بە وردیو توندوتۆڵی ئەنجام دەدرێت، ئەویش بەوەی کە مرۆڤ ژیانی بە گشتی، جوڵەو خەوی، خواردنو خواردنەوەی، قسەکردنو بێدەنگی لە ماوەی گەشتی دنیادا لەگەڵ دوو دانە فریشتەی چاودێردا بەسەر دەبات کە بەردەوام لەلای راستو چەپیەوە ئامادەن، هەرچی قسەو گوفتارو جمو جوڵێك دەکات دەستبەجێ تۆماری دەکەن - بێگومان بە دەزگای زۆر پێشکەوتو تر لەوەی کە تا ئێستە مرۆڤ دروستی کردووە - !

ئەو فریشتانە هەمیشە دووچاودێری ئامادەن نەك ناویان (رقیب عتید) بێت!

ئێمە نازانین چۆن کاروکردەوەکان تۆمار دەکەن، پێویستیش ناکات خەیاڵبافی بکەین، چونکە هەڵوێستی ئێمە بەرانبەر ئەو باسە غەیبیو شاراوانە ئەوەیە کە باوەڕمان پێی هەبێتو وەك خۆی وەری بگرین، باوەڕمان بە ئامارژە قورئانیەکان دەبێ هەبێت بەبێ رۆچوون لە باسی چۆنیەتیەکەیدا، کە زانینی هیچ سودمان پێ ناگەیەنێت، بەتایبەت کە لە سنوری زانینو تاقیکردنەوەکانی ئێمە بەدەرە.

- شایانی باسە لەم سەردەمەدا مرۆڤ توانیویەتی میمۆریو دەزگای زۆر پێشکەوتوو بۆ تۆماری دەنگو رەنگ دروست بکات، دەبێ بڵێین داخۆ ئەو دەزگایانەی کە خالقو بەدیهێنەری مرۆڤ و هەموو شت بەخشیویەتی بە فریشتەکانی دەبێ چەندە وردو پێشکەوتوو بن!! - .

چونکە لەم سەردەمانەی ئێمەدا هۆکاری وا پەیدا بووە بۆ تۆماری دەنگ و رەنگ؛ هەرگیز بەخەیاڵی باوو باپیرانماندا نەهاتووە، وەکو شریتە دەنگیەکان و شریتی سینەما و تیڤییەکان ـ لەم سەردەمەدا ئەوەندە تەکنۆلۆژیایان لە مۆبایلدا ئاخنیوە مرۆڤ سەری سوڕدەمێنێ لەو مادانەی کە ئەم هەموو نهێنی یانەیان تێدایەو بەهۆی کارەبایەکی لاوازەوە ئەم هەموو خزمەتانە پێشکەش دەکەن ـ .

ئەمە هەمووی بۆ ئێمەی مرۆڤ، لەبەر ئەوە ناکرێت بە نیسبەت فریشتەکانەوە شێوازێکی تایبەت لە تۆمارکردن بڕیار بدەین کە لە جیهانی واقیعی ئێمەدا هەیە، چونکە ئێمە زۆر دوورین لەو دنیا غەیبیی و نەناسراوەوە، کە هیچی لێ نازانین جگە لەوەی کە خوای گەورە شارەزاییەکی پێبەخشیین ـ لەڕێگەی قورئانەکەیەوە ـ بەبێ زیادو کەم !

ئێمە ئەوەندەمان بەسە کە لە سایەی ئەم حەقیقەتە وێناکراوەدا پشوویەك بدەین، وە هەستێکمان بۆ دروست ببێ کە هەرچی قسەو گوفتارێك لە دەممان دەردەچێت دڵنیایین کە تۆمار دەکرێت لەلایەن ئەو فریشتانەوە، بۆ ئەوەی بیخەنە نێو دۆسیەکانمانەوە، تا لەبەردەم دادگای سەرتاپا دادی خواییدا لە ڕۆژی لێپرسینەوەدا لەبەر دەستی قودرەتی ئەو زاتەدا بێت.

ئێمە ئەوەندەمان بەسە کە لەو سایەیەدا ورد بینەوەو تێفکرین، چونکە ئەوە حەقیقەتێکە هەرچەندە ئێمە لە شێوازەکەی تێناگەین، کەسیش ناتوانێ خۆی لێ گێل بکات، بەتایبەت ئەوەتە خوای گەورە ئاگاداری کردوین تا حسابێکی وردی بۆ بکەین، نەك خۆمان ماندو بکەین لە چۆنیەتیەکەیدا.

شایانی باسە ئەوانەی کە سودیان لەم قورئانەو لە ڕێنوێنیەکانی پێغەمبەر(ﷺ) وەرگرتووە کە پەیوەستە بە قورئانەوە، بەم شێوەیە بیریان کردۆتەوە: سەرەتا هەستو نەستو شعوریان بزواوەو دواتر بۆتە ڕێکخەری کارو کردەوەیان ..

بۆ نموونە ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی:جاری وا هەیە کەسێك شتێك دەڵێت کە ڕەزامەندی خوای گەورەی تێدایە، نازانێ چەندە جێگیرو چاكو بە بەرەکەت بووە، دیارە خوای گەورە پێزانەو ڕەزامەندی خۆی بۆ تۆمار دەکات، ئەو ڕۆژەی کە بە دیداری شاد دەبێت ـ بۆی دەردەکەوێت چەندە شتێکی چاکی وتووە ..

لەلایەکی ترەوە کەسێکی تر شتێك دەڵێت کە خوای گەورە پێی ناخۆشەو نازانێ چ هەڵەو گوناهێکی ئەنجامداوە، لە هەمان کاتدا ئەو زاتە ڕقو قینی خۆی بۆ بڕیار دەدات، هەتا ئەو ڕۆژەی ئامادە دەکرێ بۆ لێپرسینەوە ـ ئەو کات بۆی دەردەکەوێت چ ناماقوڵی یەکی کردووەو چ هەڵەو گوناهێکی ئەنجام داوە!!

دەگێڕنەوە کە پێشەوا (احمد) لە سەرەمەرگدا ناڵاندویەتی، گوێی لە کەسێك بوو دەیوت: کە ناڵە ناڵی نەخۆش تۆمار دەکرێت، ئیتر بێدەنگ بوو، هەتا گیانی دەرچوو.

ئابەو شێوەیە ئەو جۆرە کەسایەتیانە ئەم حەقیقەتانەیان وەردەگرتو بە دڵنیاییەوە لەگەڵیدا دەژیان.

* * *

ئەوەی باس کرا لاپەڕەی ژیان بوو، بەشوێنیدا باسی لاپەڕەی سەرەمەرگ دێت..

﴿ وَجَآءَتۡ سَكۡرَةُ ٱلۡمَوۡتِ بِٱلۡحَقِّۖ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنۡهُ تَحِيدُ ١٩ ﴾

(١٩) ئەی ئینسان خۆت ئامادە بکە ، هاکا، تەنگانەو ئازارەکانی مردن هاوڕێ لەگەڵ کۆمەڵێك حەق و حەقیقەت و راستەقینەدا یەخەی پێ گرتیت (وەك دیتنی فریشتەی مەرگ ، فریشتەکانی چاودێر ، مەنزڵ و مەقامت وە پێت وترا:) ئەمە ، ئەو پێشهاتەیە کە خۆت لێی دورە پەرێز دەگرت و خۆتت لێ پەنا دەدا .

دیارە مردن رووداوێکی سەختەو مرۆڤ زۆر هەوڵدەدات تارماییەکەی لەخۆی دوور بخاتەوەو خۆی لێ بدزێتەوە، بەلاّم هەرگیز ئەوەی بۆ ناکرێت و بۆی نالوێت، چونکە مردن شتێکە کۆڵ نادات و بەشوێن ئادەمیزادەوە یەو هەنگاوەکانی خاوناکاتەوەو هیلاك نابێت و لە وادەی خۆیشی دواناکەوێت، باسی تەنگانەکانی سەرەمەرگ بەسە کە جەستە بێنێتە لەرزەو پەشۆکان، جا لەکاتێکدا دیمەنی مەرگ سەری هەڵداوە مرۆڤ گوێبیستی ئەم ئایەتە دەبێت ﴿ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنْهُ تَحِيدُ (١٩)﴾ ئا ئەمە ئیتر ئەو پێشهات و ساتەوەختەیە کە تۆ خۆتت لێ لادەداو هەوڵت دەدا لێی دوورەپەرێز بیت.

مرۆڤ بە دەنگدانەوەی ئەو بیرخستنەوەیە لەرزی لێ دێت بە مەرجێ هێشتا لەژیاندایە: داخۆ حاڵی چۆن بێت کاتێ هەواڵی ئەوەی پێدەدرێت لە حاڵەتێکدا ئەو هێشتا لەکاتی گیان کێشان و گیان لە دەستداندایە..

لە روایەتێکی راست و دروستدا هاتووە کاتێ حاڵەتی گیانکێشان بەسەر پێغەمبەردا(ﷺ)هات؛ ئارەقی ناوچەوانی دەسڕی و دەیفەرموو: { سبحان الله ، بەڕاستی مردن حاڵەتێکی سەختە} ئەو زاتە ئەوەی دەوت لەکاتێکدا کە خۆی لیقای خوای گەورە و بڵندی و شکۆمەندی هەڵبژاردبوو، داخۆ حاڵی کەسانی تر چۆن بێت؟!

جا لە ئایەتەکەدا وشەی (حق) هاتووە : ﴿وَجَآءَتْ سَكْرَةُ ٱلْمَوْتِ بِٱلْحَقِّ ﴿١٩﴾﴾ کە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە مرۆڤ لەو کاتەدا بەتەواوەتی حەق و حەقیقەتی بۆ دەردەکەوێت، چونکە پەردە لەسەر بینایی لادەبرێت، زۆر شتی بۆ دەردەکەوێت کە جاران نەیدەزانی، یاخود ئینکاری دەکرد، بەڵام تازە کار لەکار ترازاوەو کات بەسەر چوو، بینینی جیهانی غەیب و شاراوەکان سودی نیە، تێگەیشتن لە ڕاستیەکان بێ هودەیە، ئیتر تەوبەو پەشیمانی وەرناگیرێت، ئیمان و باوەڕهێنان بەهای نیە، ئەمە ئەو حەق و حەقیقەتەیە کە خەڵکێکی زۆر باوەڕی پێی نەبوو، خۆیان سەرگەردان و پەرتەوازە کردبوو بەرانبەری!!

هەر بۆیە کاتێ کە یەخەیان دەگرێت و باوەڕی پێدەکەن هیچ سود و قازانجێکی نیە بۆیان!!

* * *

پاشان لە تەنگانەو کۆسپەکانی مردنەوە، بۆ سەختیەکانی گۆڕەپانی کۆکردنەوە ، بۆ سەختی و سامناکی موحاسەبەو لێکۆڵینەوە..

﴿وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ ۚ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْوَعِيدِ ﴿٢٠﴾ وَجَآءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّعَهَا سَآئِقٌ وَشَهِيدٌ ﴿٢١﴾ لَّقَدْ كُنتَ فِى غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلْيَوْمَ حَدِيدٌ ﴿٢٢﴾ وَقَالَ قَرِينُهُۥ هَٰذَا مَا لَدَىَّ عَتِيدٌ ﴿٢٣﴾ أَلْقِيَا فِى جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٍ ﴿٢٤﴾ مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ مُّرِيبٍ ﴿٢٥﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَأَلْقِيَاهُ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلشَّدِيدِ ﴿٢٦﴾ قَالَ قَرِينُهُۥ رَبَّنَا مَآ أَطْغَيْتُهُۥ وَلَٰكِن كَانَ فِى ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ ﴿٢٧﴾ قَالَ لَا تَخْتَصِمُوا۟ لَدَىَّ وَقَدْ قَدَّمْتُ إِلَيْكُم بِٱلْوَعِيدِ ﴿٢٨﴾ مَا يُبَدَّلُ ٱلْقَوْلُ لَدَىَّ وَمَآ أَنَا۠ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٢٩﴾﴾

(٢٠) پاشان ڕۆژێك دێت فوو دەكرێت بە دەزگای (صور)دا ، ئەوە ئیتر ڕۆژی ئەنجامدانی ئەو هەڕەشانەیە كە كاتی خۆی دەكرا (لە كافرو موشریك و دوو ڕووەكان) .

(٢١) ئەو ڕۆژە هەر كەسێك دوو فریشتەی لەگەڵدایە یەكێكیان سەوقی دەكات و دەیگەیەنێتە شوێنی دادگایی كردنی ، ئەوی تریشیان شایەتە بەسەریەوەو دۆسیەو پەروەندەكانی پێیە...

(٢٢) ئەوسا بە یەكە یەكەی تاوانباران دەوترێت: لە ڕاستیدا تۆ خۆت گێل دەكرد لە باسی ئەم پێشهاتەو باوەڕت پێی نەبوو ئێستا ئیتر ئەوەتە پەردەمان لەسەر چاوت لاداوەو هەموو ئەو شتانەی كە بۆت باسكرابوو بە ڕونی دەیبینیت و ئەمڕۆ دەزگای بینابیت زۆر تیژە!!

(٢٣) لە كاتی وەستاندا یەكێ لە فریشتەكان هاوەڵی بێدینەكەیە و چاك دەیناسێت و ڕابردووی ئەو كەسە چارە ڕەشەی لەبەر دەستدایە بۆیە دەڵێت: پەروەردگارا: ئا ئەمەی لای منە ، دۆسیەی كارو كردەوەی لەگەڵ خۆیدا ئامادەیە...

(٢٤) ئینجا دوای لێپرسینەوە خوای گەورە فەرمان دەدات بە هەردوو فریشتەكە و دەفەرموێت: ئادەی هەرچی كافرو بێ باوەڕێكی سەركەش و بوغزن و پیلانگێڕ هەیە فڕێی بدەنە ناو ئاگری دۆزەخەوە ....

(٢٥) ئەو جۆرە كەسانەی كە كاتی خۆی قەدەغەی هەموو خێرو چاكەیەكیان دەكرد ، مافی خەڵكیان پێشێل دەكرد ، خۆی گومانی هەبوو لە چەمكەكانی ئاین و لەم ڕاستیانەو گومانیشی دەخستە دڵ و دەرونی خەڵكیەوە...

(٢٦) ئەو کەسەی کە کاتی خۆی شەریك و هاوەڵی بۆ خوای گەورە بڕیار دەدا ، دوقۆڵی بیگرن و فڕێی بدەنە نێو سزای بە ئێش و ئازارەوە .

(٢٧) ئینجا هاوەڵە شەیتانەکەشی دیارە کە ئامادە کراوە ئەویش پاکانە بۆ خۆی دەکات و دەڵێت: پەروەردگارا خۆ من لە خشتەم نەبردووە ، من پاڵنەری نەبووم بۆ ئەو هەموو گوناهو تاوانە ، بەڵکو هەر خۆی لە نێو گومڕایی و سەر لێشێواویەکی قوڵدا خۆی قەتیس کردبوو.

(٢٨) (ئینجا دیارە شەیتان و ئادەمیزادی سەرگەردان لەبەردەم دادگای خواییدا ، دەبێتە کێشەیان ، بۆیە خوای گەورە بێدەنگیان دەکات و دەفەرموێت: ) دەمە دەمێ و شەڕە قسە لای مندا مەکەن ، چونکە کاتی خۆی من هەڕەشەی هاتنی ئەم ڕۆژەم خستبووە بەرچاوتان و ڕاستیەکانم پێڕاگەیاندبوون.

(٢٩) ئیتر قسەو بڕیاری من نەگۆڕەو هەڵناوەشێتەوە ، وە من هەرگیز ستەمکاریش نیم بەرانبەر بەندەکانم .

لەڕاستیدا بیرکردنەوە لەم بەسەرهاتانەی قیامەت بەسە بۆ ئەوەی کە مرۆڤ ژیانی دنیای لەم سەر زەوی یەدا بە وریایی و هەستیاری و چاودێری وردی خۆی بەسەر بەرێت، بەتایبەت پێغەمبەرمان(ﷺ) پتر لە چواردە سەدە فەرمویەتی: من چۆن ئاسودە دەبم لەکاتێکدا کە فریشتەی تایبەت کەڕەناکەی بەدەستەوەیە، بە چەماوەیی وەستاوەو چاوەڕوانی ئەوەیە فەرمانی پێ بدرێت؟!

هاوەڵان وتیان ئەی پێغەمبەری خودا؛ چی بڵێین ـ باشە ـ ؟ ..

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموێ ، بڵێن : ( حسبنا الله و نعم الوكيل )

واتە: خوای گەورەمان بەسە فریادڕەسمان بێت، چاکترین و پیرۆزترین یارو یاوەرو دڵسۆزمانە. (ترمذي) روایەتی کردووە .

هەر کەسە ئامادە کراوە بە جەستەو ناخ و دەرونیەوە، دیارە لێپرسینەوە روودەکاتە ناخ و نیەت و دەروون، هەر ئەویش پاداشتی کارو کردەوەکانی لەسەر وەردەگیرێت، فریشتەیەك تاوانبارەکە راپێچ دەکات و فریشتەیەکی تر شایەتی لەسەر دەدا، رەنگە دووفریشتە چاودێرەکە بن خۆیان و دۆسیەی کاروکردەوەی مرۆڤەکەیان پێیە، وەکو چۆن لە دنیادا کەسێك دەبرێت بۆ لێپرسینەوە لە دادگایەکدا .. بەڵام لێرەدا بۆ بەردەم دادگای خواوەندی بەهێزو بەتوانا، کە هیچ شتێك لە دەستی قودرەتی و لەژێر رکێفی دەرناچێت.

ئا لەو بارودۆخە تەنگانەو سامناکەدا پێی دەوترێت: ئەمڕۆ ئیتر (واقیع)و بەسەرهاتەکەی روونەو بێ پەردەیە، ئەمە؛ ئەو رۆژەیە کە خۆتت لێ گێل کردو حسابت بۆ نەکرد، ئەوە ئیتر پەردەمان لەسەر دەزگای بینایت لاداوەو تەماشا بکە، ئەمرو چاوەکانت تیژن و بە چاکی راستی یەکان دەبینن!

ئا لێرەدا یەکێ لە دوانەکە؛ پێدەچێ ئەو فریشتەیەیان بێت کە دۆسیەی کردەوەکانی هەڵگرتووە، دەڵێت : ئەمە هەرچی یەکی کردووە لای منە و ئامادەیە، پێویست بە هیچ شتێکی تر ناکات بۆ دادگایی کردنی.

ئینجا رێڕەوی ئایەتەکان باسی لێکۆڵینەوەو لێپرسینەوەکە ناکات، بەڵکو یەکسەر لە باسی بڕیاری دادگای سەرتاپا دادی ئیلاهی دەدوێت و بڕیارەکە دەردەکات و دەست بەجێ ئەنجام دەدرێت .. فەرمان دەدرێت هەر بەو دوو فریشتەیە کە لە دنیادا چاودێرییان دەکردو - ئەو ئاگای لە خۆی نەبوو حسابی

بۆ نەدەکردن ، بەڵام ئەوان هەرچی دەکردو دەیوت و نیەتی هەبوو لەسەریان کۆدەکردەوەو بە دەزگای زۆر پێشکەوتوو تۆماریان دەکرد بۆ ئەو رۆژەو بۆ کاتی ئەو لێپرسینەوەیە ـ .

ئینجا فەرمان دەدرێت: ئادەی هەرچی کافرو بێ دینو سەرسەختە بیخەنە دۆزەخەوە، بێگومان ئەو سیفەتانە ئەوەندەی تر بارودۆخەکە سەخت و دژوار دەکاتلە سەر ناپوختیان، چونکە ئەوە بەڵگەیە لەسەر تورەبوونی خواوەندی خەشمگیر لەو جۆرە کەسانە، لەو بارودۆخە سامناكو ترسناکەدا، ئەو سیفەتانەش زۆر ناشیرینو ناپەسەندو نالەبارن، لە هەر کەسێکدا ببێ شایستەی ئەوەیە کە سزای سەخت بدرێ ، چونکە کابرا کافرە، سەرسەختو ئینکارە، قەدەغەو رێگری لە هەموو خێرو چاکەیەك دەکات،دەستدرێژکارو سنور شکێنە، گومان دروستکەرە، شەریكو هاوەڵی بۆ خوای گەورە بڕیار داوە .. کۆتایی ئایەتەکەش بە دوویات کردنەوەی سزا سەختەکە دێت کە دوویات کردنەوەی ناوێت .. چونکە پێشتر گیرۆدە بووە، بەڵکو تەنها بۆ دەست نیشانکردنی شوێنەکەیەتی لە دۆزەخدا کە فەرمان دەرچوو فڕێ بدرێتە ناوی..

ئەوسا هاوەڵەکەی لە جنۆکە ترسو لەرز دایدەگرێتو دەڵێت :ئەی پەروەردگارم من هۆکاری سەرکەشی و یاخی بوونی ئەو نیم، بەڵکو ئەو هەر خۆی لە گومڕایی یەکی قوڵدا خۆی قەتیس کردبوو. دیارە ئەم هاوەڵەیان ئەو شەیتانەیە کە کراوە بە مۆکلی بۆ تاقیکردنەوەی ، بەڵام لە ترسا حاشادەکات لەوەی کە ئەم دەستی هەبووبێ لە سەرگەردانی کردنیدا، بۆیە دەڵێت : بەڵکو ئەو خۆی کەسێکی نالەبارو سەرگەردان بووە و گوێی گرتووە بۆ وەسوەسە و هاندانەکانم!!

لە قورئاندا دیمەنی تریش هەیە کە باسی حاشاکردنی هاوەڵە شەیتانەکە دەکات لە هاوەڵە ئادەمی یەکە ..

لەوانەشە هاوەڵەکە مەبەست فریشتەیەکی چاودێر بێت، کە دۆسیەی کردەوەکانی پێیە، بەڵام هەڵوێستەکە ئەوەندە سەختە وای لێ دەکات کە حاشابکات لە کاتێکدا ئەو تاوانێکی نیە، بەڵام ئەوە روون دەکاتەوە کە هەرچەندە هاوەڵ و چاودێری ئەم سەرسەختو نالەبارەی کردووە، بەڵام هیچ دەستی نەبووە لە کارە ناباش و خراپەکانیدا.

جا کەسی بێ تاوان حاشابکات، ئەو حاڵەتە ئەوە دەگەیەنێت کە کارەساتێکی گەورەو وێرانگەرو ترسناك وا خەریکە پێش دێت!!

بۆیە گوتاری یەکلاکەرەوە دەفەرموێت: ئیتر ئێرە شوێنی دەمەدەمێ و تۆمەتبارکردنی یەکدی نیە، پێشتر هەڕەشەی ئەم پێشهاتو رووداوانەم پێڕاگەیاندبوون، هەموو شتێکیش تۆمارەو دەستکاری ناکرێت، پاداشتی هەر کەسێکیش لەسەر بنەما تۆمارکراوەکانە ـ ئەڵبەتە نیەتیش حسابی خۆی هەیە ـ کەسیش ستەمی لێ ناکرێت، چونکە ئەو کەسەی پاداشتەکانی رێکخستووە دادوەرێکی دادپەروەرە.

بەم شێوەیە دیمەنی لێپرسینەوە سامناکەکە، بەو هەموو توندیو هەڕەشانەوە کۆتایی دێت، بەڵام کۆتاییشی نەهاتووە، چونکە ئایەتەکەی دواتر دیمەنێکی ترسناكو تۆقێنەر باس دەکات :

﴿ يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ امْتَلَأْتِ وَتَقُولُ هَلْ مِن مَّزِيدٍ ﴿٣٠﴾ ﴾

(٣٠) ڕۆژێك دێت (ئەوەندە خەڵكی بێ شومار فڕێ دەدرێتە دۆزەخەوە) بە دۆزەخ دەڵێین: ئایا ئەوە هەر پڕ نەبویت؟ ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: ئایا کەسی زیاتر نیە؟! هێشتا جێگەی زۆر ماوە!!؟

دیمەن و ڕووداوەکان هەمووی گفتوگۆیە .. خوای گەورە ڕووبە دۆزەخ دەفەرموێت پرسیاری لێ دەکات و وەڵام دەدرێتەوە، دیمەن و پێشهاتێکی سامناکە.. ئەوەتە هەرچی کافرە سەرسەختەکانە، ئەوانەی کە دژی خێرو چاکە دەوەستان و دەستدرێژکارو گومان دروستکەر بوون.. ئەوانەی کە زۆر زۆر بوون و پۆل پۆل فڕێ درانە نێو ئاگری دۆزەخەوەو لەسەر یەکتر کەڵەکە بوون.. ئەوسا خوای گەورە پرسیار لە دۆزەخ دەکات و دەفەرموێت : ئایا پڕ بویت؟ ئایا بەستە ؟ بەڵام دۆزەخ خۆی دەخواتەوەو داخ لە دڵەو وەکو برسی یەکی زۆر خۆردەڵێت : ئایا کەسی تر ماوە؟ کەسی تر نیە گیرۆدەی بکەم؟ کێ‌سی تر نیە سزای سوتاندنی پێبچێژم؟ بەڕاستی ترس و بیم و سامناکی یەکی بێ وێنەیە .. لەوبەریشەوە لە بەرانبەر ئەم دیمەن و ڕووداوە سامناکە وە، دیمەنێکی ناسك و نازدارو پڕلە سۆز و جوانی و قەشەنگ خۆی دەنوێنێ. ئەویش دیمەنی بەهەشتە، لە تەقواداران و دینداران نزیکەو دەبینن، لەگەڵ ڕێزو پێشوازی بێ وێنەدا:

﴿ وَأُزْلِفَتِ الْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ غَيْرَ بَعِيدٍ ﴿٣١﴾ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِكُلِّ أَوَّابٍ حَفِيظٍ ﴿٣٢﴾ مَّنْ خَشِيَ الرَّحْمَٰنَ بِالْغَيْبِ وَجَاءَ بِقَلْبٍ مُّنِيبٍ ﴿٣٣﴾ ادْخُلُوهَا بِسَلَامٍ ذَٰلِكَ يَوْمُ الْخُلُودِ ﴿٣٤﴾ لَهُم مَّا يَشَاءُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ ﴿٣٥﴾ ﴾

(٣١) لەو لاشەوە بەهەشت نزیك خراوەتەوە لە تەقوا داران و پارێزکاران و

خواناسان (بەرێزی شایستەوە بە هۆکاری بوراق ئاسا بە گوێرەی ئاستی ئیمان و خواپەرستی و کرداریان دابەش دەکرێن بەسەر بەهەشتەکاندا و ) هیچ دورنیە لێیانەوە .

(٣٢) (ئینجا کە دەگەنە بەهەشتەکەیان پێشوازی گەرم و شایستەیان لێ دەکرێت و پێیان دەوترێت): ئەمە ئەو بەڵێنەیە کە کاتی خۆی پەروەردگاری میهرەبان وادەو بەڵێنی پێدا بوون ، ئەم نازو نیعمەتانە ئامادە کراوە بۆ هەموو ئەو بەرێزانەی کە هەمیشە دڵیان لای پەروەردگاریان بووە و زۆر مەبەستیان بووە ئەو زاتەیان لێ نەرەنجێت ، سنورەکانی خوایان پاراستووەو هەوڵیانداوە نافەرمانی خوای گەورە نەکەن ...

(٣٣) جا ئەوەی کە لە کاتی تەنهایی و پەنهانیدا لە خوای گەورە ترسابێت و حسابی بۆ ئەو زاتە کردبێت و بە دڵێکی پڕ لە ئیمان و شەوقەوە گەڕابێتەوە بۆ لای پەروەردگاری ....

(٣٤) ئەوە بەو بەختەوەرانە دەوترێت: بفەرمون بچنە ناو بەهەشتەوە لەگەڵ سەلام و ئاشتی و ئارامی و هێمنیدا ، ئیتر لەمڕۆ بە دواوەوە کات بۆ هەمیشەیەو هەرگیز تەواو نابێت و ژیان بەردەوامە لەو پەڕی بەختیاری و شادی و کامەرانیدا .

(٣٥) ئەو بەهەشتیانە هەرچی داوا بکەن ، حەز لە هەرچی بکەن لەو بەهەشتەدا بۆیان ئامادەیە ، بەڵکو زۆر لەوەش زیاتریان پێ دەبەخشین کە داوای دەکەن و حەزی لێ دەکەن ( کە یەکێکیان تەماشا کردنی زاتی (ذوالجلال و الأکرام)ە،

خوای گەورە نائومێدمان نەکات و بە دیداری زاتی شکۆمەندی خۆی شادو خۆشنودمان بکات ).

لەڕاستیدا لە هەموو وشەیەکدا رێز و خۆشەویستی نومایانە، دیمەنێکی هێورو پرسۆزە، رەزامەندییەکی قەشەنگە، دیمەنی بەهەشتە نزیک خراوەتەوە لە تەقواداران، بە ئاسانی وبە هۆکاری زۆر پێشڕەفتە و زۆر خێرا، لە ساتەوەختێکی کەمدا، لە یەکێ لە گۆڕەپان و شوێنە رازاوەکانیدا دادەبەزن هیچ دوور نیە لێیانەوە، لەگەڵ رەزامەندیی زاتی پەروەردگاردا، لە بەهەشتی نەبڕاوە و بەردەوامدا! ئەمەش بەڵێنی خوای گەورەیە و دێتە دی بۆ ئەو کەسانەی کە بە دڵ و بە کوڵ گەڕاونەتەوە بۆ لای ئەو زاتە، ئەوانەی کاتی خۆی سنورەکانی خوای گەورەیان دەپاراست و سنورشکێنیان نەدەکرد، جا ئەو کەسەی کاتی خۆی ترسی زویربوونی پەروەردگاری لەدڵدا بوو بێت و بە دڵێکی پڕ لە سۆزو خۆشەویستی یەوە گەڕابێتەوە وهەمیشە دڵی لەلای خواوەندی میهرەبان بوو بێت .. ئا ئەوانە پێیان دەوترێت: فەرمون بۆ ناو بەهەشت لەگەڵ سڵاو و رێزدا، لەگەڵ ئاشتی و هێمنیدا، ئەوانیش کاتێ بەو سیفاتانەوە لەلایەن پەروەردگاری ئازیزیانەوە وەسف دەکرێن دڵنیا دەبن کە پەروەردگاریان لە ریزی ئەوانەدا حسابیان بۆ دەکات کە دڵیان لە دنیادا بەردەوام لای خواوەندی میهرەبان بووە، سنورەکانیان پاراستووە، ترسی رەنجاندنی خواوەندی ئازیزیان لە دڵدا بووە هەرچەندە بەچاوی سەر لە دنیادا بە دیداری شاد نەبوون، ئەوانە کاتی خۆی بەردەوام ملکەچ و فەرمانبەردار بوون.

ئا ئەوانە پێیان دەوترێت: فەرموون بۆ ناو بەهەشت لەگەڵ ئاشتی و هێوری و هێمنی بەردەوامدا، ئیتر ئێوە بۆ هەمیشە لە بەهەشتدا دەحەوێنەوە و رۆژگاری ژیانی نەبڕاوە و بێ کۆتا دەست پێدەکات..

ئینجا ئاگادار دەکرێن لەلایەن زاتی پەروەردگارەوە کە لەوێ نازو نیعمەتەکانی بێ سنورەو هەرچی داوابکەن بۆیان ئەنجام دەدرێت زۆریش بەزیادەوە، هەرچی داوادەکەن و، هەرچی پێشنیاردەکەن ئاگاتە ئەوەی کە بۆیان ئامادە کراوە، چونکە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگاریان بێ سنورە..

* * *

پاشان بەشی کۆتایی سورەتەکە دێت، ئایەتەکان بەخێرایی تێدەپەڕن و کاریگەری خۆیان بەجێ دێڵن، ئاماژە بە تیاچوونی پێشینەکان دەکەن، هەروەها ئاماژە بە گەردوونی فراوان کە وەکو کتێبێکی ئاشکرای کراوە خۆی نومایان دەکات، ئاماژەش بە زیندوبوونەوە و کۆکردنەوەی گۆڕەپانی حەشر لە دیمەنێکی تازەی ئاشکرادا دەکات هاوڕێ لەگەڵ کاریگەریی و ئاراستەکردنی مەبەستداری قوڵدا بۆ سەر دڵ و هەست و نەستەکان :

﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هُمْ أَشَدُّ مِنْهُم بَطْشًا فَنَقَّبُوا فِي الْبِلَادِ هَلْ مِن مَّحِيصٍ ﴿٣٦﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى السَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدْ خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ ﴿٣٨﴾ فَاصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ ﴿٣٩﴾ وَمِنَ اللَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَأَدْبَارَ السُّجُودِ ﴿٤٠﴾ وَاسْتَمِعْ يَوْمَ يُنَادِ الْمُنَادِ مِن مَّكَانٍ

قَرِيبٍ ﴿٤١﴾ يَوْمَ يَسْمَعُونَ الصَّيْحَةَ بِالْحَقِّ ذَٰلِكَ يَوْمُ الْخُرُوجِ ﴿٤٢﴾ إِنَّا نَحْنُ نُحْيِي وَنُمِيتُ وَإِلَيْنَا الْمَصِيرُ ﴿٤٣﴾ يَوْمَ تَشَقَّقُ الْأَرْضُ عَنْهُمْ سِرَاعًا ذَٰلِكَ حَشْرٌ عَلَيْنَا يَسِيرٌ ﴿٤٤﴾ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ وَمَا أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ فَذَكِّرْ بِالْقُرْآنِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ ﴿٤٥﴾ ﴾

(٣٦) باشە ئەو خەڵكە بۆ تێنافكرن ، بۆ بیر ناكەنەوە ئێمە چەندەها نەوەمان پێش ئەمان لەناو بردووە ، كە زۆر لەمان دڕندە ترو شەڕەنگێز ترو دەسەڵاتدار تربوون دە بگەڕێن بەسەر زەویداو سەرنج بدەن ، ئایا هیچ شتێك فریایان كەوت و پەنایدان .

(٣٧) لە ڕاستیدا ئا لەو بەسەر هاتانەدا یاداوەری ڕون و ئاشكرا هەیە بۆ هەموو ئەو كەسانەی كە بە دڵ گوێ دەگرن بۆ ڕاستیەكان و دادەچڵەكێن و دەبنە شایەت لەسەر ڕاستی قورئان و فەرمودەكانی خواو پێغەمبەرەكەی ...

(٣٨) (باشە ، ئەو خەڵكە بۆ بیر ناكەنەوە ، ئەو زاتەی كە ئەم قورئانەی ناردووە دەفەرموێت: ) ئێمە لە ڕاستیدا ئاسمانەكان و زەویمان لە ماوەی شەش ڕۆژدا دروستكردووە و هیچماندوش نەبوین لە دروستكردنیاندا (دیارە كە ئەو زاتە فەرمانی بونی هەر شتێك بدات دەست بەجێ فەرمانەكە ئەنجام دەدرێت: ئەو ڕۆژانەش كە ئاماژەی پێ فەرمووە ، هەر خۆی دەزانێت ماوەكەیان چەندە!!) .

(٣٩) ئەی محمد ﷺ تا دەتوانیت خۆگربە لە بەرانبەر گوفتارو قسەی نابەجێی خوا نەناسانەوە ، خۆت سەرگەرم بكە بە شوكرو سوپاس و تەسبیحات و ستایشی پەروەردگارتەوە پێش هەڵاتنی خۆر و پێش ئاوابوونی (كە سەرەتای ڕۆژێكی نوێ و كۆتایی هاتنیەتی و جێگەی سەرنج و تێڕامانە بۆ ئیماندار) .

(٤٠) هەروەها لە شەوگاریشدا نوێژ و تەسبیحات و ستایشی پەروەردگارت بکەو دوای نوێژەکانیش . (بە ویردەکانی: سبحان الله ، الحمدلله ، الله اکبر ، ...هتد بەردەوام بە لەیاکردنیدا).

(٤١) هەروەها چاك گوێ بگرە بۆ باسەکانی ڕۆژی قیامەت ، چونکە ڕۆژێك دێت جاڕدەرێك ، بانگدەرێك بانگ دەکات لە نزیکەوە: (ئەی ئێسکە ڕزیوو داتەپیوەکان ، ئەی مردوە تێکەڵبووەکانی ناو خاك ، ئادەی خۆ ئامادەکەن بە فەرمانی خوا ببنەوە بە مرۆڤەکانی جاران) .

(٤٢) ئەو ڕۆژە ئیتر کە گوێیان لە نرکەی دەزگای (صور) دەبێت کە حەق و حەقیقەت و ڕاستی یە ئیتر ئەو ڕۆژە ڕۆژی هاتنە دەرەوەیە (هاتنەدەرەوەی ئێوە لەنێو خاك ، لە گۆڕەکان ، لە ناخی زەوی .

(٤٣) خەڵکینە: دڵنیابن کە هەر ئێمە ژیان دەبەخشین ، هەر ئێمەش مردن پێش دەهێنین ، گەڕانەوەشتان هەر بۆ لای ئێمەیە .

(٤٤) ڕۆژێك دێت زەوی بە خێرایی درزو قڵیشی تێ دەبێت و خەڵکەکەی ناوی بە پەلە دێنە دەرەوە بێگومان ئەو کۆکردنەوەیە لای ئێمە زۆر ئاسانە .

(٤٥) ئێمە چاك گوێ بیستی قسەو گوفتاری نابەجێی خوا نەناسانین ، دەربارەی تۆ ئەی محمد ﷺ ، دەربارەی قیامەت و زیندوبونەوە ، دەربارەی قورئان ، بێگومان تۆ زۆردار نیت و دەسەڵاتت بە سەریاندا نیە ، بەڵکو کاری تۆ ئەوەیە کە بەم قورئانە ئەو کەسانە بێدار بکەیتەوە کە لە هەڕەشەکانی ئێمە دەترسن و لێپرسینەوەی ئەو ڕۆژە زۆر بە گرنگ و هەند دەگرن .

جا هەرچەندە شێوازێك لەو ئایەتانە لە سەرەتای سورەتەکەدا هاتووە. بەڵام کاتێ کە لە کۆتایی یەکەشیدا بە شێوازێکی نوێ و کاریگەرییەکی نوێ، وە بەو چڕیو خێرایی یەوە دێت، تامو چێژێکی تر دەبەخشێ جیاواز لەوەی کە بە درێژتر لە سەرەتای سورەتەکەدا هاتووە.. ئەمەش لە تایبەتمەندی یە سەرسوڕهێنەرەکانی قورئانە!

لەم کۆتاییەدا باس لە هەمان حەقیقەتی پێشوو دەکات، بەڵام بە شێوازێکی نوێ، پاشان ڕووداو و گۆڕانکاری سەدەکانی ڕابوردوو دەخاتە بەرچاو لە ناوچە جیاوازەکانی سەرزەویدا، کە زۆربەیان بەشوێن خۆشگوزەرانیدا گەڕاون و هەموو خەمیان بۆ ئەم چەند ڕۆژەی ژیانی دنیا بووە، کاتێکیش خوای گەورە لەناوی بردوون کەسیان لێ دەرباز نەبووە.

لەڕاستیدا پەندو ئامۆژگاری ئاشکرابەدی دەکرێت لە تیاچوونی خەڵکانی سەردەمەکانی ڕابردوودا، بۆ کەسانێك کە خاوەنی دڵێکی زیندو و هزرێکی هۆشیارن، ئەوەی ئەو باسانە بێداری نەکاتەوە دیارە کە دڵێکی مردوی هەیە، یان هەر دڵی نیە .. بەڵکو کەسێك کە دەزگای بیستنی هەبێتوگوێ دێری ئەو جۆرە بەسەرهاتانە ببێ حەق وایە داچڵەکێتو بیربکاتەوە، چونکە دڵو دەروونی مرۆڤی هۆشیار هەستیارە بەرانبەر بەسەرهاتی خەڵکانو نەوەکانی ڕابوردوو، کەمترین بێداریو کەمترین کرانەوە بەسە بۆ بیرکردنەوە لە ڕووداو و یاداوەری یەکان لە پێشهاتو بەسەرهاتە سەختەکان، بێگومان کاریگەریی خۆی دەبێ لەسەر دڵو دەروونە هەستیارەکان..

ئەوەبوو پێشتر هەندێ لە لاپەڕەکانی گەردوون هەڵدرایەوە، بەڵام لێرەدا ئاماژەی بەوە کردووە کە دروست کردن و داهێنان لای خوای گەورە کارێکی زۆر ئاسانە لە نێو ئەم بەدیهێنراوە گەورەو بێ سنورانەدا، ئیتر زیندوکردنەوەی مردوان لە بەرانبەریانەوە شتێکی زۆر سوك و بچوك و ئاسانە ..

دیارە خۆر هەڵاتن و ئاوابوونی وە دیاردەی شەو کە بەشوێن خۆرئاوابووندا دەست پێدەکات، پەیوەندی بە گەردوونەوە هەیە، هەموویشی پەیوەستە بە تەسبیحات و ستایش و حەمدو سوپاسگوزاری و سوژدەی باوەڕدارانەوە، لە هەمان کاتدا هاندانە بۆ ئارامگرتن و خۆگری لەسەر گوفتاری نابەجێی بێباوەڕان دەربارەی قیامەت و زیندوکردنەوە .. وە ئینکاری دەستەڵاتی رەهاو بێ سنوری خوایی دەربارەی دووبارە زیندو کردنەوەیان ئیتر کەش و هەوایەکی نوێ دەوری ئەو باسە دەدات، کەش و هەوای خۆگرتن و ئارامگرتن و سوپاسگوزاری و تەسبیحات و ستایش و سوژدەبردن، کە هەموویشی بەستراوە بە بابەتەکانی گەردوون وبونەوەرەوە، هەموو ئەوانەی هەستەکان دادەچڵەکێنێ، کاتێ کە سەرنجی ئاسمانەکان و زەوی دەدات ـ بە شێوازی ئاسایی ، یان لەسەر شاشەکان ـ یاخود هەرکات سەرنجی دیمەنی خۆر هەڵاتن یان ئاوابوون و پەیدابوونی شەو دەدرێت، یاخود هەرکاات ئیماندار سوژدەو کڕنوش لە نوێژەکاندا دەبات لە بەرەبەیان و ئێوارەکاندا.

پاشان بە شێوازێکی نوێ باسێکی گرنگ دووبارە دەکاتەوە کە پەیوەستە بەم گەردوونەی کە نومایانە و خوای گەورە داوا لە پێغەمبەر (ﷺ) وە تاکە تاکەی باوەڕداران دەکات کە خۆگربن لەسەر تەسبیحات و ستایش و سوژدەو

خواپەرستیان بەردەوام بن، چونکە تۆ چاوەڕوانی دەکەیتو بە تەمای لە هەر چرکەساتێکی شەو یان ڕۆژدا ڕووداوێکی گەردوونی زۆر گەورەو گرنگو فراوان ڕوویدات کە مەگەر غافڵو بێ ئاگاکان حسابی بۆ نەکەن، ئەمەش مەبەستی سەرەکیو بابەتی هەرە گرنگی سورەتەکەیە .

لەڕاستیدا ئەمە دیمەنێکی نوێی سەرنج ڕاکێشە، لەو ڕۆژە سەختو تەنگانەیەدا، پێشتر لە ئایەتی (٣٠-٣١)دا بە شێوازێکی تر و لە دیمەنێکی جیاوازدا وێنای کردبوو، بەڵام لێرەدا لەباتی باسی فوکردن بە کەڕەنا تایبەتەکەدا، باس لە دەنگێکی گەورە دەکات. بەشوێنیدا دیمەنی هاتنە دەرەوەی مرۆڤەکان لە توێی درزەکانو لەت بوونی خاکی زەوی نومایان دەکات .. سەیرە ئەم هەموو خەڵکەی کە لە ڕابوردوودا گوزەریان بەسەر زەویدا کردووە هەتا کۆتایی هێنان بە دنیاو گەشتی سەرزەوی!! هەموویان کە لە ژمارە نایەن لە گۆڕەکانیان لە توێی خاکدا دێنە دەرەوە زۆربەیان کەڵەکە بوون لەسەر یەکتر هەروەکو (معری) لە دوودێڕ هۆنراوەدا باسیان دەکات، کە ئەمە واتاکەیەتی:

لەوانەیە گۆڕێك هەبێت چەندەها جار جەنازەی تێکرابێ .. پێکەنینی بێت بەو هەموو خەڵکە هەمە جۆرەی کە لە توێیدایە، چەندەها خەڵك نێژراوە بەسەر نێژراوەکانی تردا بە درێژایی زەمان و پانتایی زەمین!!

سەرزەمین هەمووی قاژ قاژ دەبێتو درزی تێ دەبێت جەستەو ئێسکو پروسکەکان و سەرجەم خانەکان کە ون بوون لە توێی خاکداو لە کونو کەلێنی زەویدا، کە مەگەر هەر خوا بزانێ کە لە کوێدا گیرساونەتەوە، ئەو زاتە




سەرجەمیان، سەرلەنوێ زیندودەکاتەوە، بەڕاستی دیمەنێکی سەیرەو بۆچوون لە ئاستیدا کول و کۆڵە!!

جا لە سایەی ئەم دیمەنە گەرمو وروژێنەرەدا ئەو حەقیقەتە دووپات دەکاتەوە کە ئەو خەڵکە ناحاڵیو بیرکۆڵانە قسەو باسی لەسەر دەکەن، یاخود ئینکاری دەکەنو باوەڕیان پێی نیە .

بەڵێ !! لە سایەی ئەو دیمەنو رووداوانەدا ئایەتەکان روو دەکەنە پێغەمبەر(ﷺ) تا دڵنیابێتو خۆگر بێت لە بەرانبەر دەمە دەمێو گوتاری نابەجێو بێباوەڕییان لە بەرانبەر ئەم حەقیقەتە روونو ئاشکرایەداکە لە ناخو ویژدانی باوەڕداردا هیچ جێگەی گومانو دوودڵی نیە، بۆیە دەفەرموێت :

ئێمە ئاگادارینو لە ئێوە چاکتر دەزانین کە ئەو ناحەزو ناپوختانە چی دەڵێن، تۆ دەستەڵاتت بەسەریاندا نیە، ئەوانە ئەو هەڵوێستەیان بەسەردا تێناپەڕێتو خۆیان دەبیننەوە.دیارە ئەوە هەڕەشەیەکی ترسناکەو نەهامەتی سامناك یەخەیان دەگرێت ـ گەر فریای خۆیان نەکەون ـ تۆیش وەنەبێ دەستەڵاتت هەبێ بەسەریانداو بەزۆر ناچاری ئیمانو باوەڕیان بکەیت، چونکە ئەوە بەدەست تۆ نیە، ئەوە بەدەست ئێمەیە، ئێمە چاودێریان دەکەینو ئاگامان لێیانە، لەبەر ئەوە تاکە هۆکار ئەوەیە کە تۆ بەم قورئانە یاداوەری ئەو کەسانە بکەیت کە لە هەڕەشەکانی ئێمە دەترسن.

بێگومان قورئان دڵەکان رادەوەشێنێ، دەروونەکان دەهەژێنێ، گەر دڵی هۆشیارو بێدار هەبێت، ترسی ئەو رۆژگارەی لەناخدا هەبێتو باوەڕی بەو راستیانە هەبێت کە بەو شێوازە سەیرە دڵو دەروونەکان دەهێننە لەرزە!!

جا کاتێ کە ئەم سورەتە بەجوانی بەسەر خەڵکیدا دەخوێنرێتەوە ئیتر پێویستی بە زۆردار نیە ملیان با بداتو بەزۆر باوەڕیان پی بسەلمێنێ، چونکە خۆی هێزو دەستەڵاتێکی وای تێدایە کە زۆردارەکان نیانە، وە ئەوەندە کاریگەریی هەیە لە سەر دڵی مرۆڤەکان کە زۆر بەهێزترە لە قامچی زۆرداران:

دیارە خوای گەورە راستو رەوانو چاکی فەرمووە بۆ داچڵەکاندنی دڵە زیندوو هۆشیارەکان ..

---

﴿رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾﴾

﴿ البقرە ﴾

پەروەردگارە ئەم کارەمان لێ وەربگرە و لە ریزی چاکەکا نماندا تۆماری بکە ،

چونکە بەڕاستی تۆ خوایەکی زۆر بیسەر و زانایت .

---

## ﴿ سورەتی ( الذاریات ) ﴾

ئەم سورەتە کەش‌و هەوایەکی تایبەت بە خۆی هەیە، باس لە چوار جۆر هێز دەکات .. کە هەموویان فەرمانبەرداری خوای گەورەن هەرچەندە دەستەواژەکان زۆر روون نین، بەڵام کاریگەرییان هەیە لەسەر دڵ‌و دەروون، چونکە ئاشکرایە ئەو شتانە گرنگی‌و نهێنی خۆیان هەیە، بۆیە خوای گەورە سوێندیان پێدەخوات:

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿وَالذَّارِيَاتِ ذَرْوًا ﴿١﴾ فَالْحَامِلَاتِ وِقْرًا ﴿٢﴾ فَالْجَارِيَاتِ يُسْرًا ﴿٣﴾ فَالْمُقَسِّمَاتِ أَمْرًا ﴿٤﴾ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٌ ﴿٥﴾ وَإِنَّ الدِّينَ لَوَاقِعٌ ﴿٦﴾﴾

(ذاریات و حاملات وجاریات و مقسمات) لەو دەستەواژەو وشانە نین کە خەڵکی ئەو سەردەمە لە مەبەستەکەیان تێگەیشتبن، بەڵکو پێویستیان بە پرسیار لێیان‌و رونکردنەوە دەربارەیان هەیە، هەربۆیە کاریگەرییان هەبووە و هەیە لەسەر هەست‌و نەستەکان‌و مەبەست‌و سایەی تایبەت بە خۆی هەیە، رەنگە مەبەستی خوای گەورە هەر ئەوە بێت کە کەش و هەوایەکی تایبەت بە سورەتەکە ببەخشێت.

سەیر لەوەدایە هێشتا سوێندەکانی سەرەتای سورەتەکە کۆتایی نەهاتووە، سوێندێکی تر دێتە مەیدان﴿وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْحُبُكِ ﴿٧﴾﴾ ئەم سوێندەیش بۆ باسی حاڵەتێکی ئەو خەڵکەیە ﴿إِنَّكُمْ لَفِي قَوْلٍ مُّخْتَلِفٍ ﴿٨﴾﴾ ، واتە : قسەکانتان زۆر بێ سەرو بەرەیە و هیچ بنەمایەکی نیە، هەمووی گومان‌و درۆو دەلەسەیە‌و هیچ

بنەمایەکی زانستی و دڵنیا کەرەوەی نیە .. شایانی باسە دەستپێکردنی ئەم سورەتە بەم شێوەیەو ڕێڕەوەکەی بە گشتی، مەبەستێکی روون و ئاشکرای لە پشتەوەیە، ئەویش پەیوەست کردنی دڵی مرۆڤەکانە بە ئاسمانەوە، بەخوای گەورەوەو بە نهێنی یەکانیەوەو ، رزگارکردنیەتی لە لەمپەرو گرفتەکانی زەوی، رزگارکردنیەتی لە هەموو کۆت و بەندێك کە نایەڵێت مرۆڤ لێیبڕێت بۆ خوا، بەتەاوەتی یەکلایی بێتەوە، بۆ خزمەتی بەرنامەی ئەو زاتە، رابکات و هەڵبێت بە هەموو هەست و نەستیەوە بۆ دەستەبەرکردنی رەزامەندی پەروەردگاری، بۆ پیادەکردنی ئەو فەرمانەی ﴿ فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ ﴿٥٠﴾ ﴾ هەروەها بۆ ئەنجامدانی ئەو داخوازییەی کە ئەو زاتە لە بەندەکانی دەوێت : ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾ ..

لە ڕاستیدا سەرگەرمی خەڵکی بۆ پەیداکردنی رزق و رۆزی و شارەزایی کەمیان لە دەستی قودرەت و نهێنی یەکانی قەدەری ئیلاهی، لە کۆسپە زەق و بەربەستە ئەستورەکانن لە بەردەم مرۆڤدا، قورئان بە (جد)ی هەوڵدەدات کە دڵەکان لەو بوارەدا ببەستێ بە ئاسمانەوە، نەك بە زەوی و هۆکارەکانیەوە:

﴿ وَفِى ٱلسَّمَآءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾.. ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ ﴿٥٨﴾ ﴾

هەروەها لەم سورەتەدا باسی سەخاوەت و بەخشندەیی ئیبراهیم دەکات کە چۆن بۆ ژمارەیەکی کەم لە میوانەکانی - کە نەشی دەناسین و فریشتە بوون - چۆن خێرا گۆشتی سورەوەکراوی گوێرەکەیەکی قەڵەوی بۆ ئامادە کردن!! هەر بە گەیشتنیان و سڵاوکردنیان میوانداری لێ کردن !!

جا هەوڵدان بۆ رزگارکردنی دڵان لە کۆتو بەندی زەوی، لە خەمی رزق و رۆزی، وە بەستنی بە سۆزەوە بە ئاسمانەوە، تا رۆح بدات لە شەقەی باڵو لەو مەودایەدا بفڕێتو چاو ببڕێتە بەخششەکانی پەروەردگاری بڵندو بەدیهێنەری، وە لادانی ئەو کۆسپو لەمپەرانەی کە نایەڵن لە ئەسارەت دەرچێتو بەرەو دەستەبەرکردنی رەزامەندی خوای گەورە بەپەلە هەنگاو هەڵگرێت، لەڕاستیدا ئەو بابەتو دۆزانەی کە ئەم سورەتە باسیان دەکات بەزۆری لەو بابەتە دەدوێت، هەربۆیە ئابەو شێوەیە دەستی پێکردووە، وە بەو سەرەتایەی کە تا ڕادەیەك ناڕوونە، ئینجا سوێند خواردن بە ئاسمانو دووبارەبوونەوەی باسی ئاسمان شایانی سەرنجو تێڕامانە ..

بۆیە لەو سەرەتایەوە لە پاداشتی دیندارو تەقواداران دەدوێت، چەپکێ ئایەتی پیرۆز هاندەرە بۆ چاوبڕینە دەستەبەرکردنی رەزامەندی پەروەردگارو بەتەمابوونی پاداشتی نەبڕاوەی ئەو زاتە، هەروەها لێبڕان بۆ پەرستنی بەتایبەتی شەونوێژ، وە پاڕانەوە و داوای لێخۆشبوون لەو زاتە لە بەرەبەیانەکاندا لەگەڵ کەمی گرنگیدان بە ماڵ و سامان، وە خۆ رزگاکردن لە فشاریو، خەمخۆری بۆ هەژارانو نەدارانو بەخشینی پێیان،جا لێرەوە سەرنجی ئیماندار رادەکێشێ بۆ ئایەتەکانی خوای گەورە لە زەویو لە خودی مرۆڤەکاندا، وە بەستنەوەی دڵ بە ئاسمانەوە بەتایبەت لە مەسەلەی رزقو رۆزیدا، نەك تەنها بە زەوی و هۆکارەکانیەوە.

هەربۆیە ئامارژە بە دروستکردنی ئاسمانو فراوانیەکەی دەکات لەگەڵ ئامادەکردنی زەویو ئاسان بەکارهێنانی بۆ هەر کارێك کە مرۆڤ دەیەوێت،وە

دروستکردنی هەموشت بە جووت، دوای ئەوانە هەمووی، هانمان دەدات بۆ هەڵاتن و بە پەلە چوون بەدەم بانگەوازی خوای گەورەوە..

لە کۆتاییشدا خوای گەورە ویست و ئیرادەی خۆی لە دروستکردنی جنۆکەو ئادەمیزادا بە روونی باس دەفەرموێت، کە بریتی یە لە خواپەرستی ..

ئەم شێوازەش لە قورئاندا دارشتن و سازدانێکی بەردەوامە، ئاوازی هەمەجۆری هەیە، بە هەموویەوە ئەو سازدانە پێك دەهێنن، وە ئەو ئاراستەیە دروست دەکەن ، ئاراستە کردنی دڵی مرۆڤ بەرەو ئاسمان!!

هەروەها ئاماژەی خێراشی تێدایە بە بەسەرهاتی (ابراهیم و لوطوموسی) و قەومی (عاد و ثمود و نوح) .

لە بەسەرهاتی (ابراهیم) دا ئامارژەیەك بە بەخشینی سامان دەکات، هەروەها ئامارژەیەك بە ئایندەو مژدە بە بەخشینی منداڵێکی زاناو شارەزا، بەبێ ئەوەی ئەوان بە تەمای ئاوا بەهرەیەك بن.

هەروەها لە چیرۆك و بەسەرهاتەکانی تریشدا ئامارژە هەیە بەوەی کە بەڵێن و وادەی خوای گەورە هەر دێتە دی، ئەو وادەیەی کە لە سەرەتای سورەتەکەدا سوێندی لەسەر خواردبوو، لە کۆتایشدا هۆشیاری دەدات بە موشریك و هاوەڵگەران گەر باوەڕ بەم پەیامە نەکەن، ئەمەش دوای ئەوەی کە نمایشێکی نەوە بێباوەڕەکانی سەدەکانی رابردووی کرد کە هەر دەڵێی رێنوێنی یەکتریان کردووە کە دژایەتی پێغەمبەران وپەیامەکانیان بکەن و باوەڕیان پێنەکەن.

دیارە کە چیرۆکەکانی ئەم سورەتەو بەم شێوەیە ـ وابەستەیە بە بابەتە سەرەکیەکەوە ، ئەویش هەوڵدانە بۆ ئەوەی دڵەکان یەکلا ببنەوە بۆ خوا بۆ

خواپەرستی، وە رزگار بکرێن لە هەموو کۆتو بەندەکان، تا پەیوەست بن بە ئاسمانەوە، بە ئیمانو دڵنیاییەوە، ئینجا هەرچی ئەو کۆسپو لەمپەرو ئاستەنگانەی کە نایەڵن دڵەکان باڵ بگرنەوە و بفڕنو ئازاد بن و بەرەو ئەو ئاسۆ پیرۆزانە هەڵفڕن لا بخرێت ـ ئەوکات مرۆڤ هەست بە کامەرانیو بەختیاری و ئاسودەیی دەکات ..

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿وَالذَّارِيَاتِ ذَرْوًا ۝١ فَالْحَامِلَاتِ وِقْرًا ۝٢ فَالْجَارِيَاتِ يُسْرًا ۝٣ فَالْمُقَسِّمَاتِ أَمْرًا ۝٤ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٌ ۝٥ وَإِنَّ الدِّينَ لَوَاقِعٌ ۝٦﴾

(١) خوای گەورە سوێند دەخوات بە رەشەباو ئەو بایەی کە هەورو هەڵمی ئاو هەڵدەگرێت و پەخشی دەکاتەوە بە ئاسمانی دنیادا ، هەروەها تەپ و تۆز بەرپا دەکات و بڵاوی دەکاتەوە ، کە ئەویش ڕۆڵی هەیە لە باران باریندا (شایەنی باسە کە سوێند خواردنی پەروەردگار بۆ سەرنج ڕاکێشانمانە بۆ دیاردەو دروستکراوەکانی).

(٢) هەروەها سوێند بەو هەورانەی کە هەڵگری باری قورس و گرانن لە هەڵمی ئاو ، کە لە چینەکانی سەرەوەدا چڕ دەبنەوەو سەنگین دەبن و دەبارێن لەو شوێنانەدا کە ویستی خوای گەورەی لەسەرە لە شێوازی نمە باران و لێزمە باران و تەرزەو بەفردا .

(٣) هەروەها سوێند بەو هەورانەی کە بە ئاسماندا لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەگوێزرێنەوە بە دیمەنی جوان و شێوازی هەمە جۆریان ئاسمان دەڕازێننەوە




، یاخود سوێند بەو کەشتیانەی کە بە ئاسانی بە ڕوبارو دەریاو زەریاکاندا هاتو چۆ دەکەن .

(٤) سوێند بەو فریشتانەش کە کاروبار دابەش دەکەن (هەندێکیان گیانی ئیمانداران دەکێشن بەڕوی خۆش و مژدەوە، هەندێکیان گیانی ناپوخت و بێباوەڕان دەکێشن بە توڕەیی و هەڕەشەوە ، هەندێکی تریان کۆمەکی باوەڕداران دەکەن، هەندێکیان تۆڵە لە ناحەزان دەسێنن هەندێکی تریان .....)

(٥) سوێند بەوانە هەموی ، هەرچی بەڵێن و وادەیەکتان پێدراوە دەربارەی قیامەت و لێپرسینەوەو بەهەشت و دۆزەخ، درەنگ بێ یان زوو هەر دێتە دی و هەموی راست و دروستە .

(٦) بە ڕاستی ڕۆژی قیامەت و لێپرسینەوە بەڕێوەیە ، کەس لێی دەرباز نابێت .

ئەم ئایەتە کورت و خێرایانە، وە بەو دەستەواژانەی کە ـ ئەندازەیەك ـ هەر وەکو وتمان ناڕوونی پێوە دیارە ، کاریگەرییەکی تایبەتی لەسەر ناخ و هەستی مرۆڤ دروست دەکات، سایەیەکی تایبەتی دەدا بە سەریدا، دڵ دەبەستێ بە شتێکی گرنگەوە، بابەتێکە دەبێ گوێ بیستی بێت و گوێی بۆ هەڵخەیت، دیارە هەر لەسەرەتای نازڵبوونیەوە کەسانێك لە واتای (ذاريات و حاملات وجاريات و مقسمات) یان پرسیوە:

دەگێڕنەوە کە پرسیار دەربارەیان لە پێشەوا (علی ﷺ) کراوە : دەربارەیان وتویەتی:

﴿وَالذَّارِيَاتِ ذَرْوًا ۝١﴾ ڕەشەبایە.. ﴿فَالْحَامِلَاتِ وِقْرًا ۝٢﴾ هەورە .. ﴿فَالْجَارِيَاتِ يُسْرًا ۝٣﴾ کەشتی یە.. ﴿فَالْمُقَسِّمَاتِ أَمْرًا ۝٤﴾ فریشتەیە ..

لە پێشەوا (عمریش ﷺ) پرسیار کراوە دەربارەیان، هەروەکو پێشەوا (علی ﷺ) وەڵامی داوەتەوە ..

دیارە خوای گەورە سوێندی خواردووە بە باو رەشەبا کە تەپو تۆزو هەڵەو هەورو شتی تر بڵاو دەکاتەوە، لەو شتانەی کە مرۆڤ دەیزانێ یان نایزانێ، هەروەها سوێندخواردنیش بەو هەورانەی کە بڕێکی زۆر ئاویان پێیە و خوای گەورە بۆ کوێی بوێت ئاراستەیان دەکات، لەگەڵ سوێندخواردن بەو کەشتیانەی کە بە ئاسانی بەسەر ئاودا هاوتوچۆ دەکەن بە ویستی خوای گەورە، بەهۆی ئەو تایبەتمەندییانەی کە بە ئاوو بە کەشتی ، بەڵکو هەموو گەردوون دراوە تا رێگە بدات کەشتیەکان بە ئاسانی هاتوچۆ بکەن ..

پاشان سوێندخواردن بەو فریشتانەی کە کاروباریان دابەش کردووە، فەرمانەکانی خوای گەورە ئەنجام دەدەن، بە ویستی ئەو زاتە کاروبارەکان دابەش دەکەنو هەموو شت یەکلایی دەکەنەوە لە گەردووندا ، لەو شتانەدا کە پەیوەندی بەوانەوە هەیە ..

بێگومان رەشەبا و هەورو کەشتیو فریشتە هەموویان لە دروستکراوان و بەدیهێنراوانی خوای گەورەن، کردونی بە هۆکاری نواندنی دەسەڵاتی بێ سنور و رەهای خۆی، کەشتی وا لێ کردووە کە بە ئاسانی سەرئاو بکەوێتو هاتوچۆی لەسەر بکات ..

پاشان سوێندخواردن بە فریشتەکان کە کاروبار دابەش دەکەن، یاخود کاروباریان بەسەردا دابەش کراوە ، فەرمانی خوای گەورە وەردەگرن " بە ویستی ئەو زاتە دابەشی دەکەنو ئەنجامی دەدەن ..

بێگومان هەورو با و کەشتی و فریشتە هەندێکن لە دروستکراوانی خوای گەورە ، کردونی بە هۆکاری نمایش کردن و پەردەپۆشی بۆ دەستەڵاتی خۆی، وە لەو رێگەیەوە قودرەتی خوای گەورە لە بونەوەرو لەنێو بەندەکانیدا نومایان دەبێت، کاتێ ئەو زاتە سوێندیان پێدەخوات ئەوە لەبەر گرنگی و مەزنییانە، تا دڵەکان سەرنج بدەن و بیریان لێ بکەنەوە و دەستی قودرەتی خوایی ببینن لە دروستکردن و ئاراستەکردنیان؛ وە لەو رۆڵەدا کە دەیبینن بۆ ئەنجامدانی ئەوەی کە ئەو زاتە دەیەوێت .. دیارە باس کردنیشیان بەم شێوازە دڵان ئاراستە دەکات بۆ بیرکردنەوە لە نهێنی و شاراوەکانیان" هەر بۆیە بەو شێوازە پەیوەستیان دەکات بە بەدیهێنەری دروستکراوانەوە بە جوانترین شێوە.

پاشان لەلایەکی ترەوە پێدەچێ پەیوەست بێت بە باسی رزق و رۆزی یەوە ، کە ئەم سورەتە دەیەوێت دڵی مرۆڤەکان لە کۆت و بەند رزگار بکات، لە سەنگینی خەم رەهای بکات، چونکە با و هەورو کەشتی پەیوەندییەکی ئاشکرایان هەیە بە هۆکارەکانی رزق و رۆزی یەوە.. بەڵام فریشتەکان و دابەش کردنی کارو فەرمان بەسەریاندا ئەوە دەگەیەنێت کە یەکێك لە کارە گرنگەکانیان رێکخستنی رزق و رۆزی یە ، ئێستە ئیتر روون دەبێتەوە کە پەیوەندییەك هەیە لە نێوان سەرەتای سورەتەکەو ئەو بابەتەی کە سورەتەکە لە هەندێ شوێندا گرنگی پێداوە.

خوای گەورە سوێند بەو چوار جۆرە لە دروستکراوانی دەخوات بەوەی کە وادەو بەڵێن و هەڕەشەکانی خوای گەورە هەمووی راستە، وە رۆژی قیامەتیش هەر دێتە دی، دیارە کە خوای گەورە بەڵێنی بە خەڵکی داوەلەسەر چاکەکانیان پاداشتیان دەداتەوە، لەسەر گوناهەکانیشیان سزایان دەدا ـ گەر تەوبە نەکەن ـ ،

ئەو زاتە کاتێ کە لە دنیادا مۆڵەتی داون، ئەوە لەوجیهان لێپرسینەوەیان فەراموش ناکات، چونکە بەڵێنەکە راستو دروستە وهەر دێتە دی.. ئەوەی کە بڕیاری لەسەر داوە لەو بارەیەوە، وە لە هەموو بوارێکدا هەر ئەوە حەق و حەقیقەتە، بەڵێنەکانیشی لە هەر بوارێکدا لەکاتی لەباری خۆیدا ئەنجام ئەدرێت..

خوای گەورە هەندێ جار بە پێویستی ئەزانیوە سوێند بە زاتی خۆی بخوات، بەڵکو سوێندی بە هەندێ لە دروستکراوەکانی خواردووە تا بە دڵ و بە هۆشیارییەوە سەرنجیان بدەینو بیریان لێ بکەینەوە، وە بیر لەودەستەڵاتە شکۆمەندە بکەینەوە کە ئەم هەموو دروستکراوانەی بە یاساو ئەندازەی رێکوپێك دروست کردووە. بەبێ گومان و دوودڵی ئەو زاتە لە چڵە پۆپەی راستگۆییدایە. وە لێپرسینەوەش لە خێرو شەڕ. لە چاکسازیو گەندەڵی هەر ئەنجام ئەدات. چونکە سروشتی دروستکراوان ئەوە دەگەیەنن کە مرۆڤ و دروستکراوان بە هەوانتەو بێ مەبەست و هەڕەمەکی دروست نەکراون .. ئا بەو شێوەیە هەرچی دروستکراوانە بەڵگەی حاشاهەڵنەگرن لەسەر ئەوەی کە هیچ شتێك رێکەوتی کوێرانەو بێ مەبەست نیە ..هەرچی شتە دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە بە مەبەستو بەتایبەتی سوێند بە دروستکراوانی دەخوات تا سەرنجمان رابکێشێ، تا دڵان ئاوڕ بدەنەوە، هەستەکان ببزوێن، ئەمەش رێبازێکە بۆ پەروەردە، گفتوگۆ کردنە بۆ مرۆڤ بە زمانی گەردوون و بونەوەر . وە بە شێوازێکی راستەوخۆ، تا تێفکرێتو تێبگات..

دوهەم سوێندیش ئەمەیە :

﴿وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْحُبُكِ ﴿٧﴾ إِنَّكُمْ لَفِي قَوْلٍ مُّخْتَلِفٍ ﴿٨﴾ يُؤْفَكُ عَنْهُ مَنْ أُفِكَ ﴿٩﴾﴾

(٧) سوێند بە ئاسمانی ڕێك و پێك و چنراو تۆكمەو رازاوە بە ملیارەها ئەستێرەو هەسارەی هەمە جۆر ......

(٨) ئەی خوا نەناسان ئێوە راو بۆچونی هەڵەتان هەیە ، گوفتارتان بێ سەرو بنەو دورە لە ڕاستی و حەقیقەتەوە .

(٩) بێگومان ئەو كەسەی سەری لێ شێواوەو لە بەرنامەی یەكخواناسی لادراوە ، بەهۆی گوناهو تاوان و دڵڕەقیەوە ، لە باوەڕهێنان لا دەدرێت...

دیارە خوای گەورە سوێند دەخوات بە ئاسمان ـ بە ئەستێرەو هەسارەكانی ـ كە زۆر بە جوانی و بتەوی و ڕێكوپێكی چنراون، وەكو زنجیرەی تێهەڵكێش بەستراون بە یەكەوە لە هەموو لایەكەوە ..

دەكرێ مەبەست هەورە تێهەڵكێشەكان بێت، یاخود حاڵەتێكی هەمیشەیی ئەستێرەو هەسارەكان بێت لە خولگە تێهەڵكێش و ڕێكوپێكەكانیاندا .

بەڵێ ! خوای گەورە سوێند دەخوات بە ئاسمانی هاوسەنگ و چنراو لەسەر ئەوەی كە ئەوانە راو بۆچوونی جیاوازیان هەیە، گوتاریان ناجێگیرەو بنەمای نیە، دانەمەزراوە بەردەوام لە گۆڕانكاریدایە، ئەمەش حاڵەتێكی بەردەوامە بۆ بەتاڵ و ناحەقی، هەندێك پابەندی دەبن و هەندێكی تر وازی لێ دێنن، هەرگیز دامەزراوی و سازان و مەحكەمی بە خۆیەوە نابینێ، وێڵ بوونێكە هیچ مەشخەڵ و روناكی یەك لە ڕێگوزەریدا بەدی ناكرێت، بەردەوام وەكو جۆلانە ئەم بەرو ئەوبەر دەكات و لە كەناری بنەمایەكی بتەودا لەنگەر ناگرێت، چونكە پێوەرێكی

وردی پێ نیە، هەندێ جار لایەنگرانی بەدەوریدا کۆدەبنەوە ، بەلاَم زۆر ناخایەنێ ئاشبەتاڵ و بلاَوەی لێ دەکەن و ناکۆکی و دووبەرەکی سەر هەڵدەدات..

ئەم سەرگەردانی و ناکۆکیەشیان بە تەواوەتی روونە کاتێ کە بەراورد دەکرێ لەگەڵ ئاسمانێکی رێکوپێکی تۆکمەو چنراودا .

پاشان ئایەتەکان بەردەوامن و باس لەوە دەکەن کە ئەو خەڵکە ناحاڵی یە بەردەوام لە گومان و دوودڵیدان دەربارەی ئەو جیهان، پشت نابەستن بە حەق و دڵنیایی ـ کە لەم قورئانەدا دەستیان دەکەوێت ـ بەردەوام راو بۆچوونی جیاوازیان هەیە لەسەر ئەم حەقیقەتە روون و ئاشکرایە .. هەر بۆیە لە دیمەنێکی زیندوودا ، کە بە چاوی سەر ببینرێت دیمەنێکی سەختی ئەو رۆژەیان دەخاتە بەر چاو :

﴿ قُتِلَ الْخَرَّاصُونَ ﴿١٠﴾ الَّذِينَ هُمْ فِي غَمْرَةٍ سَاهُونَ ﴿١١﴾ يَسْأَلُونَ أَيَّانَ يَوْمُ الدِّينِ ﴿١٢﴾ يَوْمَ هُمْ عَلَى النَّارِ يُفْتَنُونَ ﴿١٣﴾ ذُوقُوا فِتْنَتَكُمْ هَذَا الَّذِي كُنتُم بِهِ تَسْتَعْجِلُونَ ﴿١٤﴾ ﴾

(١٠) دەك بە کوشت چن درۆزن و بوختانچیەکان ...

(١١) ئەوانەی کە لە گومرایی و سەرگەردانیدا رۆچون و لە تاریکی و زەلکاودا خۆیان راهێناوەو خۆیان سەرگەرم کردووە...

(١٢) ئەوانەی بە گاڵتەو تەڵفیسیەوە دەپرسن ، یان دەڵێن: باشە! رۆژی قیامەت کەی بەرپا دەبێت ، کەی پێش دێت؟!

(١٣) ئەوانە کاتێك بە خۆیان دەزانن لە نێو ئاگردا گیریان خواردووەو سزا دەدرێن و دەبرژێنرێن....

(١٤) لەوێدا پێیان دەوترێت: دە ئیتر ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە باوەڕتان پێی نەبوو ، دەی بچێژن ئەو بەڵایەی کە بەسەر خۆتان هێنا ، ئەمە ئەو سزاو ئازارەیە کە بە گاڵتە پێکردن و بێباوەڕییەوە پەلەتان لە هاتنی دەکرد.

دیارە وشەی (الخرص) بە واتای گومانو بۆچوونی هەڵە دێت کە هیچ بنەماو پێوەرێك نایگرێتەوە.. خوای گەورەش نزای کوشتنو لەناوچوون لە درۆزنو بوختانچیان دەکات.. بەڕاستی کارەساتی، نزای خوای گەورە بڕیارەو ئەنجام دراوە، پاشان زیاتر روونی دەکاتەوە ئەوانە بریتین لەوانەی خۆیان سەرگەرمی پرۆپاگاندەی گومڕاکەر کردووە، شوێنی خەوو خەیاڵ کەوتوونو نایەنەوە هۆش و خەبەریان نابێتەوە ..

دیارە کە دەستەواژە قورئانیەکە سایەیەکی تایبەتی دەدات بەسەریاندا، باسی خەڵکە دنیاپەرستەکان دەکات وەکو ئەوەی کە هەستیان مردبێتو ئاگایان لە دەوروبەریان نەبێت، وەکو سەرخۆشو مەستو حەیران!!

ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە ئەوانە نایانەوێت شوێن بەرنامەیەکی روون بکەون، ئەو بەرنامەیەی کە کەسانی بێدارو هوشیار پەیڕەوی دەکەن ، بۆیە دەپرسن، کوا، کەی رۆژی قیامەت بەرپا دەبێت؟!

پرسیارەکەش بۆ تێگەیشتنو شارەزابوون نیە ـ هەندێ نەفامی سەردەمیش دەڵێن : کوا کێ لەوێوە هاتۆتەوە ؟ ـ ئەوان خۆیان بە گەورەو زانا دەزانن لەو بوارەداو بڕوایان بە پێشهاتنی نیە، هەر بۆیە قورئان بە وشەی تایبەت (ایَانَ)کە گوتاری ئەوانەو باس لە گومانەکانیان دەکات! هەر بۆیە خێرا و بە پەلە دیمەنی بەگیرهاتنیان لەو رۆژەدا باس دەفەرموێت کاتێ کە وەکو کانزا دەسوتێنرێن تا

حەقیقەتیان دەربکەوێت، وە بە رەخنەی توندو سەرزەنشتەوە لەو تەنگانەیەدا پێیان دەوترێت: دە بچێژن تاڵاوی بێ ئیمانی و ریسوایی .. ئەمە ئەو حاڵەیە کە ئێوە پەلەتان بوو لە پێشهاتنیدا ..

ئەو بەگیرهاتنە خێرایە وەڵامێکی لەبارە بۆ پرسیارە نادروستەکەیان - وە بۆ بیرو باوەڕە چەوتەکەیان - هەروەها ئەم توندوتیژی یە لە دژیان بەرانبەرە لەگەڵ بێباکی و بێ بەندوباری و بێبڕواییدا کە درۆزن و خاوەن گومان و بێ دینەکان دەیوروژێنن .. هەروەها ئەنجامدانی نزا خواییەکەیە لە بەگیر هاتن و بە کوشت چوونیان لە توندترین و ناسۆرترین دیمەندا .. کە دیمەنی سوتاندنیانە وەکو کانزا تا حەقیقەتیان بە تەواوەتی دەربکەوێت .

* * *

لەولاشەوە،لەو بەرەوە دیمەنێکی تر ، بۆ دەستەیەکی تر، بۆ کەسانێك کە دڵنیان و بەدوورن لە گومان و دوودڵی، لەخواترس و خواناس و دیندارن، بێدارو هۆشیارن، خواپەرستن هەمیشە هەست بە کەم و کوری دەکەن و داوای لێبوردن لە پەروەردگاریان دەکەن، ژیانی دنیا بە مەستی و سەرگەردانی و بێ بەندوباوی بەسەر نابەن :

﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٥﴾ آخِذِينَ مَا آتَاهُمْ رَبُّهُمْ إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ ﴿١٦﴾ كَانُوا قَلِيلًا مِّنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِالْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿١٨﴾ وَفِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ ﴿١٩﴾﴾

(١٥) لەولاشەوە دەستەی پارێزکاران و خواناسان لە نێو باخ و لە پاڵ تاڤگە و کانیاوەکانی بەهەشتدا ، لە سەیرانی هەمیشەییدا ژیانی پڕ لە شادی و کامەرانی دەبەنە سەر....

(١٦) بەهرەمەندن لەو شتانەی کە پەروەردگاریان بۆی ئامادە کردون و بەڕێزەوە پێیان دەبەخشێت ، ئەوانیش بە سوپاس و پێزانینی بێ وێنەوە وەری دەگرن و سوپاسی بێ پایانی پەروەردگاری ئازیزیانی لەسەر دەکەن ، ئەمەش لە پاداشتی ئەوەی کە ئەوان کاتی خۆی لە دنیادا چاکەکارو چاکەخواز بوون ...

(١٧) ئەو بەڕێزانە لە شەوگاردا کەم دەخەوتن ، یاخود کەم شەو هەبوو کە تێیدا هەڵنەسن و بە سۆزەوە شەو نوێژو خوا پەرستی نەکەن .

(١٨) لەبەرە بەیانەکانیشدا داوای لێخۆشبونیان لە پەروەردگاریان دەکرد تا لێیان خۆش بێت چونکە لە ناخەوە هەستیان دەکرد کە وەك پێویست پەروەردگاری خۆیان نەپەرستوەو حەقی بەندایەتیان بە تەواوەتی ئەنجام نەداوە!!

(١٩) ئەوانە کاتی خۆی لە ماڵ و سامانیشیان بەشیان بۆ هەژارو نەداران تەرخان دەکرد ، زیاتر لە زەکاتیان دەبەخشی (چونکە دڵنیا بوون کە هەر ئەوەیان بۆ دەمێنێتەوە) .

ئەم دەستەیە دەستەی تەقواداران و پارێزکارانە، دەستەی بێدارو هەستیارەکانە، چونکە دڵنیان کە خوای گەورە چاودێریانە بۆیە چاودێری خۆیان دەکەن، ئا ئەوانە لەنێو باخەکانی بەهەشت و سەرچاوەکانی ئاوی رازاوەدا کە لە شێوازی تاڤگەو کانی دڵڕفێندا بۆیان ئامادەکراوە ـ ژیانی پڕ لە شادی و کامەرانی دەبەنە سەر ـ ئەوان لەلایەن پەروەردگاریانەوە بەهرەمەند کراون لەو نازو نیعمەت و بەخششانە، لە پاداشتی دەستپێشکەری یە چاکەکانیان لە ژیانی دنیادا، لە پاداشتی ئەو خواپەرستی یەی کە دەیانکرد هەروەکو لە دیداریدا بن، چونکە

دڵنیابوون کە ئەو زاتە دەیانبینێت! ئەوانە کاتی خۆی چاکەکارو چاکە خواز بوون، چاکەکانیان بەوپەڕی دڵسۆزیو ملکەچی یەوە ئەنجام دەدا، زۆر هەست ناسكو بەشعور بوون، هەربۆیە زۆربەی شەوگاریان بە شەونوێژ دەبردە سەرو کەم رادەکشان، لە بەرەبەیانەکانیشدا داوای لێخۆشبوونیان دەکرد چونکە هەستیان بە کەمو کوڕیو کەم تەرخەمی دەکرد لە بەرانبەر بەخششە بێ سنورەکانی پەروەردگاری میهرەبان.

(حسن البصري) لە تەفسیری ﴿ كَانُوا قَلِيلًا مِّنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾ ﴾ دەڵێت : بەدرێژایی شەو" شەونوێژیان دەکرد، بەشێکی کەم لە شەو دەخەوتن، دواتر چالاك دەبوون و درێژەیان بە شەو نوێژەکەیان دەدا تا بەرەبەیان، ئەوکات داوای لێبووردنو لێخۆشبوونیان لە پەروەردگاری میهرەبان دەکرد !!

(احنف بن قیس) لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا وتویەتی: من لەو کەسانە نیم کە ئەو ئایەتە باسیان دەکات، هەروەها وتویەتی من کردەوەکانی خۆم بەراورد کرد لەگەڵ کردەوەی بەهەشتیاندا، خەڵکانێکم دی زۆر لە ئێمەوە دوورن و کردەوەی ئێمە ناگاتە کردەوەی ئەوان چونکە ئەوان زۆربەی شەوگار بێدار بوون و کەم راکشاون.. بەڵام کاتێ کە بەراوردم کرد لەگەڵ کردەوەی دۆزەخیاندا - دڵم خۆش بوو - چونکە کەسانێکم دەبینی کە کاتی خۆی باوەڕیان بە قورئان و پێغەمبەرانو زیندووبوونەوەی دوای مردن نەبوو .. بۆیە من وا دەزانم کە چاکترینمان کەسانێکن کە کردەوەی چاکمان هەیەو، تێکەڵ لەگەڵ هەندێ گوناهو هەڵەدا - کە مژدەی لێخۆشبوون دەیگرێتەوە لە روانگەی ئەم ئایەتەوە کە دەفەرموێت :

﴿ وَءَاخَرُونَ ٱعۡتَرَفُواْ بِذُنُوبِهِمۡ خَلَطُواْ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١٠٢﴾ ﴾ التوبة

(عبدالرحمن) کوڕی (زید) یش دەڵێت : کابرایەکی تەمیمی لە باوکمی پرسی : ئەی باوکی (أسامە) سیفەتو تایبەتمەندی یەك هەیە، خوای گەورە بۆی باس کردووین ، نابینم لە نێوماندا هەبێت، ئەویش بێداریو خواپەرستی یە لە زۆربەی کاتەکانی شەودا، چونکە بەڕاستی ئێمە زۆر کەمی شەو هەڵدەستین بۆ شەونوێژ!!

باوکم (خوای لێ رازی بێ) وتی: خۆشبەختی بۆ ئەو کەسەی کە ڕادەکشێ کاتێ کە خەو زۆری بۆ دێنێو وەنەوس دایدەگرێت، وە پارێزکاری دەکات و سنورەکانی خوا نابەزێنێ کاتێ کە بێدارە ..

ئەمە حاڵەتێکە شوێنکەوتووانی هاوەڵان بە ئاواتیەوە بوون، لەوانەی کە پلە تایبەت بوون لە ڕووی ئیمان و دینداریو بڕوا بتەوییەوە، بەڵام خۆیان دەبینی لەو ئاستەدا نین ، دیارە ئەو حاڵەتە کەسانێك کە هەڵبژاردەی خواوەندی میهرەبانن پێی هەستاون و پێیهەڵدەستن و وە بە یارمەتی ئەو زاتە توانیویانە مافی خۆی بدەنێ و بەو هیمەتەیان دەچنە ریزی چاکە خوازان :

﴿ وَفِيٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ حَقّٞ لِّلسَّآئِلِ وَٱلۡمَحۡرُومِ ﴿١٩﴾ ﴾

دیارە کە ئەو کەسەی کە هەژارەو داوا دەکات بێبەشی ناکەن، هەروەها ئەو کەسەش کە شەرمنەو داوا ناکات لە یادی ناکەن، ئەوانە بەشدانی ئەوانەیان کردووە بە ئەرکی سەرشانیان، وە ئارەزوو مەندانە بە ئەنجامدانی ئەو ئەرکە پیرۆزە هەڵدەستن..

ئەمە ئاماژەیەکە بۆ چارەسەر کردنی کێشەو بابەتی رزق و رۆزی و ماڵ و سامان، تا دڵ و دەروون لە کۆت و بەندی رەزیلی و دەست نوقاوی رزگاری ببێ ، وە بەربەستەکانی بەردەمی لەو بارەیەوە رامالێ .. وەکو پێشەکییەك بۆ چوونە سەر باسی برگەی دوهەمی سورەتەکە، لە کاتێکدا کە نیشانەی تەقواداران و وێنەی چاکە خوازانی[1] خستە روو ..

*　　*　　*

﴿ وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِّلْمُوقِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَفِي أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾ وَفِي السَّمَاءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ ﴿٢٢﴾ فَوَرَبِّ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ إِنَّهُ لَحَقٌّ مِّثْلَ مَا أَنَّكُمْ تَنطِقُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾

(٢٠) خەڵکینە سەرنج بدەن ، لەسەر زەوی و ناخی زەویدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەیە (لەسەر دەستەڵات و زانست و زانیاری و سیفاتە بەرزو بەنرخەکانی زاتی خوا لە جیهانی ئادەمیزادو ئاژەڵ و باڵندەو گیاندارانی ناو ئاودا ، لە گیاو داری هەمە چەشنەدا ، لە مارو مێرو خشۆك و دو پەل و چوار پەل و شەش پەل و بیست پەل و بێ پەل و زیندەوەرانی سەر سوڕهێنەردا .. لە کانزای هەمە جۆر ، هەمویشی بە رێژەیەکی لەبار بۆ دابین کردنی پێداویستیەکانمان لە تەمەنە جیاوازەکاندا !!)...

(٢١) هەروەها لە خودی خۆشتاندا ، (لە شێوازی روخسارتاندا ، لە رۆیشتن و هەڵس و کەوتاندا لە قسە کردن و ئاخاوتنتاندا ، لە بیر کردنەوەو هەست و نەستاندا ، لە دەزگاکانی دەرەوەو ناوەوەتاندا.. لە.. لە.. )ئایا ئەوە نابینن سەرنج نادەن ، تێنافکرن؟!!

(٢٢) دڵنیاش بن کە سەرچاوەی ڕزق و ڕۆزیتان لە ئاسماندایە ، (ئێمە لێرە ، لە بڵندییەوە بەشی هەر یەکێکمان دیاری کردووە ، جاری وا هەیە هەوڵەکان ناکام دەبن ، ڕەنجت بەخەسار دەچێت ، جاری واش هەیەدێتە بەر ، جاری وا هەیە بەبێ چاوەڕێ و بەتەما بوون دەوڵەمەندو بەهرەمەند دەبیت .) هەروەها ئەو بەڵێنانەش کە پێتان دراوە لێرەوە بڕیاری لەسەر دراوە ، (چ سەرکەوتن و پایەداری بێت لە دنیادا ، یاخود بەهەشتی بەرین لە قیامەتدا بە نیسبەت ئیماندارانەوە ، هەروەها شکستی و ریسوایی ناحەزان لە دنیاداو توند کردنیان لە دۆزەخ لەو جیهان بەنیسبەت بێ دینەکانەوە ...)

(٢٣) سوێند بە پەروەردگارو بەدیهێنەری ئاسمان و زەوی ، ئەو بەڵێن و وادانە هەر هەمووی ڕاست و دروستن ، هەروەکو ئێوە چۆن قسە دەکەن و ئاخاوتن دەکەن!! (خوایە گیان داوای لێبوردنت لێ دەکەین .. باشە زاتی شکۆمەندی تۆ کێ ناچاری کردی سوێندی بۆ بخۆیت تا بڕوات پێ بکەن!!) .

ئەو ئایەتانە سەرنج ڕاکێشانە بۆ لای موعجیزەکانی خوای گەورە لەسەر زەوی و لە خودی مرۆڤەکاندا، وە رووکردنە ئاسمان و ڕوو کردنە خوایە لەلایەن ئیماندارانەوە بۆ ڕێنمونی کردنی تا ئەوەی بۆی بڕیار دراوە لە رزق و رۆزی و خۆشبەختی بە ئاسانی بەدەستی بێنێ .. کۆتایی ئایەتەکانیش بە سوێندخواردنی خوای گەورە دێت بە سیفەتی ئەوەی کە ئەو زاتە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی یە بۆ دڵنیایی کردن کە ئەو پەیامەی بۆیان رەوانەکراوە حەق و راست و دروستە ..

لەڕاستیدا ئەم هەسارەیەی کە ئێمە لەسەری دەژین پێشانگایەکی زۆر گەورەو فراوانەو شتی زۆرو سەرسوڕهێنەری دروستکراوانی خوای گەورەی لەسەر بەدی دەکرێت، هەتا ئەمڕۆش زۆر کەم لە نهێنیی و شتە سەرسوڕهێنەرەکانی باسی لێوە کراوە، هەموو ڕۆژێ بەڵکو هەموو ساتێ شتی سەیرو سەمەرە و شتی تازەو نوێ پەی پێ دەبرێت، لە هەمان کاتدا پێشانگایەکی تریش هەیە لە خودی خۆماندا شاراوەیە ..

دڵ و دەروونی مرۆڤ ، نهێنیی و شاراوەکانی، کە نهێنی ئەم بونەوەرەی لە خۆیدا حەشارداوە ، نەك تەنها نهێنی ئەم زەوی یە !!

ئا بەو شێوازە کورتە خوای گەورە ئاماژە دەکات بۆ ئەو دوو پێشانگایەو دەروازەی هەردووکیان والا دەکات بۆ ئەو کەسانەی کە دەزگای بینایی خۆیان بەکار دێنن و بە قوڵی سەرنج دەدەن، بۆ ئەو کەسانەی کە بە شوێن دڵنیاییدا دەگەڕێن ، ئەوانەی کە دەیانەوێت لە دنیادا هەست بە خۆشی بکەن و چێژ لە تەماشاکردن و ووردبوونەوە ببەن ، هەروەها پەندو ئامۆژگاری زیندوو وەربگرن، وە سامانێك لە بەهاداریی و زانستی ڕاستەقینە وەربگرن، کە دڵانی پێ بڵند دەبێتەوەو تەمەنی پێ درێژ دەبێت ..

بێگومان دەقە قورئانیەکان بە شێوازێکن کە بۆ هەموو ناوەندو ژینگەو بارودۆخێك بگونجێن، توانایان هەیە بەشی هەموو کەس و هەموو ئاستێکی ژیری و تێگەیشتن بدەن، هەرکەس بەڕادەی تێگەیشتن و توانای.

بێگومان هەرکات مرۆڤ ئاستی زانستی بەرز بۆوەو بواری تێگەیشتنی فراوان بوو، زانیاری زۆر بوو، ئەزموونی بەربڵاوبوو، هەندێ شارەزایی پەیداکرد لە

نهێنی یەکانی گەردوون و نهێنی یەکانی دەروون" بەشی فراوان و زۆر دەبێ لە تێگەیشتنی قورئان و سەرمایەی گەورە و، توێشووی هەمەچەشن دەبێ.

چونکە قورئان کتێبێکە رەوانەکراوی بەدیهێنەری گەردوونە ، هەرگیز نهێنی و ئامـاژە سەرسـوڕهێنەرەکانی تـەواو نابێـت، دووبـارە کردنـەوەو چـەند بـارە دەورکردنەوەی کۆن نابێت و ئیماندار لێی بێزار نابێت، هەروەکو پێغەمبەر(ﷺ) وەریگرتـووە و لـە نهێنـی یـەکانی شـارەزابووەو لـە ژیـانی رۆژانەیـدا پیـادەی کردووەو باسی لە ئەزموونێکی زیندووی خۆی پێشکەش کردووە(ﷺ) ..

لە ڕاستیدا ئەوانەی کە بۆ یەکەم جار گوێ بیستی قورئان بوون ، وە ئایەتەکانی خـوای گـەورەیان دەربـارەی ـ گـەردوون ـ و زەوی و خۆیـان بیسـتووە، بەشـی خۆیان سوودیان لێ وەرگرتووە و، سەرمایەیەکیان لە زانست بەدەست هێنـاوە، بـەڕادەی تێگەیشـتن و ئاسـتی زانسـتی و ئـەزموونی خۆیـان تێکـەڵ بـە رادەی کردنەوەو گەشانەوەی دڵ و دەروونیـان، هـەروەها چین لـەدوای چین و نـەوە لـە دوای نـەوە بەشـی خۆیـان لێ هـەڵگۆزیوە بـەڕادەی زانسـت و زانیـاری و ئەزموونیان.

ئێمـەش لـەم سـەردەمەدا بـەڕادەی زانسـت و زانیـاری و ئەزموونـەکانی خۆمـان سوودی لێ دەبینین، هەر نهێنـی یەك لـەم گەردوونـە فراوانـەدا پێـی دەزانرێت ـ زیاتر گەورەیی و گرنگی قورئان و زانست و زانیاری رەهای ئەو زاتـەی رەوانـەی کردووە بۆ مان دەردەکەوێت ـ .

بێگومـان نـەوەکانی داهـاتوو زیـاتر نهێنـی ئایەتـەکانی خـوای گـەورەیان بـۆ دەردەکەوێت لەسەر زەمینی واقیع و لە خودی خۆشیاندا.

ئەوسا بەردەوام، وە تا کۆتایی دنیا ئەم دوو پێشانگا فراوانە خواکردە شتی تازەو سەیرو سەمەرە نیشانی مرۆڤەکان دەدەن.

سەرەتا ئەم زەوی یە، ئەم هەسارە ئامادەکراوە بۆ ژیان، ئامادەکراو بۆ پێشوازی کردن و لە ئامێزگرتنی ژیان بە هەموو تایبەتمەندییەکاندیەکایەوە ، کە پێدەچێ لەم گەردوونە فراوانەدا خوای گەورە هەر ئەم زەوییەی بەم شێوازە سازاندبێ، بە مەرجێ پڕە لە ئەستێرە و هەسارەی گەڕۆك، ئەوەی تا ئێستا زانراوە ئەوەیە کە سەدان ملیۆن گەلە ئەستێرە هەیەو هەر گەلە ئەستێرەیەك ـ پتر لە ملیارێك ئەستێرەو هەسارەی لە خۆ گرتووە، هەسارەکان بە دەوری ئەستێرەکاندا لە چەرخ و خولدان!! جا لەنێو ئەو ژمارە زۆرەی کە هەژمار ناکرێت زەوی تایبەتمەندی خۆی هەیە تا پێشوازی لەم جۆرە ژیانە بکات ۆ لە ئامێزی بگرێت..

گەر تەنها یەك تایبەتمەندی لە تایبەتمەندییە بێ شومارەکانی زەوی توشی ناڕێکی ببێ، ئەوە ئەم جۆرە ژیانە ئەستەم دەبێ لەسەری .. گەر قەبارەی بچوکتر یان گەورەتر بوایە، یاخود دوور و نزیکی لە خۆرەوە دوورتر" یان نزیکتر بوایە، گەر قەبارەی خۆر یاخود پلەی گەرمیەکەی گۆڕانی بەسەردا بهاتایە .. گەر لەنگەری زەوی گۆڕانی بەسەردا بێت، یان سوڕانەوەی بەدەوری خۆیدا ، یان خێراتر بە دەوری خۆیدا بسوڕایەتەوە، یان خاوتر بێت، یاخود قەبارەی مانگ کە بە دەوری زەویدا دەسوڕێتەوە جیاواز بوایە لەوی کە هەیە ، یان دوور و نزیکیەکەی ، گەر ڕێژەی ئاو و وشکانی زیاد و کەم بکات .. ئەگەر .. ئەگەر .. بڕۆ بۆ هەزاران ئەگەر، وردبەرەوە لەو شتانەی کە بە وردی دابین کراون و

ڕێکخراون، کە هەندێکی زانراوەو زۆربەی نەزانراوە، کە هەر هەمووی بە چاکی و تێرو تەواوی ئامادە کراوە بۆ پێشوازی لەم ژیانەو لەم مرۆڤەو لە ئامێز گرتنی !!
باشە داخۆ هەموو ئەمانە بەڵگەو نیشانە نین لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە پێشانگایەکی مەزنی بەرپا کردووە؟
پاشان ئەم هەموو خۆراکە هەمەجۆرو هەمە چەشنەی کە ئامادە کراوە بۆ زیندەوەران و، ئەوانەی کە لەسەری دەژین، یان هەر بە هەواکەیدا مەلە دەکەن، یان لەنێو ئاوەکانیدا ژیان دەبەنە سەر، یاخود لە ئەشکەوت و کون و کەلەبەرەکانیدا خۆیان شاردۆتەوە، یاخود لە پێچ و پەناو ژێر خاکەکەیدا خۆیان حەشار داوە ..دابین کردنی خۆراکی ئامادە، هەندێکی تێکەڵ و هەندێکی سادەو زۆرو زەبەندە بە جۆرەها شێوە کە هەرچی پێداویستی زیندەوەرانە کە لە ژمارە نایەن دابین کردووە، کە ئامار ناکرێن و جۆری جیاوازی خواردنەکانیان لە ژمارە نایەن..
لەڕاستیدا ئەم هەموو خۆراکە شاراوەیە لەنێو زەویدا، یان لە قەراغی دۆڵ و چەمەکانیدا، یان مەلە دەکات لە هەواکەیدا، یان بڵاوبۆتەوە بەسەر ڕوکاریدا، یاخود ئەوەی کە بە هۆی تیشکی خۆرەوە بەرهەم دێت، یاخود بەهۆی هۆکاری ترەوە کە هەندێکی زانراوە وهەندێکی نەزانراوە، هەموویشی بە شێوازێکی حساب بۆکراو لەلایەن ئەو زاتەوە کە ئەم لانکەو باوەش و کۆشەی سازداوە بۆ ژیان، ئەم هەموو جۆرە لە دروستکراوانی کە هەژمار ناکرێن ـ لە ڤایرۆسێکەوە تا تیمساحێك ، لە میکرۆبێکەوە تا زەڕافەیەك ، بۆ سەرجەمیان لە جیهانی مرۆڤەوە بۆ جیهانی ئاژەڵ و باڵندەو خشۆك و ماسی و نەهەنگی نێو دەریا و زەریاکان ..تد هەرچی خۆراك و پێداویستی یە بۆ ژیانیان بۆی ئامادە کردوون ـ !! .
زیندەوەران بە دیمەنی جیاوازیان" سروشتیان ڕازاندۆتەوەو بۆ هەر لایە دەڕوانی

، بۆ هەر شوێنێك دەڕۆی، لە دەشتو دەرو چیاو دۆڵەکان، دەریاو زەریاو گۆماوەکان، دەریاچەو روبارو تاڤگەکان،شتی جیاوازو هەمە چەشن بەدی دەکەیت، باخ و باخات و بێستان و رەزەتری، کشتوکاڵی هەمەجۆر،دارخورمای یەك پەلو دووپەل، هەموو دیمەنەکان بەردەوام داهێنان و جوانکاری و گۆڕانی بەردەوامیان پێوە دیارە،زۆرجار مرۆڤ بەلایدا تێدەپەڕێت تۆوەکان دیار نین و لەژێر خاکدان بەڵام دوای ماوەیەك دەردەکەون بە شێوازێك، دوای ماوەیەکی تر دیمەنی تریان هەیە، بە سەوزی دەیانبینی، کاتی دروێنەش زەرد هەڵدەگەڕێن و دیمەنێکی تریان هەیە. دەکرێ مرۆڤ هەموو ئەم دیمەنانە ببینێ و هەنگاوێکی نەنابێت ـ بەتایبەت لەم سەردەمەدا لە شاشەی تی ڤی یەکانەوە زۆر لەوانە زیاتر بەدی دەکات ـ شایانی باسە هەرچی زیندەوەران هەیە زەوییان ئاوەدان کردۆتەوە .. لە جیهانی روەك و ئاژەڵ ، لە باڵندەو ماسی، لە خشۆك و مێروو، بەڵکو لە ئادەمیزادی هەمەجۆر، هەر هەموویان قورئان ئاماژەی تایبەتی بۆکردوون بە دەقی تایبەت .. ئەم زیندەوەرانەی کە هێشتا کەس ژمارەی جۆرو رەگەزیان نازانێ ، ئەوە هیچ کە ئەستەمە ژمارەی تاکەکانیان بزانرێت، لەکاتێکدا هەر جۆرێکیان ئوممەت و گەلێکی تایبەتن، هەر تاکێکیان شتێکی سەرنج راکێش و سەرسوڕهێنەرە، هەر ئاژەڵێك، هەر باڵندەیەك، هەر خشۆکێك، هەر مێروویەك، هەر کرمێك، هەر روەکێك، بەڵکو باڵی هەر مێروویەك، گەڵای هەر گوڵێك، لاسکی هەر گەڵایەك، هەر هەمووی لە پێشانگای سەرسوڕهێنەری خواییدا خۆی دەنوێنێ کە شتە سەیرو سەمەرەکانی هەرگیز تەواو نابێت و کۆتایی نایەت!!

جا ئەگەر مرۆڤ هەوڵ بدات، بەڵکو سەرجەم مرۆڤەکان هەوڵ بدەن سەرنجی دروستکراوان بدەن و تێبینی خۆیان یاداشت بکەن دەربارەی ئەوەی لەسەر زەویدا هەیە لە دروستکراوانی سەیرو سەمەرە ، وە باس لە تایبەت مەندییان بکەن لە هەموو رویەکەوە، ئەوە باسەکان هەرگیز تەواو نابن .

قورئانیش هەر ئەوەندەی مەبەستە کە دڵەکان رابچڵەکێنێ تا سەرنج بدەن و بیر بکەنەوە، باس لە وردەکاریەکان بکەن لەم پێشانگا گەورەو مەزنەدا، بە درێژایی گەشتەکەیان لەسەر ئەم هەسارەیە هەوڵ بدەن لە سەرنج و تێبینی یەکانیان دەربارەیان چێژ بەرن!!

بەڵام کەس چێژ لەم دروستکراوە سەیرو سەمەرانە نابات و بە تەواوی دەرکیان ناکات و - ئاستی ئیمانی پێ بەرز نابێتەوە - ئەوانە نەبێت کە دڵ و دەروونیان سارێژە لە ئیمان و یەقین و دڵنیایی چونکە دڵنیابوون لە دەستی قودرەتی خوایی، دەبێتە هۆی زیندوکردنەوەی دڵان ، دەبینێ و تێدەگات، دیمەنەکانی سەرزەوی بە زمانی حاڵ باسی خۆیان بۆ دڵە زیندووەکان دەکەن ونهێنی یەکانیان دەدرکێنن و ئاماژە بۆ دەستی قودرەت دەکەن کە بە شێوازێکی جوان و داهێنانێکی نایاب هەموویانی هێناوەتە سەر گۆڕەپانی ژیان.

جا ئەگەر ئاوا بیرنەکەینەوە ، هەموو دیمەن و دیاردەکان، هەموو دروستکراوان وشك و بێ گیان دێنە بەرچاو، هیچ قسەو گفتوگۆیەك بۆ دڵان ناکەن، کاردانەوەیان نابێت، چونکە زۆر دێن و دەچن بە ناو ئەم پێشانگا خواییە کراوەیەدا" بەڵام چاوی خۆیان نوقاندووە و دڵیان داخستووە، هەست ناکەن ئەمە پێشانگایەکی زیندووە، لە زمانحاڵی تێناگەن، چونکە هەر لە سەرەتاوە

ئیمانو دڵنیاییەکی دامەزراویان نیە، وا هەست ناکەن دەوروبەر ژیانی تێدایە، هەندێکیان لەوانەیە لە ریزی زاناکانیشدا بن، بەڵام هەر رواڵەت دەبینن .. حەقیقەتی شتەکان شاراوەیە لە دڵیانو هەستی پێناکەن، چونکە دڵان خۆیان ناکەنەوە بۆ بیرکردنەوە لە بونەوەر بە کلیلی ئیمانو نوری یەقین نەبێت دەرکی شتەکان ناکەن .. ئاشکرایە کە خوای گەورە راستی فەرمووە لەو پێناسەیەدا.

پاشان لە شتێکی سەرسوڕهێنەری تر دەدوێت و دەفەرموێت :

﴿ وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ٢١ ﴾ لە هەموو شتێك سەیرو سەمەرەتر لەم سەرزەویەدا ئەم مرۆڤەیە کە مەخابن بیر لە ناخی خۆی ناکاتەوە، بیر لە نهێنی یە شاراوەکانی کە لە ناخیدا خۆی حەشار داوە ناکاتەوە، بەتایبەتی کاتێ کە دڵی خۆی لە ئیمان وێڵ دەکاتولە نیعمەتی یەقین خۆی بێ بەش دەکات..

بەڕاستی مرۆڤ لە لەشو لاریدا پێکهاتەیەکی سەرسوڕهێنەرە، لەو رۆحو گیانەدا کە جەستەی هەڵدەسوڕێنێ تەواو جێگەی سەرنجو تێرامانە، لەولاشەوە نەفس و دەروونو ناخی کە نهێنی زۆری تێدایە شایستەی بیر لێ کردنەوەیە چونکە کاریگەری ئاشکراو بەرچاوی هەیە لەسەر جەستەو هەڵسوکەوتی ..

بەڕاستی ئەم مرۆڤە هەرچی نهێنی گەردونە لە خۆی گرتووە ..

وا دەزانێ شتێکی بچوکە، بەڵام جیهانێکی گەورەی لە نهێنی لە خۆ گرتووە، هەرکات مرۆڤ بیر لە پێکهاتەکانی دەرەوە و ناوەوەی خۆی دەکاتەوە رێی لە نهێنی سەرسامئاوەر دەکەوێت.. لە پێکهاتەی ئەندام و کۆئەندامەکانی جەستەیدا، لە شێوازی دابەش بوون و پێکهاتەکانیدا، لە ئیشو کارو

چالاکیەکانیدا، بۆ نموونە:کۆئەندامی هەرس و سوودوەرگرتن لە خۆراك، کۆئەندامی هەناسەدان و کارلێکی وزەبەخشین، سوڕی خوێن و دڵ و دەمارەکان، کۆئەندامی دەمار و چۆنیەتی بەڕێوەبردنی کاروباری جەستەو چالاکی و ڕێکخستنەکانی، هەروەها هاوئاهەنگی نێوانیان بەدەم یەکترەوە بوونیانبە شێوازێکی زۆر ورد و ڕێکوپێك، هەموو ئەمانەش نهێنی زۆری تریان لەخۆ گرتووە، لە هەموو ئەندامێك و لە هەموو بەشێکیدا، بەڵکو لە بچوکترین بەشی ئەندامێکدا ئەوەندە موعجیزە هەیە کە بیروهۆش سەرسام دەکات..

نهێنی ڕۆحیش با لەولاوە بوەستێ، توانا ئاشکراو پەنهانەکانی، چۆن لە شت تێدەگات و بە چ شێوازێك ، چۆن زانیارییەکان دەپارێزێ و چۆن دێتەوە یادی، ئەم هەموو زانیاری و وێنانە لە کوێدا هەڵدەگرێت و چۆنی هەڵدەگرێت؟! ئەی ئەم هەموو وێنەو ڕووداوانە لە چ پاشخانەیەکدا چاپ دەکات و چۆن؟ کاتێ بانگ دەکرێت، چۆن تێدەگات و دێت، ئەمە هەندێ لە ئاسەوارە زانراوەکانیەتی، ئەوەی نەزانراوە زۆر فراوان و زیاترە، ناو بەناو ئاسەواری دەردەکەوێت، کاتێ کە هەندێ ئاماژەی لێ بەدی دەکرێت کە دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە لە پشتی شتە دیارو ئاشکراکانەوە نهێنی زۆرو بێ شومار هەیە.

هەروەها لە نهێنی یەکانی تری ئەم مرۆڤە چۆنیەتی زۆربوون و سەرهەڵدانەوەی سیفاتە بۆماوەییەکانیەتی..

لە خانەیەکدا هەرچی تایبەتمەندی یەکانی رەگەزی مرۆڤە ئاخنراوە، بەزۆری سیفاتی دایك و باوکەکەو باوباپیرانی نزیکی لەخۆ گرتووە، باشە ئەم هەموو ئەندام و کۆئەندام و سیفاتانە لەکوێی ئەم خانەیەدا خۆی حەشارداوە، وەچۆن

مێژوویەك دووبارە دەكاتەوەو بەشێوازی ـ دیجیتاڵ ـ بەوردی دووبارەی دەكاتەوە، وە دەبێتە هۆی سەر لەنوێ دروستبوونەوەی ئەم مرۆڤە سەرسوڕهێنەرە؟!

لەلایەكی ترەوە هەڵوێستەیەك لەگەڵ ئەو چركەساتەدا كە كۆرپەلە لە دایكی جیا دەبێتەوەو ژیانێكی تر دەست پێدەكاتو بە زۆری دەبێ خۆی هەوڵبدات، دڵی دەبێ بكەوێتە ئیش، سی یەكانی دەبێ بكەونە كار، لەڕاستیدا هەڵوێستەیەك لە بەرانبەر ئەو چركەساتەدا، وە لەبەردەم ئەم جوڵەیەدا عەقڵ و هۆش سەرسام دەكات، مرۆڤ دەحەپەسێنێ و ئیمان ساڕێژ دەبێتو هیچ دڵێك خۆی بۆ ناگیرێتو هیچ هەستو نەستێك بێ هەڵوێست نابێت!!

هەروەها ئەو چركەساتەش جێگای سەرنجو تێڕامانە كە منداڵی ساوا دەست دەكات بە دەربڕینی هەندێ وشەو هەندێ برگە، پاشان هەندێ رستەو هەندێ دەربڕین..

مرۆڤ حەق وایە سەرسام بێت لە بەرانبەر قسەكردنی خۆیدا جوڵەی زمانو ئاراستەكردنی قوڕگ ـ جوڵەی چەناگەو دەمو لێو ـ بەڕاستی جێگەی سەرسوڕمانن، چونكە زۆر دووبارە دەبێتەوە بەچاكی سەرنجمان راناكێشێ، بەڵام هەركات گەر بۆچركەساتێكیش هەڵوێستە بكەین كاریگەریو كاركردی نوێ دەبێتەوە" بەڕاستی موعجیزەو سەراسیمەیە، سەراسیمەیەكی ئەوەندە سەیرە كە پێمان دەڵێ ئەم موعجیزەیە بەخوای گەورە نەبێت بەكەس ناكرێت!!

جا هەر بەشێك لە ژیانی ئەم دروستكراوە پێمان دەڵێت : كە من موعجیزەیەكم، سەراسیمەو سەرنجدانم تەواو نابێت، هەر تاكێك لەم رەگەزە جیهانێكی تایبەتە

بەخۆی.. ئاوێنەیەکە لە توێیدا هەموو ئەم بونەوەرە رەنگ دەداتەوە بەشێوازێکی تایبەت کە هەرگیز بە درێژایی زەمان دووبارە نابێتەوە، وە هاوشێوەی لەنێو سەرجەم مرۆڤەکاندا لە شێوازو روخساردا هەرگیز دووبارە نابێتەوە، هەروەها لە ئاستی هزرو تێگەیشتنیدا، لە رۆح و هەست و نەستیدا، لە هەستی تایبەتی خۆی بەرانبەر بونەوەر کە بە شێوازێك بە بەردەمی ئەمدا تێدەپەڕێت کە هەرگیز دووبارە نابێتەوە، هەروەکو چۆن نەخشی پەنجەکان دووبارە نابنەوە لەسەر زەویدا، وە لە هەموو سەردەمەکاندا!!

زۆرێك لەو شتانەی کە لە رەگەزی مرۆڤدا هەیە لەبەر چاوە! هەموویشی ئاماژەیە بۆ نهێنی زۆرو شاراوە.

شتەکان سەیرو سەمەرەکان ئەوەندە زۆرن، لە کتێبێکی گەورەدا باسیان تەواو نابێت، چونکە ئەوەی کە پێی زانراوە هەر بەشێکی پێویستی بە چەندەها بەرگ کتێبی گەورە هەیە، ئەوەشی کە پەنهان و شاراوەیە زۆر زیاترە لە زانراوەکان، قورئانیش ئاماری ناکات و سنوری بۆ دانانێت، بەڵکو بەو شێوازە دەیەوێت ئەم مۆزەخانەیە کە والآیە بۆ دەزگاکانی بینایی و تێگەیشتن دابچڵەکێنێ، تا ئەم گەشتەی لەسەر ئەم هەسارەیە بە سەرنجدان و تێبینی و لێکدانەوە بەسەر بەرێت وە چێژێکی بڵندو بەرز وەربگرێت لە تەماشاکردنی ئەم دروستکراوە سەیرو سەمەرەیە ، تا لە خودی خۆیەوە دەست پێبکات و تێبگات و لە خەوی غەفڵەت و سەرگەرمی دنیا خۆی قوتار بکات.

بەڕاستی ئەو چرکەساتانەی کە مرۆڤ دەیباتە سەر لە سەرنجدانی روخساری خەڵکی و تایبەتمەندی و جوڵە و داب و نەریتی مرۆڤەکانی وەك خۆیدا، وەختێکی

بەنرخن، کاتێ کە بە چاوی بەندایەتیو سیاحەتو وردبوونەوە لە مۆزەخانەی ئەو زاتەدا بەسەری دەبات کە دروستکاری چاکی وەك ئەو هەر نیە ـ بەڵکو دروستکارێکی تر وجودی نیە ـ.

جا داخۆ چەندە بەختەوەر بێت ئەو کەسەی کە ژیان بەم سەرنجدانو رۆحە زیندووەوە دەباتەسەر؟!

شایانی باسە کە ئەو حاڵەتە سەرسوڕهێنەرانە تەنها خاوەنی ئەو دڵانە چێژی لێ دەبەن کە دڵ و دەرونیان سارێژە لە ئیمانو دڵنیایی، سەرنجی دەوروبەر دەدەن لەسەر زەوی خوادا، دڵنیان کە هەرچی دەبینن دەستکاری زاتێکی کاربەجێ و جوانکارە ، ئیتر شتەکان بەچاوی دڵ دەبینن، بە دڵ بیری لێ دەکەنەوە، ئەوسا دیمەنەکانی زەویش وەك ئەوەی گیانیان کرابێ بەبەردا دێنە گۆو رازو نهێنی یەکانی خۆیان دەردەخەن، باسی دەستی قودرەتو داهێنەر دەکەن، گەر ئاوا بیرنەکەینەوە، دیمەنەکان هەموو مردونو کلۆرن، هیچ ناڵێن بۆ دڵ، هیچ جۆرە کاردانەوەیەکیان نابێت، زۆرێك لە خەڵکی بە پێشانگای خوایی کراوەدا تێدەپەڕن بە چاوی نوقاو و دڵی داخراوەوە، هەست بە ژیان ناکەن، لە هیچ زمانێك تێناگەن، چونکە لە دڵنیایی بێ بەشن، هەست بە ژیان ناکەن لە دەوروبەریاندا!

لەوانەیە کەسانی زاناشیان تێدا هەڵبکەوێت ، بەڵام هەر لە تەنها لە رواڵەتی دنیادا، بەڵام حەقیقەتی لە دڵیان شاراوەیە، چونکە دڵ ناکرێتەوە بە حەقیقەتی ئیمان نەبێت، چونکە بە نوری یەقین نەبێت راستی یەکان نابینرێن، پاشان شتێکی تری سەرسوڕهێنەر لەسەر زەویدا بەدی دەکرێت:

لەڕاستیدا ـ ئێمە ڕاهاتوین لە دیتنی یەکدیدا ـ لە حاڵێکدا دروستکراوێکی مەزنی سەرسوڕهێنەرین لەسەر ئەم زەوی یەدا، بەڵام مەخابن نرخی خۆمان نازانین، هەوڵنادەین نهێنی و شاراوەکانی خۆمان پەی پێ بەرین ، ئەویش بەهۆی ئەوەو کە دڵمان بێ بەش کردووە لە نوری ئیمان و نیعمەتی دڵنیایی، بەڕاستی مرۆڤ شتێکی سەرسوڕهێنەرە لەڕووی پێکهاتەکانی جەستەیەوەو لە ڕوی نهێنی ڕۆح و ناخ و دڵ و دەروونیەوە، نهێنی یەکانی گەردوونی لەخۆ گرتووە .. خۆی بە بچوك دەزانێ بەڵام نهێنی یەکانی جیهانی، لەخۆیدا حەشار داوە.

هەرکاتێ مرۆڤ هەڵوێستە دەکات و بیر لە نهێنی یەکانی خۆی دەکاتەوە، سەرسام دەبێت و سەری سوڕ دەمێنێ.. هەر لە دابەش کردنی پێکهاتەی ئەندامەکانیەوە، تا دەگاتە ئەرك و کارەکانیان، وە شێوازی ئەنجامدانی ئەرکەکانیان، هەر لە چۆنیەتی کاری هەرس و مژینەوە، بۆ چۆنیەتی هەناسەدان و سوتان، تا دەگاتە سوڕی خوێن و کاری دڵ، هەروەها پێکهاتەی کۆئەندامی دەمار و ڕەگ و ماسولکە و بەڕێوەبردنی سەرجەم کارەکانی جەستە، جگە لە لوەکان و ئەو مادەدانەی کە دەری دەدەن و پەیوەندیان بە گەشەی جەستەو چالاکی و ڕێکخستنەکایەوە، لەلایەکی ترەوە ئەم هەموو هاوکاری و هاریکاری یەی کە لە نێوان سەرجەم دام و دەزگا و کۆئەندامەکانی جەستەدا هەیە بەوپەڕی وردەکاری و ڕێکوپێکی شایستەی تێفکران و تێڕامانە ، هەر بەشێك لەوانە کۆمەڵێ نهێنی و شتی سەرسوڕهێنەری لەخۆ گرتووە، گەر مرۆڤ سەرنجیان بدات و تێفکرێت لێیان، سەرسام دەبێت.

لەلایەکی ترەوە رۆحی هەر مرۆڤێك نهێنی یەکی سەرسوڕهێنەرە، زۆر لە وزەی کارەبا لە جیهانی ماددەدا گرنگترە، چۆن ئەو وزەیە گەر نەما هەرچی دەزگا کارەباییەکان هەیە لەکار دەکەون، ئەم رۆحەش کە قەفەزی جەستەی بەجێ هێشت ، هەموو دەزگاکانی لەکار دەکەون و دەست بەجێ بەرەو هەڵوەشان دەچن ..

باشە ئەم رۆحە چۆن لە شتەکانی دەوروبەر تێدەگات، چۆن و لەکوێدا خۆی حەشارداوە، ئەم هەموو زانیاری یە چۆن دێتەوە یادی، ئەم هەموو وێنەیەی لەکوێدا هەڵگرتووە ؟ ئەی نهێنی خەوبینین چی یە؟ ـ هەندێ خەو وەکو حەقیقەتێك وایە فەرامۆش ناکرێت ـ چۆن روودەدات لەکاتێکدا تۆ لە پرخەی خەودایت و چاوت نوقاوەو لە پەل و پۆ کەوتویت و هیچ ئاگات لە دەوروبەر نیە .
ئەی چۆن دوایی دەیگێڕیتەوە، یان چۆن باسی رۆژگاری رابردوو دەگێڕیتەوە بە وردی، ئەمە هەندی لەو شتانەیە کە دەربارەی رۆح جێگەی سەرنج و تێڕامان و بیرکردنەوەن، ئەوەی کە شاراوەیە زۆر زیاترە لەوەی کە تا ئێستا پێمان زانیوە، جار جار گەر پەیوەندیمان بە پەروەردگارەوە بەهێز بێت دەروازەی هەندێ ئاسۆمان لێدەکاتەوەو زیاتر دڵنیا دەبین کە لە پشتی ئەم شتانەوە کە دیارن چەندە نهێنی زەق و بێ شومار خۆی حەشار داوە.
ئینجا بێینە سەر باسی ئەم مرۆڤە سەیرو سەمەرەیە ، چۆن پەیدا دەبێ و چۆن سیفاتە بۆماوەییەکانی سەرهەڵدەدەنەوە سەرەتا چۆن خانەیەك هەرچی سیفات و تایبەتمەندی مرۆڤایەتی هەیە لە خۆی گرتووە ، چۆن سیفاتی دایك و باوك و باو و باپیرانی هەڵگرتووە، باشە ئەم هەموو سیفەتە بۆماوەییانە لە کوێی

خانەیەکدا کە بەچاو نابینریٚ خۆی حەشار داوە؟ چۆن خۆی دەتوانیٚ بە وردی میٚژووی باو باپیران لەسەر گۆڕەپانی ژیان ریٚك بخاتو سەرلەنویٚ سەرهەڵبداتەوە، وە ئەم مرۆڤە سەرسوڕهیٚنەرەبەردەوام لەسەر زەویدا بمیٚنیٚتەوە ؟!

لەڕاستیدا هەڵویٚستەیەك لەلای ئەو کۆرپەلەیەدا کە لە دایك دەبیٚو ژیانی نویٚ دەست پیٚدەکات، جیٚگەی سەرنجو تیٚرامانی قوڵە، کاتیٚ کە دڵ و سی یەکانی دەست بەکار دەکەن، بۆ دریٚژەدان بە ژیان!! ئەو چرکەساتە ناخی مرۆڤی باوەڕدار دەهەژیٚنیٚ و ئیمانی سارێژ دەکاتو ئەسرین لە دیدەی سارێژ دەبیٚت!!

هەروەها هەڵویٚستەیەك کاتیٚ کە منداڵی ساوا دەست بە وتنی پیتەکان دەکاتو فیٚری وشەو رستە دەبیٚت !!

بەڕاستی قسەکردن خۆی موعجیزەیە،جوڵەی زمانو ئارستەکردنی گەروو، جوڵەی لیٚو، داڕشتنی پیتەکانو دروستکردنی وشەو رستەودریٚژەدان بە قسەکردن هەر هەمووی موعجیزەیە..

بەڵام مەخابن بەهۆی راهاتنمانەوە لە دیتنی ئەو دیاردەیە زۆر بیری لیٚ ناکەینەوە، بەڵام هەر ساتیٚك هەڵویٚستەیەك بکەین و بیری لیٚ بکەینەوە کاریگەری خۆی هەیە، بەڕاستی موعجیزەیە موعجیزەیەکی سەرسامئاوەر، پیٚمان دەڵیٚت: ئا ئەمە بەخوا نەبیٚ بە کەس ناکریٚت!!

جا ئیتر بۆ هەر بەشیٚك لە ژیانی ئەم مرۆڤە دەڕوانی، سەرنجی هەر لایەنیٚکی دەدەیت موعجیزەو سەراسیمەیەکە بۆ خۆیو ئەو ئایەتە دیٚنیٚتەوە یاد کە دەفەرمویٚت :

﴿وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ﴿٢١﴾﴾ هەر تاکێك لە دەستەی مرۆڤەکان جیهانێکە بۆخۆی، ئاوێنەیەکە بۆ وێناکردنی بونەوەر لە شێوازێکی تایبەتدا کە دووبارە نابێتەوە بە درێژایی زەمان، وە وێنەی دووبارە نابێتەوە لە شێوازو تایبەتمەندی یەکانیدا، لە عەقڵ و تێگەیشتندا، لە رۆح و هەستەکانیدا، لە وێنەو راو بۆچوونی دەربارەی گەردوون، لەم مۆزەخانە سەرسوڕهێنەرەدا کە بە ملیۆنەها ملیۆن کەس مەزەندە دەکرێت، چونکە هەر تاکێك وێنەی دووبارە نابێتەوە لە شێوازو رواڵەتیدا، لە تێگەیشتن و ژیریدا، لە رۆح و هەستەکانیدا. هەروەکو چۆن نەخشەی پەنجەی هیچ کەس دووبارە نابێتەوەو بە درێژایی زەمان..

لەڕاستیدا زۆر شت لە تایبەتمەندیی و شتە سەرسوڕهێنەرەکانی مرۆڤ روون و ئاشکرایە و بەچاو دەبینرێ، بینراوەکانیش بەڵگەن و ئاماژە دەکەن بۆ جیهانێکی فراوان و شاراوە..

باسی ئەو شتانەش لە کتێبێك و چەند کتێبێکدا ناکرێت، چونکە ئەوەی کە نادیارە زۆر زیاترە لەو شتانەی کە دیارو زانراون، قورئان هەژمارو سنورداری ناکات، بەڵکو دەیەوێت دڵ و دەروون بهەژێنێ تا سەرنجی ئەم مۆزەخانە خوایی یە بدات بە چاوێکی کراوەو دیدێکی هۆشیارانە، تا گەشتەکەی لەسەر ئەم هەسارەیە بە وردی و هۆشیاری بەسەر بەرێت، هەروەها حەق وایە بەردەوام سەرنجی دروستکراوانی سەرسوڕهێنەری دەوروبەری بدات، کە هەندێکی لە خودی خۆیدا خۆی حەشارداوە، لە کاتێکدا خۆی غافڵ کردوەو خۆی سەرگەرم کردووە بە شتی لاوەکیەوە.

بەڕاستی ئەو کاتانەی کە مرۆڤ سەرنج دەدات لە ڕواڵەتو سیماو هەڵسوکەوتو داب و نەریتی خەڵك بە چاوێکی عابدانەو بە دڵێکی پڕ لە ئیمان سەیری ئەو هەموو خەڵکە دەکات کە دروستکاری زاتێکن تەواو جوانکارو دروستکارە، لە ناخەوە هەست بە ئاسودەیی و خۆشی دەکاتو چێژی لێ دەبینێ ئاستی ئیمانی پێ بەرزو بڵند دەبێتەوە.

لەڕاستیدا قورئان بەم ئاماژانەی بیروباوەڕو بۆچوونی مرۆڤ نوێ دەکاتەوە گیانێکی نوێی پێ دەبەخشێ، چێژێکی بێ وێنە لەژیانو واتاکانی ژیان دەبات لە دنیادا، جگە لە دەستەبەر کردنی بەهەشت لەسایەی میهری خوادا..

بەڵێ بەو شێوازە بڵندە قورئان دەیەوێت خەڵکی بیربکاتەوە، هەر ئیمانیش دەتوانێ ئەو توێشووە بە دڵ ببەخشێ، بە تێفکران لە قورئانو ئاماژەکانی چێژ ببات، لە کاتێکدا هێشتا ئەم لە دنیاو لە جیهانی خاكو قوڕدایە !!

ئەمەی باس کرا لەسەر پێشانگای سەرزەوی بوو ، دواتر سەرنجدان لە خودی مرۆڤ خۆی، ئینجا ئاماژە بۆ پێشانگای بەرزو بڵندی شاراوە کە لەوێ رزقو رۆزیو پێشهاتو رووداوەکان رێکدەخرێت، یاخود رێکخراون:

﴿ وَفِي ٱلسَّمَآءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾

بەڕاستی سەرنج ڕاکێشانێکی سەرسوڕهێنەرە، بەتایبەت کاتێ کە لە ڕواڵەتدا هۆکارەکانی رزقو رۆزی لە زەویدایە، مرۆڤەکان هەوڵدەدەنو ماندوو دەبن ، وە بەتەمان لەو رێگەیەوە رزقو رۆزی بەدەست بێنن، بەڵام قورئان دەیەوێت مرۆڤ روو لە ئاسمان بکات، لە خوای گەورە داوا بکات، چونکە لەوێوە رزق و رۆزی دابەش دەکرێت، لەوێ بەشی هەمووکەس دیاری دەکرێت !!

چونکە زەوی هەرچی تێدایە و هەرچی لەسەریەتی بەڵگەو نیشانەن بۆ ئەو کەسانەی کە بەهۆی ئیمان و باوەڕیانەوە دڵنیان. دڵان دەگێڕنەوە بۆلای خوا تا هەمیشە چاوی لە رزق و رۆزی ئەو زاتە بێت و بەتەمای فەزڵی ئەو بێت، خۆی لە چاوچنۆکی و کۆت و کۆسپەکانی زەوی رزگار بکات، هۆکارەکان بە هەمووشت نەزانێ، نەیەڵێت ببنە کۆسپ لەنێوان خۆی و پەیوەست بوون بە سەرچاوەی یەکەم و سەرەکی کە بەدیهێنەری هۆکارەکانە.

بێگومان دڵی ئیماندار ئەم سەرنجە وەکو خۆی دەناسێت، وە دەزانێت کە ئەمە پشتگوێ خستنی هۆکارەکان و ئاوەدان کردنەوەی زەوی نیە، چونکە ئەو ئەرکی نیشتەجێ بوون و ئاوەدان کردنەوەی زەوی لە ئەستۆدایە، مەبەست ئەوەیە کە دڵبەندی نەبێت، وە لەخوای خۆی غافڵ نەبێت، ئاوەدان کردنەوەی زەوی فەرامۆش نەکات، با لە زەویدا چی دەتوانێ لە کاری خێرو چاك ئەنجامی بدا بەڵام با روخساری روو لە ئاسمان بێت، با سوود لە هۆکارەکان وەربگرێت، لە هەمان کاتدا با دڵنیا بێت کە هۆکارەکان رزقی پێ نابەخشن، چونکە رزق و رۆزی ئەو لە ئاسماندا دیاری کراوە، ئەوەی کە خوای گەورە بەڵێنی پێداوە هەر بەنسیبی دەبێت..

ئەو کات ئیماندار دڵ و دەروونی لە کۆیلەیی بۆ هۆکارەکانی زەوی رزگاری دەبێت، بەڵکو بە باڵی هۆکارەکان دەفرێ بۆ مەملەکەتی ئاسمانەکان، چونکە دڵنیایە هۆکارەکان" بەدیهێنەری هۆکارەکانی پێدەناسێنن.

ئەوسا ئیتر هەمیشە دڵی پەیوەستە بە ئاسمانەوە، پێیەکانیشی مەحکەم و دامەزراوە لەسەر زەویدا.

بێگومان خوای گەورە دەیەوێ مرۆڤ وا بێت، دەیەوێ ئەم مرۆڤە کە بەشێکی لە قوڕو خاکی زەوی یەو بەشەکەی تری لەو رۆحە تایبەتەیە کە زاتی خۆی پێیبەخشیوە، فەزڵ و رێزی دراوە بەسەر دروستکراوانی سەرجەم جیهانەکاندا. بەڕاستی هەر بە ئیمانی دامەزراویش ئەو حاڵەتە بۆ مرۆڤ دروست دەبێت و باشترین و ئاسودەترین دۆخی بۆ پێش دێت، چونکە ئەوە ئەو حاڵەت و بارودۆخەیە کە خوای گەورە فیترەتی ئاسایی خەڵکی لەسەر دروست کردووە، پێش ئەوەی فەسادو لادان و گەندەڵی بیشێوێنێت ..

ئینجا دوای ئەو گەشتە بە زەوی و ناخی مرۆڤ و ئاسماندا ..

خوای گەورە سوێند بە زاتی بەرزو بڵندی خۆی دەخوات لەسەر راستی و دروستی ئەم گوفتارەو ئەم قورئانە و دەفەرموێت:

﴿ فَوَرَبِّ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ مِّثۡلَ مَآ أَنَّكُمۡ تَنطِقُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾

جا ئەوەی کە مرۆڤەکان قسەو ئاخاوتن دەکەن، موعجیزەیەکە و هەستی پێ دەکەن، بە هیچ شێوەیەك ناتوانن نکولی لێ بکەن، یان گومانیان لێی هەبێت و بە درۆوە دژی بوەستن، ئەمەش دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە دابەش کردنی رزق و رۆزی بەدەشت خوای گەورەیە، ئەم قورئانەش پەیامی راست و دروستی خوای گەورەیە بۆ هەموو مرۆڤەکان لە تەواوی سەر زەمین و سەرجەم زەماندا ..

(اصمعي) رووداوێکی سەیر دەگێڕێتەوە و دەڵێت : لە مزگەوتی گەورەی بەسرە دەگەڕامەوە، کابرایەکی عەرەبم بینی کۆمەڵێ خەڵکی کەپێدەچوو فەرمانڕەوایان بێ لەدەوری بوون" کە منی بینی لێی پرسیم: خەڵکی کوێیت؟ وتم : لە تیرەو بنەماڵەی (اصمع)م ..




کابرا وتی: لە کوێوە هاتویت؟ وتم : لە شوێنێکەوە کە فەرمودەی خوای میهرەبانی تێدا دەخوێنرا ..

کابرا وتی : هەندێکم بۆ بخوێنە .. منیش دەستم کرد بە خوێندنی ﴿وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرۡوٗا ١﴾ هەتا گەیشتمە ئایەتی ﴿وَفِي ٱلسَّمَآءِ رِزۡقُكُمۡ وَمَا تُوعَدُونَ ٢٢﴾..

کابرا وتی : ئیتر بەسە .. ئینجا هەستا و وشترەکەی سەربڕی و دەستی کرد بە بەخشینەوەی گۆشتەکەی بەسەر هەر کەسدا کە دەهات یان دەڕۆی، دوای ئەوە شمشێرو تیروکەوانەکەی شکاندو رۆی ..

کاتێ کە لەگەڵ (هارون الرشید) چووم بۆ حەج لەکاتی (طواف)دا گوێم لە دەنگێکی لاواز بوو بانگی کردم، ئاوڕم دایەوە، کابرای عەرەبم بینی لاواز بووە و رەنگی زەرد هەڵگەڕاوە، سڵاوی لێ کردمو داوای خوێندنی ئەو سورەتەی لێ کردم کە ئەوسا بۆم خوێندەوە ، کاتێ گەیشتمە ئایەتەکەی ئەوسا ﴿وَفِي ٱلسَّمَآءِ رِزۡقُكُمۡ وَمَا تُوعَدُونَ ٢٢﴾ .. هاواری کرد و وتی: بێگومان بەڵێنی خوای گەورەمان بەڕاستی بە چاوی خۆمان بینی، ئەی جگە لەوە فەرمایشی تر هەیە؟ منیش ئەم ئایەتەی دواترم خوێند کە دەفەرموێت :

﴿فَوَرَبِّ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ إِنَّهُۥ لَحَقّٞ مِّثۡلَ مَآ أَنَّكُمۡ تَنطِقُونَ ٢٣﴾..

کابرا هاواری کرد و وتی : یا سبحان الله ، ئەوە کێ بڕوای بە خوای گەورە نەکردووە تا ناچار بێ سوێند بخوات؟ بڕوایان پێ نەکردووە، ناچاری سوێند خواردنیان کردووە؟ سێ جار ئەمەی وتو گیانی سپارد!!

لە راستیدا ئەم بەسەرهاتە ، گەورەیی ئەو سوێندەمان بۆ دەردەخات کە خوای پەروەردگار خواردویەتی بە زاتی خۆی ، وە بە سیفەتی ئەوەی کە پەروەردگارو

خاوەنی ئاسمان و زەوی یە .. ئەمەش شکۆی ئەو شتو ئەو بابەتە دەردەخات کە سوێندی لەسەر خوراوەو خۆی حەقیقەتێکە بە بێ هیچ سوێندێك .

* * *

بەشی دوهەمی سورەتەکە چەند ئامارژەیەکی تێدایە بۆ بەسەرهاتی ( ابراهیم ، لوط ، موسی، هود ، صالح ، نوح ) (علیهم السلام ) هەموویشی پەیوەستە بە باسەکانی پێشەوە ، هەروەها بەو یاسایانەوە کە دواتر دێت ..

﴿ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْمُكْرَمِينَ (٢٤) إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَقَالُوا۟ سَلَـٰمًا قَالَ سَلَـٰمٌ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ (٢٥) فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ فَجَآءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ (٢٦) فَقَرَّبَهُۥٓ إِلَيْهِمْ قَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ (٢٧) فَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً قَالُوا۟ لَا تَخَفْ وَبَشَّرُوهُ بِغُلَـٰمٍ عَلِيمٍ (٢٨) فَأَقْبَلَتِ ٱمْرَأَتُهُۥ فِى صَرَّةٍ فَصَكَّتْ وَجْهَهَا وَقَالَتْ عَجُوزٌ عَقِيمٌ (٢٩) قَالُوا۟ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْعَلِيمُ (٣٠) قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا ٱلْمُرْسَلُونَ (٣١) قَالُوٓا۟ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمٍ مُّجْرِمِينَ (٣٢) لِنُرْسِلَ عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن طِينٍ (٣٣) مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ لِلْمُسْرِفِينَ (٣٤) فَأَخْرَجْنَا مَن كَانَ فِيهَا مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ (٣٥) فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِّنَ ٱلْمُسْلِمِينَ (٣٦) وَتَرَكْنَا فِيهَآ ءَايَةً لِّلَّذِينَ يَخَافُونَ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ (٣٧) ﴾

(٢٤) ئەی پێغەمبەر ﷺ ، مەگەر هەواڵی میوانە بەڕێزەکانی ئیبراهیمت پێ نەگەیشتووە؟!

(٢٥) کاتێك چون بۆ ماڵەکەی ، بۆ سەردانی ، چونە ژورەوەو وتیان: سڵاو ، ئەویش وەڵامی دانەوەو وتی: سڵاو لە ئێوەش ، هەرچەندە داوای لێبوردن دەکەم ، ناتانناسم؟!

(٢٦) پاشان دوای بەخێرهێنانیان مۆڵەتی وەرگرت و چوو بە هاوکاری خێزانی گوێرەکەیەکی قەڵەوی سەربڕی و بەشێکی جوانی لەگۆشتەکەی لێ سور کردەوەو هێنای بۆ میوانەکانی ..

(٢٧) لەبەر دەمیاندا دایناو لێی نزیك کردنەوەو فەرمووی لێ کردن (ئەوانیش نەیانخوارد چونکە فریشتە بوون) بۆیە پێی وتن: ئەوە نافەرمون؟ ئەوە ناخۆن؟! ئەوانیش وەڵامیان نەدایەوە!!

(٢٨) ئەوسا ئیبراهیم ترسی لێ نیشت ، ئەوانیش کە زانییان حاڵی بەشێوە ، وتیان: مەترسە، ئێمە فریشتەین ، مژدەشیان دایە کە لە ئایندەدا خوای گەورە منداڵێکی زانای پێ دەبەخشێت .

(٢٩) هاوسەرەکەی کە لە تەمەندا بوو ، گوێی لە گوفتاری فریشتەکان بوو ، هات و قریوەیەکی کردو بە ئاستەم دای بە ڕومەتی خۆیدا (وەکو ئەوەی کە ئافرەتان لە کاتی سەرسامیدا دەیکەن)و وتی: ئەی ڕۆ!! پیرەژنێکی نەزۆکی وەك من چۆن منداڵی دەبێت!!؟

(٣٠) فریشتەکان وتیان: ئەوە فەرمان و بڕیاری پەروەردگارتەو جێ بە جێ دەبێت ، چونکە بە ڕاستی ئەو زاتێکی تەواو دانایە لە بڕیارو پێشهاتەکاندا ، تەواویش زانایە بە هەمو شتێك لە بونەوەرەکەیدا .(هیچ شتێك لای ئەو زاتە ئەستەم و گران نیە کە ئەنجامی بدات بەتایبەت بۆ کەسایەتیەکی لێ بڕاو و دیندارو خواناسی وەکو ئیبراهیم) .

(٣١) ئینجا کە ئیبراهیم دڵنیا بوو ، لێی پرسین: باشە ، ئەی فریشتە بەڕێزە ڕەوانە کراوەکان جگە لەو مژدەیە هیچ کارێکی گرنگی ترتان بە دەستەوەیە؟!

(٣٢) فریشتەکان وتیان: بەڵێ: ئێمە ڕەوانە کراوین بۆ سەر قەومێکی تاوانکارو تاوانبارو بەد ڕەوشت....

(٣٣) بۆئەوەی بەڵایەکی گەورەیان بەسەر بێنین و بەرد بارانیشیان بکەین ، بە بەردی سورکراوە ، کە لە قوڕ دروستکراوە ....

(٣٤) بەردەکانیش نیشانەدارن ، یاخود ناونوس کراون بەفەرمانی پەروەردگارت ، تا بدات بە تەوقی سەری ئەو ناپوخت و بەدڕەوشت و لە سنور دەرچوانەدا...

(٣٥) ئەوسا هەرچی ئیماندار هەبوو دەرمان کردن و ڕزگارمان کردن و دورمان خستنەوە لەو بەلایەی کە بەسەر تاوانباراندا هێنرا .

(٣٦) جا سەیر لەوەدا بوو لەو شارو شارۆچکەو ناوچەیەدا جگە لە تاقە خێزانێکی ڕەوشت بەرز ، جگە لە بنەماڵەیەکی مسوڵمانی خواناس کەسی ترمان بەدی نەکرد کە پاك و خواناس بێت . (تا ڕزگاری بکەین).

(٣٧) پاشان ئەو شوێنەمان بە شێوەیەك کاول کرد کە ببێتە پەندو عیبرەت و ئامۆژگاری بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە لە سزاو تۆڵەی ئێمە دەترسن .

ئەم باسانە بەڵگە نەویستن لە مێژووی پەیامەکانی خوادا، نیشانەکانی دەستەڵاتی خوای گەورە دەنوێنن کە لە زەوی و لە خەڵك و ناخ و دڵ و دەروونیاندا بەرپای کردووە، ئەمانە جۆرە بەڵێنێکن بە پشتیوانی، جۆرێك لە ڕێزن لەلایەن خوای گەورەوە بۆ پێغەمبەران و شوێنکەوتووانیان..

سەرەتا باس لە میوانە ڕێزدارەکانی (ابراهیم) دەکات .. سێ فریشتە لە شێوەی مرۆڤدا چوون بۆ سەردانی ئەو پێغەمبەرە ڕێزدارە، بێگومان سەرجەم فریشتەکان ڕێزدارن لای خوای گەورە، (ابراهیم) وەك میوان ڕێزی لێ گرتن، هەر کە سڵاویان کرد، وەڵامی سڵاوەکەی دانەوە و بە گەرمی بەخێرهاتنی کردن بە مەرجێ نەیدەناسین، پاشان مۆڵەتی لێ خواستن و دوای ماوەیەك هاتەوە بۆلایان و لەسەر دەفرێکی گەورە گۆشتێکی سورەوەکراوی زۆری بۆ هێنان کە بەشی دەها کەسی دەکرد، چونکە گوێرەکەیەکی قەڵەوی بۆسەربڕیبوون، کاتێ کە

لەبەر دەمیانا داینا و فەرموی لێ کردن ، بینی دەستی بۆ نابەن، پێناچێ هەر هیچی لێ بخۆن!!

(ابراهیم) کە بینی لێی ناخۆن ترسا، چونکە کەسێك خۆراکی خاوەن ماڵەکەی نەخوات، دیارە نیەتی باش نیە، یاخود هەستی کرد کە هەڵسوکەوتیان نامۆیی پێوە دیارە، ئەوسا فریشتەکان حەقیقەتی خۆیان ئاشکرا کردو دڵنیایان کردو مژدەی منداڵێکی زیرەك و زانایان پێدا کە (اسحاق)ەو لە هاوسەرە نەزۆکە بەتەمەنەکەی دەبێت..

دیارە هاوسەرەکەشی گوێبیستی گفتوگۆی فریشتەکان و (ابراهیم)بووە، بە هەواڵەکە سەرسام بووە و مژدەکەی لا سەیر بووە وەکو نەریتی ژنان دەستی ماڵیوە بە ڕومەتی خۆیدا وتویەتی : پیرەژنێکی نەزۆك چۆن منداڵی دەبێ؟! .

ئیتر ئەوەی فەرامۆش کرد کە ئەوانە فریشتەن و ئەم مژدەو هەواڵە دەدەن .. بۆیە فریشتەکان وتیان: ئەمە فەرمانی پەروەردگاری تۆیە و ئەو زاتە تەواو داناو زانایە، لەڕاستیدا زۆرجار داب و نەریت و راهاتن لەسەر حاڵەتێك بۆچوون و تێگەیشتنی مرۆڤ سنوردار دەکات .. هەر بۆیە سەرسام دەبێت کاتێ کە رووداو" یان پێشهاتێکی جیاواز لەوە روودەدات!!

سەرسامە لەوەی کە چۆن روویدا؟! جاری وا هەیە نکولی دەکات و دەڵێ شتی وا نابێت!!

بیرناکەنەوە لە دەستەڵاتی رەهای خوای گەورە کە خولقێنەرو داهێنەری هۆکارەکانە، ویستی خوای گەورە پەیوەست نیە بەوەی کە بیروبۆچوونی سنورداری مرۆڤە بچوکەکان لەسەری راهاتوون، چونکە ئەو زاتە داهێنەری هەر شتێکە کە بیەوێت بەبێ هیچ بەربەست و سنورێك!!

ئینجا کە (ابراهیم) حەقیقەتی میوانەکانی ناسی (ابراهیم ـ علیه السلام) لێی پرسین: دەی کاری گرنگی تر چیتان بەدەستەوەیە؟ وتیان : ئێمە رەوانە کراوین بۆ لەناوبردنی قەومێکی تاوانبارو تاوانکار، تا بەردبارانیان بکەین بە بەردی تایبەتی نیشانەدارو دیاریکراو لەلایەن پەروەردگاری تۆوە ( ئەی محمدﷺ) بۆ لە سنور دەرچووان و ناپوختان..

چا ئەو بەردە ئامادەو دیاریکراوە لەلایەن خوای گەورەوە بۆ لەناوبردنی شەپواڵ پیسانی قەومی (لوط) کە سنوری فیترەت و حەق و دینیان بەزاندووە، دەکرێ گڕکانێك بووبێت و لەژێر شارەکەیاندا تەقیبێتەوە، چونکە ئەوەش هەر بە ویستی خوای گەورە لە کات و سات و شوێنی خۆیدا روودەدات، دەکرێت ئەو رووداوە بەسەرپەرشتی فریشتەکان ئەنجام درابێت.. لە هەمان کاتدا ئێمە حەقیقەتی فریشتەو پەیوەندیان بە گەردوون و دانیشتوانیەوە نازانین چۆنە؟!

چونکە ئێمە لە هێزە گەردوونیە جۆراوجۆرەکان شارەزاییمان نیە، تەنها ئەوەیە ناویان لێ دەنێین ..

لەبەر ئەوە رەوانیە کە بڕوامان لەق بێت بەوەی کە خوای گەورە هەندێ جار، هەندێ لە هێزو سەربازانی بەشێوەیەك لە شێوەکان دژی خەڵکانێکی بێ دین و بەرەڵاو خوانەناس بەکار بێنێ لە شوێنێك، یان ناوچەیەك لە ناوچەکانی زەوی یەکەیدا!

بە مەرجێ ئێمە زەخیرەی زانستیمان زۆر کەمە .. لەڕاستیدا چونیەکە خوای گەورە بەرد لە ئاسمانەوە ببارێنێ،یاخود گڕکانێك بەرپا بکات، هەمووی هەر دروستکراوی خوای باڵادەستەو، دروستکاری ئەوە، نهێنی یەکانیشی لای خۆیەتی هەرکات بیەوێت بەرپای دەکات و دەری دەخات!!

ئەوسا ئیتر هەرچی ئیماندار هەبوو رزگارمان کردو هەرچەندە تاکە ماڵێك‌و تاکە خانەوادەیەك بوون، کە خانەوادەی (لوط) پێغەمبەر بوو، بەبێ هاوسەرەکەی کە باوەڕی پێی نەبوو!!

ئینجا لەناوبردنی ئەو خەڵکە ناپوختەمان کردە بەڵگە بۆ ئەو کەسانەی کە لە سزای سەخت‌و بە ئێشی ئێمە دەترسن، هەرچەندە خەڵکانی بێ دین‌و مێشك پووت دڵ و دەروونیان داخراوەو بیر لە نیشانەکانی دەستەڵاتی خوای گەورە ناکەنەوە نە لە زەوی و نە لە خۆیاندا، پەندو ئامۆژگاری لە رووداوەکانی مێژووش وەرناگرن ..

* * *

بەڵگەیەکی تر لەسەر دەستەڵاتی خوای گەورە لە بەسەرهاتی موسادا روون و ئاشکرایەو لە سەروبەندی بەسەرهاتی پێغەمبەراندا (علیهم السلام ) باس دەفەرموێت :

﴿ وَفِي مُوسَىٰٓ إِذْ أَرْسَلْنَٰهُ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾ فَتَوَلَّىٰ بِرُكْنِهِۦ وَقَالَ سَٰحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ ﴿٣٩﴾ فَأَخَذْنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذْنَٰهُمْ فِى ٱلْيَمِّ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿٤٠﴾ ﴾

(٣٨) لە بەسەرهاتی موسا پێغەمبەریشدا پەندو ئامۆژگاری هەمە جۆر هەیە ، کاتێ کە ناردمانە سەر فیرعەون بە چەندەها موعجیزەوە دەسەڵاتێکی ئاشکرامان پێ بەخشی (کە نەیاندەوێرا لە ناوی بەرن ، جگە لەدارعەساکەی کە: هەموو جار دەبوبە مارێکی سامناکی گەورە ، هەروەها دەستی وەك کریستاڵ و کافوری سپی لێ دەهات هەرکات بیویستایە) .

(٣٩) کەچی فیرعەون ڕوی وەرگێڕاو خزایە قوژبنەکەی خۆی و بڕوای نەکردو وتی: ئەم فرستادەیە یان جادوگەرە ،یان شێتە !!

(٤٠) دوای ساڵەها هەوڵ و کۆشش و ماندوبون ، فیرعەونمان لەگەڵ دارو دەستەو سەربازەکانیدا گرفتاری ئاوی دەریا کردوو پێچامانەوە ، لە کاتێکدا ئەو هەتا دنیا دنیایە لۆمە کراوەو سەرزەنشت کراوە ، بێگومان لە قیامەتیشدا هەمان بەشی دەبێت ، لەگەڵ سزای توندو بە ئازار .

بێگومان ئەو دەستەڵاتە ئاشکرایەی کە خوای گەورە بەخشی بە موسا کاتێ ناردی بۆ سەر فیرعەون بریتی بوو لە بەڵگەی بەهێزو روون و ئاشکرا وە ئە و سامو هەیبەتەی کە خوای گەورە بۆی سازاندبوو ، چونکە ئەو زاتە بەردەوام رووداوەکان و هەمووشتێکی دەبیستو دەبینی، بەڵام فیرعەون خۆی ترنجانە قوژبنەکەی خۆیەوە و دوورەپەرێزیی گرتو بەو حەقیقەتە روون و ئاشکرایە رازی نەبوو، بۆیە بە موسا پێغەمبەری وت :

ئەمە" یان جادووگەرە یان شێتە!!

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە موعجیزەو سەرتاسیمە نابێتە هۆی هیدایەتی ئەو دڵانەی کە ئامادەییان تێدا نیە بۆ وەرگرتنی ئیمان، وە ئەو دەمو زمانانەش خامۆش ناکات کە سورن لەسەر ناحەقیو سەرکەشیو نالەباری و درۆو دەلەسە ..

جا قورئان لێرەدا درێژەی بەسەرهاتەکان باس نافەرموێت" بەڵکو یەکسەر کۆتایی بە هەموشت دەهێنێ و دەفەرموێت: ئێمەش خۆی و سەربازانیمان لە دەریادا خنکان لەکاتێکدا ئەو زەلامە شایستەی هەموو جۆرە لۆمەو سەرزەنشتێکە بەهۆی سەرکەشیو باوەڕنەبوونیەوە.

شـایانی باسـە دەسـتی قـودرەتی خـوایی روونو ئاشـکرایە لـە تیاچـوونو لەناوبردنی خۆیو شوێنکەوتووانیدا، کە چۆن لە دەریادا بەبێ نرخی خنکان، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر پشتیوانی خوای گەورە لە پێغەمبەرەکەی کە لە توێی ئایاتوبەڵگەکانیدا باسی دەفەرموێت کە لە زەوی و لە مرۆڤەکانو لە مێژووی پەیامەکانو پێغەمبەراندا روویان داوە.

* * *

ئینجا باسی بەڵگەیەکی تر لە دەستەڵاتی بێ سنور و رەهای خۆی دەکات لە قەومو هۆزی (عاد)دا :

﴿ وَفِي عَادٍ إِذْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الرِّيحَ الْعَقِيمَ (٤١) مَا تَذَرُ مِن شَيْءٍ أَتَتْ عَلَيْهِ إِلَّا جَعَلَتْهُ كَالرَّمِيمِ (٤٢) ﴾

(٤١) قەومی (عاد)یش کاتێك کە ڕۆچون لە گوناهو تاوان و یاخیبوندا ، کاتێك هود پێغەمبەر(علیه السلام) ساڵەها ، ئامۆژگاری کردن ، سودی نەبوو ، خوای گەورە ڕەشە بایەکی ساردو سەخت و توندی بێ خێری هەڵکردە سەریان ...

(٤٢) ئەو ڕەشە بایە ئەوەندە بەهێزو توند بوو بەسەر هەرشتێك و هەر کەسێکدا بڕۆشتایە بێ کەڵکی دەکردوو لە ناوی دەبردو وەك شتێکی فڕێ دراوی لێ دەکرد.

خوای گەورە ڕەشەباکەی بە نەزۆك و بێ خێر ناوبردووە، چونکە نە هەڵمی ئاوی هەڵگرتبوو نە هۆکاری باران بوو، وەکو بەتەمابوون، بەڵکو مردنو کاولکاری هێنا بەسەریاندا، هەرچی شتە تێکی شکاند بەسەر یەکداوشاروشارۆچکەی بەسەریاندا کاول کرد!!

بێگومان ڕەشەبا هێزێکە لە هێزەکانی ئەم گەردوونە، سەربازێکە لە سەربازانی خوای گەورە ، هەرکات بیەوێ دەینێرێت و هەڵدەکات لەچوارچێوەی ویست و ئیرادەی ئەو زاتەدا بە شێوەیەك لە شێوەکان، لەکاتی دیاریکراودا، بۆ سەر هەرگەل و هۆزو شارێکدا، جا یان وێرانی دەکات، یان ژیان و ئاوەدانی پێدەبەخشێت ..

بێگومان لێرەدا جێگەی باس و ڕەخنەی سادە نابێتەوە دەربارەی ئەوەی کە هەڵکردنی با و ڕەشەبا بە یاسای سورشتی یە ، لێرەو لەوێ هەڵدەکات بە هۆکاری تایبەت بە خۆی لە بوونی پاڵەپەستۆو نەبوونی، چونکە ئەو زاتەی ئەو هۆکارو یاسایانەی بۆ داناوە هەندێ جار دەیکاتە هۆکارێك بۆ تۆڵەسەندن، لێرەو لەوێ، لەسەر بنەمای ویست و نەخشەی خۆی ، ئەو هۆکارانەش هەر خۆی سازاندوویەتی، ئیتر جێگەی ڕەخنەو گومان و ڕای جیاواز نابێتەوە!

* * *

سێهەم بەڵگە و باسیش دەربارەی هۆزی (ثمود)ە :

﴿وَفِي ثَمُودَ إِذْ قِيلَ لَهُمْ تَمَتَّعُوا حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٤٣﴾ فَعَتَوْا عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ فَأَخَذَتْهُمُ الصَّاعِقَةُ وَهُمْ يَنظُرُونَ ﴿٤٤﴾ فَمَا اسْتَطَاعُوا مِن قِيَامٍ وَمَا كَانُوا مُنتَصِرِينَ ﴿٤٥﴾﴾

(٤٣) قەومی (ثمود)یش پێیان وترا کە ئێوە لە ژیانی دنیا بەهرە بەرن و سود مەندبن تا کاتێکی دیاریکراو ...

(٤٤) کەچی ئەوانیش لە بەرنامەو فەرمانی پەروەردگاریان یاخی بوون ، دوای چەندەها ساڵ ئەوانیش کوتوپڕ یەك بروسکەو شریخە پێچانیەوەو چاوی ئەبڵەق

کردن و مردن یەخەی پێ گرتن ، وەك کەسێك کە لە ترسێکی زۆردا چاوی زەق دەبێتەوە .. (جگە لەو بومەلەرزە بەهێزەی کە شاروشارۆچکەیانی کاول کرد).

(٤٥) ئیتر نەیانتوانی لە جێگای خۆیان ڕاست ببنەوە ، بێگومان سەرکەوتوش نەبون .

لە ئایەتەکاندا ئاماژە کراوە بەوەی کە لە نازو نیعمەتەکانی خوای گەورە بەهرەمەند بوون تا ماوەیەك.. دەکرێ ئەو ماوەیە هەموو ئەو سالانە بێ کە (صالح) پێغەمبەر لە ناویاندا بووە و بانگی کردوون بۆ بەرنامەی یەکخواناسی، یاخود ئەو سێ ڕۆژە مۆڵەتە بێت کە دوای سەربڕینی وشترەکە پێیان درا..

بە هەرحاڵ ئەوان بە دەنگێکی سامناكو بومەلەرزەیەکی بەهێز لەناوبران، دیارە کە سەربازانی خوای گەورە هەمەجۆرن ، بەردبارانی قەومی (لوط)ی کرد و ژێرەوژووری کردن، ڕەشەبایەکی بەهێزی نارد بۆسەر قەومی (عاد)، بە دەنگێکی سامناكو زەوی لەرزە قەومی (ثمود)ی لەناوبرد، گڕبارانی قەومی (شعیب)ی کرد ..

قەومی نوحیشی لەنێو زریان و تۆفاندا خنکان!!

هەر بۆیە ئاماژەیەکی خێرایان لە تاکە ئایەتێکدا پێدەکاتو دەفەرموێت :

﴿ وَقَوْمَ نُوحٍ مِّن قَبْلُ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمًا فَاسِقِينَ ﴿٤٦﴾ ﴾

(٤٦) پێشتریش قەومی (نوح) پێغەمبەر لەنێو تۆفان و زریانەکەدا لەناوبران ، ئەوانیش هەر تاوانبارو خوانەناس و لارو وێر بوون (بۆیە سەر زەویمان لێ پاك کردنەوە) .

بەسەرهاتی قەومی (نوح) لە زۆر سورەتی تری قورئاندا بە درێژی باس کراوە ..

﴿ وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾ وَالْأَرْضَ فَرَشْنَاهَا فَنِعْمَ الْمَاهِدُونَ ﴿٤٨﴾ وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٤٩﴾ فَفِرُّوا إِلَى اللَّهِ إِنِّي لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾ وَلَا تَجْعَلُوا مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ إِنِّي لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٥١﴾ ﴾

(٤٧) ئێمە ئاسمانمان بە هێزو توانای خۆمان بەدی هێناوەو بەردەوامیش فراوانی دەکەین (لەم سەردەمەدا ئەو ئاماژە قورئانیە وەك حەقیقەتێکی زانستی سەلمێنراوە) .

(٤٨) زەویشمان ڕاخستووە (بۆتان و ژیانمان لەسەری ئاسان کردووە) بەڕاستی ئەو خوایە زاتێکی کارسازو کاربەجیٚ یە (هەموو پێداویستیەکانی ئادەمیزادی زۆر بە زیادەوە لەسەر زەویدا دابین کردوەو زەوی خستۆتە خزمەتیەوە ، دەیکات بەچی دێت بە دەستیەوە)...

(٤٩) لە هەمو شتێکیش ئێمە جوتمان بەدی هێناوە (لە جیهانی ئادەمیزادو گیاندارو روەك و بیٚ گیانەکاندا لە هەموو شتێکی ماددی و مەعنەویدا) بۆ ئەوەی تێفکرن و یاداوەری وەربگرن .

(٥٠) (ئەی محمد ﷺ بلیٚ): خەڵکینە بە گشتی ، ئیمانداران ئێوە بە تایبەتی ، بە پەلەو گورج و گۆڵانە هەوڵبدەن بۆ بە دەست هێنانی ڕەزامەندی خوا ، بۆ هەرچی پەروەردگار پێی خۆش و ڕازی و خۆشنودە ، دڵنیاش بن کە من لە لایەن خواوە رەوانەکراوم و بێدارکەرەوەیەکی ئاشکرام تا لە خەوی غەفڵەت بێدارتان بکەمەوە. (تا سەرفەرزای هەردوو جیهان دەستەبەر بکەن).

(٥١) خەڵکینە ڕەوا نیە هیچ کەس و هیچ شتێك بکەنە هاوەڵ و هاوتای خوای پەروەردگارتان ، دڵنیاش بن کە من بێدارکەرەوەیەکی ئاشکرام و لە لایەن خوای گەورەوە رەوانە کراوم تا لە ڕاستیەکان ئاگادارتان بکەم .

ئەم ئایەتانە گەڕانەوەیە بۆ پێشانگای گەردوون کە لە سەرەتای سورەتەکەدا بە شێوازێك لە شێوازە جۆرا و جۆرەکانی باسی دەفەرموێت تا کاریگەریی هەبێت لەسەر دڵان،جاری وا هەیە لێرەو لەوێ درێژە بە باس کردنیان دەدات و ئەوزاتە مەبەستێتی کە هانی مرۆڤەکان بدات لە ڕێگەی پێغەمبەرەکەیەوە(ﷺ) فێرار بکەن و بە پەلە بە دڵ و ڕۆحیان ڕوو بکەنە خوای پەروەردگارو دروستکاریان، چونکە ئەو زاتە بەدەستەڵات و هێزو توانای خۆی ئاسمانی پڕ لە ئەستێرەو هەسارەو کاکێشانی بێ شومار رازاندۆتەوە، بەردەوامیش فراوانی دەکات ئەو فراوانی یەش ئاماژەیە بۆ فراوانی رزق و رۆزی لەلایەن خوای پەروەردگارەوە کە لە ئاسمانەوە بڕیاری دابەش کردنی دراوە، ئەمە ئاماژەیە بۆ سەلماندنی ئەوەی کە هەمووشت بەدەست خوای گەورەیە .. پاشان ئاماژە بە زەوی و ئامادەکردنی دەدات کە چۆن ئەو زاتە کردویەتی بە لانکەی ژیان و وەکو فەرش رایخستووە، هەموو شتێکی پێویستی بۆ ژیانی مرۆڤ تیایدا دابین کردووە، بەڕاستی زاتێکی خەمخۆرو جوانکارو ڕێخۆشکارە بۆ ژیان.. هەروەها خوای گەورە هەمووشتێکی لەسەر زەویدا، بەڵکو لە گەردووندان بە جووت دروست کردووە، دیارە کە هەمووشت لەسەر بنەمای جووت دروستکراوە، ئەوەش کە ناوی جوتەکان بە وشەی . شت . ناوزەد دەفەرموێت ئەوەش دەگەیەنێت کە جیهانی ماددەش بە شێوەیەکی گشتی جووتن، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دەستەواژەکە ئاماژەیەکە بێ گیانەکانیش وەکو گیاندارەکان لەسەر بنەمای جوت دروست کراون ..

جا کاتێ بیردەکەینەوە لەم دەقە قورئانی یەی کە پێش پتر لە چواردە سەدە هاتووەو بابەتی بوونی جوت لە هەموو شتێکدا لەو سەردەمەدا نەزانراوە باس

دەکات، کەواتە ئێمە لەبەردەم زانستێکی گەورە و فراواندایین کە لەم گەردوونەدا زانایان پێیان زانیوە!!

هەروەها بۆمان دەردەکەوێت کە لێکۆڵینەوە زانستی یە نوێیەکان بونەتە هۆکارێك بۆ ناسینی حەقیقەت، بەتایبەت کە زانراوە ئەم گەردوونە هەمووی لە ئەتۆم دروست کراوە، ئەتۆمیش بارگاوی یە بە دووجۆر تەزووی کارەبایی کە ناونراوە ساردو گەرم، ئەمەش هەندێ پەردە لادەبات لەسەر ئەو دەقە قورئانیە!!جا لە سایەی ئەم ئاماژە قورئانیانەدا گەشتمان پێدەکات بە بۆشایی ئاسمانو سەرزەوی‌و ناو زەویدا، وە بە قوڵایی ناخی مرۆڤەکاندا.. لە ئاوا کەش و هەواکەیدا بانگمان دەکاتو هانمان دەدات کە بە گورج و گۆڵی‌و بە پەلە بەرەو دەستەبەرکردنی رەزامەندی بەدیهێنەری ئاسمان و زەوی ودروستکراوان بچین، خۆمان رزگار بکەین لە هەموو ئەو شتانەی کە رۆح سەنگین دەکەن‌و لە پەل‌و پۆی دەخەن، با ئەو زاتە بە زاتێکی تاك‌و تەنهاو باڵادەست‌و دەستەڵاتداری رەها بناسین کە ئەم گەردوونەی بە تاك‌و تەنها دروست کردووەو هیچ جۆرە شەریك‌و هاوتاشی نیە ..

﴿ فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ إِنِّي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ مُّبِينٞ ۝٥٠ وَلَا تَجۡعَلُواْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ إِنِّي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ مُّبِينٞ ۝٥١ ﴾

(٥١) خەڵکینە رەوا نیە هیچ کەس و هیچ شتێك بکەنە هاوەڵ و هاوتای خوای پەروەردگارتان، دڵنیاش بن کە من بێدارکەرەوەیەکی ئاشکرام و لە لایەن خوای گەورەوە رەوانە کراوم تا لە ڕاستیەکان ئاگادارتان بکەم .

(٥٢) خەڵکانی پێش ئەمانیش ، هەر بەو شێوەیەی ئەمان ، هەڵوێستیان ناڵەبارو خراپ بووەو هەر پێغەمبەرێکمان بۆ ڕەوانە کردبن پێیان وتووە: ئەمە کابرایەکی جادو گەرە ، یان شێتە!!

لەڕاستیدا دەستەواژەی هەڵاتن و پەلەکردن دەستەواژەیەکی سەیرە ، ئەوە دەگەیەنێت کە مرۆڤ بە کۆت و ونجیرو شتی سەنگینی زۆر گیرۆدە بووە، مرۆڤی بەستووە بە زەوی یەوە، نایەڵێ دەرباز بێ، لە هەموو لایەکەوەگەمارۆی داوەو نایەوێ رەها ببێ ..

بەتایبەت خەمی رزق و رۆزی و سەرگەرمی بە هۆکارە ئاشکراکانەوە بۆ بەدەست هێنانی بەشی خۆی، هەر بۆیە خوای گەورە داوای هەڵاتن و پەلەکردن و راکردن دەکات بۆلای ئەو زاتە خۆی دەکات، داوای خۆدەرباز کردن لە کۆت و زنجیرەکان دەکات ، ئەم ئاگاداریەشی لەلایەن پێغەمبەرەوە(ﷺ) پێڕاگەیاندوون کە ئەو لەو بوارەدا بێدارکەرەوەیەوکی ئاشکرایە

*   *   *

﴿كَذَٰلِكَ مَآ أَتَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُواْ سَاحِرٌ أَوۡ مَجۡنُونٌ ﴿٥٢﴾ أَتَوَاصَوۡاْ بِهِۦۚ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٞ طَاغُونَ ﴿٥٣﴾ فَتَوَلَّ عَنۡهُمۡ فَمَآ أَنتَ بِمَلُومٖ ﴿٥٤﴾ وَذَكِّرۡ فَإِنَّ ٱلذِّكۡرَىٰ تَنفَعُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٥٥﴾﴾

(٥٢) خەڵکانی پێش ئەمانیش ، هەر بەو شێوەیەی ئەمان ، هەڵوێستیان ناڵەبارو خراپ بوەو هەر پێغەمبەرێکمان بۆ ڕەوانە کردبن پێیان وتووە: ئەمە کابرایەکی جادو گەرە ، یان شێتە!!

(٥٣) سەیرە ، دەڵێی ئەوان و ئەمان بە گوێی یەکدا خوێندویانە و ڕاسپاردەیان بۆ یەکتر دابەزاندووە ، نەخێر (ئەمانە ناخیان ناپوختە) بەڵکو هەر خۆیان قەومێکی ستەمکارن وەکو ئەوانەی پێشوو.

(٥٤) ئـەی محمـد(ﷺ) تـۆ گوێیـان مـەدەرێ ، بایـەخ بـە قسـەو قسـەڵۆك و هەڵوێستیان مەدە ، چونکە تۆ لەسەر یاخی بونی ئەوان سەر زەنشت کراوو لۆمەکراو نابیت .

(٥٥) تۆ بەردەوام ئامۆژگاریان بکە و ڕاستیەکانیان بۆ ڕون بکەرەوە ، چونکە هەمیشـە و بەڕاشـکاوی ، ئامۆژگـاری و یادخسـتنەوە سـود بـە ئیمانـداران دەگەیەنێت .[1]

دیارە ئەو خەڵکە یەك هەڵوێست و یەك سروشتی ناباش و ناقۆڵایان هەیە بەرانبەر بە پێغەمبەران، دەروون نەخۆش و گێلەکان بە یەك شێواز پێشوازی لەو کەسایەتی یە دڵسۆزو ڕێزدارانە دەکەن، ئەوانیش وەکو موشریکەکانی مەککە وتویانە جادوگەرە !! شێتە !!

دەڵێی بە درێژایی زەمان بە گوێی یەکدیدا خوێندوویانە .. تا بەردەوام دژایەتی حەق بکەن، هەر بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) رادەسپێرێ کە گوێ بە قسەو گوفتاری نالەباری ئەوانە نەدات، وە ئەو لۆمەو گلەیی لێ ناکرێت لەسەر گومڕایی و سەرگەردانیی ئەوان، ئەو کەمتەرخەمی نەکردووە لە هەوڵەکانی بۆ هیدایەتیان، کاری ئەو زاتە یادخستنەوەیە، دەبێت بەردەوام بێت لەسەری هەرچەندە

---

(١) کاتێ ئایەتی ٥٤ نازڵ بوو کە دەفەرموێت: ئەی محمد (ﷺ) تۆ پشتگوێیان بخەو وازیان لێ بێنە ، چونکە تۆ لەسەر ئەو حاڵەتە لۆمەناکرێیت و رەخنەت لێناگیرێت. هەندێ لە هاوەڵان وتیان: نازڵبوونی ئەو ئایەتە غەمباری کردین ووتمان فەرمان دراوە بە پێغەمبەر کە وازمان لێبێنێت ، ئیتر ئەوەبوو ئایەتی ٥٥ نازڵ بوو ، (وذكّر فإنّ الذكرى تنفعُ المؤمنين) ئیماندارانی خۆشنوود کرد.

دژایەتی بکرێت و باوەڕی پێ نەکرێت .. بێگومان بیرخستنەوەو یادخستنەوە سودی هەیە بۆ باوەڕداران، بەڵام بی سوودە بۆ دڵڕەش و دڵبەردەکان .
لەڕاستیدا بیرخستنەوە ئەرکی سەرشانی پێغەمبەرانە، هیدایەت و گومڕایی لە ئەرك و کاری ئەوان بەدەرە، ئەو شتانە بەدەست خوای گەورەیە ، ئەو زاتەی کە مرۆڤەکانی بۆ تاقیکردنەوە بەدی هێناوە و ـ سەرپشکی کردوون و ئازادی پێ بەخشیوون ـ

*　　*　　*

﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ مَآ أُرِيدُ مِنْهُم مِّن رِّزْقٍ وَمَآ أُرِيدُ أَن يُطْعِمُونِ ﴿٥٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ ﴿٥٨﴾ ﴾

(٥٦) لە ڕاستیدا من ئادەمیزادو جنۆکەم تەنها بۆ پەرستنی خۆم دروستکردووە (ئەگەر ئەم دوو دەستەیە خواناس بن ، هەموو چالاکیەکانی ژیانیان دەچێتە چوار چێوەی عیبادەت و خواپەرستی یەوە) ....
(٥٧) خۆ من نە ڕزق و ڕۆزیم لەوان دەوێت: نەخواردن و خواردنەوە، چونکە من پێویستم بە هیچکام لەوانە نیە ...
(٥٨) چونکە لە ڕاستیدا هەر خوای گەورە خۆی رۆزی بەخش و ڕۆزی دەرە ، گەنجینەی ڕزق و ڕۆزی فراوان و بێ سنورە ، لە هەمان کاتدا خاوەنی هێزو دەسەڵاتی بتەوو تۆکمەیە.
ئەم بەشەی کۆتایی سورەتەکە بابەتی هەڵاتن بۆلای خوای گەورەو پەلەکردن بۆ دەستەبەر کردنی ڕەزامەندیی ئەوزاتە روون دەکاتەوە، داوای خۆڕزگارکردن لە

کۆتو زنجیرەکانی دنیا دەکات، بۆ ئەوەی ئەو ئەرکەی کە بۆی دروست کراوین ئەنجامی بدەین..

لەڕاستیدا ئەو ئایەتە کورتانە ، حەقیقەتێکی زۆر گەورەو فراوانیان لەخۆ گرتووە، لە هەموو حەقیقەتەکان گەورەترەو ژیانی مرۆڤەکان لە دنیادا بەوە نەبێ راستو رێك نابێت کە دەبێ جوان تێبگەن لە مەبەستی بوونیان و دڵنیاش بن لێی، وەکو تاكو وەکو کۆمەڵیش، بەڵکو سەرجەم ژیانی مرۆڤایەتی لە هەموو سەردەمەکاندا بەستراوە بە واتاو چۆنیەتی خواپەرستی یەوە. لەڕاستیدا ئەو ئایەتە واتای زۆرو هەمە جۆر لە خۆ دەگرێت، هەموویشی لەژێر دروشمی عیبادەتو خواپەرستیدا جێگەی دەبێتەوە و دەبێتە بەردی بناغە بۆ هەموو ژیان!!

یەکەم حەقیقەت ئەوە دەگەیەنێت کە مەبەستێکی دیاریکراو هەیە لە بوونی دەستەی جنۆکەو ئادەمیزادا .. ئەوەی کە بە ئەرکی سەرشانی خۆی هەستێ، ئەوە ئیتر ئامانجی لە دروستبوونی خۆی پێکاوە!! بەڵام ئەوەی کەمتەرخەمی بکات ئەوە ئامانجی لە بوونی خۆی لێ شێواوە!! وەکو ئەوە وایە کە هیچ ئەركو کارێکی لەسەر شان نەبێت، ژیانی بی ئامانجو مەبەستە، هیچ ناوەرۆکێکی نیە ، چونکە لە بازنەی ئامانجو مەبەست لە بوونی ترازاوە، سەرگەردان و گومڕاو سەر لێ شێواوە..

چونکە هەر ئەو ئەرکە، ئەرکی خواپەرستی دەستەی جنۆکەو ئادەمیزاد دەبەستێ بە سەرچاوەی بوونیان، چونکە شتێکی حاشا هەڵنەگرە، دەبێ خودا

هەبێت و عەبدو بەندەش هەبێت، پەروەردگارێك هەبێت بەندەكەی بیپەرستێ، خوایەك هەبێت شایستەی پەرستن بێت..

ئەوسا ژیانی بەندە لەسەر ئەو بناغەیە رێكوپێك دەبێت، لێرەوە دەردەكەوێت كە عیبادەتو خواپەرستی واتایەكی فراوانتری هەیە لەوەی كە تەنها دروشمو سروتەكان ئەنجام بدرێن..

جنۆكەو ئادەمیزادیش هەموو ژیانیان بە ئەنجامدانی سروتەكان نابەنە سەر ، خوای گەورەش داوای ئەوەی لێ نەكردوون ، بەڵكو داوای ئاوەدانكردنەوەی زەوی لێ كردوون كە بەشی زۆری ژیانیان دەبات،رەنگە ئێمە نەزانین جنۆكە خەریكی چین ، بەڵام ئەو ئەركانە دەزانین كە لە مرۆڤ داواكراوە لە بواری ئاوەدانكردنەوەی زەوی و بەرپاكردنی پیشەسازی هەمەجۆرو گرنگیدان بە بواری كشتوكاڵ و گەڕان لە زەویداو سوود وەرگرتن لە سامانەكانی سەرزەوی و ناو زەوی، وە بەكارهێنانی وزە جۆراو جۆرەكان ... تا سەرەنجام ئەوەی خوای گەورە دەیەوێت لەسەر دەستی مرۆڤەكاندا ئەنجام بدرێت و ژیان بەرەو پێش بچێت، بەڵام لەژێر سایەی شەریعەتی خوادا، گەر وانەبێت مرۆڤایەتی حەساوە نابێتو هەردەم لە نەهامەتیدا ژیان دەباتە سەر.

كەواتە عیبادەتو خواپەرستی بوارێكی زۆر فراوانتری هەیە لە ئەنجامدانی سروتەكان زۆر گشتگیر ترە لە ئەنجامدانی تەنها سروتەكان، لە چوارچێوەی یاسا گەردوونی یە گشتی یەكاندا.

ئەوسا دەردەكەوێت كە مەبەست لە عیبادەتو بوونی ئادەمیزاد لەسەر زەویدا چی یە، دەریش دەكەوێت دەستەبەركردنی رەزامەندی خوای گەورە بەوە دەبێت كە هەموو كارو كردەوەو چالاكیەكان لە چوارچێوەی رەزامەندیی خوادا بێت، وە

نیشتەجیٚ کردنی مرۆڤ لە زەویدا بۆ هەموو ئەو مەبەستانەیە وە خواپەرستی لە دوو بواری سەرەکیدا خۆی دەنوێنیٚ:

یەکەم: بریتی یە لە چەسپاندنی واتای بەندایەتی بۆ خوای گەورە لە ناخ و دڵ و دەروونـدا.. بـە واتـای ئـەوەی کـە لـە هەسـت و نەسـتی مرۆڤـدا ئـەم حەقیقەتـە مەحکەم و بتەو و داڕێژراو بێت.. کە خـوا هەیـە و بەنـدەش هەیـە، خوایەك هەیە دەبێت بپەرسترێت، بەندەیەکیش هەیە دەبیٚ خواپەرست بێـت، لـەم بیروباوەڕە رەسـەنە بـەدەر شـتێکی تـر نیـە، هـەر ئـەو حاڵـەتـەش نـرخ و بایـەخی هەیـە ، ئـەم بونـەوەرە جگـە لـە خوایـەکی تـاك و تـەنها" دروسـتکارێکی تـری نیـە، جگـە لـە پەروەردگارێکی تاك خاوەنێکی نیە، هەموانیش بیانەویٚ یا نەیانەوێت بەنـدەی ئەو زاتەن .

دوهەم : هەوڵدان بۆ دەستەبەر کردنی رەزامەندی خوای گەورە لە هـەموو هەڵسو کەوت و بیرکردنەوە و هەوڵدانێکدا بە شێوازێکی دڵسۆزانە و لێبڕاوانە، تا وای لیٚ دێت لە هەموو چالاکیەکدا مەبەست دەستەبەر کردنی رەزامەنـدی خـوای گـەورە بێت..

ئـا بـەو شـێوەیە واتـای بەندایـەتی پیـادە دەکرێـت، کـارو کردەوەکانمـان وەکـو سـروتەکان دەبێتـە خواپەرستی، خواپەرسـتی و سـروتەکانیش دەبنـە پاڵنـەر بۆ ئـاوەدان کردنــەوەی زەوی، بــۆ خــەبات کــردن، بــۆ خــۆگری لــە بەرانبــەر پێشهاتەکانەوە، وە رازی بوون بە هەر پێشهات و ڕووداوێك ، بە شێوەیە هـەموو ژیان، هەموو دنیا دەبێتـە پەرستگاو ئەو مەبەستەی کە خوای گـەورە جنۆکـەو ئادەمیزادی بۆ دروست کردووە دێتە دی ، کە هەمووی بریتی یە لە ملکەچی بۆ

یاساو بەرنامە گشتی یەکان کە هەر هەمووی واتای پەرستنی خوای گەورە وێنا دەکات ..

ئەو کاتە مرۆڤ لەسەر زەویدا ژیان دەباتە سەر، هەست دەکات بە ئەنجامدانی ئەرکێك هەڵدەستێ کە لەلایەن خوای بالادەستەوە پێی سپێردراوە، لەماوەی ژیانی دنیاشیدا دەتوانێ ڕۆڵێکی ئەرێنی ببینێ و بەمەش ملکەچیی خۆی بۆ پەروەردگاری خۆی دەسەلمێنێ، هەموو ئامانجی دەبێتە فەرمانبەرداریی بۆ ئەو زاتە، هەر لە دنیادا پاداشتێکی دەست دەکەوێت بەوەی کە دڵئارامو دڵنیایەو لە بارودۆخ و کارەکانی رازی یە، هەست بەوە دەکات کە خوای گەورەش لێی رازیو خۆشنوودەو بەردەوام چاودێری دەکات و لە قیامەتداو لەو جیهاندا پاداشت و نازو نیعمەتی گەورەو ڕێزی تایبەتی لێ دەگیرێت.

ئەوکاتە ئیتر ئیماندار بە گورج و گۆڵی و بەپەلەو بە دڵ و بە گیان ڕوودەکاتە خوای گەورەو ئەوپەڕی هەوڵ و کۆشش دەدات تا خوای گەورە لە خۆی رازی بکات، هەوڵدەدات خۆی لە کۆت و زنجیرەکانی دنیا، لەکۆسپ و لەمپەرەکان ڕزگار بکات، بە دڵگەرمی هەوڵدەدات ڕەزامەندی خوای گەورە دەستەبەر بکات، وە بەندەیەکی چاك و پاك و بۆخوا صوڵحاو بێت، ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجام بدات، ئەندامێکی کاریگەر بێت و نیشتەجێیەکی سەلار و کارا بێت، لە هەمان کاتدا هەوڵدەدات دڵبەندی بە دنیاوە نەبێت و بەرهەمەکانی تەنها بۆ خۆی قۆرخ نەکات و بەشوێن ئارەزووی ناپەسەندی خۆیدا وێڵ نەبێت، هەوڵبدات بۆ چرکەساتێك پەروەردگاری ئازیزی فەرامۆش نەکات.

دەبێ ئەوە بزانێ کە نرخی کارو چالاکیەکانی بە پاڵنەرەکانیەتی لە ناخ و دڵ و دەروونیدا، نەك بە دەرەنجامەکانی، گرنگ ئەوەیە لە چوارچێوەی شەرعی خوادا بێ، چونکە پاداشت لەسەر دەرەنجام نیە، بەڵکو حساب بۆ نیەت و مەبەست دەکرێت، چونکە دەرەنجام بەدەست ئەو نیەو کاری ئەویش نیە،بەڵکو قەدەر و نەخشەی خوای گەورەیەو ئەویش لەو چوارچێوەیەدا کار دەکات..

شایانی باسە هەرکات مرۆڤ توانی لە دڵبەندیی بە دەرەنجامەکانەوە خۆی رزگار بکات و هەست بکات کە بە ئەرکی سەرشانی خۆی هەستاوە و پاداشتی لای پەروەردگار مسۆگەرە، ئەوە ئیتر براوەیەو خوایاربێ بە پاداشتی خۆی شاد دەبێ، ئەوکات ئیتر لەسەر دنیایەکی تەمەن کۆتا شەڕو کێ بەرکێ ناکات، تەماع ناکاتە ئەو شتانەی کە مافی ئەو نیە ، هەوڵدەدات کە بەندایەتی خۆی بۆ خوای گەورە بسەلمێنێ، نەك پەلاماری دنیا بدات و هەوڵبدات زۆرترین بەش بە ناحەق و ناڕەوا بۆ خۆی بپچڕێت.

لەڕاستیدا قورئان هەوڵدەدات کە ئەو هەست و نەستە لە ناخی مرۆڤی باوەڕداردا گەشە پێبدات، تا خەمی رزق و رۆزی نەخوات و خۆی لە رشدی و رەزیلی دەرباز بکات، چونکە رزق و رۆزییەکەی مسۆگەرە، خوای گەورە بڕیاری لەسەر داوە، چونکە ئەو زاتە هیچ شتێکی ناوێ بۆ خۆی، بەڵکو خۆی رزق و رۆزی بۆ مرۆڤ و سەرجەم زیندەوەران دابین دەکات هەروەکو بەڵێنی داوە..

ئەوکاتە مرۆڤ چاوچنۆك و دەست نوقاو نابێت، بەڵکو بەردەوام لە خەمی دەستەبەر کردنی رەزامەندیی خوای گەورەدا بێت، لەو پێناوەشدا ئەوپەڕی

وزەو توانای خۆی بەکار دێنێ و زۆریش ئاسوردە و دڵخۆشە بە هەوڵ و خەبات و کارەکانی..

جا ئەگەر ئەمڕۆ مرۆڤایەتی هەست بەو کامەرانیە نەکات، ئەوە هۆی ئەوەیە کە لەو کەش و هەوایەدا نەژیاوە و بۆی نەژیاوەو چێژی لێ نەبردووە، وەکو نەوەی یەکەم کە لە سایەی قورئاندا، لەسایەی ئەو بەرنامە پیرۆزو گەورەیەدا بۆی ژیا .

جا کاتێ کە مرۆڤ چاو دەبڕێتە ئەو ئاسۆیە و هەوڵ دەدات بەندایەتی خۆی بنوێنێ و بەردەوام بێ لەسەری، ئەوکاتە هەرگیز هۆکاری نزم و ناپوخت بەکارناهێنێ بۆ مەبەستێکی گەورەو پیرۆز.. با مەبەستەکەش سەرخستنی ئاینی خوای گەورەو بەرنامە پیرۆزەکەی بێت، چونکە هۆکاری ناپوخت واتاو مەبەستی خواپەرستی پاك و بێگەرد وێران دەکات .. چونکە ئیماندار هەوڵەکانی بۆ دەستەبەر کردنی مەبەست و ئاواتەکانی خۆی نیە، چونکە ئەرکەکان بەکار دێنێ بۆ بەرجەستە کردنی واتای بەندایەتی.. ئاوات و ئامانجەکان دەسپێرێ بە خوای گەورە کە ئەویش بە ویستی خۆی ئاڵوگۆڕ دەکات لە زەوی یەکەیدا و نەخشە دەکێشێ بۆ سەرخستنی ئاینەکەی..

ئەوکاتە ئیمانداری خواناس لەهەر بارو دۆخێکدا بێ" ویژدانی ئاسوودەیە، دڵ و دەروونی ئارامە، ئەگەر دەرەنجامی هەوڵەکانی ببینێ یان نا ..

ئەوەی ئەم نەخشەی بۆ کێشاوە سەری گرت، یان پێچەوانەکەی پێشهات، گرنگ ئەوەیە ئەم چی توانیوە ئەنجامی داوە، چونکە دڵنیایە ئەم بەندەی خوایەو لەو سنورە ناترازێ، چونکە چاك دەزانێ خوای پەروەردگار هەیەو بۆی نیە رەخنەو

پێشنیاری بۆ بکات، بەڵکو بە دڵ و بە کوڵ لێی دەپارێتەوە کە کارەکانی و کاری موسڵمانان تەنانەت چاوتروکانێك و لەوەش کەمتر نەداتە دەست خۆیان..

هەروەك پێغەمبەر(ﷺ) زۆرجار ئەو نزایەی فەرمووە : ( اللّهُمَّ لاَ تَكِلْنِي إِلَى نَفسِي طَرْفَةَ عَيْنٍ،أو أقَلُّ مِنْ ذَلِكَ )

لەبەر ئەوە توانیویەتی خوای گەورە لە خۆی رازی بکات و ئەویش لە خوای گەورە رازی بێت ، دواتر خوای گەورەش بەرەکەتی خستە پەیامەکەیەوە، ئەو هەموو ئەندام و لایەنگرەی لە سەر زەویدا بە درێژایی زەمان و پانتایی زەمین بۆ دروست بووو.

ئا بەو شێوەیە هەندێك لە گەورەیی ئەم پەیامە لە توێی ئایەتێکی کورتدا کە دەفەرموێت: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾ بەرجەستە دەبێت..

بەڕاستی گەر واتای عبودیەت و بەندایەتی ئا بەو شێوەیە پیادە بکرێت، ژیان لە هەموو بوارەکاندا گۆڕانی ئەرێنی زۆری بەسەردا دێت و مرۆڤایەتی لە ژیانی دنیایدا پێش هاتنی قیامەت ئاسودە دەبێت..

* * *

جا لە روانگەی ئەو راستی یە گەورە و گرنگەوە لە دوو ئایەتی کۆتاییدا ، خوای گەورە هەڕەشە لە ستەمکارو بێ دینەکان دەکات، بەتایبەت ئەوانەی کە باکیان لە هەڕەشەکانی نیە، یاخود باوەڕیان پێی نیە :

﴿ فَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا ذَنُوبًا مِّثْلَ ذَنُوبِ أَصْحَابِهِمْ فَلَا يَسْتَعْجِلُونِ ﴿٥٩﴾ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا مِن يَوْمِهِمُ الَّذِي يُوعَدُونَ ﴿٦٠﴾ ﴾

(٥٩) لـە ڕاسـتیدا بـۆ ئەوانـەی کەسـتەمیان کـردوەو سـتەم دەکـەن سـزای زۆر سەختمان ئامادە کردووە هەروەك چۆن بۆ هاوەڵ و هاوبیرەکانیان ئامادە کراوە ، دەبـا ئـیتر پەلـەم لێ نەکـەن (نـەڵێن: کـەی؟ کـوا؟ چـونکە زۆری پـێ ناچـێت داوێنگیریان دەبێت ).

(٦٠) ئەو کاتە ئیتر وا وەیلاو ئاهو ناڵە بۆ ئەو کەسانەی کە ڕێبازی کوفرو خوا نەناسیان گرتەبەر لەو ڕۆژەی کە هەڕەشەیان لێکراوەو زۆر ناخایەنێت یەخەیان پێ دەگرێت . (چونکە کاتێ قیامەت بەرپا دەبێت و وادەزانن ساتێك ، یان ڕۆژێك کەوتۆتە نێوان دنیاو قیامەت!!).

---

﴿ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا ﴿١٠﴾ ﴾

﴿ الكهف ﴾

پەروەردگارە لەلایەن خۆتەوە ڕەحمەت و میهرەبانی تایبەتمان پێ ببەخشەو لە سۆزی خۆت بەهرەوەرمان بکەو ڕێگەی ڕزگاری و سەرفرازیمان بۆ بسازێنە لەم کارەماندا .

---

# ﴿ سورەتی ( الطور ) ﴾

ئەم سورەتە کاریگەرییەکی قوڵ لەسەر دڵی مرۆڤ جێ دەهێڵێ، هەرچی گومانو دوودڵیی و وەسوەسەو شتی بێ سەروبن هەیە بە توندی راوی دەنێت، لەو شتانەی کە لەملاولاوە لە پێچو پەناکانی دەروونەوە سەرهەڵدەدەن، هەرچی بەڵگەو پاکانە هەیە کە رێگرن لە پەیرەوی حەقو دوورە پەرێزی لە ئیمان، هەمووی پوچەڵ دەکەنەوە، بەڵکو شوێنی دەکەوێتو کوڵی لێ نادات، هەتا ناچاری ملکەچ بوون و تەسلیم بوونی دەکات!!

ئایەتەکانی ئەم سورەتە لەشکرێکی پیرۆزە کە وشەو دەستەواژەکان، واتاو ئاماژەکان، وێنەو سایەکان، ئاوازو سەدای ئایەتەکان، هەروەها وەستانی نێوان ئایەتەکان؛ هەموویان هاوئاهەنگن لە سەرەتاوە تا کۆتایی،وەکو تیرو موشەکو هەورە بروسکە .. وێنەو سایەکانی دەڵێی قامچی یەو دەماڵێ بە هەستەکانداو لە سەرەتاوە تا کۆتایی هەوڵی داچڵەکاندنو بێدارکردنەوە دەدات!! سەرەتای سورەتەکە بە سوێندی خوای گەورە دەست پێدەکات بە زیندوو هۆشیارەکان. ئاماژە بەهەندێ شتی پیرۆز لە زەوییو لە ئاسماندا دەکات؛ کە هەندێکی روونو ئاشکرایە و هەندێکیشی نادیارو نەناسراوە!

سوێندەکەش دیارە بۆ شتێکی گەورە و گرنگو سامناکە، دڵ بە توندی رادەوەشێنێ، ترس لە هەستەکاندا بەرپا دەکات، بە شێوازێك کە ئاماژەیە بۆ پێشهاتی سامناك کە دڵان دەهێنێتە لەرزە، لەنێو دیمەنە تۆقێنەرەکەشدا، کارەساتی ترسناكو سامناك بەدی دەکەینو دەنگی هاوارو ئاهو ناڵە و

هەڕەشەو سەرکۆنەکردن دەبیستین .. دوای ئەو بەشە لە هەڕەشە و باسی تۆڵە سەندن لەخوانەناسان، کۆپلە ئایەتێکی تر سەر هەڵدەدات و تەماعێکی زۆر دەخاتە بەردەم ئەو دڵە زیندوانەی کە گوێبیستی ئە و هەڕەشانە بوون، لێرەدا دیمەنی خواناس و تەقواداران و ئەو نازو نیعمەتانەی کە بۆیان ئامادەکراوە باس دەفەرموێت لەگەڵ ڕێزو خۆشگوزەرانیدا بە دوور و درێژی، بە باسی وردەکاری یەکان ، شێوازو جۆرەکان، هەست و نەستەکان وا لێ دەکات کە هەست بە فێنکی و چێژی نازو نیعمەتەکان بکات، دوای ئەوەی کە باسی سزاو بەڵاو نەهامەتی یەکانی بۆ کراو دڵان هەستیان بە قامچی ئازارو سزا کرد لە چەپکە ئایەتی سەرەتادا، وە چێژیان لە باسی نازو نیعمەت برد لە کۆپلە ئایەتی دووهەمدا، چەپکی سێهەم دێت تا وەسوەسە و خەتەرەو خەیاڵە خراپەکان راوبنێ، گومان و نارەواکان پاڵ پێوە بنێ، هەرچی قسەو باس و قسەلۆکی بێ بنەمایە بە درۆی بخاتەوە، ئینجا حەقیقەت بە روونی و ئاشکراو سادەو بتەو بخاتە روو، ئەویش بە شێوازێکی قوڵ و کاریگەر کە لێکدانەوەی هەڵە ناگرێتە خۆ، ئەوەندە راست و ڕەوانە پێچ و پەنا ناگرێتە خۆ، ملی مرۆڤ ناچاری ئاوڕدانەوەو سەرنجدان دەکات، ناچاری خۆدان بە دەستەوە و تەسلیم بوون دەکات.

سەرەتا ڕێنموونی پێغەمبەر(ﷺ) دەکات کە بەردەوام بێت لە یاداوەری کردنیاندا، هەرچەندە ئەوان بێ ئەدەب و بێ وێڵ وناکاری جوانن لە بەرانبەر ئەو زاتە دڵسۆزەدا، ئەویش بەم گوفتارە جوانە کاریگەرە بەهێزو راست و ڕەوانە؛ ئاراستەیان دەکات .

جا دوای ئەم هەموو پرسیارە یەك لەدوای یەكە، دوای ئەو هەموو موشەكە بەكارە كە بەتاڵ‌و ناڕەوا هەڵدەتەكێنێ، كەسانی خۆبەزلزان‌و مێشك پوت بەگیر دەهێنێت، هەموو ئەو زمانانە لاڵ دەكات كە دژی حەقن‌و موجادەلەی ناڕەوا دەكەن .. بەشوێن ئەو یاسانەدا سەرسەختی و دژایەتیان وێنا دەكات كە چۆن دژی دیاردە هەستپێكراوەكان دەوەستن‌و باوەڕی پێناكەن ..

خۆ ئاشكرایە كە پارچە ئەستێرەیەك بەربێتەوە جیاوازە لە دیمەنی هەور، بەڵام ئەوانە بەشوێن گوماندا دەگەڕێن‌و حەق و رەوای ئاشكراو روونیان ناوێت .

ئەوسا لێرەدا كۆتا موشەكیان ئاراستە دەكات ، موشەكی پڕ لە هەڕەشە و سامناكی، لە بەرانبەر دیمەنی تسامناكدا كەشدا باسی فەرمووە.

هەروەها هەڕەشەی سزای نزیكیان لێ دەكات كە دوور نیە هەر لە دنیادا یەخەیان بگرێت..

ئینجا كۆتایی سورەتەكە بە شێوازێكی نەرم و ناسك دێت، روو بەو پێغەمبەرە رێزدارە كە دەربارەی دەڵێن :

شاعیرە و چاوەڕێین مردن یەخەی بگرێت !!.

یاخود دەڵێن كاهینە یاخود شێتە !!.

لە بەرانبەر ئەو بێ وێڵ و بێ ئەدەبانەوە خوای گەورە دڵی دەداتەوە و دڵخۆشی دەكات، رێزی دەگرێت‌و قەدر دانی لێ دەكات ، بە شێوازێك كە لە قورئاندا هاوشێوەی نیە ، روو بە هیچ پێغەمبەر و فرستادەیەكیش رەنگە خوای گەورە نەیفەرمووبێت .

بەڕاستی ئەوە کۆتاییەکە ماندوبوون و تاڵی و ئازار و ئەسرین لە دڵ و دەرونی ئەو پێغەمبەرە نازدارە دەسڕێتەوە کە بەهۆی ئەو خەڵکە مێشك پوتو ناحاڵی یەوە توشی دێت . ئەوانەی ئەوەندە ناپوخت بوون شایستەی ئەو هەموو هێرش و رەخنە توندە بوون - لەلایەن خواوەندی ئاسمانەکان و زەوی یەوە -

*　　*　　*

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ وَالطُّورِ ﴿١﴾ وَكِتَابٍ مَسْطُورٍ ﴿٢﴾ فِي رَقٍّ مَنْشُورٍ ﴿٣﴾ وَالْبَيْتِ الْمَعْمُورِ ﴿٤﴾ وَالسَّقْفِ الْمَرْفُوعِ ﴿٥﴾ وَالْبَحْرِ الْمَسْجُورِ ﴿٦﴾ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَاقِعٌ ﴿٧﴾ مَا لَهُ مِنْ دَافِعٍ ﴿٨﴾ يَوْمَ تَمُورُ السَّمَاءُ مَوْرًا ﴿٩﴾ وَتَسِيرُ الْجِبَالُ سَيْرًا ﴿١٠﴾ فَوَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ ﴿١١﴾ الَّذِينَ هُمْ فِي خَوْضٍ يَلْعَبُونَ ﴿١٢﴾ يَوْمَ يُدَعُّونَ إِلَىٰ نَارِ جَهَنَّمَ دَعًّا ﴿١٣﴾ هَٰذِهِ النَّارُ الَّتِي كُنْتُمْ بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿١٤﴾ أَفَسِحْرٌ هَٰذَا أَمْ أَنْتُمْ لَا تُبْصِرُونَ ﴿١٥﴾ اصْلَوْهَا فَاصْبِرُوا أَوْ لَا تَصْبِرُوا سَوَاءٌ عَلَيْكُمْ ۖ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾ ﴾

(١) سوێند بە کێوی - طور - ئەو چیایەی کە موسا پێغەمبەر (علیه السلام) گفتوگۆی لەسەر کرد لەگەڵ خوای گەورەدا ، پەروەردگاری مەزن خۆی پێ ناساندو کتێبی تەوراتی پێ بەخشی .

(٢) وە سوێند بە کتێبی ئاسمانی نوسراو ، کە لە لاپەڕەی نورینداا تۆمار کراوەو پاشان نازڵ کراوە بۆ هیدایەتی سەرجەم ئینسانەکان لە هەمو زەمان و سەرزەمینێکدا .

(٣) هەمویشی لەپەڕە تایبەتیەکاندا بە جوانی و ڕونی نەخشێنراوەو والآ کراوە ، لەسەرەتاوە لە (لوح المحفوظ) دا پاشان دابەزێنراوە بۆ (بیت العزة) ئینجا بۆ پێغەمبەرﷺ لەرێی ئەویشەوە) بلاوبۆتەوە بەسەر زەویدا بە تایبەت لەم سەردەمەدا .

(٤) هەروەها سوێند بە مالی ئاوەدان ، کە مەبەست ڕوگەی فریشتەکانە لە ئاسمانەکاندا (کە لە فەرمودەیەکی راست و دروستدا ئامارەی بۆ کراوە) یاخود کەعبەی پیرۆزە کە بەردەوام دەوری ئاوەدانە بەو ئیماندارانەی کە زیارەتی دەکەن بۆ حەج و عەمرە و خواپەرستی و(طواف)ی دەکەن

(٥) هەروەها سوێند بە سەقفی بلندکراوە ، کە مەبەست ئەو هەمو کاکێشان و ئەستێرەو هەسارە بێ شومارانەیە کە لە ئاسماندا لە بلندیەوە ڕاگیراون و بەردەوامیش لە چەرخ و خولدان‌و بونەتە هۆی ڕازاندنەوەی ئاسمان لە شەوگاردا ، یاخود ئەو بەرگە بایەی کە دەوری زەمینی داوەو نایەلێ تاشە بەردو تیشکە زیانبەخشەکان بدەن بەزەویدا و زیانمان پێ بگەیەنن.

(٦) سوێند بە دەریای داگیرساو ، کاتێ کە کۆتایی دنیا دێت پێکهاتەی ئاو هەلدەوەشێتەوەو دەبێتەوە بە ئۆکسجین و هایدرۆجین ، هایدرۆجین بە خێرایی دەسوتێ و ئۆکسجینیش یارمەتی سوتان دەدات ، ئەو کاتە دەریاکان دەبنە بۆمبای هایدرۆجینی و بەشداری دەکەن لە کاول کردنی زەویدا .

(٧) سوێند بەوانە هەموی ، سزاو بەلای پەروەردگاری تۆ ئەی محمد ﷺ ، ئەی ئینسان هەر پێش دێت ( دوای ماوەیەکی کورت یان درێژ).

(٨) هیچ هێزو دەسەلاتێکیش ناتوانێت بەری بگرێت و ڕێگەی لێ بگرێت .

(٩) ڕۆژێك دێت ئەستێرەو هەسارەکانی ئاسمان هەمویان لە خولگەی خۆیان دەردەچن و دەدەن بە یەکدا .

(١٠) کێوەکانیش لە شوێنی خۆیان هەڵدەکەنرێن و وەکو پەڵە هەور دەڕۆن و پاشان وردو خاش دەکرێن و دەبنە تەپ و تۆز.

(١١) ئەو ڕۆژە ئیتر هاوارو ئاهو ناڵە بۆ ئەو کەسانەی کە بڕوایان بەو ڕۆژە و ، بە پێشهاتنی ئەو ڕوداوانە نیە .

(١٢) ئەوانەی کە بەردەوامن لەسەر بەرنامەی بەتاڵ و ناحەقی خۆیان و گاڵتەیان دێت بەو هەواڵانەی کە قورئان باسیان دەفەرموێت و هەر سەرگەرمی گەمەو گاڵتەی خۆیانن.

(١٣) ڕۆژێك دێت بە پاڵی توند و بە تێهەڵدان ڕاپێچی ئاگری دۆزەخ دەکرێن و زۆر بە زەبر ڕەفتاریان لەگەڵ دەکرێت، دەنگ لەسینەیانەوە دێت و ...

(١٤) پێیان دەوترێت: ئەمە ئەو ئاگرو دۆزەخەیە کە ئێوە کاتی خۆی باوەڕتان پێی نەبوو.(ئەوسا لێیان دەپرسن):

(١٥) باشە ئەمەی کە ئێوە ئێستا گیرۆدەی بوون سیحرو جادووە ؟! یان ئێوە چەواشە بون و ڕاستیەکان نابینن؟!...

(١٦) (قوڕ بەسەرتان) دەبێ هەر ئێستە بگەنە ناوی و تێیدا ببرژێن ، جا ئیتر خۆ دەگرن یان خۆ ناگرن – ئەوە کێشەی خۆتانە- چونیەکە بۆتان ، لە ڕاستیدا ئێوە هەر پاداشتی کارو کردەوەی خۆتان وەردەگرن و تۆڵەی ئەو ڕەفتارانەتان لێ دەکرێتەوە کە جاران لەدنیادا دەتانکرد.

ئەم ئایەتە کورتانە، ئەم نێوانە سازدراوانە، ئەم سەدا جیاوازانە لە سەرەتای سورەتەکەوە دەست پێدەکات، سەرەتا بە یەك وشە، ئینجا دەبێتە دوان تا سەرەنجام دەبێتە دووانزە هێرش و هێزو سەداشی وەك خۆی پارێزراوە

طور : بە کەژێك دەووترێت کە بە دارو درەخت داپۆشرابێت .ئاماژەشە بۆ ئەو کێوەی کە قورئان لە شوێنی تردا باسی فەرمووە، کە لە بەسەرهاتی موسادا (سلاوی خوای لێ بێت ) تابلۆکانی تەورات لە لاپاڵی ئەو کێوە پیرۆزەدا دابەزیووە .

دیارە کەش‌وهەواکە، کەش‌وهەوای شتە پیرۆزەکانە کە خوای گەورە سوێندیان پێ دوخوات بۆ سەلماندنی رووداوێکی گەورە وگرنگ، کە دواتر باسی دەکەین . کتێبە نوسراوەکەش کە لە لاپەڕە کراوەکاندا نومایانە، رەنگە مەبەست تەورات بێت کە بۆ موسا رەوانە کراوەو لە تابلۆی تایبەتدا نەخشێنراوە، چونکە پەیوەندی بە کێوی (طور)ەوە هەیە، هەروەها وتراوە مەبەست لێی (لوح المحفوظ)ە کە کتێب و پەیامەکانی خوای گەورەی تیادا پارێزراوەکە لە ڕێگەی پێغەمبەرانەوە ئاراستەی مرۆڤایەتی کردووە لە سەرجەم نەوەکاندا .

چونکە پەیوەستە بە ئاستی دوای خۆیەوە کە باس لە ﴿ وَٱلۡبَيۡتِ ٱلۡمَعۡمُورِ ۝٤ ﴾ و ﴿ وَٱلسَّقۡفِ ٱلۡمَرۡفُوعِ ۝٥ ﴾ دەکات..

﴿ وَٱلۡبَيۡتِ ٱلۡمَعۡمُورِ ۝٤ ﴾ یش دەکرێت ئاماژە بێت بۆ (کعبە)، هەروەها دەکرێت مەبەست قیبلەی فریشتەکان بێت لە ئاسماندا کە پێغەمبەرﷺ لە شەوی (میعراج)دا ناوی هێناوە و دەفەرموێت : پاشان بەرز کرامەوە بۆ (بیت المعمور)،

کە هەر رۆژە حەفتا هەزار فریشتە تەوافی بە دەوردا دەکاتو، بەشێك لە خواپەرستی خۆیان ئەنجام دەدەن، هەروەکو چۆن باوەڕداران لە سەر زەویدا (طواف)ی (بیت) دەکەن لە (المسجد الحرام) دا هەروەها نوێژو خواپەرستی دەکەنو روگەی بەردەوامیانە لە نوێژەکانیاندا.

﴿ وَٱلسَّقۡفِ ٱلۡمَرۡفُوعِ ۝٥ ﴾یش مەبەست ئاسمانە کە خوای گەورە لەنگەری ئەستێرەکان وزەویشی لە نێویدا ڕاگرتووە، هەروەکو فەرمویەتی : ﴿ وَجَعَلۡنَا ٱلسَّمَآءَ سَقۡفٗا مَّحۡفُوظٗاۖ وَهُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِهَا مُعۡرِضُونَ ۝٣٢ ﴾ الانبياء

﴿ وَٱلۡبَحۡرِ ٱلۡمَسۡجُورِ ۝٦ ﴾ دەکرێ مەبەست لێی دەریای پڕ لە ئاو بێت کە لەگەڵ باسی دیمەنی ئاسمانەکاندا گونجاوە کە فراوانی و پڕی و گوشادی تێدا نومایانە و بەڵگەیە لەسەر قودرەتی پەروەردگاری مەزنو شایانی باسکردنە، هەروەها دەکرێ مەبەست داگیرساندن بێت ، هەروەکو لە سورەتی (التکویر)دا فەرمویەتی: ﴿ وَإِذَا ٱلۡبِحَارُ سُجِّرَتۡ ۝٦ ﴾التکویر، واتە: کاتێ کە دەریاکان دادەگیرسێنو دەبنە ئاگرێکی زۆر گەورە و زەبەلاح، یاخود دەکرێ شتێکی تر بێت کە هەر زاتی پەروەردگار خۆی بیزانێت!!

خوای گەورە سوێند بە هەموو ئەو شتە گەورە و مەزنانە دەخوات ، دوای ئامادەکردنی بیرو هۆش تا باوەڕ بکەن کە : سزای پەروەردگاری تۆ ئەی محمد(ﷺ) ، ئەی ئیماندار هەر دێتە دی دژی کافران، وە هیچ هێزو هیچ کەسیش ناتوانێ بەری لێ بگرێت.

بێگومان وشە قورئانیەکان ئەو مەبەستە بە شێوازێکی توندو یەکلاکەرەوە دەگەیەنن، هەست دەبزوێنن، خەڵکانی خوانەناس هیچ بەناو شوێنێك شك نابەن کە پەنای بۆ ببەن، کاتێ کە بەو شێوەیە وشەو کلماتی قورئان دەدرێت بە گوێی مرۆڤدا ـ گەر ئەو کەسە خاوەن هەست بێت ـ هەر بۆیە شەوێك (عمر)ی کوڕی (خطاب) ( ﷺ ) کاتێ دەگەڕا بەناو شاری مەدینەدا گوێ‌بیستی ئەو ئایەتانە بوو لە موسڵمانێکەوە لە شەو نوێژەکەیدا دەیخوێند.. نەیتوانی بە پێوە بوەستێ لە گوێ درێژەکەی دابەزی و پاڵیدا بە دیوارێکەوە و وتی: سوێندێکە بە پەروەردگاری (کعبە) ئەو هەڕەشە یەڕاستە و دێتە دی، ماوەیەك وەستاو دوایی گەڕایەوە بۆ ماڵەوە یەك مانگ نەخۆش کەوت ، خەڵکی سەردانیان دەکرد و نەیاندەزانی نەخۆشییەکەی چی یە!!..

خۆ (عمر ﷺ) پێشتریش گوێ بیستی ئەم سورەتە بووە ودەوری کردۆتەوەو لە نوێژدا خوێندویەتی ، جاری واش هەبووە پێغەمبەر(ﷺ) لە نوێژدا دەیخوێند، (عمر)یش ئەوەی دەزانی و وەکو ئەو زاتەی دەکرد بەڵام لەو شەوەدا بە تەواوەتی دڵی بۆ کردبۆوە، هەموو هەست و نەستی خۆی بۆ واڵاکردبوو ، ئەویش خۆی کرد بە کرۆکی دڵیداو ئەو کاریگەرییەی لەسەر کرد کە کردی، بە تایبەت کە بە سەنگینی و توندی و حەقیقەتی یەکسەری و پەیوەست بەو زاتەی کە فەرمویەتی ، پەیوەست بە سەرچاوەی یەکەم کە دڵی پێغەمبەریش(ﷺ) وەریگرتووە و بەرگەی گرتووە، چونکە دڵی ئەو زاتە ئامادەکراوە بۆ وەرگرتنی، بەڵام جگە لەو رەنگە حاڵەتێکیان بۆ پێش بێت وەکو ئەوەی بۆ (عمر ﷺ) پێشهات کاتێ بە تەوژم وحەقیقی خۆی دەکات بە کرۆکی دڵەکاندا!!

جا بەشوێن باسی قیامەت بەو شێوازە دیمەنێکی ترسناکی تر باس دەفەرموێت کە ئەویش دیمەنی تێکچوونی ئاسمانی پڕ لە ئەستێرەو هەسارەیە کاتێ کە ژێرەو ژور دەبێت وەکو شەپۆلی دەریا لێرەوە بۆ ئەوێ و بە بەردەوامی، هەروەها کەژو کێوە دامەزراوە سەختەکان کاتێ کە سوك‌وسۆڵ دەبن‌و ڕەشەبای بەهێز ئەملاولایان پێدەکات، ڕووداوێکی سامناك‌و سەرسوڕهێنەرە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کارەساتی گەورە ڕوویداوەو بەڵایەکی گەورە بەسەر ئاسمان‌و کێوەکاندا هاتووە، جا ئیتر دەبێ حاڵی ئەم مرۆڤە بچوکە (گزگل)و لاوازە چۆن بێت لە بەرانبەر ئەم ڕووداوە سامناك‌و ترسناك‌و مەترسیدارانەدا؟!

جا لەنێو ئەو جەنجاڵە سامناکەدا کە هیچ شتێك لەجێی خۆی نامێنێ، لەنێو ئەو کەشە سامناکە تەکاندەرەی کە هەموو شتێك هەڵدەتەکێنێ هێرش دەکاتە سەر بێباوەڕان‌و بە شێوازێکی توندو سامناك ، هەڕەشەی توندیان لێ دەکرێت لەلایەن ئەو زاتەی کە باڵادەستەو تۆڵە سێنەری بە زەبرە، ئەو هەڕەشەیە بڕیاری لەسەر دراوەو ئەنجامدانیشی مسۆگەرە، هیچ هێزێك ناتوانێ لە بەرانبەریدا بوەستێ .

ئەو ڕۆژەی کە لەنگەری هەسارەو ئەستێرەکانی ئاسمان تێك دەچێت‌و کێوەکان لە شوێنی خۆیان هەڵدەتەکێن‌و بەملاولادا دەبڕێن، ئەوە سامناکییەکی بێ‌هاوتایە لەگەڵ ئەو هەڕەشەیەدا، هەموویشی دەڕوخێ بەسەر بێباوەڕاندا، ئەوانەی کاتی خۆی لە دنیادا سەرگەرمی کاری پڕو پوچ و یاری‌و گەمەبوون!!

بێگومان ئەو تۆڵەیە پڕاوپڕی بیروباوەڕی پوچ‌و بیروبۆچوونی سەقەت‌و هەڵسوکەوتی موشریك‌و هاوەڵگەرانی سەرگەردانە. لە ڕاستیدا ئەو ژیانەی کە ئەو بیروباوەڕ پوچ‌و ئەو بۆچونە سەقەتانە ئاراستەی دەکات، هەمووی ستەم‌و

گەمەو گاڵتەیە، دوورە لە شتی گرنگ و بایەخدار، هەروەکو مەلەوانێك کە بەبێ مەبەست مەلە بکات و لە بیری گەیشتن بە رۆخی دەریادا نەبێت!!

جا ئەم وەسفە هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە دوورن لە ئیسلام، ئەم راستی یەش کەس دەرکی ناکات مەگەر ئەوانەی کە بەراوردو دیراسەی بیرو بۆچوون و فەلسەفەو داستان و بیروباوەڕی کۆمەڵانی خەڵکی سەر زەوی دەکەن، وە بەراوردی دەکەن لەگەڵ بیروبۆچوونی پاك و بێگەردی ئیسلامدا دەربارەی بوونەوەرو بوونی ئادەمیزاد ـ کە وەك میوانێك وایە لەم گەردوونەدا ـ

لەڕاستیدا بیروبۆچوونی ئەو فەیلەسوف و تیتۆڵبازانەی کە مێژووی مرۆڤایەتی شانازیان پێوە دەکات هەروەکو هەوڵ و کۆششی مندالان وایە کە هەوڵبدەن لە ڕاستی یەکان تێبگەن!!

وەکو شیکردنەوەی هاوکێشەیەکی ماتماتیکی ئاڵۆز وایە لەلایەن منداڵێکەوە کە تازە ژمارەکان دەناسێ!!

ئەو راستی یەی کە لە بیروبۆچوونی ئیسلامیدا روونکراوەتەوە، بەتایبەت لە قورئاندا بە شێوازێکی هێمن و روون و بەهێزو سادەو قوڵ، لەگەڵ فیترەتدا پێك دێتەوەبێ مانوبوون و زەحمەت و ئاڵۆزی. چونکە حەقیقەتی رەسەن و قوڵی خۆی بیردەخاتەوە، تەفسیری بونەوەرو پەیوەندی یەکانی بۆ روون دەکاتەوە، هەروەها پەیوەندی گەردوون و بونەوەر بە بەدیهێنەریەوە بە شێوازێك کە گونجاوو دامەزراو بێت لەگەڵیدا، بەدوور لەو هەوڵە بێ سەرو بن و ناتەواوانەی کە ئەستەمە تەواو و دروست بێت!

لەڕاستیدا هەموو شتەکان لە هەستی مرۆڤدا، لە بیروبۆچوونیدا ناڕێك و ناتەواوە، ڕەنگە بیروبۆچوونە چەوتەکان کاریگەرییان لەسەر هەبێت، یاخود هەوڵە مرۆییەکان، بەڵام کاتێ کە گوێ بیستی قورئان دەبێت لە هەر بابەتێکدا کە مەراقیەتی و حەز دەکات تێیبگات، هەست دەکات نورێکی لەسەرخۆ، پێوەرێکی دامەزراو هەیە کە هەموو شت لەجێی خۆیدا دادەنێت، هەموو بابەتێك نرخی خۆی دەداتێ، هەموو ڕاستیەکان بە هێوری ودامەزراوی خۆیان نومایان دەکەن و بەدوورن لە شڵەژاوی و لاریبوونەوە، ئەوسا هەست دەکات کە دڵ و دەروونی ئاسودەیە، ناخی هێورە، عەقڵ و هزری دڵنیا بووە لەو حەق و حەقیقەتەی کە روونە، ئیتر لێڵی و دوودڵی نەماوە و هەموو شت دامەزراوە لەجێی خۆیدا.

هەروەها زوربەی خەڵکی دەڵێی خەریکی یاری و گەمەن لە بەرانبەر گرنگیدانیان تەنها بەژیانی دنیا، کەچی زۆر کەم گرنگی دەدەن بە داخوازیەکانی دڵ و دەروون، بە خۆخەریك کردن بە لێکدانەوە و لێکۆڵینەوە و بیرکردنەوە کە ئیسلام زۆر گرنگیان پێدەدات.

جا ئیمانداری دامەزراو کاتێ کە سەیری ئەو خەڵکە دەکات کە چۆن خۆیان سەرگەرم کردووە بە شتی بچوك و بێ نرخەوە، گرنگی پێدەدەن، رۆچوون تیایدا، دەڵێی باسی رووداوە گەردوونیەکان دەکەن!

ئەمیش تەماشایان دەکات، وەکو منداڵانی بچوك دێنە بەرچاوی کە گرنگی دەدەن بە شیرینی و کێکەکان، بە بوکە شوشە مردووەکان، وادەزانن ئەوانیش کەسانی زیندوون، دەبینی کات بەسەر دەبەن لەگەڵیان بە گفتوگۆ و سروود وتن، دەمێ یاریان لەگەڵ دەکەن، دەمێکیش یارییان پێدەکەن!!

لەڕاستیدا ئاینی پیرۆزی ئیسلام وا لە مرۆڤ دەکات کە گرنگی بدات بەو ئاوات و شتانەی کە شایستەن گرنگیان پێبدرێت، هەربۆیە بۆچوونیان دەربارەی خۆیان و بونەوەر بەرەو ئاستێکی بالا دەبات، وە هۆکاری بوون و چۆنیەتی و چارەنووسیان بۆ روون دەکاتەوە، وەلامی روون و راست و دروستیشی هەیە بۆ هەموو ئەو پرسیارانەی کە لە ناخی هەموو کەسدایە ! سەرەتای بوونی مرۆڤ لە کوێوە سەرچاوەی گرتووە؟ من بۆچی پەیدابووم؟ سەرەنجام بەرەو کوی دەبێ بچم؟

جا ئەو وەلامانەی کە لە ئاینی ئیسلامدا هەیە بۆ ئەو پرسیارانە بۆچوونێکی دروست دەبەخشێت بۆ پەیدابوونی مرۆڤ بەتایبەتی و بونەوەرو گەردوون بە گشتی، چونکە مرۆڤ شتێکی شاز نیە لەنێو دروستکراواندا، بەڵکو ئەو یەکێکە لەوان، ئەو زاتەی کە بونەوەری سازاندووە ئەمیشی دروست کردووە، وەلامدانەوەی ئەوپرسیارانەش بە تەواوی روونی دەکاتەوە کە ئەم بونەوەرە بۆچی پەیدا بووە، پەیوەندییەکانی بە مرۆڤەوە، پەیوەندی هەمووان بە بەدیهێنەری هەموانەوە لەسەر چ بنەمایەکە!!

جا ئەم تەفسیرکردن و روونکردنەوانە کاریگەری تەواویان هەیە لەسەر ئەو شتانەی کە مرۆڤ لە ژیاندا گرنگییان پێدەدات، ئاستی کەسایەتی پێ بەرزو بالا دەبێت.. ئەوسا لە بەرانبەردا گرنگی خەڵکانی تری دوور لە ئاینی ئیسلام بچوك و لاواز دەردەکەون، چونکە ئەم دەیەوێت وجود و بوونی گرنگی خۆی لەم گەردوونەدا بسەلمێنێ و زاڵ بێ بەسەر شتە بچوك و داخوازی یە بچوك و لاوازو بێ نرخەکاندا کە یاریکەر و یاریچیەکان پێوەی سەرگەرمن .

لەڕاستیدا ژیانی کەسی باوەڕدار ژیانێکی گەورەو مەزنە، چونکە پەیوەستە بە ئەرکێکی گەورە و گرنگەوە، پەیوەندی بەم بونەوەرە گەورە و فراوانەوە هەیە، کاریگەریشی لەسەر ئەم بونەوەرە فراوانەوە هەیە، ئەم ژیانە زۆر بەنرختر و بەهادار ترە لەوەی کە بە گەمە و گاڵتە و یاریو وازی و شتی بێ بەها و بێ نرخەوە خۆی سەرگەرم بکات ..

بەڵام مەخابن زۆربەی ئەو شتانەی کە خەڵکی گرنگی پێدەدەن لە چوارچێوەی شتی بێ هودەو گەمەو یاریو گاڵتەو گەپ دەرناچێ بە تایبەت کاتێ کە بەراورد دەکرێت لەگەڵ ئەو شتانەدا کە باوەڕدار گرنگی پێدەدات، کە هەڵقوڵاوی بیرو بۆچوونیەتی دەربارەی ئەو ئەرکو داوایانەی کە لەسەریەتی و پەیوەستی دەکات بە حەقیقەتی بوونیەوە .

جا قوڕ بەسەر ئەو دەم بەتاڵ و بوختانچیانەی لەو ڕۆژەدا کە بە پاڵەپەستۆو تێهەڵدان راپێچی دۆزەخ دەکرێن بە شێوازێکی توندو بێ بەزەییانە، وشەی (دع) بە واتای پاڵنانە بە پشتەوە، حاڵەتێکی توندەو شایستەی خەڵکی غافڵ و دەم بەتاڵ و ئەوانەیە کە دنیا هەر بە گەمەو گاڵتە دەبەنە سەر، داناچڵەکێن، بێدار نابنەوە، سەرنج نادەن، تێنافکرن، هەر بۆیە وەکو ئاژەڵ لە پشتەوە بە توندی پاڵیان پێوە دەنرێت هەتا دەگەیەنرێنە لێواری دۆزەخ ئەوسا سەرزەنشتیان دەکرێتو پێیان دەوترێت: ئا ئەمە ئەو ئاگرو دۆزەخەیە کە ئێوە باوەڕتان پێی نەبوو!! جا لە کاتێکدا ئەوان لەو تەنگانەو ناسۆرەدا گیریان خواردووە، بە توندی پاڵیان پێوە دەنرێ بۆ نێو ئاگری دۆزەخ، سەرزەنشت دەکرێنو سەرکۆنە دەکرێن، بەهۆی ئەوەی کە کاتی خۆی باوەڕیان بەم پێشهاتو راستیانە نەبووە

کە خوای گەورە لە قورئانەکەیدا باسی فەرمووە، بۆیە پێیان دەوترێت : ئا ئێستە باش سەرنج بدەن و ورد ببنەوە : ئا ئەمە حەقیقەتە یان ئێوە چاوتان نابینێ؟ چونکە ئەوان کاتی خۆی قورئانیان بە سیحرو جادوو ناودەبرد، باشە، داخۆ ئەم دۆزەخەی کە دەیبینن و دەخرێنە ناوی، ئەمەش سیحرو جادووە؟ یاخود ئەمە حەقیقەتێکی زۆر گەورە و مەزن و ترسناک و سامناکە؟! یاخود کوێراییان داهاتووە، هەروەکو چۆن کاتی خۆی بەرانبەر قورئان کوێراییان داهاتبوو - لەڕاستیدا شێوازی ئایەتەکانی قورئان جێگەی سەرنج و تێڕامانە ، کاتێ کە ئەو خەڵکە بێباوەڕە دەگوێزرێنەوە بۆ بازاڕی قیامەت و بەو شێوەیە سەرکۆنە دەکرێن، ئایەتەکان حەقیقەتێك وێنا دەکات بۆ ئەوەی تا ئاوا گیرۆدە نەبوون فریای خۆیان بکەون -

پاشان دوای ئەو سەرکۆنەو گاڵتەجاڕی یە توشی نائومێدی و بێ هیواییان دەکات و دەفەرموێت: ئا ئەمە ئیتر دۆزەخە و دەبێ بچنە ناوی و تیایدا ببرژێن ..

جا ئەوەی توشی بەڵاو نەگبەتی ئاوەها دەبێت، ئەوەندەی تر ئازارو مەینەتیەکانی زۆر دەبی بەوەی کە پێی دەترێت، ئەمە ئیتر بەشی تۆیە، خۆگر دەبیت، یان خۆگر نابیت، هیچ چارەیەکت نیە، تازە دەبێ لە سوتان و ئازارو ئەشکەنجەدا ژیانی بەردەوام بەسەر بەریت، دان بە خۆتا دەگریت ، یان قوڕدەپێویت و هاوار دەکەیت، چونیەکە، چونکە مانەوەت بڕیاری لەسەر دراوە ـ کاتی خۆیشی باسی ئەم دەرەنجامەت بۆ کرابوو، بەڵام گاڵتەت پێی دەهات، بە ئەستەمت دەزانی، ئەمە ئیتر پاداشتی کارو کردەوەکانی خۆتە، چونکە کاتی خۆی؛ خۆت هۆکار بویت بۆ ئەم حاڵەتەی کە گۆڕان و سوك کردنی بەسەردا نایەت ..

ئا بەو شێوەیە ئەو دیمەنە سامناکە کۆتایی دێت و بەشی یەکەمی سورەتەکە بە پایان دەگات !!

*　　*　　*

ئینجا بەشی دوهەمی سورەتەکە دەست پێدەکات، بێگومان کاریگەری لەسەر هەست و نەستەکان هەیەو دەیان وروژێنێ و، بەتایبەتی کاتێ باسی خۆشی و شادی و نازو نیعمەتەکان دەکات، کە ئەمە بانگەشەیەکە حەق نیە کەس لە بەرانبەریدا کەمتەرخەم بێت، بەتایبەت کە لە دوای باسی دیمەنی سزاو ئەشکەنجەی پڕ لە نائومێدی و بێ هیوایی دێت :

﴿إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٍ وَنَعِيمٍ ﴿١٧﴾ فَٰكِهِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ وَوَقَىٰهُمْ رَبُّهُمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٨﴾ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔۢا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ سُرُرٍ مَّصْفُوفَةٍ وَزَوَّجْنَٰهُم بِحُورٍ عِينٍ ﴿٢٠﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَمَآ أَلَتْنَٰهُم مِّنْ عَمَلِهِم مِّن شَىْءٍ كُلُّ ٱمْرِئٍۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ ﴿٢١﴾ وَأَمْدَدْنَٰهُم بِفَٰكِهَةٍ وَلَحْمٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٢٢﴾ يَتَنَٰزَعُونَ فِيهَا كَأْسًا لَّا لَغْوٌ فِيهَا وَلَا تَأْثِيمٌ ﴿٢٣﴾ ۞ وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ غِلْمَانٌ لَّهُمْ كَأَنَّهُمْ لُؤْلُؤٌ مَّكْنُونٌ ﴿٢٤﴾ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٢٥﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّا كُنَّا قَبْلُ فِىٓ أَهْلِنَا مُشْفِقِينَ ﴿٢٦﴾ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا وَوَقَىٰنَا عَذَابَ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلُ نَدْعُوهُ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْبَرُّ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٨﴾﴾

(١٧) لەو لاشەوە تەقواداران و دینداران و خواناسان لە نێو باخەکانی بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەتدا ژیانی پڕ لە شادی و کامەرانی و بەختیاری دەبەنە سەر ...

(١٨) ئەو بەختەوەرانە زۆر دڵخۆش و شادمان و کەیف خۆشن بەو ناز و نیعمەتانەی کە پەروەردگاریان پێی بەخشیون ـ لە کۆشک و تەلار، لە خواردن و

خواردنـەوەی هەمـەجۆر، لـە نـازو نیعمـەتی کـەس نـەدیو، لـە ...... لـە ......
هەروەها پەروەردگاری ئازیزیان پاراستونی لە سزاو ئازاری ئاگری دۆزەخ .
(١٩) بـەردەوام پێیـان دەوترێـت: بخـۆن و بخۆنـەوە نۆشـی گیانتـان بێـت لـە پاداشتی ئەو کارو کردەوە چاکانەی کە جاران لەدنیادا ئەنجامتان دەدا .
(٢٠) جـا لـە نێـو ئـەو بەهەشـتە و لـە شـوێنە بـەرزو خـۆش و رازاوەکانیـدا بەختـەوەران بـە کـەمالی ئیسـراحەت شـانیان داداوە لەسـەر کورسـی و قەنەفـە رازاوەکان ، ژیانی پڕ لە شادی بەسەر دەبەن لەگەڵ ئەو حۆرییە چاو گەشانەدا کە کردومانن بە هاوسەریان .
(٢١) جا ئەوانەی کە ئیمان و باوەڕیان هێناوە و نەوەکانیشیان لەدنیادا بە ئیمان و باوەڕی دامەزراوەوە شوێنیان کەوتن، ئێمە نەوەکان دەگەیەنین بە باوانیان و بەیـەکتر شـادیان دەکـەین ، جـا وە نـەبێت لـە پاداشـتی کـارو کـردەوەی هـیچ لایەکیان کەم بکەینەوە ـ بەڵکو پلە نزمەکان بۆ لای پلە بەرزەکان بڵند دەکەینەوە ، هەرچەندە هەر کەس بارمتەی کارو کردەوەی خۆیەتی...
(٢٢) جا لە بەهەشتدا بەردەوام بەهرەمەندیان دەکەین لە سفرەو خوانی رازاوە بە میوەی جوان و بە تـام و هەمـە جـۆر لەگـەڵ گۆشـتی ناسکی تایبـەتا کـە ئامـادە کراوە بە دەها شێوازی بەتام و بەلەزەت لەو شێوازەی کە ئەوان حـەزی لێ دەکـەن . (٢٣) جار جار بەهەشتیان بۆ خۆشی زیاتر لە ئاهەنگە تایبەتیەکاندا کاسی پڕ لـە شـەرابی تایبـەت لەیـەکتر دەستێنن بـە دوور لـە ڕەفتـاری نابـەجێ و لـە بێـزار کردنی یەکترو لە قسەو هەڵس و کەوتی هەڵیت و پەڵیت .

(٢٤) هەروەها منداڵانی ناسك و جوان و نازداری تایبەت خۆیان ، سەردانیان دەکەن و دەست لە ملیان دەکەن وگوفتاری جوان و سرودی بەتام دەچڕێنن ، ئەوەندە قەشەنگن دەڵێی مرواری ناو سەدەفی کەس نەدیون.

(٢٥) جا بەشێك لەو ئاهەنگە خۆشە بەوە دەبەنە سەر کە سەردانی یەکتر دەکەن و هەندێکیان دەچنە لای هەندێکیان و باسی ژیانی دنیا دەگێڕنەوەو وێنەی رەفتارە جوانەکانیان نیشانی یەکتر دەدەن .

(٢٦) پاشان دەڵێن: لە ڕاستیدا سوپاس بۆ خوا کارێکی چاکمان کرد بەوەی کە کاتی خۆی لە دنیادا لە ناو کەس و کاردا بەسۆزو میهرەبان بوین ، هەروەها حسابمان بۆ زاتی خواو قیامەت دەکرد .

(٢٧) ئێستە ئەوەتە خوای گەورە بەخێری گێڕاو لای رەحمەتی لێ کردینەوە و لە فەزڵی خۆی بەهرەمەندی کردین و لە سزای دۆزەخی ژاراوی پڕ ئازار ئێمەی پاراست.

(٢٨) لە ڕاستیدا ئێمە کاتی خۆی بە دڵ و بەکوڵ لێی دەپاڕاینەوە ، ئەویش نائومێدی نەکردین ، بەڕاستی ئەو خوایە زاتێکی خاوەن چاکەی بێ سنور و سۆزو میهری فراوانە.

*　　*　　*

لە ڕاستیدا دیمەن و باسەکان زیاتر لەو نازو نیعمەتانە دەدوێت کە بە هەستەکان هەستی پێدەکرێت، لە سەرەتاوە هەستەکان دەدوێنێت، دڵ و دەروون و ناخ رادەکێشێت بۆ چێژوەرگرتن لە نازو نیعمەتە ماددیەکان لەوپەڕی پاکی و

جوانی و بێگەردیدا، لە بەرانبەر ئەو سزا سەختانەی کە خاوەن دڵە رەش و دنیا پەرستەکان باسیان کراو گیرۆدەی بوون ..

چونکە هەر دوورەپەرێزی لە سزای دۆزەخ کە پێشتر باس کرا فەزڵ و نیعمەتێکی زۆر بەنرخە، لە کاتێکدا کە جگە لەوە بەهەشت و باخە رازاوە پڕ لە نازو نیعمەتەکانیشی لەگەڵ بێت؟ بەختەوەران لەوپەڕی شادی و کامەرانیدان بەو بەخششە بێ سنورانەی کە پەروەردگاریان پێیبەخشیون؟

پیرۆزباییان لێ دەکرێت و بەوپەڕی ڕێزەوە پێیان دەوترێت بخۆن و بخۆنەوە، نۆشی گیانتان بێت ئەمە پاداشتی ئەو کارو کردەوانەتانە کە جاران لە دنیادا ئەنجامتان دەدا، بێگومان ئەو رێزگرتنەش خۆی لە خۆیدا نازو نیعمەتێکی زۆر بەنرخە، بەتایبەت کاتێ لەلایەن مەقامێکی بڵندەوە لەلایەن زاتی پەروەردگارەوە ئەو گوتارەیان ئاراستە دەکرێت..

ئینجا باسی کۆڕو کۆبوونەوەکانیان و شێوازی دانیشتنیان دەکات لەسەر کورسی و قەنەفە رازاوەکان کە بەوپەڕی رێکوپێکی دانراون بۆ ئەوەی باوەڕداران ناو بەناو بە دیداری برا هاوزەمانەکانیان، یان برایانی رابوردویان لە هەمان کاتدا شادبن.

هاوسەرانیش لە حۆری چاوگەش لەلایەن خوای گەورە کراون بە هاودەم و هاوەڵیان بە هاوسەر و حەڵاڵیان، لەوپەڕی جوانی و شەنگ و شۆخیدان و چاو بۆ غەیری هاوسەرانیان هەڵنابڕن، ئەمەش بەنرخترین نیعمەتە کە مرۆڤ بیری لێ دەکاتەوە.

پاشان ڕێزو قەدردانی هەنگاوێکی تریش دەچێتە پێش، ئەویش بەوەی کە نەوەی ئیمانداران بەشدارن لەو نازو نیعمەتانەداو لەو کۆڕو ئاهەنگانەدا، ئەویش دەبێتە نیشانەیەکی تری گرنگیدان و قەدردانی، گەرچی کردەوەکانیشیان نەگاتە ئاستی کارو کردەوەی باوانی پارێزکاریان یان نەوە خواناسەکانیان ، بەڵام چونکە باوەڕدارن، ئەوە پلەو پایەی نەوەکان، یان باوان دانابەزێنرێت، بەڵکو پلەو پایەی ئەمان بەرز دەکرێتەوە، لە هەمان کاتدا خوای گەورە حساب بۆ کاروکردەوەی هەر تاکێکیش دەکات، بەڵام فەزڵی ئەو زاتە هەمووان دەگرێتەوە..

پاشان باسی نازو نیعمەتەکان بەردەوامەو بەختەوەران چێژ لە خواردنی جۆرەهامیوەی جوانی تام خۆش و بۆن خۆش و دیمەن جوان دەبەن، هەروەها لەسەر سینی و دەفرە رازاوە زێڕ و زیوەکان جوانترین شێوازی گۆشتی ئامادەکراویان پێشکەش دەکرێت کە زۆر حەزی لێ دەکەن و بە ئیشتیهاوە نۆشی دەکەن، ئینجا جۆرە شەرابێکیان پێشکەش دەکرێت کە وەکو عەرەق و شەرابی دنیا نیە بکەونە وڕێنەو قسەی هەلەق و مەلەق و بۆنی ناخۆش بڵاو بکەنەوە و هەستن بە گوناهو تاوان و چەپۆکان، بەڵکو شەرابێکی پاك و بێگەردەوجار جار بۆ خۆشی لە دەستی یەکتر وەری دەگرن ، لە هەمان کاتدا لاوانێکی رووخۆش و پاك و بێگەرد و دیمەن جوان بەردەوام سەرگەرمی خزمەتکردن و ڕێزگرتنیانن، هەردەڵێی مرواری شاراوەو کەس نەدیون، ئەوانیش ئەوەندەی تر کەش و هەواو بۆنەکان ـ کە هەمیشەو بەردەوامن ـ خۆش و سازگار دەکەن ودڵ و دەروونی باوەڕداران خۆش دەکەن.

جا ئیتر بۆ سازاندنی کەش و هەوایەکی تەواو خۆش‌و لەبار ، هەندێ جار باسی دنیاو ژیانی رابوردویان باس دەکەن هەمووانیش فیلم‌و میمۆری کاروکردەوەی خۆیان پێیەو لەسەر دەزگای پێشکەوتووتر لە داتا شۆ ـ نیشانی دۆستان‌و برایان‌و ئامادەبووانی دەدەن وە باس لەو هۆکارانە دەکەن کە بوو بەهۆی دەستەبەرکردنی ئەم هەموو نازو نیعمەتە بێ‌شومارە، وە ئەو نهێنی یەی کە بوو بە مایەی ئەم هەموو خۆشی‌و رابواردنە، ئەم هەموو پاداشتە بەنرخ‌و ناوازەیە، ئەویش بەوەی کە ئەو بەختەوەرانە ژیانی دنیایان بە وریایی بردە سەرو هەمیشە لە خەمی ئەوەدا بوون کە کارێ نەکەن پەروەردگاریان لێ زیز ببێ‌و حسابی (جدی)یان بۆ قیامەت دەکرد، دەترسان لەوەی کە بەڕوو زەردی‌و شەرمەزاری بە خزمەت پەروەردگاریان بگەن، دەترسان لە لێپرسینەوەی ئەو زاتە، لە کاتێکدا کە لە نێوکەس‌و کاریاندا بوون، کە لە رواڵەتدا هێمنی‌و هێوری هەیە، ئەوان بەو حاڵەتە و بە ژیانی دنیا نەخەڵەتان، کە زۆرجار دەبێتە هۆی سەرگەرمی وا کە مرۆڤ قیامەت فەرامۆش بکات، ئەو کاتە ئیتر ئەوان شایستەی ئەوە بوون کە پەروەردگاریان لە سزای ژەهراوی دۆزەخ بیانپارێزێت، ئەو سزایەی کە هەموو جەستە دادەگرێت وەکو ژەهرێکی کاریگەری کوشندە!

بەڵێ هەر ئەو زاتە دەیانپارێزێ لەو سزایە بە بەخشش‌و فەزڵی خۆی، کاتێ کە بۆی دەرکەوت ئەوان بە کردارو گوفتار سەلماندیان کە تەقوادارن‌و ترسی سزاو رەنجاندنی خوای گەورەیان لە دڵدا هەبووە، جا ئیمانداران ئەوە دەزانن‌و ئەوەش کە هیچ کەس بە کردەوەی خۆی ناچێتە بەهەشتەوە مەگەر فەزڵ و کەرەمی خوایی بیگرێتەوە، چونکە کردەوە هەر ئەوە دەسەلمێنێ کە خاوەنەکەی هەندێ

هـەوڵی داوەوکـەمێ خـۆی مانـدوو کـردووە و حـەزی لـەو بەخشـشـە خواییانـە کردووە، بەوەش خۆی شایستەی فەزڵ و بەخششەکانی خوای گەورە کردووە..

جا ئەوانە لەگەڵ ترس و بیمیان لە خوای گەورە و تەقوا دارییان بەردەوام دۆعاو نـزای بەکوڵیشـیان کـردووە ودڵنیـابوون و زانیویانـە کـە پـەروەردگاری مـەزن چاکەکارو چاکەخوازە لەگـەڵ بەندەکانیـدا، هـەروەها بەسـۆز و خـاوەن میهـرە پێیان..

ئا بەو شێوەیە نهێنـی ئـەو بەختـەوەرە ڕێزدارانـە دەردەکـەوێت کە بە چ شێوازو هۆکارێك ئەو مەقامو پلەو پایانەیان بەدەست هێناوە.

* * *

جا ئێستە کە هەست و نەستی مرۆڤ هەستی بە قامچی سزا کرد لە کۆپلە ئایـەتی یەکەمداو، باسـی نازو نیعمـەتی فراوان وهەمـە جۆری بۆ کـرا لـە کۆپلـە ئایـەتی دوهەمـدا، وە ئامـادەیی تێـدا دروسـت بـوو کـە بە هـەموو هەسـتی گـوێ بیسـتی ڕاستیەکان ببـێ .. کۆپلـەی دواتـر بـە کۆمـەڵێك ئایـەتی کـورت و خێـرا ناحـەزان دادەگرێتـەوە، ڕاسـتیەکان زیـاتر ڕوون دەکاتـەوە، شـوێنی وەسوەسـە و گـرێ کوێرەکـانی نـاخی مـرۆڤ دەردەکـەوێت. بـە کۆمـەڵێك پرسـیاری ڕەخنـە ئـامێزو (تحدا)ی بەهێز کە هەرکات مرۆڤ گوێ بیستی دەبێ خۆی بۆ ناگیرێت :

﴿ فَذَكِّرْ فَمَآ أَنتَ بِنِعْمَتِ رَبِّكَ بِكَاهِنٍ وَلَا مَجْنُونٍ ﴿٢٩﴾ أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ نَّتَرَبَّصُ بِهِۦ رَيْبَ ٱلْمَنُونِ ﴿٣٠﴾ قُلْ تَرَبَّصُوا۟ فَإِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُتَرَبِّصِينَ ﴿٣١﴾ أَمْ تَأْمُرُهُمْ أَحْلَٰمُهُم بِهَٰذَآ ۚ أَمْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ ﴿٣٢﴾ أَمْ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُۥ ۚ بَل لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٣﴾ فَلْيَأْتُوا۟ بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِۦٓ إِن كَانُوا۟ صَٰدِقِينَ ﴿٣٤﴾ أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ أَمْ

خَلَقُوا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ ۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ عِندَهُمْ خَزَائِنُ رَبِّكَ أَمْ هُمُ الْمُصَيْطِرُونَ ﴿٣٧﴾ أَمْ لَهُمْ سُلَّمٌ يَسْتَمِعُونَ فِيهِ ۖ فَلْيَأْتِ مُسْتَمِعُهُم بِسُلْطَانٍ مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾ أَمْ لَهُ الْبَنَاتُ وَلَكُمُ الْبَنُونَ ﴿٣٩﴾ أَمْ تَسْأَلُهُمْ أَجْرًا فَهُم مِّن مَّغْرَمٍ مُّثْقَلُونَ ﴿٤٠﴾ أَمْ عِندَهُمُ الْغَيْبُ فَهُمْ يَكْتُبُونَ ﴿٤١﴾ أَمْ يُرِيدُونَ كَيْدًا ۖ فَالَّذِينَ كَفَرُوا هُمُ الْمَكِيدُونَ ﴿٤٢﴾ أَمْ لَهُمْ إِلَٰهٌ غَيْرُ اللَّهِ ۚ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٤٣﴾ وَإِن يَرَوْا كِسْفًا مِّنَ السَّمَاءِ سَاقِطًا يَقُولُوا سَحَابٌ مَّرْكُومٌ ﴿٤٤﴾

(٢٩) جا ئیتر تۆ ئەی محمد ﷺ ، ئەی ئیماندار ، بەردەوام باسەکانی ئیمان و دینداری و بەندایەتی بیری دەوروبەر بە تایبەتی و خەڵکی بە گشتی بێنەرەوە ، چونکە تۆ بە هۆی نازو نیعمەتی پەروەردگارتەوە ـ کە بریتیە لە بیرو باوەڕی یەکخواناسی و بەرچاو ڕونی دەربارەی دنیاو قیامەت ـ بە دوریت لەوەی کە فاڵچی بیت یان عەقڵ و ژیریت لە دەست دابێت!!

(٣٠) جاری وا هەیە خوا نەناسان دەڵێن: گوایە تۆ شاعیریت و چاوەڕێن کە مردن یەخەت بگرێت و کۆتایی بە خۆت و پەیامەکەت بێت!!

(٣١) تۆش پێیان بڵێ: تا بۆتان دەکرێت چاوەڕوان بن ، بێگومان منیش لە گەڵتان لە چاوەڕوانیدام .

(٣٢) باشە ئەوانە عەقڵ و ژیریان فەرمانیان پێدەدات کە ئەو هەمو بڕو بیانوە لە قورئان و لە پێغەمبەرمان بگرن و ئاوا دژایەتیان بکەن ، یان هەر خۆیان کەسانێکی ستەمکارو ستەم پیشەن و نایانەوێت پەیڕەوی لە ڕاستیەکان بکەن؟!

(٣٣) یاخود هەندێکیان دەڵێن: ئەم قورئانە هەر محمد ﷺ خۆی هەڵیبەستووە و دایڕشتووە!! نەخێر ئەوانە هەموی بوختانە ، بەڵکو ئەوانە کەسانێکن بڕیاریان داوە کە هەر باوەڕ نەهێنن!! (هەندێ لە نەفامانی ئەم سەردەمەش ئەو قسەیە دەکەن!!)

(٣٤) دەی ئەگەر وایە خۆ ئەوانیش قسە زان و لێزانن ، دەبا ئەوانیش کتێبێکی وەك ئەم قورئانە دارێژن و بیهێننە مەیدان ، ئەگەر ڕاست دەکەن.

(٣٥) باشە ئەوانە بۆ بیر ناکەنەوە ، ئایا هەر وا لە خۆیانەوە بەبێ بونی بەدیهێنەر و دروستکراوێك هاتونەتە کایەوە؟! یان خۆیان ، خۆیان دروستکردوەو خۆیان بەدیهێناوە؟!

(٣٦) باشە ، داخۆ ئەوانە ئاسمانەکان و زەوییان دروستکردووە؟! (هیچ ستەمکارێك تا ئێستا نەیتوانیوە شتی وا بڵێت ، ئەگەر کەسێکیش شتی وا بڵێت ، ئەوە بە شێت و ناتەواو دەدرێتە قەڵەم) کەچی ئەوانە هەر دڵنیا نابن و دڵدامەزراو نابن (لە بەرانبەر ئەو زاتە بەدیهێنەرو ئەو پەروەردگارە دروستکارو جوانکارە ، بیرناکەنەوە کەچاو دەکەنەوە ئەم هەموو بونەوەرە دەمێکە هەیەو لەخزمەتیاندایە ).

(٣٧) باشە ، داخۆ ئەوانە گەنجینەی ڕزق و ڕۆزیەکانی پەروەردگاری تۆیان بەدەستە یان ئەوەیە کە دەستەڵاتێکی بێ سنوریان هەیە؟ کە ئاوادەوێرن یاخی بن و لە سنوری دەرچن؟!

(٣٨) یان پەیژەیەکی تایبەت و هۆکارێکی گرنگیان بۆ خۆیان دابین کردووە تا پیایدا سەرکەون و گوێ بیستی نهێنی یەکانی ئاسمان بن؟! دەبا ئەگەر ڕاست دەکەن بەڵگەیەکی ئاشکرا پەیدا بکەن ؟!! ئەوسا ملەجەڕێ بکەن!!

(٣٩) کەی ئەوە ڕاست و ڕەوایە کە کچان نەوەی خوا بن و کوڕانیش بۆ ئێوە بێت (بەمەرجێك بەهۆی نەفامیانەوە خۆیان لە کچان بێزارن!! بەڵام بۆ خوای گەورە بەڕەوای دەبینن!!)

(٤٠) یان ئەوەیە داوای کرێ و پارەیان لێ دەکەیت ، تا ببێتە بارێکی گران بەسەریانەوەو بۆیان هەڵنەسوڕێت؟!

(٤١) یان ئەوەیە کە خۆیان شارەزای نهێنی و شاراوەکانن و خۆیان دەتوانن چارەنوسی خۆیان یاداشت بکەن؟! ، یان بڕیارو پێشهاتەکان بە دەست ئەوانە؟!

(٤٢) یان دەیانەوێت نەخشەو پیلانێك داڕێژن دژی ئیسلام و مسوڵمانان ، بەڵام خەیاڵیان خاوە کافرو خوا نەناسان خۆیان کەوتونەتە ناو پیلان و داوو تەڵەی خۆیانەوە ، پیلانەکانیان بەسەر خۆیاندا دەشکێتەوە. (درەنگ یان زوو).

(٤٣) یان ئەوانە وا بیر دەکەنەوە کە خوایەکی تریان هەیە جگە لە زاتی (الله) ، پاکی و بێگەردی بۆ زاتی خوایە لەو بیرو باوەڕە چەوتانە ، ئەو زاتە بە دوورە لە هەموو ئەو کەس و شتانەی کە ئەوان دەیکەنە شەریك و هاوەڵ بۆ ئەو زاتە بێ وێنەیە.

(٤٤) خۆ ئەگەر لە سەر ئەنجامی یاخی بون و لادانیاندا خوای گەورە بەڵایەکیان بۆ بنێرێت لە ئاسمانەوەو رو بە زەوی بێت ، نەفامان دەڵێن: هیچ نیە ، پەڵە هەورەو نیشتۆتە سەریەك!!

*　　*　　*

ئینجا بەم فەرمانەو بەم بیرخستنەوەیە یاداوەری رووەدەکاتە پێغەمبەر(ﷺ) تا بەردەوام بێت لەسەر کاری پیرۆزی، بێ ئەدەبی و رەفتار ناشیرینی ئەو خەڵکە نالەبارە ساردی نەکاتەوە کە دەمێك بە کاهین و دەمێکی تر بە شێت ، یان هەردوو ناوو ناتۆرەکەی پێ دەڵێن کە گوایە کاهینەکان لە شەیتانەکان سوود

وەردەگـرن و شـەیتانیش لـە هەنـدێ کـەس دەسـت دەوەشێنێ وشـێتی دەکـات، شەیتان هۆکاری دوولایەنەیە، کاهینی پێ بڵێن ، یان شێت!! بە حسابی ئەوان دەست رۆیشتووە!!

هەموو ئەم ناوو ناتۆرە ناحەقەشیان بۆیە لێ دەنا لەبەر ئەوەی کە حەپەسابوون و سەرسـام بـوون لـە بەرانبـەر قورئانـەوە کـە موعجیزەیـەك بـوو شـتی وایـان نەبیستبوو، بەمەرجێ ئەوان بەناوبانگ بوون لە داڕشتنی شیعرو قسەو باسدا، جـا چـونکە نەیاندەویسـت بـاوەڕی پـێ بکـەن کـە لەلایـەن خـوای گەورەوەیـە و کـەلامی ئـەو زاتەیـە، دەگـەڕان و بیریـان دەکـردەوە کـە سەرچـاوەیەکی تـری بـۆ هەڵبەستن، چـونکە لـە داڕشـتنی مرۆڤەوە دوورە وبـەراورد نـاکرێ لەگـەڵ قسەو گوفتاری ئەواندا، بۆیە بە ناحەق دەیانوت : دەستی جنۆکەی تێدایە، کاهینـەو لەوانـەوە فێـر دەبێـت، یـان سـاحیرو جادوگـەرەو ئـەوان یارمـەتی دەدەن، یـان شاعیرەو جنۆکە فێری دەکات، یان شێتەو کاریگەریی شەیتانی لە سەرە و ئەم گوفتارە سەیرەی فێردەکات!!

بەڕاستی قسەیەکی ناڕەواو بوختانێکی شاخدارە، هـەر بۆیـە خـوای گـەورە دڵـی پێغەمبەرەکـەی دەداتـەوە، کاریگـەریی ئـەو بوختانانەلەسـەر دەروونـی بچـوك دەکاتەوە، بیری دەخاتەوە کە ئەو بەهرەمەندە لە نازو نیعمەتی پەروەردگاریولە کاهین بوون و شێتی یەوە زۆر زۆر دوورە .

هەروەها ناڕەزاییش دەردەبڕێت بەرانبەر ئەو بوختانەشیان کە گوایە شاعیرەو بە یەکدییان دەوت کە با خۆگربین تا مردن یەخەی پێ دەگرێت و رزگارمان دەبێت لە دەستی!!

هەر بۆیە لە هەڕەشەیەکی مانادار‌دا بە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ، کە پێیان بڵێ : ئێوە خۆگر بن منیش لەگەڵ ئێوەدا خۆ دەگرم، پاشان دەردەکەوێت سەرەنجام بە قازانجی کێ تەواو دەبێت، کێ خۆگرییەکەی بەرەو سەرکەوتن و دەرکەوتن دەیبات!!؟ لەو سەردەمەدا پیاوماقوڵانی قورەیش بە خاوەنی خەون ناوزەد دەکران کە ئاماژە بوو بۆ ژیری و حیکمەت بە قازانجدان لە بەڕێکردنی کاروباردا بۆیە قورئان تانەیان لێ دەدات لە خۆیان و خەونەکانیان، باشە؛ بۆچی ئاوا دژ بە ئیسلام دەوەستن، بە مەرجێ ئەو هەڵوێستەیان دژە لەگەڵ دانایی و ژیریدا، هەربۆیە پرسیارێکی تانەداریان ئاراستە دەکات: ئایا ئەو وەسفانەی کە ئاراستەی محمدی(ﷺ) دەکەن ، وە ئە و هەڵوێستانەی کە دەیگرن لە سەرەنجامی بیرکردنەوەی قوڵ و لێکدانەوەی ژیرانەدایە، یاخود ئەوانە کەسانێکی ستەمکارن و حساب بۆ عەقڵ و ژیری ناکەن؟!!دیارە پرسیاری یەکەم تانە و تەشەرێکی گازندەیە، پرسیاری دوهەمیش تۆمەتبارکردنێکی ریسواکەرە، دیارە ئەوانە شایستەی یەکێك لەو تۆمەتانەن لەو هەڵوێستە نادروست و گوماناوی یەیاندا !!

لەڕاستیدا دەمدرێژی ئەوانە گەیشتە رادەیەك کە پێغەمبەر(ﷺ) تۆمەتبار بکەن بەوەی کە ئەم قورئانەی دەیخوێنێتەوە بە سەریاندا خۆی هەڵیدەبەستێ ، هەر بۆیە قورئان بە توندی پاڵ بەم تۆمەتەوە دەنێت لە حاڵێکدا دەبوا قسەی وا بە دەم زاریاندا نەهاتایە، بەڵام ئەوانە بێ باکانە ئەو قسە ناڕەوا و نامۆیە دەڵێن، چونکە دڵ و دەروون و ناخیان ئیمان و باوەڕی تێدا نیە، گەر ئەمانە حەقیقەتی

قورئانیان بناسیایە و دڵنیا بوونایە کە دەستکاری هیچ مرۆڤێك نیە و (محمد)یش(ﷺ) کەسایەتییەکی راستگۆو ئەمینە شتی وا ناقۆڵایان نەدەوت!!
بەڵام مەخابن دڵیان لەحەقیقەتی ئەم قورئانە تێناگات، هەر بۆیە بە بەڵگەی واقیعی (تحدی)یان دەکات کە روپامایی نایگرێتە خۆ:﴿ فَلْيَأْتُوا بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِ إِن كَانُوا صَادِقِينَ ﴿٣٤﴾ ﴾کەواتە با ئەوانیش بابەتێکی وا دارێژن ئەگەر راست دەکەن . لە راستیدا ئەم (تحدی)یە چەندەها جار دووبارە بۆتەوە لە قورئانی پیرۆزدا، ناحەزو نامۆکانیش هەمیشە دەسەوسان بوون لە بەرانبەریدا، بونەتە باوە قورەت و قەزەم لەبەر دەمیدا، ئەم (تحدی)یەش تا رۆژی قیامەت بەردەوامەو ، هەموو باوەقورەتەکان لە بەرانبەریدا دەسەوسانن.
دیارە ئەم قورئانە نهێنی تایبەتی خۆی هەیە هەرکەس گوێ بیستی دەقەکانی دەبێ ' یان دەیخوێنێتەوە ، هەتا پێش ئەوەی بەشوێن سەراسیمەو(اعجاز)ەکاندا بگەڕێ، هەست دەکات دەستەواژەو دارشتنەکانی بە شێوازێکی تایبەتی دایدەگرێت، هەست دەکات کە لە پشتی واتاکانەوە شتێکی تر هەیە کە بە هزر و ئاوەز تێیدەگات ، شتێکی تر هەیە کە بەسەر هەستو نەستدا دەرژێت لە کاتی گوێ بیستی قورئاندا، هەندێ کەس بە روونی هەستی پێدەکات و هەندێکی تریش ناڕوونە لایان، بەڵام ئەو حاڵەتە شتێکی حاشاهەڵنەگرو ئاشکرایە!!
ئەو کاریگەرییەی دەڕژێ بەسەر هەست و نەستدا ، ئاسان نیە سەرچاوەکەی دیاری بکرێت: ئایا لە توێی دارشتن و دەستەواژەکانیایەتی؟ یاخود لە واتاو

داخوازیەکانیدا؟ یان لەو سایەو وێنانەی کە نیشانی دەدا؟ یاخود لەو کاریگەرییە تایبەتی یەدایە کە وشە و ئایەتەکانی قورئان لە هەموو شتێکی تر جیا دەکاتەوە، یاخود هەموو ئەمانەیە پێکەوە؟ یان شتێکی تری دیاری نەکراوو نەزانراوە؟

ئەمەش نهێنی یەکە لە توێی هەموو دەقێکی قورئانیدا هەستی پێ دەکرێت، هەرکەس گوێ بیستی دەبێ هەستی پێ دەکات، پاشان لە سەرانسەری قورئاندا نهێنی زۆر هەڵدەقوڵێ و دەیبەخشی بەو کەسانەی کە بە وردی سەرنجی دەدەن ولێکی دەدەنەوەو بیری لێ دەکەنەوە، ئەوسا بە تەواوەتی هەست دەکەن کە بۆچوونێکی راستو دروستو پەسەند لە هەستو نەستو دلو دەروونو بیرو هۆشیاندا دروست بووە، دەربارەی خودی مرۆڤ ، بوون و هەبوون، بەتایبەت دەربارەی ئەو زاتەی کە هەرچی هەیە ' جێ دەستی قودرەتی ئەو زاتە پاكو بێگەردەیە.

شایانی باسە ئەو شێوازەی کە قورئان پەیرەوی دەکات بۆ بەرپاکردنی بۆچوونێکی دروستو تەواو لە مرۆڤدا پشت دەبەستێ بە دواندنی فیترەت بە شێوازێکی تایبەت، کە لە گوتاری هیچ مرۆڤێك ناچێ !!

قورئان دەیەوێت لە هەموو لایەکەوە گەمارۆی دڵ و دەروونی مرۆڤ بدات، چارەسەری گرفتەکانی وەك شارەزایەك بکات، لە هەموو گۆشە نیگایەکیەوە، لە روانگەی شارەزایی تەواویش بە هەموو نهێنی یەکانی رێنوێنیەکانیشی گشتگیرو هاوسەنگو هاو ئاهەنگن، هەمووشیان لە ئاسۆیەکی روونو بە هێڵێکی ئاسۆیی ئاراستەی مرۆڤ دەکەن کە هەرگیز لە کاری مەردوم ناچێت،

هیچ کات لە یەك شێوازدا نامێننەوە .. لە یەك ئاستدا ناوەستن ، هەمووگۆشە و کەنارێکیش ناگرنەوە، هاوسەنگی بەردەوامیش بە رەهایی ناپارێزن کە کەم و زۆری کاریگەری نەبێت لەسەری، یاخود زیادەڕەوی و کەم ڕەوی و کورت ڕەوی، قورئان بە شێوازێك ڕێکخراوە کە ناڕێکی و دژبوونی تێدا نیە نە لە بنەما سەرەکیەکانیدا نە لە لق و بەشەکانیدا.

ئەم دیاردانەو وێنەیان نهێنی یەکی پەنهانەو نکولی لێ ناکرێت.. هەر ئەوەشە کە قورئانی کردۆتە موعجیزەیەکی رەها لە هەموو سەردەمەکاندا،ئەمەش کەسێ دژی ناوەستێ کە ڕێزی خۆی و هەستەکانی بگرێ، ڕێز لەو حەقیقەتەی کە بە توندی و قوڵی و روونی بگرێت کە لە بەردەمیدا بەرپا بووە، هەرکات بە دڵێکی پاك و دامەزراوەوە روی تێکرد ..

کەواتە گەر باوەڕیان نیە با فەرمایشتێکی وەك ئەم بێنن گەر راست دەکەن ..

ئەم پرسیارەی دوایی لە حەقیقەتی بوون و پەیدابوونیان لە دنیادا یەخەیان دەگرێت، کە ئەویش حەقیقەتێکی ئاشکرایەو کەس ناتوانێ خۆی لێ بدزێتەوە، ناشتوانن لێکدانەوەی هەڵەی بۆ بکەن، دەبێ هەر ملکەچی ئەو بیرو ڕاو راستیە بن کە قورئان باسی دەفەرموێت، کە ئەویش بریتی یە لەوەی کە ئەو خەڵکەو سەرجەم دروستکراوان خالق و دروستکارێکیان هەیە کە لە نەبوون هێناونی بۆ سەر گۆڕەپانی بوون، ئەویش خوای گەورە و تاك و تەنها و پاك و بێگەردە، ئەو هەر بووە و هەر دەبێت یەکەمینە و کەس لە پێشیەوە نیە ودواهەمینە و کەس لە دوای ئەو نیە، ئەوە ئەمانن کە دروستکراوی دەستی قودرەتی ئەو زاتەن.

لەڕاستیدا بوونی مرۆڤ بەم شێوەیە کە سەرچاوەیەکی نەبێت و ئەو خەڵکە هەڕەمەکی لە خۆوە پەیدا بووبن شتێکە لەگەڵ فیترەت وژیریدا پێك نایەتەوە، نە کەم و نە زۆر پێویستی بە موجادەلەو باس و خواس نیە، چونکە دەبێ یان خۆیان خۆیان دروست کردبێ، کە شتی وا نەوتراوە و هیچ دروستکراوێکیش نایڵێ، یان دەستێکی بە توانا و زانا و دانا بەدی هێنابن..

کە ئەمە حەقیقەتێکە کە قورئان چەندەها جار بە شێوازی جۆراو جۆر باسی فەرمووە .. ئەویش ئەمەیە کە سەرجەم ئەو خەڵکە دەستکارو دروستکراوی خواوەندی تاك و تەنهان کە هەرگیز شەریك و هاوەڵ و هاوتای نیەو کەس بەشداری ناکات لە دروستکردندا، کەواتە نابێ هیچ کەسیش بپەرستێ لە بواری پەروەردگاریتی و بەندایەتیدا جگە لەو زاتە، ئەمەش بیروڕا و گوتارێکی روون و سادەو بێ پێچ و پەنایە، هەروەها بەرەنگاریان دەبێتەوە بەوەی کە ئەو زاتە ئاسمان و زەوی هەیە وئەوەتە دروستکراوانی ئاشکران ، باشە داخۆ ئەوە ئەوان دروستیان کردوون؟ خۆ خۆیان بەدیهێنەری خۆیان نین، هەروەکو چۆن ئەوان بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەویش نین ..

دیارە نە ئەوان و نە هیچ ژیرێك ناڵێت : ئاسمانەکان و زەوی خۆیان بەدیهێنەری خۆیانن، یاخۆ بەبێ دروستکار لە خۆیانەوە ــ بەرێکەوت ــ دروستبوون، بێگومان نە ئەوان و نە کەسانی تریش ناڵێن: ئێمە دروستکاریانین، ئەوەتە لە بەرانبەر و بە بەر چاویانەوە هەن، بەڕاستی پرسیارێکی زیندووە و وەڵامی دەوێت!!

خۆ ئەوانە کاتێ پرسیاریان لێ دەکرێت : کێ ئاسمان و زەوی بەدی هێناوە، بە دڵنیاییەوە دەڵێن : (الله)، بەڵام ئەم حەقیقیەتە ئەوەندە لایان روون نەبوو کە ئاسەوارێك لەسەر دڵ و دەروونیان دابنێت، وە ببێتە پاڵنەر بۆ دەستەبەرکردنی بیروباوەڕێکی بتەوو روون و ئاشکرا..

ئینجا پرسیاریان لێدەکات لە ئاستێکی خوارتر لە باسی بەدیهاتنی خۆیان ، یان ئاسمانەکانو زەوی بەوەی کە پرسیاریان لێ دەکات: ئایا ئەوان خاوەنی گەنجینەی رزقو رۆزی یە هەمەجۆرەکانی خوای گەورەن؟ ئایا بەخشین و نەبەخشین زەرەر و قازانج بەدەست ئەوانە؟

خۆ وا نیە و، شتی واشیان نەوتوو ، ئەی کێ خاوەنی گەنجینەکانە؟ کێ کاربەدەستە؟ سامانەکانی پەروەردگارت بەدەست کێ یە و لای کێ یە؟!

قورئان دەفەرموێت: گرتنەوە و فراوان بوونی رزقو رۆزی هەر بە دەست خوای گەورەیە، رێکخەرو بەڕێوەبەری سەرجەم کاروبارەکانەو هەر بەم شێوازە لێکدانەوەیە بەڕێوەبردنی کاروباری گەردوون لێك دەدرێتەوە، لەڕووی فراوان کردن، یان گرتنەوەی رزقو رۆزی ، یاخود بەڕێوەبردنو رێکخستنی هەموو شتەکان ـ کە هەر هەمووی بەدەست خوای پەروەردگارە ـ دوای ئەوەی کە ئاشکرایە ئەوان خاوەنی گەنجینەکان نینو هەرگیز دەستەڵاتی بەڕێوەبردنیکاروباریشیان نیە!

ئینجا پلەیەکی تر لە پرسیارکردن دێتە خوارەوەو دەپرسێت: ئایا ئەوانە هۆکارێکیان بەدەست هێناوە تا گوێ بیسبت بن لە سەرچاوەی نازڵبوونی ئەم قورئانە؟!

لەڕاستیدا محمد(ﷺ) پێیان دەڵێت : کە ئەو خوای فرستادەیەو پەیامی خوای گەورەی پێدەگات.. وە ئەم قورئانە ناو بە ناو بۆی نازڵ دەبێت لەلایەن خوای گەورەوە، لە بڵندی یەکانەوە، کەچی ئەوان بڕوای پێناکەن، باشە ئەوان پەیژەو - ئاسانسۆریان - هەیە و دڵنیان لەوەی کە محمد(ﷺ) نیگای بۆ ناکرێت، حەق جیاوازە لەوەی کە ئەو دەیڵێت؟ دەبا ئەوانە بەڵگەیەکی ئاشکرا لەسەر ئەو راو بۆ چوونەیان بێننە مەیدان؟ بەڵگەیەکی بەهێز کە کاریگەری لەسەر دڵو دەروونەکان هەبێتو ناچاری بڕوا هێنانیان بکات.

ئەمەش ئاماژەیە بۆ کاریگەریی قورئانو بەگیرهێنانیان کاتێ کە بە ئایەتو بەڵگە جۆراوجۆرەکان یەخەیان دەگرێت، کەچی فودەکەنە خۆیان و دژایەتی دەکەن!!

دواتر وەڵامی گوفتارێکی ناقۆڵاو بێ مانایان دەداتەوە کە بۆ خوای گەورە هەڵیان بەستووە کە گوایە فریشتەکان نەوەی ئەو زاتەن و مێینەشن بۆیە بەشێوازێکی راستەوخۆ وەڵامیان دەداتەوە تا بە تەواوەتی شەرمەزارو ریسوا بن، کاتێ کە روو بەوان دەفەرموێت: مەگەر خوای گەورە تەنها خاوەنی کچانە و کوڕانیشی بۆ ئێوە بڕیارداوە؟!

بەتایبەت کاتێ کە ئەونەفامانە کچیان بە مرۆڤی پلە دوو دادەنا، تا ڕادەیەك کە ئەگەر پێیان بوترایە کچتان بووە لەداخا روخساریان رەش دادەگیرسا و خۆیان دەخواردەوە ، بەڵام شەرمەزار نابن کە کچان بۆ خوای گەورە بەڕەوا دەزانن!!

بۆیە لێرەدا خوای گەورە دەیەوێت لەسەر بنەمای دابو نەریتی ناڕەوای خۆیان بەگیریان بێنێو تا شەرمەزاریان بکاتو ئەو بوختانە بداتەوە بەڕوویاندا، هەرچەندە بوختانەکە قسەیەکی بێ نرخو ناڕەوایە !!

ئەوان بانگەوازی پێغەمبەریان(ﷺ) لا سەختو سەنگین بوو لە کاتێکدا ئەو بانگی دەکردن بۆ هیدایەتو بەرنامەیەکی پاكو بێگەردو هیچ پاداشتو کرێیەکیشی لێ نەدەویستن، باجو خەراجیشی لەسەر دانەدەنان دەبوا زۆر بەجوانی پێشوازیان لە خاوەنی ئەو بەرنامەیە کردبا، یان هیچ نەبێ بە شێوەیەکی جوان دەستیان پێوە بنایە.

هەر بۆیە رەخنە لە هەڵوێستی نالەباریان دەگرێتو دەفەرموێت:

مەگەر تۆ ئەی محمد(ﷺ) داوای کرێیەکی زۆرت لێ کردوونو کۆڵیانت سەنگین کردووە؟ لە واقعیشدا نەکرێ و نە غەرامەت بە سەردا پاندوون، کەواتە گوتارو هەڵوێستیان زۆر ناشیرینو نالەبارە شەرمەزار دەبن کاتێ بەو شێوازە یەخەیان دەگرێتو دەیداتەوە بەسەریاندا؟ ئینجا بەرەنگاریان دەبێتەوەو پرسیار لە هۆکاری بوونیان دەکات لەم بونەوەرەدا ، خۆ ئەوان کەسانێکی سنوردارن، بەشێکی سنوردار لەم گەردوونەیان بۆ باس کراوە، زۆر شت لەوان شاراوەیە و تایبەتە بەو زاتەوە کە بەدیهێناون، شاراوەی زۆر هەیە کە هەر خوای گەورە خۆی دەیزانێتو ئەوان هیچی لێ نازانن!!

ئەو خەڵکە زۆر چاك دەزانن کە شارەزای غەیبو نهێنیو شاراوەکان نین، دەسەڵاتیشیان لەو بوارە نیە، هەروەها لە تۆمارگەی شاراوەکاندا هیچ شتێکیان تۆمار نەکردووە!! ئەوە هەر خوایە کە چی بوێت تۆماری دەکاتو نە خشەی قەدەر بۆ بەندەکانی دەکێشێت ـ لە هەمان کاتدا مرۆڤەکان ئەوپەڕی ئازادیشیان دراوەتێ ـ !!

بێگومان ئەو ناتەی کە غەیب و نهێنی و شاراوەکانی بەدەستەو ئاگای لە هەموو شتێکە، هەر خۆی خاوەنی هەموو نەخشەو پلانێکە، ئیتر ئەوانە چیان بە دەستە کاتێ کە شارەزا نین، بە مەرجێ هەرچی نەخشەو پلان و پیلانی ناحەزان هەیە، هەمووی لە تۆمارگەی ئەو زاتەدا هەیە و ئاگای لێیەتی، هەرچەندە ئەوانە وا بزانن کە لە ئایندەدا هەندێ شتیان بۆ دەکرێت، یاخود دەڵێن کە محمد(ﷺ) شاعیرە و ماوەیەك خۆمان مەڵاس دەدەین تا دەمرێت و پەیامەکەی کۆتایی پێدێت!!

یاخود ئەوانە خەریکی نەخشەدانان و نەخشەسازین بۆ دژایەتی کردنی ئەم بانگەوازە، نازانن کە خۆیان لە بازنەی نەخشەی خوای گەورەدان و لە دەستی قودرەتی قوتار نابن،

باشە داخۆ ئەوە ئەوان نین کە هەرچی خاوەنی غەیب بۆی بڕیارداون ، هەر ئەوە دێتە ڕێیان، هەر ئەوان نەخشە و ویستی خوای گەورە بەسەریاندا پیادە دەبێت، بەتایبەتی کە ئەو زاتە چاکترین نەخشەساز و پلاندانەرە.

باشە؛ ئەوانە مەگەر جگە لە خوا خوایەکی تر هەیە کە بیانپارێزێت لە نەهامەتی و کێشەکانی دنیا و ڕێگری بکات لە پیادەکردنی نەخشەکانی .. لەڕاستیدا پاکی و بێگەردی و ستایش و شکۆمەندی شایستەی خوای گەورەیە، کە موشریك و هاوەڵگەران دەیکەن و دەیڵێن!!

شایانی باسە کە بەبڕیاردانی ئەو پاکی و بێگەردی و دووری یە لە هەموو جۆرە شیرك و هاوەڵگەری یەك کۆتایی بەو ڕەخنەو هێرشە بەردەوامانە دێت، کە کاریگەری بەهێزو توندی بووە و دەبێت ــ لەسەر دڵ و دەروونی کەسانی

هۆشیارو دڵ زیندوو - چونکە هەموو گومانێکی خستە روو، هەموو بەڵگەیەکی نادروستی پوچەڵ کردەوە، خەڵکی خستە بەردەم راستیو رەوان بە شێوازێکی روون و ئاشکراو هیچ برووبیانوویەکی بەدەستەوە نەهێشتن‌و هیچ بەڵگەیەکیان پێنەما.

ئینجا حەقیقەتی سەرسەختی و عینادو خۆ بە شت زانینیان دەخاتە روو کاتێ کە رووبەڕووی حەق‌و رەوایەکی دروست دەبنەوە، وە پەنا دەبەن بۆ سادەترین گومان ، تا ئەو ئاستەی کە ئەگەر سزایان لە شێوازی هاتنە خوارەوەی تاشەبەردێکدا لە ئاسمانەوە بۆ بێت بۆ لەناوبردنیان - بێ باکن - و دەڵێن: ئەوە پەڵە هەوری کەڵەکە بووە!! ئاوو ژیانی پێیە: بەهۆی سەرسەختی‌و دژواریتان بۆ حەق و رەوا و بڕیاریاندا کە تەسلیمی نەبن و نەیپەزێرن، گەر شمشێر لەسەر گەردنیان بێت هەروەکو خۆیان دەڵێن!!

رەنگە ئەمەش ئاماژەیەك بێت بۆ بەسەرهاتی قەومی عاد؛ کاتێ کە سزایان بۆ هات لە شێوازی پەڵە هەوری وێرانگەردا وتیان: ئەوە هەورە و بارانی پێیە بۆمان، بەڵام وەڵامیان درایەوە بەوەی کە ئەوە ئەو سزایەیە کە پەلەتانە لە پێشهاتنی، ئەوە رەشەبایەکی توندەو سزایەکی بەئێشی پێیە بە فەرمانی پەروەردگاری، هەرچی شتە وێرانی دەکات‌و لەناوی دەبات!

* * *

دوای ئەوەی ئایەتەکان عینادیو سەرسەختییانی وێنا کرد دژایەتیانی بۆ حەق روون کردەوە، سزای خوایش بە راسەریانەوە نزیك بێت، گوتار روو دەکاتە

پێغەمبەر (ﷺ) با دەستیان لێ بشواتو وازیان لێ بێنێ بۆ ئەو ڕۆژگارەی کە لە سەرەتای سورەتەکەدا باسی فەرموو، بۆ ئەو سزایەی کە لە دۆزەخدا چاوەڕێیانە، با بەردەوام خۆگر بنو چاوەڕێی فەرمانی ئەو پەروەردگارە بکەن کە چاودێرییان دەکاتو گرنگی پێداون ، دەبا بەردەوام تەسبیحات و ستایش و سوپاسگوزاریی دەربڕێت لە بەیانیاندا کاتێ کە هەڵدەستێ، هەروەها لە شەوگارو ڕۆژگاریشدا کاتێ کە ئەستێرەکان دیار نامێنن..

﴿ فَذَرْهُمْ حَتَّىٰ يُلَٰقُوا۟ يَوْمَهُمُ ٱلَّذِى فِيهِ يُصْعَقُونَ ﴿٤٥﴾ يَوْمَ لَا يُغْنِى عَنْهُمْ كَيْدُهُمْ شَيْـًٔا وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤٦﴾ وَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ عَذَابًا دُونَ ذَٰلِكَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٧﴾ وَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا ۖ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٤٨﴾ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَإِدْبَٰرَ ٱلنُّجُومِ ﴿٤٩﴾ ﴾

(٤٥) وازیان لێ بێنە بۆ ئەو ڕۆژەی کە بەڵای خوا یەخەیان دەگرێت و وەکو بروسکەو کارەبایەکی بەهێز لێیان بدات هەمویان دەگرێت و لە ناویان دەبات...
(٤٦) ئەو ڕۆژە ئیتر پیلان و نەخشەو توانایان فریایان ناکەوێت و سەرکەوتوو سەرفرازنابن.

(٤٧) بێگومان بۆ ستەمکاران سزای تریش هەیە بێجگە لەوەی کە جار جار بۆیان پێش دێت، پێش تیا چونی یەکجاری ، بەڵام زۆربەیان نافامن و نازانن و دەرکی پێناکەن (هەست بە دەستی قودرەتی خوای گەورە ناکەن لە ڕوداوەکاندا)
(٤٨) ئەی محمد ﷺ تۆ هەر خۆگربە لەبەرانبەر بەجێهێنانی فەرمانەکانی پەروەردگارتەوە ، دڵنیابە کە لە ژێر چاودێری ئێمەدایت ، هەروەها بەردەوام تەسبیحات و ستایش و سوپاسگوزاری پەروەردگارت بکە ، کاتێک کە لە شەونوێژ و بەرەبەیانەکاندا هەڵدەستیت...

(٤٩) هەروەها لە شەوگاریشدا هەر خوای گەورە بپەرستەو ستایشی بکە ، کاتێکیش کە دنیا رونـاك دەبێتەوەو ئەستێرەکان لەبەرچاو ون دەبن هەر تەسبیحات و ستایش‌و سوپاسی خوا بکە..(هەولبدە ، هیچ کات غافڵ نەبێت ).

ئەمە قۆناغێکی نوێترە لە هێرش کردنە سەریان دوای ئەوەی کە هەڕەشەی لێکردن بە هاتنی رۆژێکی سامناك، ئەو رۆژەی کە فو دەکرێت بە دەزگای (صور)دا پێش زیندوکردنەوەیان، ئەو رۆژە هیچ جۆرە تەکبیرو ڕایەك فریایان ناکەوێت، بەڵکو کاتی پرس‌و ڕا نەماوەو هیچ پشتیوانێکیش نیە..

* * *

ئەوان لەمڕۆدا، لە دنیادا با خەریکی پیلان گێڕان‌و پیلان دانان بن، بەلام لەو رۆژەدا هیچ نەخشەو پیلانێك فریایان ناکەوێت، بەڵکو بواریان نیە وبواریان نادرێت تا نەخشەو پلان و پیلان بگێڕن چونکە ئەو رۆژە سزایەکی سەخت بۆیان ئامادە کراوە، هەرچەندە زۆربەی ئەوانە لەم راستیانە تێناگەن‌و نایانەوێ تێبگەن!!

پاشان بەم کۆتا هەڕەشەیە دەست بەرداری ستەمکاران دەبێت دوای ئەوەی بەتوندی لە هەموو لایەکەوە بەگیری هێنان و رێی لێگرتن ، سەرەنجامیشی خستە بەرچاویان کە چۆن لە دوور و لە نزیکەوە چاوەڕێیانە..

خوای گەورە لە باسی ئەوان دەبێتەوەو روو دەکاتە پێغەمبەری رێزدار کە دەم درێژو ناپاکان، دەمبازو بوختانچیان زۆر ئازاری دەونییاندا، قورئان ئاوڕی لێ دەداتەوەو ئاراستەی دەکات بۆ ئارامگرتن و خۆی لە بەرانبەر ئەو ئازارو

ناخۆشیانەوە، لە بەرانبەر باوەڕ نەکردن وخۆ فش کردنیانەوە.. خۆگری لەسەر ڕێبازی بانگەوازی تولانی پڕ لە ئازارو مەینەت و سپاردنی کارو دەرەنجامەکانی بە پەروەردگاری لە هەمان کاتدا مژدەی گرنگیدان و ڕێزی پەروەردگاری و چاودێری خوایی و هەست کردن بە ڕێزو خۆشەویستی ئەو زاتە کە دەستی پیرۆزی قودرەتی دەهێنێ بەسەر دڵ و دەروونی پێغەمبەرەکەیدا(ﷺ) تا زام و برینەکانی ساڕێژ بکات، وە خۆگری ببێتە هۆکارێکی نازدار لە پێناوی بانگەوازدا، چونکە خۆگری هۆکارە بۆ ڕێزو پێزانین :

﴿وَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعۡيُنِنَاۖ ...﴿٤٨﴾﴾... ئای کە دەستەواژەیەکی سەیرە! ئای کە وێناکردنێکی ناوازەیە! ئای کە ڕێزو پێزانینێکی بەنرخە!

ئەمە پلەو پایەیەکە هیچ مرۆڤێك پێی نەگەیشتووە، ئەم دەستەواژە پیرۆزە بەم شێوازە تەنها ئەمجارە لە قورئاندا هاتووە، جیاوازە لە هاوشێوەکانی تر..

بۆ نموونە بە موسای فەرمووە : ﴿وَأَنَا ٱخۡتَرۡتُكَ فَٱسۡتَمِعۡ لِمَا يُوحَىٰٓ ﴿١٣﴾﴾ طـه.

﴿...وَأَلۡقَيۡتُ عَلَيۡكَ مَحَبَّةٗ مِّنِّي وَلِتُصۡنَعَ عَلَىٰ عَيۡنِيٓ ﴿٣٩﴾﴾ طـه.

﴿وَٱصۡطَنَعۡتُكَ لِنَفۡسِي ﴿٤١﴾﴾ طـه.

ئەمانە هەمووی بەڵگەن لە ڕێزو پلەی تایبەت ..

بەڵام بە محمد(ﷺ) وتراوە : ﴿...فَإِنَّكَ بِأَعۡيُنِنَاۖ ...﴿٤٨﴾﴾ بێگومان دەستەواژەیەکە ڕێزێکی تایبەت دەگەیەنێت، سۆزو ڕێزێکی تایبەت دەردەخات، سایە و سێبەرێکی ناوازەو نەرم و ناسك دەدات ـــ بەسەر دڵ و دەروونی پێغەمبەردا(ﷺ)ـ کە بە دەربڕینی مرۆڤ وێنا ناکرێت و ڕاڤەکردنی ئەستەمە..

مەگەر تەنها لە دوورەوە ئاماژە بکەین بۆ سایەو سێبەری و هەوڵبدەین لە ژێر ئەو سایەو سێبەرەدا تاوێك پشوو بدەین .

جا لەگەڵ ئەم هەستو سۆزە پیرۆزەدا ، پەروەردگاری دڵسۆزی ئاراستەی دەکات بۆ ڕێبازی پەیوەندی هەمیشەو بەردەوام بەو زاتەوە : ﴿...وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ ۝٤٨ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَإِدْبَٰرَ ٱلنُّجُومِ ۝٤٩﴾ .. بەدرێژایی ڕۆژ، لە کاتی بێداری یەوە تا کاتی خەو، جار جار لە شەو بێداریدا، لە بەرەبەیاندا کاتێ کە ڕووناکی ئەستێرەکان ون دەبن . لەهەموو ئەو کاتانەدا بواری گوێ بیستی هەیە، بۆ ئەم سۆزو حاڵەتە پڕ لە خۆشەویستی یە .. کە لە تەسبیحات و ستایشی پەروەردگاری ئازیزدا خۆی دەبینێتەوە، تەسبیحاتیش توێشووە و هەست کردنە بە نزیکی خوای گەورە وگفتوگۆی نهێنی دڵەکانە لەگەڵ پەروەردگاریاندا، جا ئاخۆ حاڵی دڵی خۆشەویستانی خوای گەورە چۆن بێت کاتێ کە هەست دەکەن ئەو زاتە ئەوانی خۆش دەوێتو نزیکە لێیانەوە ؟!!

---

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا ۝١٠﴾

﴿الكهف﴾

پەروەردگارە لەلایەن خۆتەوە ڕەحمەت و میهرەبانی تایبە تمان پێ ببەخشەو لە سۆزی خۆت بەهرەوەرمان بکەو ڕێگەی ڕزگاری و سەرفرازیمان بۆ بسازێنە لەم کارەماندا .

## ﴿ سورەتی (النجم) ﴾

ئەم سورەتە بە شێوەیەکی گشتی دەڵێی ئاوازێکی سەمفۆنیای بڵندە بە ئاوازێکی رێك و پێك رێکخراوە، سازو ئاوازی لە رێکخستنی وشەکاندا هەستی پێ دەکرێت، هەروەها لە نێوان ئایەتە هاوتەریبە هاوسەنگەکاندا، - شێوازی تایبەتی خۆی هەیە - لە هەموو سورەتەکەدا بەگشتی تێبینی دەکرێت، بەڕوونی دیارە کە خوای گەورە بەتایبەت لە هەندێ شوێندا بە چاکی زانیوە کە بەو شێوەیە بێت، جاری وا هەیە وشەیەك یان سەروایەك هاتووە و زیاد کراوە، بۆ ئەوەی سازو ئاوازو کاریگەرییەکەی بەردەوام بێت ؛ هاوڕی لەگەڵ ئەو واتایەی کە مەبەستە لە دەستەواژەو داڕشتنە قورئانیەکەدا وەکو :

﴿ أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ ﴿١٩﴾ وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ ٱلْأُخْرَىٰٓ ﴿٢٠﴾ ﴾ ئەگەر بیفەرموایە (وَمَنَوٰةَ ٱلْأُخْرَىٰ) هاوکێشەی ئایەتەکە ناڕێك دەبوو یان تەنها بیفەرموایە (وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ) سەرواکە تێك دەچوو!!

دیارە کە هەموو وشەیەك نرخ و جێگەی خۆی هەیە .. دیارە کە خوای گەورە حسابێکی وردی بۆ هاوسەنگی و سەروا کردووە .. بۆ نموونە وشەی (إذن) کە بەم شێوەیە هاتووە (إذًا) لەم دوو ئایەتەدا پێویستە بۆ هاوسەنگیان : ﴿ أَلَكُمُ ٱلذَّكَرُ وَلَهُ ٱلْأُنثَىٰ ﴿٢١﴾ تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَىٰٓ ﴿٢٢﴾ ﴾ دیارە کە وشەی (إذًا) پێویستە بۆ هاوسەنگی، سەرەڕای ئەوەی کە کارێکی هونەرییشە لە داڕشتنەکەدا ..

بەڵێ؛ ئەو شێوازە لە داڕشتن سازو ئاوازێکی تایبەتی و کاریگەریی خۆی هەیە، شێوازێکی شەپۆلاوی یە لەلایەك، ئاسانکاری یە لە تێپەڕبوونیدا لەلایەکی

ترەوە، بەتایبەت لە بەشی یەکەم و بەشی کۆتایی سورەتەکەدا.. ئەمەش هاوئاهەنگییەکی جوان نیشان دەدات لە شەپۆلو تێپەڕبوونی ئاسان کە گونجاوە لەگەڵ وێنەو سایەی ڕەهادا کە دڵان دەهێنێتە جوڵەو لەرزە لە بڕگەی یەکەمدا، هەروەها هاوئاهەنگە لەگەڵ واتای ئەو کاریگەرییانەی کە لە بڵندیەوە دێن لە بڕگەی کۆتاییدا، لەو نێوانەشدا بابەتەکان و کەش و هەواکان نزیکن لەو باسانە.

بێگومان وێنەو سایەکان لە بڕگەی یەکەمدا لە بڵندی یەوە دێنو تیشك و نور و روناکی دەبەخشن و ڕووداوە نورانیەکان و دیمەنە پەروەردگارییەکان باس دەکەن. لەم جمو جوڵ و خۆنیشاندانی حەقیقی جوبرەئیل بۆ پێغەمبەری نازدار(ﷺ).. پاشان سایە و وێنەو جوڵەو دیمەنی نورانی تر هاوڕێ لەگەڵ کەشو هەوای ئیمانیو رۆحی، کە هەمووی لە دەستەواژەو توێی ئایەتەکاندا نومایانە، بە شێوازێکی ڕێكو پێكو سەرسوڕهێنەر.. دواتریش ئەو بۆنە خۆشو ئەو سایە قەشەنگە کەشو هەوای سورەتەکە بە تەواوەتی دادەگرێت، ئاسەوار لەسەر هەموو بەشەکانی تری سورەتەکە دادەنێت، هەتا کۆتایی دێت بە شێوازێکی زۆر کاریگەرو ڕێنمونیەکی زۆر قوڵ و وروژێنەر.. هەموو خانەیەکی مرۆڤ دێنێتە لەرزەو بە دەوریدا خەریکە باڵ دەگرێتەوەو بەدەم داخوازی یەکانەوە دەچێت.

ئەم بابەتەی کە ئەم سورەتە گرنگی پێداوە هەر ئەو بابەتەیە کە سورەتە مەککیەکان گرنگیان پێداوە؛ بابەتی عەقیدەو بیروباوەڕە کە بریتیە لە بابەتی وەحی و نیگا، تاكو تەنهایی خوای گەورە، باسی قیامەتو جیهانی دوایی.

سورەتەکە لە گۆشە نیگایەکی تایبەتەوە لەو بابەتانە دەدوێت، بابەتی وەحی و نیگا دوویارە دەکاتەوە کە هەرچی دێت دەربارەی ئەم عەقیدەیە راستو دروستە، بیروباوەڕی شیرکو هاوەڵگەری دەخاتە روو کە چەندە بێ بنەماو پوچو مژمۆڵ و خەیاڵبافی یە ..

برگەی یەکەمی سورەتەکە حەقیقەتی وەحی و سروش باس دەفەرموێت، دوو دیاردە لە دیاردەکانی باس دەکات؛ دیمەنێك لە دیمەنەکانی، راستی و دروستی و واقیعیەتی وەحیو نیگا لە روانگەی ئەو دوو دیمەنەوە دەخاتە روو؛ هەروەها ئەوە دووپات دەکاتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) لە جوبرەئیل سلاوی لێ بێت ئەم پەیامەی وەرگرتووە وبە چاوی خۆی؛ بەڕوونی بە دیداری شاد بووە، هەروەها ئاگاداری کردووە لە بەڵگەو نیشانە گەورەکان لە دروستکراوانی خوادا ..

برگەی دوهەمیش باس لە بتەکانیان دەکات : لات و عوزا و مەنات، هەروەها بۆچوونی خورافییان دەربارەی فریشتە، وە بەختانە بێ سەرو بنەکانیان کە گوایە کچی خوان!! هەموو ئەمانەش گومانی نادروستن و زۆر دوورن لە حەقیقەتەوەو بە هیچ شێوەیەك لێی نزیك نابنەوە ، ئەمە لە کاتێکدا کە پێغەمبەر(ﷺ) بەوپەڕی دڵنیایی و متمانەو بەرچاو ڕوونیەوە بانگی کردوون بۆ ئیمان.

برگەی سێهەمیش پێغەمبەر(ﷺ) ئاراستە دەکات بۆ وازهێنان لەو کەسانەی کە پشت دەکەنە بەرنامەی خواو حەز بە یادو باسی ناکەن تەنها بە دنیاوە سەرگەرمن و لەو سنورە بەدەر شتێکی تر نازانن، پاشان باسی قیامەت دەکات و پاداشتی ئەویّ دەبەستی بە کارو کردەوەی خەڵکیەوە، پەیوەستی دەکات بەوەی کە خوای گەورە تەواو زانایە پێیان، هەر لەو کاتەوە کە لە خاکی زەوی دروستی کردوون، پاشان کە بونەتە کۆرپەلە لە سکی دایکیاندا، بێگومان ئەو زاتە لە خودی خۆیان شارەزاترە پێیان، لەسەر بنەمای زانستی روون و ئاشکرا، نەك لەسەر بنەمای گومان و مژمۆڵی ، لێپرسینەوە و پاداشتیان دەداتەوە ، سەرەنجام کۆتایی هەمووشت بەرەو لای ئەو زاتە دەبێت.

برگەی کۆتایی و چوارەمیش باسی بنەماکانی عەقیدەو بیروباوەڕ دەکات هەروەکو لە پەیامە دێرینەکاندا هاتووە، کە هەرکەس بارمتەی کارو کردەوەکەی خۆیەتی ، بەوردی حسابی لەگەڵ دەکرێت، پاداشتی بەدادپەروەرانە دەدرێتەوە، هەمووان بەناچاری بۆلای پەروەردگاریان دەبرێنەوە، ویستی ئەو زاتە رەها و بی سنورە، لەگەڵ ئەوەشدا هانمان دەدات تا ئاورێك لە هۆکاری تیاچوونی قەومە پێشووەکان بدەینەوە، پاشان بە چەند ئایەتێك کۆتایی بە سورەتەکە دێنێت: سەرەنجام سەرەتا و کۆتایی لە سروش و وێنە و سایەو هاوسەنگی و رواڵەتی گشتیدا پێك دەگەنەوە..

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

﴿ وَالنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ (١) مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ (٢) وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ (٣) إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ (٤) عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَىٰ (٥) ذُو مِرَّةٍ فَاسْتَوَىٰ (٦) وَهُوَ بِالْأُفُقِ الْأَعْلَىٰ (٧) ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ (٨) فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ (٩) فَأَوْحَىٰ إِلَىٰ عَبْدِهِ مَا أَوْحَىٰ (١٠) مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَىٰ (١١) أَفَتُمَارُونَهُ عَلَىٰ مَا يَرَىٰ (١٢) وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ (١٣) عِندَ سِدْرَةِ الْمُنتَهَىٰ (١٤) عِندَهَا جَنَّةُ الْمَأْوَىٰ (١٥) إِذْ يَغْشَى السِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ (١٦) مَا زَاغَ الْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ (١٧) لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَىٰ (١٨) ﴾

(١) سوێند بەو ئەستێرەیەی کە لە شوێن و خولگەی خۆی دەترازێت و بەخێرایی لە بۆشایی ئاسماندا بەردەبێتەوەو وردو خاش دەبێت و ون دەبێت ..

(٢) ئەو هاوەڵەی ئێوە (محمد ﷺ) کەسایەتیەکی گومڕاو سەرلێشێواو نیەو لەبەرنامەی ڕاست و دروست لای نەداوە ...

(٣) هەرچی دەیڵێت گوفتاری جوان و بەجێیە (بە تایبەت ئایەتەکانی قورئان) لە ئارەزوو هەوەس بازییەوە دوورە ...

(٤) بەڵکو ئەوەی کە رایدەگەیەنێت ، قورئانەو فەرماییش و وەحی و نیگای خوای گەورەیە ...

(٥) (لەڕێگەی فریشتە جوبرەئیلەوە بە پێغەمبەرەکەی دەگات)و فێری دەکات ، بێگومان جوبرەئیل خاوەنی هێزو توانای زۆر فراوانە.

(٦) ئەو جوبرەئیلە ، خاوەنی بیرو هۆشێکی زۆر بەهێزو دیمەنێکی جوانەو جار جار لەسەر شێوە ڕاستەقینەکەی خۆی دەوەستێت و خۆی نومایان دەکات(تا پێغەمبەر(ﷺ) بە تەواوی دڵنیا بێت کە قورئانی لە لایەن زاتێکی زۆر گەورەو

شکۆمەندەوە پێ دەگات ، ئەوە فریشتەو فرستادەکەی بێت؛ داخۆ زاتی خۆی چەندە مەزن و گەورە و شکۆمەند بێت )

(٧) کاتێك جوبرەئیل لە شێوەی خۆیدا لە ئاسۆی بەرزو بڵندا خۆی نیشانی پێغەمبەر(ﷺ)دا هەموو ئاسۆی پڕ کردبوو ئەوەندە مەزن بوو!!

(٨) پاشان تا دەهات نزیك دەبۆوە سەرئەنجام هاتە خوارەوەو شۆڕبۆوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) (لە شێوەی ئادەمیزادێکدا) .

(٩) ئەوەندە لێی نزیکبۆوە نێوانیان بەقەدەر دووکەوان ، یان کەمتریش بوو .

(١٠) ئینجا خوای گەورە لە ڕێگەی جوبرەئیلەوە نیگای کرد بۆ بەندەی خۆی ئەوەی کە نیگای کرد لە قورئانە پیرۆزەکەی .

(١١) ئەوسا ئیتر ئەوەی کە بە چاوی خۆی بینی لە ناخ و دڵ و دەروونیەوە قەناعەت و متمانەی بەتەواوەتی پێی هەبوو کە حەقیقەت و ڕاستەقینەیە و دورە لە خەیاڵبافی .

(١٢) ئیتر کەی ئەوە ڕاستە موجادەلە لەگەڵ پێغەمبەرەکەماندا دەکەن لەسەر شتێك کە ئەو دڵنیایە لە دیتن و پێشهاتن و روودانی .

(١٣) سوێند بێت جارێکی تریش لە هاتنە خوارەوەیەکی تردا جوبرەئیلی بینی(ئەو کاتەی کە بردی بۆ شەوڕەوی و میعراج)....

(١٤) لە کاتێکدا کە لە نزیك (سدرة المنتهی) دا بوو (کە هەندێك لە موفەسرین بە درەختێکی گەورەو ناوازە ناوزەدی دەکەن) .

(١٥) جا هەر لەوێدا بەهەشتی (مأوی) هەیە بە واتای لانەو جێگەی حەسانەوە و خۆشگوزەرانی بۆ ئیمانداران .

(١٦) جا ئەوەی کە درەختی - سدره - ی داپۆشی و بە دەوریدا کۆبۆوە مەگەر هەر خوا خۆی بزانێت کێن و چێن و ژمارەیان چەندە (لە غەیب و نهێنی و شاراوەکانن ، هەر خوای گەورە خۆی ئاگادارە پێیان) .

(١٧) لەو شەوەدا پێغەمبەر (ﷺ) نهێنی زۆرو زەبەندەی بە چاوی سەربینی ، وە نەبێت چاو بەستی لێ کرا بێت و لە سنوری خۆی ترازابێت ...

(١٨) بە ڕاستی لەو شەوەدا لە بەڵگە و موعجیزە مەزن و گەورەکانی پەروەردگاری خۆی بینی ، بە چاوی ، بەهەمو هەستی( بەدوور لەهەموو چەواشەکارییەك) .

*　　　*　　　*

لەم سەرەتایەدا ساتێك دەژین لەو ئاسۆ ئاسك و روناك و فراوان و بەربڵاوەدا کە دڵی محمد(ﷺ) تێیدا ژیاوە، ئێمەش لە خزمەتیدا بە باڵی نورانی بەرەو جیهانی بەرزو بڵندی خوایی باڵ دەگرینەوەو، گوێ بیستی ئاوازی ئاسك و بەردەوام دەبین لە توێی دارشتن و دەستەواژەی ئایەتەکاندا، وە لە سایە و سێبەر و ئاستەکانیدا کە خۆی یایدا نومایان دەکات.

ئێمە ساتێك لەگەڵ دڵی محمدا(ﷺ) ژیان دەبەینە سەر کە پەردەکان لادراون، بەربەستەکان نەماون، کاتێ کە لەگەڵ مەقاماتی بەرزو بڵندی خواییدا دەژی، دەبیستێ و دەبینێ، ئەوەی دەرکی دەکات بە تەواوەتی لە یادیا دەمێنێ، ئا ئەو حاڵەتانە چرکەساتێکن کە تایبەتی ئەو دڵە پاکە بوون، ئیتر ئەوە خوای گەورەیەو لای رەحمەت دەکاتەوە لە بەندەکانی و باسی ئەو چرکەساتانەیان بە

شێوازێکی کاریگەرو زیندوو بۆ دەکات، سایەو دەنگدانەوەو کاریگەرییەکانی دەگوێزێتەوە بۆ دڵی ئەوانیش، باسی سەفەری خاوەنی دڵە پاك و بێگەردەکە دەکات لە ئاستانەی جیهانە بەرزو بڵندەکانی خواوەندی میهرەباندا. هەنگاو بە هەنگاو؛ دیمەن لە دوای دیمەن، لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی تر؛ دەڵێی ئەوانیش ئامادەن لەو سەفەرە پڕ لە بەرەکەتە نورانیەدا.

باسەکە بەسوێندێك دەست پێدەکات، کە وەسفێکی زیندووە: باس لە جوڵەو پرشنگی ئەستێرە دەکات، پاشان سەرەولێژبوونەوەی کە نزیکە لە دیمەنی جوبرەئیلەوە کە سوێندی لەسەر خوراوە و فەرمویەتی:

﴿ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ ۝٥ ذُو مِرَّةٍ فَٱسْتَوَىٰ ۝٦ وَهُوَ بِٱلْأُفُقِ ٱلْأَعْلَىٰ ۝٧ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ۝٨ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ۝٩ فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ ۝١٠ ﴾

ئابەو شێوەیە هەر لە سەرەتاوە هاوسەنگی و هاوئاهەنگی و سازان لە دیمەن و جوڵەو سایەو کاریگەری یەکاندا بەدی دەکرێت.

سەرەتا تەفسیری جیاواز کراوە بۆ ئەو ئەستێرە تایبەتیەی کە سوێندی پێخوراوە، پێدەچێ مەبەست ئەستێرەی (شعری) بێت کە هەندێ کەس لەو سەردەمەدا دەیانپەرست و دواتریش ناوی هاتووە.

شایانی باسە خەڵکانی دێرین گرنگیان پێداوە .. میسری یە کۆنەکان کاتی لافاوی روباری نیلیان بە دەرکەوتن و تێپەڕبوونی ئەو ئەستێرەیە دیاری کردووە، لەبەر ئەوە چاودێریان کردووە و شارەزاکانیان سەیریان کردووە، هەروەها لە داستانی فارس و عەرەبەکانیشدا باسی هاتووە، بۆیە پێدەچێت

مەبەست هەر ئەو ئەستێرەیە بێت، وە ناوهێنانی بۆ هاوسەنگی و هاوئاهەنگی بێت .

هەروەها واتایەکی تریشی لێ وەردەگیرێت، ئەویش ئەوەیە ئەستێرە چەندە گەورە و مەزن بێت، سەرەو ژوور یان سەرەو لێژ دەبێتەوە و شوێنی خۆی دەگۆڕێت ـ شایانی باسە خۆر یەکێکە لەو ئەستێرانە، ئەستێرەی وا هەیە هەزاران ئەوەندەی خۆرە بەڵام لەبەر دووری لەڕادە بەدەریان بە بچوکی دێنە بەرچاو!! کە یەکێك لەوانە ئەسێرەی (شعری)یە !! ـ

جا ئەو ئەستێرانە چەندە گەورە بن شایستەی پەرستن نین، چونکە سەرەولێژ دەبن، شوێنیان دەگۆڕن ـ بەڵکو دەتەقنەوە و لەناو دەچن ـ ..

ئەو زاتەی کە شایستەی پەرستنە دەبێ مەحکەم و بەرز و بڵندو دەوامدار بێت .

ئەوە بابەتی سوێندەکەیە، بەڵام ئەوەی سوێند لەبەر ئەو خوراوە باسی پەیامی پێغەمبەرە(ﷺ) لەگەڵ باسی ئەو وەحی و نیگایەی کە باسی کردووە، ئەویش بەوەی کە پێمان رادەگەیەنێ کە :

هاوەڵەکەی ئێوە کەسایەتیەکی تێگەیشتوو پێگەیشتوو ژیرە، هەرگیز گومڕاو سەرلێشێواو نیە، هیدایەتی پێیەو ئاژاوەچی نیە، دڵسۆزەو هاندەر نیە بۆ ئاژاوە نانەوە، ئەو حەق و حەقیقەت رادەگەیەنێت لەلایەن زاتی حەقەوە، بەدوورە لە خەیاڵبافی و شت هەڵبەستن و داهێنانی نادروستەوە، ئەو دوورە لە ئارەزوو پەرستی لەڕاگەیاندنی پەیامەکەیدا، بەڕاستی ئەوە نیگایە پێی رادەگەیەنرێت، ئەویش بەوپەڕی ئەمانەت و راستگۆیی یەوە ، ئەوەی پێڕاگەیەنراوە دەیگەیەنێت ..

هەڵگری ئەم نیگایە کەسایەتیەکی ناسراوە، لە ڕێگەو ڕێبازەکەی دڵنیایە، سەفەرەکەی بینراوە ، پێغەمبەر (ﷺ) بەچاوی سەر هەموو شتێکی بینیوە، بە دڵ دڵنیا بووە، باسەکەی بەدوورە لە خەیاڵات، هەرگیز نەخەڵەتاوە.

دیارە کە ئەو فریشتەیەی ئەم پەیامە دەگەیەنێت فریشتەیەکی زۆر بەهێزو دەسەڵاتدارە، جوبرەئیلی ناوە، سڵاوی لێ بێت، هەر ئەویشە کە پەیامی خوای گەورە بەو پێغەمبەرەی کە دەیناسن رادەگەیەنێت. ڕێڕەوی گەیاندنی پەیامەکە بەو شێوازەیە، هەر ئەمەشە باسی گەشتەکە و وردەکاری یەکانی، ئەو فریشتەیە لە سەرەتای گەیاندنی پەیامەکەدا لە ئاسۆی بڵندەوە خۆی بە محمدی پێغەمبەر(ﷺ) لە شێوازی حەقیقی خۆیدا نیشانداوە .. لەو شێوەدا کە خوای گەورە دروستی کردووە، ئاسۆی پڕکردووە بە گەورەیی و شکۆمەندی خۆی. ئینجا بەرە بەرە دابەزیوە و هاتووە بۆ خزمەتی محمد(ﷺ)، بەتەواوەتی لێی نزیك بۆتەوە وەکو نزیك بوونەوەی دووکەوان لە یەکتر ـ ئەم دەستەواژەیە بۆ نزیکی تەواو بەکار دەبرێت ـ ئەوسا ئەو پەیامەی کە بڕیاربوو بە پێغەمبەری رابگەیەنێت ، رایگەیاندووە، بەو شێوازە گشتگیرو گەورە و پڕ شکۆمەندیو گرنگی یە.

جا دوای ئەوەی ئەوسا دیدارەکە لە دوورەوە بوو ئێستا لە نزیکەوە بوو بە نیگاو فێربوونو دیدارو دڵنیایی.ئەمەش حاڵەتێکە شت هەڵبەستن لە حاڵی وادا مەحاڵە، موجادەلەو دەمەدەمێ هەڵناگرێت، چونکە دڵو دەروون شایەتی حاڵ بوونو و دڵنیابوون لە حەقیقەتی پێشهاتەکە، دیارە کاتێ بە دڵو دەروون راستیەکان دەبینرێت، ئیتر بواری خەڵەتاندن نامێنێ بۆ چاوبەست، ئەو زاتە

فریشتە جوبرەئیلی بینیوەو بە تەواوەتی دڵنیابووە کە ئەو فریشتەی هەڵگری پەیامی خوایە، رەوانەکراوی پەروەردگاریەتی بۆلای ، تا فێری بکاتو داواشی لێ بکات ئەوەی فێری بووە رایبگەیەنێت.

ئیتر موجادەلەو دەمەدەمێ تەواو بوار نەماوە بۆ قسەو قسەلۆك دوای ئەوەی دڵ و دەروون و ناخ تەسلیم بووە، پێغەمبەر(ﷺ) بە دیداری جوبرەئیلی فریشتە(سلاوی لێ بێت) شاد بووە.

ئەمەش یەکەم جار نیە کە لە شێوازی تایبەتی خۆیدا بە چاو بینیویەتی بەڵکو جاری تریش بەو دیدارە شاد بووە، بەتایبەت لە شەوی شەوڕەوی و میعراج و بڵند بوونەوەدا کاتێ جوبرەئیل لە شێوازی خۆیدا خۆی نومایان کردووە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) لەلای (سدرة المنتهی)دا، سیدرەش درەختێکە و ئاماژەیە بۆ کۆتایی گەشتەکە لەگەڵ ئەودا، بەهەشتی (مأوی) ش لەو نزیکانەیە، دوا مەنزڵی گەشتی (معراج)ە، یاخود هاوەڵێتی یجوبرەئیل لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) تا ئەو سنورە بووە.

ئەو وەستا و محمد(ﷺ) مەودایەکی تر سەرکەوت زیاتر لە عەرشو تەختی فەرمانڕەوایەتی خوای گەورە نزیك بۆوە..

ئەمانەش هەمووی لە غەیبو نهێنی یەکانی خوای گەورەن، کە نیشانی بەندەی هەڵبژاردەی خۆی دا، لەو بارەیەوە هەر ئەوەندە هەواڵمان پێگەیشتووە، تێگەیشتن لەو باسانەش لە توانای دەركو زانستی ئێمە بەدەرە، مرۆڤ ناتوانێ تێیان بگات مەگەر بە ویستی خواوەندی دروستکاری محمد(ﷺ) و

دروستکاری فریشتەکان، ئەو زاتەی کە تەواو زاناو شارەزایە بە تایبەتمەندی یەکانی مرۆڤ و تایبەتمەندی فریشتەکان.

هەروەها باس لە ڕووداوەکانی (سدرة المنتهی) دەکات و زیاتر دوپاتی دەکاتەوە

﴿إِذْ يَغْشَى السِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ ⑯﴾ بەبێ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە و دیاری بکات، کە چی تێیەڕ دەبێت بە سیدرەدا، چونکە ڕووداوەکە زۆر مەزنترو گەورەترە لە باس کردنو دیاری کردنی بینراوەکانو ڕووداوەکان!!

ئەمەش هەمووی حەقیقەتێك بووە و بە دڵنیایی ڕوویداوە﴿ مَا زَاغَ الْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ⑰﴾ واتە: ئەم ڕووداوانە چاوبەستو دیدارێکی سادە نەبووە، بەڵکو دیدارێکی ڕوون بووە و لەوپەڕی حەق و دڵنیاییدا بینراوە کە گومانو دوودڵی هەڵناگرێت، بە تایبەت کە پەروەردگاری مەزن بەڵگە مەزنو گەورەکانی نیشان داوە؛ ـ زەمەن وەستاوەو کاتی لە کار خستووە ـ دڵی پیرۆزی ئاوێزەی ڕاستیەکان کردووە بە شێوازێکی ڕاستەوخۆو ئاشکراو ڕوون.

کەواتە مەسەلەی (وحی) شتێکی ڕوون و ئاشکرایە ، بینینێکی تەواو ڕاستو دروستە ، دڵنیایی یەکی بتەوە، پەیوەندی یەکی ڕاستەوخۆیە، زانستی یەکی دڵنیا بەخشە، هاوەڵی و هاوڕێیەتیەکی هەست پێکراوە، کەشتێکی واقعی یە، بە هەموو باس و دیدارو خواستەکانیەوە ..

لەسەر ئەو بنەمایەش محمدی هاوەڵتان(ﷺ) بانگتان دەکات لەکاتێکدا ئێوە ئینکاری دەکەنو بڕوای پێناکەنو گومانتان لە دروستی ئەو پەیامە هەیە کە پێی گەیشتووە.

محمدیش هاوەڵ و ناسراوی ئێوەیە ، بەچاکی دەیناسن و تاقیتان کردۆتەوە، کە چەندە راستگۆو ئەمینە، ئەو کەسایەتییەکی نەناس و نامۆ نیە لە نێوانتاندا، پەروەردگاری بەراستدانەریەتی بەڵکو سوێند دەخوات لەسەر راستگۆیی ئەو، چۆنیەتی گەیشتنی (وحی)و نیگاتان بۆ باس دەکات، بارودۆخەکەی، کێ رەوانە کراوە بۆلای، چۆن پێیگەیشتووە و لە کوێ بینیویەتی !!

* * *

ئا ئەمە ئەو کارو ئەرکەیە کە محمد(ﷺ) دڵنیایە لێی و بانگتان دەکات بۆ تێگەیشتن لێی و پەیڕەوی کردنی..

ئەی ئەوان پشت بەچی دەبەستن لە بواری بت و پەرستن و داستانە بێ سەروبنەکانیاندا؟ بە چ بەڵگەیەك لات و عوزا و مەنات دەپەرستن؟ چ بەڵگەیەکی پەسەندیان هەیە کە گوایە ئەوبتانە فریشتەن، فریشتەش کچی خواوەندن؟! بە چ بەڵگەیەك ئەوانە شەفاعەت و تکا دەکەن و شەفاعەت و تکایان لای خوای گەورە وەرگیراوە؟!

ئەم خورافات و خەیاڵاتانە لەم بەشەی تری سورەتەکەدا چارەسەر دەکات:

﴿ أَفَرَءَيْتُمُ اللَّتَ وَالْعُزَّىٰ ﴿١٩﴾ وَمَنَوٰةَ الثَّالِثَةَ الْأُخْرَىٰ ﴿٢٠﴾ أَلَكُمُ الذَّكَرُ وَلَهُ الْأُنثَىٰ ﴿٢١﴾ تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَىٰ ﴿٢٢﴾ إِنْ هِيَ إِلَّا أَسْمَاءٌ سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَءَابَاؤُكُم مَّا أَنزَلَ اللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَمَا تَهْوَى الْأَنفُسُ وَلَقَدْ جَاءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ الْهُدَىٰ ﴿٢٣﴾ أَمْ لِلْإِنسَٰنِ مَا تَمَنَّىٰ ﴿٢٤﴾ فَلِلَّهِ الْآخِرَةُ وَالْأُولَىٰ ﴿٢٥﴾ وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي السَّمَٰوَٰتِ لَا تُغْنِي شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعْدِ أَن يَأْذَنَ اللَّهُ لِمَن يَشَاءُ وَيَرْضَىٰ ﴿٢٦﴾ إِنَّ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ

بِالْآخِرَةِ لَيُسَمُّونَ الْمَلَائِكَةَ تَسْمِيَةَ الْأُنثَىٰ ﴿٢٧﴾ وَمَا لَهُم بِهِ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ ۖ وَإِنَّ الظَّنَّ لَا يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئًا ﴿٢٨﴾ ﴾

(١٩) ئینجا خوای گەورە دوای ئەوەی باسی شەو ڕەوی فەرموو ، پرسیار دەکات دەربارەی هەندێ لە بتە زلە ناشرینەکان تا موشریکەکانی قورەیش دابچڵەکێنێت کە بتەکانیان هیچ نین و هیچیان بەدەست نیە ، بۆیە دەپرسێ: باشە ئێوە سەرنجی لات و عوززاتان نەداوە ؟!

(٢٠) ئەی مەنات ، کە سێهەمیانە (بێ گیان ، بێ دەستەڵات ، بێ نرخ ، خەڵك دروستی کردوون ، لەم سەردەمەشدا ڕەنگە ملیارێك زیاتر لە خەڵکی ئەم سەر زەوی یەبتی بوداو بتی تر بپەرستن ...!!)

(٢١) باشە ڕاستە و ڕەوایە ئێوە کوڕان بۆ خۆتان و کچان بۆ خوا ناوزەد دەکەن (خوای گەورە دەیەوێت بە بیرو بۆچونی چەوتیان ڕەخنەیان لێ بگرێت ، ئەگینا کچ و کوڕ هەردوك بەندەی خوان و ئەوەی ئادەمن و پێوەر تەنها خواناسی و پارێزکاری و دینداری یە) ...

(٢٢) هەربۆیە ئەو دابەشکردنەی ئێوە ، دابەشکردنێکی نارێکەو دورە لە دادپەروەری یەوە!!

(٢٣) لە ڕاستیدا هەموو ئەو شتانەی کە ئێوە دەیانپەرستن خۆتان و باوو باپیرانتان داتان هێناون و ناوتان لێ ناون ، هیچ پەیوەندی بە خوای گەورەوە نیەو هیچ بەڵگەیەکی ڕەوانە نەکردووە لەسەر ڕەوا بونیان ، ئەو خەڵکە گومڕایە هەر هەموویان شوێنی گومان و ئارەزوی نەفس کەوتون ، لە کاتێکدا کە لە لایەن پەروەردگاریانەوە ئەم بەرنامە جوان و ڕێك و پێکەیان پێ ڕاگەیەنراوە .

(٢٤) باشە ، بۆچی ئادەمیزاد لە دنیادا هەموو ئاوات و ئارەزوەکانی دێتەی دی؟! ( خۆ ئەگەر هەندێکیشی هاتە دی ئایا دەوامی دەبێت؟!)

(٢٥) لە کاتێکدا خوای گەورە ئەو جیهان و ئەم دنیاشی هەیە (ئەو جیهان جێگەی حەوانەوەو بەختیاری و ژیانی هەمیشەیی یە بۆ ئیماندارانی کردەوە چاك ) .

(٢٦) ژمارەیەکی زۆر فریشتە هەن کە تکاو پاڕانەوەیان بۆ خەڵکی ناکام و بێ سودە ، مەگەر خوای گەورە خۆی مۆڵەت بدات بۆ ئەو کەسانەی کە شایستەن و ئەو زاتەش ڕازی بێت کە تکا کارەکە تکا بکات بۆ هەندێ کەس کە ویستی خوای گەورەی لەسەرە .

(٢٧) سەیرە ، ئەوانەی کە باوەڕیان بە قیامەت و لێپرسینەوە نیە ، فریشتەکانی خوای گەورە بە ئافرەت ناوزەد دەکەن ، (لە حاڵێکدا فریشتە دروستکراوی تایبەت و شاراوەن و نێرو مێیان نیە) ...

(٢٨) حاڵبوکی ئەوانە هیچ زانیاریەکیان لەو بارەیەوە نیە ، بەڵکو شوێنی گومانی بێ سەروبن کەوتون ، بەمەرجێ هیچ کاتێك گومان جێگەی حەق و ڕاستی ناگرێتەوە ...

* * *

سەیر لەوەدایە کە لات بەردێکی سپی تاشراو بوو هەندێ نەخش و نیگاری لەسەربوو!! خانویەکیان لە شاری (طائف) بۆ دروستکردبوو، پەردەو زێوانی تایبەتی هەبوو، حەوشەیەکی گەورەش بە دەوریدا دروستکرابوو، زۆر گرنگ بوو

لەلای دانیشتوانی (طائف) کە هۆزی (ثقیف)و ئەوانەی سەر بەو بوون شانازیان پێوە دەکردو خۆیان هەڵدەکێشا پێوەی لە نێو تیرەو تایەفەکانی تری عەرەبدا جگە لە قورەیش کە زێوانی کەعبە بوون، ئەو ماڵەی کە بە فەرمانی خوای گەورە (ابراهیم)و (اسماعیل) دروستیان کردبوو ـ لەوێش بتێکی لێ بوو ناوی (لات) بوو کە گوایە می یە و لە بەرانبەر ناوی پیرۆزی خوای گەورەدا، ناوی(الله)دا دایان نابوو ـ پاکی و بێگەردیو تەسبیحاتو ستایش بۆ پەروەردگاری بەرزو بڵندە لە بەرانبەر بتێکی ناشیرینو ناپوختو هیچ لێ نەهاتوودا .

(عزی)ش درەختێك بوو لە ناوچەی (نخلة) لە نێوان (مكة) و (طائف)دا هەندێ پەڕۆو پاتاڵیان پێدا هەڵواسیبوو، (قریش) بە شتێکی گەورە و گرنگیان دەزانی، هەر بۆیە (ابو سفیان) لە رۆژی غەزای (احد)دا وتویەتی : ئێمە (عزی)مان هەیە و ئێوە (عزی)تان نیە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی بە هاوەڵان: ئێوە بڵێن: خوای گەورە پشتو پەنای ئێمەیە و ئێوە پشتو پەناتان نیە ..

قورەیش وا گومانیان دەبرد کە (عزی) ناوێکی مێینەیەو بەرانبەرە لەگەڵ وشەی (العزیز)دا:

(مناة)یش لە (قدید) بووە لە نێوان (مكة ) و (مدینة)دا تیرەکانی (خزاعة) و (اوس) و (خزرج) لە سەردەمی نەفامیدا بە گرنگیان دەزانی و لەلای ئەوەوە نیەتی حەج و زیارەتی (کعبة)یان دەهێنا!!

لە دورگەی عەرەبدا زۆرێك لەو جۆرە بتانە هەبوون کە هۆزەکانی عەرەب بە گرنگیان دەزانین ، بەڵام ئەم سیانە لە هەموویان گرنگتر بوون بەلایانەوە.

عەرەبەكان گومانیان وابوو كە ئەم بتانە رۆڵی فریشتە دەبینن، سەیر لەوەدا بوو كە ئەوان لە خۆیانەوە فریشتەیان بە مێینە دەدایە قەڵەمو - بە نەفامی و كێلی - دەیانوت كچی خواوەندن ، ئیتر بەو بیانووەوە بتەكانیان دەپەرست .. زۆرجار بە تێپەڕبوونی كاتوزەمان (معبود)ی سەرەكی فەرامۆش دەكراو ئەو بتانە لەلایەن زوربەی خەڵكیەوە دەپەرستران!! هەمیشە كەمێك ژیرو روناكبیر هەبوون كە بتەكانیان بە شتێكی پڕو پوچ دەزانی و یەكخواناس بوون.

هەربۆیە كاتێ خوای گەورە باسی ئەو بتانە دەكاتو سەرسامی دەردەبڕێ لێیان و لە پەرستنیان، هەروەها ئەو بیروباوەڕە سەقەتەشیان بەرپەرچ دەداتەوە كە خوای گەورە كچان هەڵبژێرێ بۆ خۆی، بەلام بۆ ئەوان كوڕان بە ڕەوا بزانێ، چونكە هەرچی لە ئاسمانەكانو زەویدا هەیە ، هەمووی بەندەی ملكەچی ئەو زاتەن، جگە لە ئادەمیزادو جنۆكە كە ئازادییان دراوەتێ، بەلام لە گەلێ روەوە ئەوانیش بەناچاری ملكەچو فەرمانبەردارن، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە ئەو بتانە بە بیروباوەڕی چەوتیان پەیوەندی یەكیان بە فریشتەكانەوە هەیە، فریشتەكانیش بە حسابی ئەوان كچی خواوەندن!! لە حاڵێكدا ئەو نەفامانە خۆیان بە بوونی كچ سەغڵەت بوون، كەچی بۆخوای گەورە بەڕەوایان دەزانی!!بە مەرجێ هیچ بنەمایەكیان نەبوو بۆئەم بیرو بۆچوونە - شایانی باسە نێچر و مێ لە جیهانی مرۆڤدا یەكسانن و پێوەر لای خوای گەورە تەقواو دینداری یە هەروەك لە ئایەتی (١٣) ی سەرەتی (الحجرات)دا باسی فەرمووە :

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ١٣ ﴾

(١٣) ئەی خەڵکینە (لە هەموو زەمان و زەمینێکدا) ئێمە هەموتانمان لە نێرو مێیەك دروستکردووە (کە باوکە ئادەم و دایە حەوایە ، پاشان بە تێپەڕبونی زەمان) کردومانن بە چەندەها گەل و تیرەو هۆزی جیاواز (لەڕوی ڕەنگ و زمان و داب و نەریت و ...تد) تا پردی پەیوەندی لە نێوانتاندا دروست ببێت و یەکتر بناسن و هاوکاری یەکتر بن ، جا لە ڕاستیدا بەڕێزترینتان لای خوای گەورە ئەوانەتان کە زیاتر خواناسن ، زیاتر خۆیان لە حەرام و گوناهو خراپە دەپارێزن، زیاتر خزمەتگوزارن.......تد دڵنیاش بن کە ئەو خوایە تەواو زانایە بە هەموو شتێك ، تەواویش ئاگادارە لە هەموو شتێك ، ئاگادارەبە ناخ و نیەتی تاکە تاکەی بەندەکانی لە هەمو کات و ساتێکدا.

دیارە خوای گەورە (سبحانە و تعالی) لەسەر بنەمای بیروبۆچوونی سەقەت و نارێکیان لێپێچینەوەیان لەگەڵ دەکات و بە سوك و بێ نرخی دەڕوانێتە بیروباوەڕیان دەکات، کاتێ کە بۆخۆیان کوڕان بەڕەوا دەزانن، بەڵام بۆ خوای گەورە، کچان !!

ئەگەر وابێ دیارە کە زۆر نادانو دوورن لە دادپەروەری یەوە، چونکە ئەوە دابەشکردنێکی زۆر ناڕەوایە!!

بە مەرجێ هەموو ئەو شتانە خەو و خەیاڵەو هیچ بنەمایەکی لە (واقع)دا نیەو هیچ بەڵگەو پاساوێك نایگرێتەوە:

﴿ إِنْ هِيَ إِلَّا أَسْمَاءٌ سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَاؤُكُم مَّا أَنزَلَ اللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَانٍ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَمَا تَهْوَى الْأَنفُسُ وَلَقَدْ جَاءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ الْهُدَىٰ (٢٣) ﴾..

(٢٣) لە ڕاستیدا هەموو ئەو شتانەی کە ئێوە دەیانپەرستن خۆتان و باوو باپیرانتان داتان هێناون و ناوتان لێ ناون ، هیچ پەیوەندی بە خوای گەورەوە نیەو هیچ بەڵگەیەکی ڕەوانە نەکردووە لەسەر ڕەوا بونیان ، ئەو خەڵکە گومڕایە هەر هەمویان شوێنی گومان و ئارەزوی نەفس کەوتون ، لە کاتێکدا کە لە لایەن پەروەردگاریانەوە ئەم بەرنامە جوان و ڕێك و پێکەیان پێ ڕاگەیەنراوە .

ئەم ناوانە (لات ، عوزا ، مەنات) و ئەوانی تریش کە هەندێ جار بە خوا، یان فریشتە ناوزەدیان دەکەن، فریشتەش بە کچ دەدەنە قەڵەم و دەڵێن کچی خوان، ئەوانە هەر هەمووی هیچ بنەمایەکیان نیەو دوورن لەڕاستی یەوە ، خوای گەورە هیچ بەڵگەیەکی پێ نەداون تا بیانپەرستن، هەرچیش خوای گەورە لای پەسەند نەبێت هیچ هێزو دەستەڵاتێکی نیە ، چونکە هیچ بنەمایەکی نیە .. حەقیقەت سەنگینی و هێزی خۆی هەیە، حەق دەستەڵاتێکی هەیە بەسەر دڵ و دەرونەکاندا، بەڵام ناڕەوا و ناحەق سوکەو هیچ سەنگینی یەکی نیە، لاوازەو هیچ هێزی نیە، بێ نرخەو هیچ دەستەڵاتێکی نیە.

جا سەیر لەوەدایە کە لە ناوەڕاستی ئایەتەکەداوازیان لێ دێنێ بە خۆیان و خەوو خەیاڵ و داستانە بێ سەروبنەکانیانەوە، واز لەوە دێنێ کە روو بەوان فەرمایش بکات، هەر حسابیان بۆ ناکات، بەڵکو بە شێوازێکی ناڕاستەوخۆ دەفەرموێت : ﴿...إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَمَا تَهْوَى الْأَنفُسُ...﴿٢٣﴾﴾ هیچ بەڵگەو زانیاری و دڵنیاییەکیان پێ نیە ، بیروباوەڕیان لەسەر بنەمای گومان دروست بووە، بەڵگەکانیان سەرچاوەی ئارەزووە.

بە مەرجێ عەقیدەو بیروباوەڕ بواری گومانو ئارەزوو ناهێڵێتەوە، بۆیە پێویستە مرۆڤ بە تەواوەتی دڵنیا بێت و خۆی دابڕێ لە هەموو ئارەزوو مەبەستی تر، جا ئەوان ئێستە هیچ بڕوبیانویەکیان نەماوەچونکە هیدایەت لەلایەن پەروەردگاریانەوە بۆ هاتووە ـ لە ڕێگەی پێغەمبەرێکی راستگۆوە پێیان راگەیەنراوە: ﴿...وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٢٣﴾﴾ ئیتر هیچ بڕوبیانوویەکیان نەماوە جا هەرکات ئارەزووەکانی نەفس کاریگەریی هەبوو لەسەر هەر دۆزو بابەتێك، ئیتر ئەوە ڕێگەو ڕێبازی دروست ون دەکات، ئاراستەکردنو ڕێنمونی کردنیش سوودی نابێت، چونکە هۆکارەکە ئەوە نیە کە حەق ناڕوون بێت، بەڵگە لەسەری لاواز بێت، بەڵکو ئەوە ئارەزووپەرستیو سەرکەشی یەو مەبەستی تری لە پشتەوەیە، بۆیە دەگەڕێن بۆ بڕوبیانوو هێنانەوە بۆ ڕێبازی چەوتیان!!

ئەمەش حاڵەتێکی زۆر ناباشو خراپە کە توشی نەفس و دڵ ودەروونی مرۆڤ دەبێت، ئیتر بەرنامەی پاكو بێگەرد سوودی نابێ بۆیو بە هیچ بەڵگەیەکیش بڕوا ناکات!!

هەر بۆ قورئان بە ناڕەزایی دەربڕینەوە پرسیار دەکات: ﴿أَمْ لِلْإِنسَٰنِ مَا تَمَنَّىٰ ﴿٢٤﴾﴾ مەگەر مرۆڤ هەموو ئاواتو خواستەکانی دێتە دی؟ .. هەرچی حەزی لێ دەکات دەبێتە حەقیقەتو (واقع) ! بێگومان هەرگیز وا نیە . چونکەحەق حەقە و (واقع)یش (واقع)ە ئارەزووەکانی نەفسو دەروون ناتوانن کاریگەرییان لەسەر گۆڕینی راستیەکان هەبێت، بەڵکو ئەوە ئارەزووپەرستی یە مرۆڤ گومڕا دەکات، وە بە ئاواتی بێ سەروبەر لەناوی دەبات.. چونکە مرۆڤ زۆر لەوە لاوازترە کە

سروشتی شتەکان بگۆڕێت، چونکە هەمووشت بەدەست خوای گەورەیەو هەر ئەو زانە دەتوانێ سروشتی شتەکان بگۆڕێت .. هەموو گۆڕانکارییەك بەدەست پەروەردگاری مەزنەلەم جیهانو لەو جیهان چۆنی بوێت ئاراستەی دەکات:

﴿ فَلِلَّهِ الْآخِرَةُ وَالْأُولَىٰ ﴿٢٥﴾ ﴾ بیرمان نەچێت کە لەم ئایەتەدائەو جیهانی پێش ئەم جیهان ناوبردووە. بۆ ڕێکخستنی سەرەوای ئایەتەکە لەلایەکەوە، هەروەها بۆ بیرخستنەوەی ئەوەی کە ئەو جیهان گرنگترە لەم جیهان، هەروەکو سروشتی قورئان کە هەمیشە واتاو مەبەست لەگەڵ شێوازی داڕشتنی ئایەتەکاندا هاوئاهەنگ دەکات، بەبێ ئەوەی هیچ ناڕێکیەك بۆ هیچ لایەکیان دروست بکات! ئەمەش هەروەك هەموو ئەو شتانەیکە دەستکاری خواوەندی زاناو دانان، چونکە ئەو زاتە هەموو گەردوون و بونەوەری بەجوانی دروست کردووە، هەمویشی هاوئاهەنگ لەگەڵ ئەو ئەرکەدا کە پێیسپێردراوە!!

کەواتە کاتێ هەمووشت لەم جیهانو لەو جیهان بەدەست خوای گەورە بێت ئیتر خەور خەیاڵی هاوەڵگەریی کە گوایە فریشتەکان شەفاعەتو تکایان بۆ دەکەن لای خوای گەورە ئاواتێکی پوچ و بێ بنەمایە، هەروەها باوەڕیان وا بووە کە بۆیە ئەو بتانە دەپەرستن تا لەخوای گەورە نزیکیان بکەنەوە.. بێگومان ئەوەش هەر بیروباوەڕێکی پوچە .. چونکە ئەو فریشتانە بەبێ مۆڵەتی خوای گەورە هیچ جۆرە شەفاعەتو تکایەك ناکەن :

﴿ وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي السَّمَاوَاتِ لَا تُغْنِي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئًا إِلَّا مِن بَعْدِ أَن يَأْذَنَ اللَّهُ لِمَن يَشَاءُ وَيَرْضَىٰ ﴿٢٦﴾ ﴾

(٢٦) ژمارەیەکی زۆر فریشتە هەن کە تکاو پاڕانەوەیان بۆ خەڵکی ناکام و بێ

سودە ، مەگەر خوای گەورە خۆی مۆڵەت بدات بۆ ئەو کەسانەی کە شایستەن و ئەو زاتەش ڕازی بێت کە تکا کارەکە تکا بکات بۆ هەندێ کەس کە ویستی خوای گەورەی لەسەرە .

هەر بۆیە بڕو بیانوو بەڵگەیان لە بناغەدا پوچەڵە، هەروەکو لە تەفسیری ئایەتەکانی پێشوودا باسکرا،چونکە دەبێ عەقیدەو بیروباوەڕ هیچ جۆرە مژمۆڵی و گرێ کوێرەیەکی تێدا نەبێت، چونکە هەمووشت و هەموو کارێك لەو جیهان و لەم جیهان بەدەست خوای گەورەیە، ئاوات و هیواو ئارەزووەکانی مرۆڤ ناتوانێ حەق و (واقع) بگۆڕێت، شەفاعەت و تکاکارییش بەبێ مۆڵەت و رەزامەندی خوای گەورە ناکرێت، هەمووشت لە کۆتاییدا؛ وە لە هەردوو جیهاندا بەدەست ئەو زاتەیە، دەبێ هەر فەرمانبەرداری ئەو بین و چاوەڕێی لوتف و فەزڵ و بەخششەکانی ئەو بین.

جا کاتێ کە باسەکە دەگاتە ئەو سنورەی کە بیروباوەڕی شیرك و هاوەڵگەری پێ ریسوا دەبێت، ئەوانەی باوەڕیان بە قیامەت نیە تەواو شەرمەزار دەبن، بە تایبەت چونکە شەریك و هاوەڵ بۆ خوای گەورە بڕیار دەدەن و بوونی کچان بۆ خوا بە ڕەوا دەزانن و فریشتەکان بە کچ ناوزەد دەکەن!

دوای ئەمانە گوتار ئاراستەی پێغەمبەر(ﷺ) دەکات، تا پشتگوێیان بخات و گرنگییان پێنەدات، وە هەواڵەی ئەو خوایەیان بکات کە چاك و خراپ بە تەواوەتی دەناسێ، پاداشتی باوەڕدار دەداتەوەو تۆڵەش لە گومڕا دەسێنێ، چاوپۆشی لەو گوناهانە دەکات کە خاوەنەکەیان سوور و بەردەوام نیین لەسەری، ئەو زاتە تەواو ئاگایە بە نیەت و نهێنی یەکان، چونکە ئەو

بەدیهێنەری مرۆڤە، لە هەموو شتێکیان شارەزایە، ئاگاداری هەموو قۆناغەکانی ژیانیانە:

﴿ فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَ مَبْلَغُهُم مِّنَ الْعِلْمِ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اهْتَدَىٰ ﴿٣٠﴾ وَلِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ لِيَجْزِيَ الَّذِينَ أَسَاءُوا بِمَا عَمِلُوا وَيَجْزِيَ الَّذِينَ أَحْسَنُوا بِالْحُسْنَى ﴿٣١﴾ الَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الْإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ إِلَّا اللَّمَمَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ وَاسِعُ الْمَغْفِرَةِ ۚ هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُم مِّنَ الْأَرْضِ وَإِذْ أَنتُمْ أَجِنَّةٌ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ ۖ فَلَا تُزَكُّوا أَنفُسَكُمْ ۖ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اتَّقَىٰ ﴿٣٢﴾ ﴾

(٢٩) جا کەواتە تۆش ئەی محمد ﷺ ، ئەی ئیماندار ، گوێ مەدە بەو کەسەی کە یاخی بووە لە یادو بەرنامەی ئێمە (وە بە هیچ بەڵگەو ئایەتێك بڕوا ناکات) بەڵکو مەبەستی تەنها ژیانی ئەم دنیا تەمەن کورتەیە (ئایندەی خۆی فەرامۆش دەکات) .

(٣٠) ئەوانە هەرئەوەندە تێگەیشتنیان لە ڕاستیەکان هەیەو هەر ئەوەندەی لێ دەزانن ، جا لە ڕاستیدا هەر پەروەردگاری تۆیە کە زانیاری وزانستی بێ سنورەو ئاگادارە لەوەی کە کێ لە ڕێبازی ئەو زاتە لایداوەو گومڕایە ، وە کێش ڕێبازی هیدایەت و دینداریو خواناسی گرتۆتە بەر .

(٣١) هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدا هەیە ، هەر خوای گەورە خۆی خاوەنیانە (ئەم ئادەمیزادەی دروستکردوەو ، سەرپشکی کردووە ، بە ئازادی دەتوانێ هەر ڕێگەو ڕێبازو دینێك کە بیەوێت هەڵبژێرێت ، پاشان هەر ئەو خوایە قیامەتیش بەرپا دەکات) تا پاداشتی ئەوانەی کە گوناهو تاوان دەکەن و

باوەڕیان نەبووە بە گوێرەی بیرو باوەڕو کردەوەکانیان بداتەوە ، هەروەها بە باشترین شێوە پاداشتی ئەوانەش بداتەوە کە چاکە و چاکەکاریان کردوە.
(٣٢) جا ئەوانەی کە لە گوناهە گەورەو کردارە ناپەسەندەکان خۆیان بە دوور دەگرن ، جگە لە وردە گوناهان ، بە نیسبەت ئەوانەوە پەروەردگاری تۆ ئەی محمد ﷺ ، ئەی ئیماندار، چاوپۆشی و لێبوردنی زۆر فراوانە ، چونکە ئەو زاتە چاکتان دەناسێت هەر لەو کاتەوە کە ئێوەی لە خاکی زەوی بەدیهێناوە و پاشان کردونی بە کۆرپەلە لە سکی دایکتاندا (لە هەمو قۆناغەکاندا ئاگای لێتان بووەو هیچ شتێکی لێ پەنهان نەبووە ، جا ئیتر بەردەوام هەوڵبدەن بۆ چاکەو چاکەکاریی ، چاکەکانتان بەکەم بزانن و گوناهو هەڵەکانتان بە زۆر) نەکەن خۆتان بە چاك بزانن و باسی خۆتان بە چاکە بکەن ، چونکە هەر خوای گەورە خۆی دەزانێت کێ تەقوادارو دیندارو خواناسە .

* * *

سەرەتا فەرمان دەدا بە پێغەمبەر(ﷺ)کە ڕووی پیرۆزی وەرچەرخێنێ لەو موشریکانەی کە باس کران لەم سورەتەدا، ئەوانەی ڕۆچوون لە خورافاتداو حەز بە باسی خوای گەورە ناکەن و باوەڕیان بەو جیهانیش نیە، مەبەستیان تەنها دەستکەوتەکانی دنیایە.. شایانی باسە ئەم فەرمانە ڕوودەکاتە هەموو موسڵمانێك کە گوێنەدان بەو جۆرە کەسانەی کە حەز بە باسی زاتی خوا ناکەن و باوەڕیان بەو زاتە نیە، هەموو ئاوات و مەبەستیان تەنها ژیانی دنیایە، باوەڕیان بە قیامەت و ئەو جیهان مۆڵەقەو حسابی بۆ ناکەن، وا بیردەکەنەوە کە سەرەتا و

کۆتایی مرۆڤ هەر ئەمەیە کە لە دنیادا بۆیان پێش دێتو ئامانجێکی تر لە بوونیاندا نیە!!

ئیتر بەرنامەی ژیانیان لەسەر ئەو بنەمایە رێکدەخەنو ویژدانو دەروونی خۆیان دادەماڵن لە بڕوا بوون بە خوایەك کە هەمووشت رێکدەخات، دواتریش لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکات، دوای ئەم گەشتە سنوردارەی لەسەر زەوی پەکەیدا دەیکەن.

جا سەیر لەوەدایە کە لەم سەردەمەی ئێمەشدا ماددە پەرستان بیروباوەڕێکی لەو شێوازەیان هەیەو - خۆشیان بە پێشکەوتووخوازو رۆشنبیر دەزانن!! -

بێگومان ئەو کەسەی باوەڕی بەخوای گەورەو ئەو جیهان هەیە ناتوانێ خۆی سەرگەرم بکات بەوانەوە کە پشت دەکەنە باوەڕبوون بە خوای گەورەو چەمکەکانی تری ئیمان، کاتی زێڕینی خۆی لەگەڵ ئەواندا بەزایە نادات ..

چونکە هەرلایەك بەرنامەی خۆی هەیە بۆ ژیانی دنیاو هەرگیز لە هیچ شتێکدا بەیەك ناگەن، نە لە نەخشە رێگا، نە لە هیچ خاڵێکدا، چونکە هەرچی پێوەرەکانی ژیان هەیە ، هەرچی بەهاو ئامانجەکانی هەیە، جیاوازن لە بیروبۆچوونی هەر لایەکیاندا، بۆیە ناتوانن لە ژیانی دنیادا بەتەواوەتی هاوکاری یەکتر بن، یاخود چالاکی هاوبەش لە هەموو بوارێکدا ئەنجام بدەن، چونکە جیاوازییەکی سەرەکیان هەیە لە بۆچوونیان دەربارەی بەهاکانی ژیانو ئامانجو بەرنامەی چالاکی تیایدا..

جا چونکە هاوکاری و بەشداری ئەستەمە، ئیتر گرنگیدان بە گرنگەکانی ئەوانیش سنوردار دەبێت ..

لەڕاستیدا ئیماندار کاتی خۆی بەزایە دەدات کاتێ گرنگی بەو جۆرە کەسانە دەدات کە حەز بە باسی خوای گەورە ناکەن، هەموو ئاواتیشیان تەنها ژیانی دنیایە، چونکە ئەوکات ئیماندار تواناکانی کە بەخششی خوای پەروەردگارە لە جێگەی خۆیدا بەکار نابات.

مەبەستێکی تریش هەیە لە گوێ نەدان بەو خەڵکە بێ دینە، ئەویش ئەوەیە کە کارو کردەوەی ئەوانە بە پوچ و بێ نرخ بزانرێ، ئەوانەی کە بڕوایان بەخوای گەورە نیە و تەنها دنیایان دەوێت. لە پڕێکدا یاخود لە چرکە ساتێکدا مایەپوچ و دەست بەتاڵ دەبن..هەرچەندە خاوەنی پلەو پایەو پارەو سامان بن ئەوانە لە حەقیقەتەوە دوورن و لێیان پەنهانە، دەرکی ناکەن، لە پشتی بەربەستەکانەوەن، بەربەستەکانی ژیانی دنیا .. هەر ئەوەندەش عەقڵیان بڕ دەکات !!

ئەوەش ئاستێکی نزمو بێ نرخە، با گەورە و گرنگیش بێتە بەرچاو، هەر سنوردارە، با گشتگیریش خۆی بنوێنێ، گومڕاکەرە با وادەرخات کە گرنگ و ڕێنمونیکارە .

لەڕاستیدا ئەو کەسەی کە بە دڵ و گیان هەستو نەستو هزریەوە ئاوا خۆی قەتیش دەکات، ئەوە دیارە کە شارەزای هیچ شتێکی بەهادار نیە.

چونکە هەر بە تەماشاکردنێکی سادە ، جیهانێکی گەورە و شکۆدار خۆی دەنوێنێ کە خۆی دروستکاری خۆی نیە، هەر بوونی بەم شێوەیە بیرۆکەی (صدفە) و ڕێکەوت پوچ دەکاتەوە، ئاشکرایە کە بە هەوانتەو بێ ئامانج دروست نەکراوە، کارێکی بێ هودەیە گەر مرۆڤ تەنها بۆ ئەم ژیانە دروست کرابێتو بە نەمانی کۆتایی بە هەموو شتێك بێت.!!

لەڕاستیدا زانینی حەقیقەتی ئەم گەردوونە لە هەر لایەکیەوە بەسە بۆ باوەڕهێنان بە زاتی دروستکار، هەروەها زامنە بۆ باوەڕ هێنان بەو جیهان، چونکە بەو کارە بێ سەروبەرەیی لە دروستکاری مەزن ، پەروەردگاری داهێنەر دوور دەخرێتەوە ، کە ئەم گەردوونە گەورە و مەزنو فراوانەی بەدی هێناوە.

هەر بۆیە دەبێ زۆر گوێ نەدەین بەوەی کە پشت دەکات لە بەرنامەی خوای گەورەویادی ئەو زاتە ناکاتو تەنها مەبەستی ژیانی دنیایە ، ئەو پشت کردن و گوێ نەدانە بۆ ئەوەیە کە خۆ ماندو نەکەین لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانەدا چونکە شایستە نین، ئەو کەسەی ئەوەندە بیرکردنەوەی تەسك بێت شایانی گرنگی پێدان نیە، ئێمە ئەم فەرمانە خوایی یە دەبێ ئەنجام بدەین، نەك وەکو جولەکە ـ خوا پەنامان بات ـ بڵێین : گوێ بیست بووین بەڵام یاخی دەبین و ئەنجامی نادەین . ﴿ ذَٰلِكَ مَبۡلَغُهُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱهۡتَدَىٰ ﴿٣٠﴾ ﴾

چونکە خوای گەورە گومڕاکان دەناسێ، بۆیە نایەوێ پێغەمبەرەکەیو شوێنکەوتووانی خۆیان بەو خەڵکە سەرگەردانەوە خەریك بکەن، یان هاوڕێیەتیان بکەن، یاخود گرنگیان پێبدەن ، ـ بەتایبەتە کە بۆمان دەرکەوت کە ناخیان رەشە و بەهیچ بەڵگەیەك قوناعەت ناکەن، مەگەر ئەوەندەی کە ببێتە (حجە)ت لە قیامەتدا پێی دەمکوت بکرێن ـ

هەروەها نابێ بخڵەتێین بەو زانستە روکەشە گومڕاسازو ناتەواوەیان کە لە سنوری ژیانی دنیا تێناپەڕێت، وە بۆتە کۆسپ لە نێوان تێگەیشتنی مرۆڤو راستی یە پوختەکاندا، جا ئەوەی لە ڕاستی شتەکان تێبگات ئەوە پەلکێشی

دەکات بۆلای ئیمانی دامەزراو بەخوای گەورە، بەو جیهان ، وە لە چەسپاندنی بە دنیاو زەمین گیریو ئەم ژیانە کورتو سنوردارەی دەرباز دەکات.

سەیر لەوەدایە ئەو زانستو زانیاری یەی کە بێ دین و گومڕاکان پێیگەیشتوون لەبەرچاوی خەڵکی سادەو هاوشێوەیان، ئەوانەی دڵیان داخستووە و هەست بە نهێنیو دەستی قودرەتی خوایی ناکەن، زۆر شتێکی گەورە و مەزنەو کاریگەریشی هەیە لەسەر گۆڕەپانی ژیانی دنیا، جا ئەو دەستەڵات و پێشکەوتنەیان لە سیفەتی گومڕایی و سەرگەردانی و نەفامی نایانپارێزێت، چونکە ئەو پەیوەندی یەی کە هەیە لە نێوان ئەم بونەوەرەو دروستکاریدا ، هەروەها پەیوەندی نێوان کارو کردەوەی مرۆڤو پاداشتەکەیدا، ئەم دوو حەقیقەتە پێویستن بۆ هەموو زانستێکی دروست، گەر وانەبێ زانستەکان توێکڵنوکاریگەرییان لەسەر ژیانی مرۆڤ نابێتو بەرەو ئاستێکی بالا نایبەن، چونکە نرخی هەر زانستێك پەیوەستە بە کاریگەریی لەسەر دڵ و دەروونو ویژدانی مرۆڤو چەندە لە کردارو رەفتاریدا رەنگ دەداتەوە .. گەر وانەبێت ئەوە تەنها ئامێرەکان پێش دەکەون، بەلام خەڵکەکە لە زەلکاودا گیر دەخۆن ، بەڕاستی ئەو زانستە بەلایە کە ئامێرەکان لە سایەیدا پێش دەکەون لەسەر حسابی پۆخڵ کردنی رۆحو رەوشتی خەڵكو کۆمەڵگە !!

کاتێ مرۆڤ هەست دەکات بەدیهێنەرێکی هەیە؛ ئەویش و ئەم گەردوونەشی بە یاسایەکی گشتگیرو هاوئاهەنگ و رێكو پێك؛ بۆ خزمەتی ئەم دروست کردووە، هەستو نەستی بەرانبەر ژیان دەگۆڕێت ، بەرانبەر ئەوانەی کە دەژین لە دەورو بەریدا، بەرانبەر ئەو شتانەی کە دەوری داوە، لە گیاندارو گیاو دارو بێ گیانو ... تد .

ئەو کات هەست دەکات کە بوونی لەسەر گۆڕەپانی ژیان شتێکی بەنرخ و بەهادارەو ئامانجی گشتگیرو بڵندو گەورەی لە پشتەوەیە، چونکە بوونی مرۆڤ پەیوەستە بە گەردوونەوە، ئەوکات هەست دەکات کە زۆر گەورەترە لەم بوونەی دنیای بۆ ماوەی چەند رۆژێك ـ یاخود ئەوپەڕی چەند ساڵێکە ـ لەسەر گۆڕەپانی ژیان، وە لە خێزانەکەشی کەلە چەند کەسێك پێك دێن، وە لە قەوم و گەلەکەی، لە نیشتمان و وڵاتەکەی، لە چین و توێژەکەی زۆر گەورەترە و فراوانترە، ئەو چین و توێژەی کە ماددەپەرستان دەهۆڵ و زوڕنایە دەوردا لێدەدەن، چونکە ئیمان و باوەڕەکەی زۆر بەرزترو بڵند ترو بەنرخترە لە هەموو ئەو شتانەی کە خەڵکی نەشارەزاو تێنەگەیشتوو لەدین گرنگی پێدەدەن!!

هەروەها ئەو هەستەی کە مرۆڤ بەهۆی ئیمانیەوە بۆی دروست دەبێت کە خواوەندی بەدیهێنەر لەو جیهان لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکات و پاداشتی لەسەر بنەمای ئیمان و کردەوەکانی دەداتەوە ئەو هەستە کاریگەریی لەسەر بیروبۆچوون و پێوەرو ئامانج و هاندەرەکانی دەبێت، هەرچی هەڵسوکەوت و کردارو رەفتاریەتی دەیخاتە چوارچێوەیەکەوە بە شێوازێك کە بەردەوام لە دڵ و دەروون و ناخیدا حساب بۆ چارەنووسی خۆی بکات، بێگومان ئەو هەست کردنەی هێزو توانای پێدەبەخشێت و هەوڵدەدات توێشووی چاکی زۆر بێت. ـ چاکەکانی بەکەم دەزانێت و بەردەوام لە خەمی زۆرکردنیاندایە، گوناهەکانی بە زۆر دەزانێت و بەردەوام لە خەمی کەم کردنەوەیاندایە!! ـ

چونکە رزگار بوون، یان تیاچوونی پەیوەستە بە بێداری یەکەی و کاریگەریی لەسەر نیەت و کردەوەکانی. ئەوسا مرۆڤ دەتوانێ دەستەڵاتی هەبێت بەسەر خۆیدا، چونکە چاودێری بێدارە ! لێپرسینەوەی کۆتایی لەوێ چاوەڕێی دەکات. لەلایەکی ترەوە دڵنیایە کاتێ کە خێرو چاکە ئەنجان دەدات،دڵی خۆشە چونکە سەرکەوتنی بەدەست هێناوە، هەتا ئەگەر لە دنیادا هەندێ جار شکستی خواردبێ، ئەو هەر ئەرکی سەرشانی ئەوەیە کە پشتیوانی لەخێر بکات و خەبات لە پێناویدا ئەنجام بدات، چونکە بەلایەوە چونیەکە گەر لەدنیادا شکست یان سەرکەوتنی بەدەست هێنا، چونکە پاداشتی کۆتایی لەوێیە و لەو جیهانە !!

بەڕاستی ئیمان و باوەڕ بە خوای گەورەو بەو جیهان دۆزێکی گەورە و گرنگە، بابەتێکی بنەڕەتی و سەرەکی یە لە ژیانی مرۆڤدا، پێویستی یەکی زۆر گرنگترە لە خواردن و خواردنەوە و پۆشاک، مرۆڤ بوونی بەمەوە بەستراوە، گەر وانەبێت ئەوە دەبێتە ئاژەڵێك لەو ئاژەلانە - ئاژەڵ هەتا دڕندەکانیشیان زۆر زیانبەخش نین، بەڵام ئەو مرۆڤەی کە خوانەناس بێت حساب بۆ قیامەت ناکات و دەبێتە ئاژەڵێکی دڕندە کە لە پێناو ئارەزووەکانیدا یاخود ئامانجە پوچەکانیدا ملیۆنەها کەس تیابچێ باکی نیە - !!

جا کاتێ کە پێوەرو ئامانج مەبەستەکان جیاواز دەبن، هەموو ئەو جیاوازیانە رەنگ دەدەنەوە لە ژیاندا، ئیتر بوار نامێنێ بۆ بەشداری و ئەرێنی دیگەران، یان ئەنجامی مامەڵە، یاخود ناسینی یەکترو پێکەوە ژیان ..

هەر بۆیە ئەستەمە کە پەیوەندی و دۆستایەتی و مامەڵەو هاوکاری و کڕین و فرۆشتن و خەمخۆری بۆ یەکتر دروست ببێ لەنێوان کەسێکدا کە ئیمان و باوەڕی

بەخوا هەبێت لەگەڵ کەسێکدا کە پشتی لەو زاتە کردبێت و هەموو ئاواتی ژیانی دنیا بێت، هەر شتێکی تر کە دەگوترێ لەو بوارەدا بێ سوودو بی کەڵکەو لەگەڵ فەرمانی خوادا یەکناگرنەوە کە فەرمانی داوە:

﴿ فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَ مَبْلَغُهُم مِّنَ الْعِلْمِ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اهْتَدَىٰ ﴿٣٠﴾ وَلِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ لِيَجْزِيَ الَّذِينَ أَسَاءُوا بِمَا عَمِلُوا وَيَجْزِيَ الَّذِينَ أَحْسَنُوا بِالْحُسْنَى ﴿٣١﴾ ﴾

(٢٩) جا کەواتە تۆش ئەی محمد ﷺ ، ئەی ئیماندار ، گوێ مەدە بەو کەسەی کە یاخی بووە لە یادو بەرنامەی ئێمە (وە بە هیچ بەڵگەو ئایەتێك بڕوا ناکات) بەڵکو مەبەستی تەنها ژیانی ئەم دنیا تەمەن کورتەیە (ئایندەی خۆی فەرامۆش دەکات) .

(٣٠) ئەوانە هەرئەوەندە تێگەیشتنیان لە ڕاستیەکان هەیەو هەر ئەوەندەی لێ دەزانن ، جا لە ڕاستیدا هەر پەروەردگاری تۆیە کە زانیاری وزانستی بێ سنورەو ئاگادارە لەوەی کە کێ لە ڕێبازی ئەو زاتە لایداوەو گومڕایە ، وە کێش ڕێبازی هیدایەت و دینداری‌و خواناسی گرتۆتە بەر .

(٣١) هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدا هەیە ، هەر خوای گەورە خۆی خاوەنیانە (ئەم ئادەمیزادەی دروستکردوەو ، سەرپشکی کردووە ، بە ئازادی دەتوانێ هەر ڕێگەو ڕێبازو دینێك کە بیەوێت هەڵبژێرێت ، پاشان هەر ئەو خوایە قیامەتیش بەرپا دەکات) تا پاداشتی ئەوانەی کە گوناهو تاوان دەکەن و باوەڕیان نەبووە بە گوێرەی بیرو باوەڕو کردەوەکانیان بداتەوە ، هەروەها بە

باشترین شێوە پاداشتی ئەوانەش بداتەوە کە چاکە و چاکەکاریو چاکسازیان کردوە.

بێگومان ئەمەی کە خوای گەورە خاوەنی هەموو ئاسمانەکانو زەویو هەرچی ئەو شتانەیە کە لە سەریانو لە ناویاندا هەیە ، پاڵپشتێکی بەهێزە بۆ ئەوەی کە دۆز و بابەتی قیامەتو ئەوجیهان نرخو کاریگەریی خۆی هەبێت، هەر ئەویش توانای پاداشت دانەوەی هەیە ، چونکە لە تایبەتمەندییەکانی خۆیەتی، خاوەنی هۆکارەکانیەتی، بێگومان ئەو خاوەنداریەتیە توانای بەخشینی پاداشتی تێرو تەواوی هەیە لەسەر بنەمای دادپەروەری، تا تۆڵە لە خراپکاران و تاوانباران بکاتەوە لە سەر بنەمای کارو کردەوەکانیان، هەروەها پاداشتی چاکەخوازانیش بە چاکە بداتەوە.

پاشان سنوری هەڵسوکەوتی ئەو چاکەخوازانە باس دەکات ، کە بە چاکە پاداشتیان دەداتەوە:

﴿ الَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الْإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ إِلَّا اللَّمَمَ إِنَّ رَبَّكَ وَاسِعُ الْمَغْفِرَةِ هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُم مِّنَ الْأَرْضِ وَإِذْ أَنتُمْ أَجِنَّةٌ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ فَلَا تُزَكُّوا أَنفُسَكُمْ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اتَّقَىٰ ﴿٣٢﴾ ﴾

(٣٢) جا ئەوانەی کە لە گوناهە گەورەو کردارە ناپەسەندەکان خۆیان بە دوور دەگرن ، جگە لە وردە گوناهان ، بە نیسبەت ئەوانەوە پەروەردگاری تۆ ئەی محمد ﷺ ، ئەی ئیماندار، چاوپۆشی و لێبوردنی زۆر فراوانە ، چونکە ئەو زاتە چاکتان دەناسێت هەر لەو کاتەوە کە ئێوەی لە خاکی زەوی بەدیهێناوە و پاشان کردونی بە کۆرپەلە لە سکی دایکتاندا (لە هەمو قۆناغەکاندا ئاگای لێتان بووەو

هیچ شتێکی لێ پەنهان نەبووە ، جا ئیتر بەردەوام هەوڵبدەن بۆ چاکەو چاکەکاریی ، چاکەکانتان بەکەم بزانن و گوناهو هەڵەکانتان بە زۆر) نەکەن خۆتان بە چاك بزانن و باسی خۆتان بە چاکە بکەن ، چونکە هەر خوای گەورە خۆی دەزانێت کێ تەقوادارو دینداروخواناسە .

گوناهە گەورەکان بریتین لە تاوانە خراپو ناپوختەکان (لمم)یش گوناهە وردەکانە، هەندێکی تریش دەڵێن مەبەست گوناهە گەورەکانە، بەڵام تەوبەی راستەقینەیان لەسەر کراوەو تاوانبارەکە جارێکی تر نەگەڕاوەتەوە سەری ..

ـ سید بەڕەحمەت بێ دەڵێت ـ ئێمە ئەم رایەی دواییمان لا پەسەندە چونکە لەگەڵ ئەم بەشەی ئایەتەکەدا دێتەوە کە دەفەرموێت ﴿إِنَّ رَبَّكَ وَٰسِعُ ٱلۡمَغۡفِرَةِۚ ٣٢﴾ ، کە ئاماژەیە بۆ فراوانبوونی لێخۆشبوونی پەروەردگار کە وا دەردەکەوێت ـ لە غەفڵەتێکدا، یان لە قۆناغێکی بێ دینیو نەشارەزاییدا،کەسێك گوناهو تاوانی گەورەی ئەنجام دابێ، پاشان تەوبەیەکی راستەقینەو پەشیمانییەکی تەواوی بۆ دروست بوبێت کە دێتەوە یادی تەزوو بە گیانیدا بێتو ئەسرین لە دیدەی ببارێت، ئەوسا ئەو جۆرە کەسانە دەچنە ریزی چاکەخوازانەوە، چونکە چاکەخوازان کەسانێکن کە دوورەپەرێزن لە گوناهو تاوان مەگەر کەسانێکیان کە لێیان قەومابێتو پاشان بەزویی تەوبەیان کردبێت ، نەك بەردەوام و سوور بووبن لەسەری هەر وەکو ئەو ئایەتانەی لە سورەتی (آل عمران)دا باسی ئەو جۆرە حاڵەتانەی کردووە کە تەوبەکاران دەخاتە ریزی پارێزکارو چاکەخوازانەوە :

﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿١٣٣﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٣٤﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوۡ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ لِذُنُوبِهِمۡ وَمَن يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمۡ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴿١٣٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغۡفِرَةٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَجَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ﴿١٣٦﴾﴾

(١٣٣) ئەی ئیمانداران پێشبڕکێ بکەن و پەلە بکەن بۆ دەستەبەر کردنی لێخۆشبوونی پەروەردگارتان و بەهەشتێك کە پانتاییەکەی ئاسمانەکان و زەوی گرتووەتەوە ( دواهەمین کەس کە خوای گەورە بەهەشتی پێدەبەخشێت بەهەشتەکەی دوو ئەوەندەو سێ ئەوەندەی دونیایە !! داخۆ ئەوانەی لە سەرەتاوە دەچن بەهەشتەکەیان چەندە فراوان بێت ، ئەستێرەی واهەیە ملیۆنێك و ١٠ ملیۆن زیاتریش لە گۆی زەوی گەورەترو زەبەلاح ترە ، بێجگە لە دووری یەکەیان کە بە ملیۆنەها ساڵی روناکی مەزەندە دەکرێت موڵك و دەسەڵات و دروستکراوانی پەروەردگار سنوری نیە وبۆچوونی ئێمە کولە و کۆڵە لە ئاستیدا جا ئەو بەهەشتە ئامادەکراوە بۆ پارێزکاران ، بۆ خواناسان بۆ دینداران ، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ئیمانداران مەنزڵگای هەندێك دەبینن وەك چۆن ئەستێرەی گەش دەبینن لە دوورەوە ، هاوەڵان فەرموویانە ئەی پێغەمبەری خوا: رەنگە ئەوانە مەنزڵگای ئێغەمبەران بن،فەرمویەتی: نەخێر ، بەڵکو ئەوانە مەنزڵگای کەسانێکن کە باوەڕیان بە خواو پێغەمبەری خوا بووە و پابەندی فەرمانەکانیان بوون ) .

(١٣٤) ئەو بەختەوەرانە کەسانێکن لە خۆشی وناخۆشیدا لەگرانی و هەرزانیدا ماڵ و سامانیان دەبەخشن ، ڕق و کینەی خۆیان دەخۆنەوە و خۆگرن ، لە خەڵکی خۆش دەبن و لێبوردەن ، بێگومان خوای گەورەو میهرەبان ئەو جۆرە چاکە کار و چاکە خوازانەی خۆش دەوێت ..

(١٣٥) ئەو ئیماندارانەش کە گوناه یان تاوانێك ئەنجام دەدەن دژی کەسانی تر ، یان گوناهو ستەمێك دەکەن لە خۆیان و گوناهێك ئەنجام دەدەن کە پەیوەندی بە خودی خۆیانەوە هەیە ، پاشان خوای گەورە و دەستەڵاتی ، سزاو تۆڵەی ، دێتەوە یادیان ، ئەوکات بە کوڵ و بە دڵ تەوبە دەکەن و داوای لێخۆش بوون دەکەن و ( ئەسرینی پەشیمانی دەڕێژن ) جا کێ هەیە لە گوناهان خۆش بێت جگە لە خوای بەخشندەو لێبوردە ؟ ! ئەو سا ئیتر ئەو جۆرە کەسانە بەتەواوی دەستبەرداری ئەو گوناهە دەبن و هەرکات هەستیان کرد نەفسی سەرکەشیان خەریکە توشی هەڵە و گوناهیان دەکاتەوە ، ئەوان خێرا دادەچڵەکێن و تەوبەکەیان دێتەوە یاد و لەهەموو جۆرە گوناهێك دوور دەکەونەوە .

(١٣٦) ئائەو جۆرە کەسانە ، ئەو تەوبەکارە ڕاستانە ، پاداشتیان لای پەروەردگاریانە: سەرەتا لێخۆشبوونە و پاشان باخەکانی ئەو بەهەشتەیە کە جۆگەو ڕوبار بەنێو باخەکانیدا دەڕوات ، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی نەمری و نەبڕا وە و هەمیشەییدا ، بێگومان ئەو بەهرەیەش پاداشتی زۆر چاك و بەنرخی کۆششکاران و ئیماندارەکاراکانە. (چونکە دیارە دوای تەوبەکەیان لە خەمی ئاینی خوا و بەدەست هێنانی ڕەزامەندی پەروەردگاردا دەبن ، هەوڵدەدەن کە خوای میهرەبان لێیان نەڕەنجێت ) .

کە ئاشکرایە بەڵێنی ئەو بەهەشتەی پێداون کە پانتاییەکەی بەقەدەر ئاسمانەکان و زەوی یە!!

ـ جا لەم سەردەمەدا هەندێ لە فراوانی ئاسمان و ژمارەی گەلەئەستێرەکان دەرکەوتووە کە دورییان بە خێرایی روناکی دەپێورێ !! ـ

جا ئەم حاڵەتە لێخۆشبوونە نزیکتر و لەبارترە کە لە تەفسیری (لمم)دا بکرێت، چونکە گونجاوە لەگەڵ فراوانی و سۆزو میهری خوای گەورەدا ، وە فراوانی لێخۆشبوون و چاوپۆشییەکانیدا..

کۆتایی ئایەتەکش کە پاداشتی مرۆڤ دەدرێتەوە بە ناخۆشی یان خۆشی، پەیوەستە بە زانیاری فراوانی خوای گەورە بەرانبەر حەقیقەتی ناخ و ئەو گۆڕانانەی کە بەسەر خەڵکیدا دێت لە سەرجەم قۆناغەکانی ژیانیاندا چونکە دەفەرموێت :

﴿ الَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ الْإِثْمِ وَالْفَوَٰحِشَ إِلَّا اللَّمَمَ إِنَّ رَبَّكَ وَٰسِعُ الْمَغْفِرَةِ هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُم مِّنَ الْأَرْضِ وَإِذْ أَنتُمْ أَجِنَّةٌ فِي بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ فَلَا تُزَكُّوٓا أَنفُسَكُمْ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اتَّقَىٰٓ ﴿٣٢﴾ ﴾

ئەوە زانست و زانیاری خوای گەورە یە ـ نەیسەپاندووە بەسەرماندا ـ چونکە خوایە و دەماننناسێ، ئێمە زانیاریمان دەربارەی ئەو پێشهاتانەی بۆمان پێش دێن نیە، بەڵام ئەو زاتەی دروستی کردووین زانیاری تەواوی هەیەنەك بە ئێمە، بەڵکو بە سەرجەم دروستکراوانی، هەروەها لەو کاتەشەوە کە لە خاکی زەوی دروستی کردوین و لە جیهانی شاراوە و پەنهاندا بووین، لە دواتریش کە بوینەتە کۆرپەلە لە سکی دایکماندا و بە روناکی ئاشنا نەبووین .. لەڕاستیدا زانای

راستو دروست دەبێ وابێت، پێش رووداو و پێشهاتنی شتەکان زانستی هەبێت، پێش کارو کردەوەکان سروشتی شتەکان بزانێت ـ ئەمەش هەر بەخوای گەورە و زانا و دانا دەکرێت ـ

جا زاتێك سروشتی زانیاریو زانستی ئاوا بێت، ئەوە کارێکی نابەجێ یە و رەفتارێکی ناباشە کە مرۆڤ خۆی هەڵکێشێو باسی خۆی بکات، لە کاتێکدا ئەو زاتە چاك حەقیقەتی دەناسێت! یاخود ستایشی خۆی بکاتو بڵێ : من ئەمەم و من ئەوەم ، چونکە خوای گەورە قەدەغەی خۆهەڵکێشان و ستایشی مرۆڤی کردووە دەربارەی خودی خۆی .

دیارە خوای گەورە پێویستی بەوە نیە کە خۆتانی پێبناسێنن، یان کاروکردەوەکانی بۆ باس بکەن، چونکە ئەو زانستو زانیاری تەواوی بە دروستکراوانی هەیە، پێوەرو تەرازووی وردی هەیە، پاداشتی لەسەر بناغەی دادپەروەری بڕیارداوە، فەرمانی یەکلاکەرەوەیە، هەمووشت بۆلای ئەو زاتە دەگەڕێتەوە.

*　　　*　　　*

پاشان بەشی کۆتایی سورەتەکە دێت ، بە شێوازێکی تەواو و رێكو پێكو سەدایەکی تەواو کاریگەر، لە شێوازی بەشی یەکەمدا ، بنچینەکانی عەقیدە دووپات دەکاتەوە، هەروەکو چۆن ئیبراهیم خاوەنی بیروباوەڕی پاكو بێگەرد خوای گەورەی دەناسیو ناساندی بە خەڵکی، ویستو ئیرادەی کاریگەریی ئەو زاتەیان بۆ باس دەکات لەسەر ژیانو هەڵسوکەوتیان یەك لەدوای یەك بە

شێوازێك كە ناخ و ویژدانیان بهەژێنێ و بە توندی رایوەشێنێ .. هەتا دەگاتە كۆتایی لە كاتێكدا كە هەستەكان دەلەرزن بەوپەڕی هەستیاری یەوە، ئومێدە بە دەم داخوازی پەروەردگاریانەوە بچن :

﴿ أَفَرَءَيْتَ الَّذِي تَوَلَّىٰ (٣٣) وَأَعْطَىٰ قَلِيلًا وَأَكْدَىٰ (٣٤) أَعِندَهُ عِلْمُ الْغَيْبِ فَهُوَ يَرَىٰ (٣٥) أَمْ لَمْ يُنَبَّأْ بِمَا فِي صُحُفِ مُوسَىٰ (٣٦) وَإِبْرَاهِيمَ الَّذِي وَفَّىٰ (٣٧) أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ (٣٨) وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَىٰ (٣٩) وَأَنَّ سَعْيَهُ سَوْفَ يُرَىٰ (٤٠) ثُمَّ يُجْزَاهُ الْجَزَاءَ الْأَوْفَىٰ (٤١) وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ الْمُنتَهَىٰ (٤٢) وَأَنَّهُ هُوَ أَضْحَكَ وَأَبْكَىٰ (٤٣) وَأَنَّهُ هُوَ أَمَاتَ وَأَحْيَا (٤٤) وَأَنَّهُ خَلَقَ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ (٤٥) مِن نُّطْفَةٍ إِذَا تُمْنَىٰ (٤٦) وَأَنَّ عَلَيْهِ النَّشْأَةَ الْأُخْرَىٰ (٤٧) وَأَنَّهُ هُوَ أَغْنَىٰ وَأَقْنَىٰ (٤٨) وَأَنَّهُ هُوَ رَبُّ الشِّعْرَىٰ (٤٩) وَأَنَّهُ أَهْلَكَ عَادًا الْأُولَىٰ (٥٠) وَثَمُودَا فَمَا أَبْقَىٰ (٥١) وَقَوْمَ نُوحٍ مِّن قَبْلُ إِنَّهُمْ كَانُوا هُمْ أَظْلَمَ وَأَطْغَىٰ (٥٢) وَالْمُؤْتَفِكَةَ أَهْوَىٰ (٥٣) فَغَشَّاهَا مَا غَشَّىٰ (٥٤) فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكَ تَتَمَارَىٰ (٥٥) هَٰذَا نَذِيرٌ مِّنَ النُّذُرِ الْأُولَىٰ (٥٦) أَزِفَتِ الْآزِفَةُ (٥٧) لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ اللَّهِ كَاشِفَةٌ (٥٨) أَفَمِنْ هَٰذَا الْحَدِيثِ تَعْجَبُونَ (٥٩) وَتَضْحَكُونَ وَلَا تَبْكُونَ (٦٠) وَأَنتُمْ سَامِدُونَ (٦١) فَاسْجُدُوا لِلَّهِ وَاعْبُدُوا (٦٢) ﴾

(٣٣) باشە ئایا سەرنجی ئەو كەسەت نەداوە كە پشتی كردە دینداری و خواناسی و خۆی وێڵ و سەرگەردان كرد ( بیری نەكردەوە ، تێنەفكرا ، خۆی گێل كرد )...

(٣٤) كەمێكی لە ماڵ و سامانی بەخشی و خێرا دەستی گرتەوە (ئەو جۆرە كەسانە نمونەیان لە زەمانی پێغەمبەرداﷺ هەبووە و بە درێژایی زەمان لە كۆمەڵگە جیاوازەكان نابڕێت) .

(٣٥) باشە بۆچی ئەو جۆرە کەسانە زانیارییان دەربارەی نهێنی و شاراوەکان هەیە؟! ئایا هەمو شتێك دەبینن؟!

(٣٦) مەگەر هەندێك لەو خەڵکە ئاگادار نەکراون لەوەی کە لە کتێبەکەی موسادا هاتووە (لە ڕێنمونی و ئاراستەی خێر) .

(٣٧) یان ئەو ئیبراهیمەی کە هەموو پەیمانەکانی بەجێ هێنا بە تەواوی و نمونەی بە ئەمەکی و وەفاداری بوو...

(٣٨) (جا لەو کتێبە پیرۆزانەدا هاتووە): کە هیچ کەسێکی گوناهبار کۆڵی گوناهی کەسێکی تر هەڵناگرێت...

(٣٩) هەروەها هاتووە کە: ئادەمیزاد تەنها ئەوەی دەست دەکەوێت کە پێشتر دەستپێشکەری بۆ کردوە ، چی چاندوە ئەوە دەدورێتەوە .

(٤٠) بێگومان هەوڵ و کۆششەکانیشی سەرجەم تۆمارن بە دەنگ و ڕەنگەوە دەبینرێتەوە لە قیامەتدا ، لەوێ نیشانی خۆی و هەرکەس خوای گەورە بیەوێت ، دەدرێت. (لەم سەردەمەدا کە ئەم هەموو هۆکارە سەیرو سەمەرانە بەدەستی ئادەمیزاد دروستکراوە و دەکرێت ، بەئاسانی ئیماندار تێدەگات لەو ئاماژە قورئانیانە).

(٤١) پاشان پاداشت دەدرێتەوە بە تێرو تەسەلی ئەگەر دۆزەخی بێت ستەمی لێ ناکرێت ، ئەگەر بەهەشتی بێت پاداشتی لە ڕادەی بیرو بۆچوون و داخوازییەکانی بەدەرە .

(٤٢) لە ڕاستیدا سەرئەنجام کۆتایی ئەم ڕێگوزەرە لای پەروەردگارت لەنگەر دەگرێت ، هەموان بۆ لای ئەوزاتە دەگەڕێنەوە . (تا ئیمانداران بۆ هەمیشە و هەتا هەتایی بحەوێنەوە).

(٤٣) بێگومان هەر ئەو زاتە دیاردەی پێکەنین و گریانی لە ئادەمیزادا بەدی هێناوە (کە دو دیاردەی سەرنج ڕاکێشەرن ئەگەر بیریان لێ بکەینەوە ).

(٤٤) هەروەها ئەو زاتە دیاردەی مردن و ژیانی بەدەستەو هەر ئەو بۆ هەمو زیندەوەرانی پێش دەهێنێت (ئەویش شایستەی تێڕامانی قوڵە ، کاتێ دەبینی کەسێکی مردوو هەموو دەزگا و ئەندامانی لەشی ماون ، کەچی چاو نابینێ، گوێ نابیستێ ، لوت بۆن ناکات ، زمان تام ناکات ، هەستەکان لە کارکەوتون ، دەست و قاچ و سەر و مل شل و شۆڵن.....هتد) .

(٤٥) هەرئەویش دوو جۆر ڕەگەزی دروست کردووە ، نێرو مێی لە هەموو گیانداراندا بەڵکو لە بێ گیانەکانیشدا بەدی هێناوەو لە هەمو شت جوت و دوو شێوازی جیاوازی تەواوکاری یەکتری بەدی هێناوە.

(٤٦) بە تایبەت ئادەمیزادی بەدی هێناوە لە نوتفەیەك ، خاڵێکی زۆر بچوك ئەویش ئەو کاتەی کە بواری پیتاندنی بۆ برەخسێت و لە منداڵدانەدا خۆی هەڵبواسێت (جا لەو خاڵە زۆر بچوکەدا سیفاتەکانی بۆ ماوەیی ، مادی و مەعنەوی دایك و باوك و باوو باپیران هەموی ئاخنراوە!!) .

(٤٧) بێگومان هەر بەدەست ئەو زاتەیەو هەر لە توانای ئەودایە کە بۆ جاری دوهەمیش زیندوی بکاتەوە (بۆ لێپرسینەوە لە کارو باری دنیای ، لە ئیمان و بیرو باوەڕی ... لە .... لە.... هتد) .

(٤٨) بێگومان دەوڵەمەند کردن و هەژار کردنیش هەر بە دەست ئەو زاتەیە (هۆکارەکانیش هەر ئەو دەیرەخسێنێت بۆ تاقیکردنەوە) .

(٤٩) هەر خوای گەورەش ، پەروەردگارو بەدیهێنەری شیعرایە (ئەستێرەیەکی زەبەلاحە هەندێ لە عەرەبەکان پەرستویاند!!قەبارەکەی دەئەوەندەی قەبارەی خۆرە ، یەك ملیۆن ئەوەندەی نێوان زەوی و خۆر لێمانەوە دوورە!! قەبارەی خۆریش یەك ملیۆن و سێ سەد هەزار ئەوەندەی قەبارەی زەوی زیاترە !!) .

(٥٠) هەر ئەو زاتە کاتی خۆی قەومی عادی پێشینی لەناو برد (کاتێك یاخی بون و کۆڵیان لە بت پەرستی و سەرکەشی و ستەم نەدا) .

(٥١) قەومی (ثمود)یشی بە تەواوی لەناو بردو هیچ کام لە یاخی و بت پەرستانی نەهێشێت .

(٥٢) پێشتریش قەومی (نوح) ی بە تۆفان و زریان لەناو برد کە لە ڕاستیدا ئەوان ستەمکارترو سەرکەش تریش بوون لەزۆربەی قەومەکانی تر .

(٥٣) هەر ئەو زاتە تاوانباران و شەڕواڵ پیسانی قەومی (لوط)یشی ژێرەو ژوور کرد ...

(٥٤) بەجۆرێك خەشمی لێ گرتن جگە لە ژێرەو ژور کردنەکە بەردبارانێك کران کە وێنەی نەبوو ، شارو شارۆچکەو دێهاتەکانی داپۆشین .

(٥٥) جا ئیتر ئەی بێ ئیمان تۆ لە کام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگاری خۆت دوو دڵیت ، بە بەخششی ئەوی نازانیت؟! بۆ بیرناکەیتەوە؟! بۆ تێنافکریت؟!

(٥٦) خەڵکینە!! دڵنیابن کە ئەم پێغەمبەرەش هۆشیار کەرەوەو بێدار کەرەوەیەکە وەکو پێغەمبەرانی پێش خۆی (لە ڕوی بیرو باوەڕەوە هەمان پەیامی پێ سپێردراوە ).

(٥٧) ئەگەر بیر بکەنەوەو تێفکرن ، بەرپاکردنی قیامەت و لێپرسینەوەتان نزیك بۆتەوە (نزیکە بە نیسبەت تاکە تاکەمانەوە ، هەر کەمردین ئەوە قیامەتێکە بۆ هەریەکەمان ، قیامەتی گەورەش کاتێك بەرپابوو مرۆڤ وا هەست دەکات کە چەند سەعاتێك پێشتر دنیا بوو ، کوێرا ئەم قیامەت و لێپرسینەوەیە بەرپابوو؟!!) ...

(٥٨) کەسیش ناتوانێت کاتی بەرپابوونی ئەو ڕۆژە دەربخات و ئاشکرای بکات و بیزانێت جگە لە خوای گەورەو بە دەسەڵات و باڵا دەست.

(٥٩) کەچی سەیرە ، گەلێکتان لەم گوفتارە ، لەم ڕاستیانە ، سەرسامن و باوەڕتان پێی نیە!!

(٦٠) قاقای پێکەنینتان دێت و ناگرین (بۆ چارەنوسی ڕەشتان) .

(٦١) زۆربەتان هەر سەرگەرمی رابواردن و خواردن و خواردنەوەیە و مەست و حەیران و بێ هۆشە لە ئاکامەکان!!

(٦٢) (ئەی مرۆڤەکان ، تا فرسەتە هەوڵ بدەن بێداربنەوە لە خەوی غەفلەت) سوژدە بۆ خوای گەورە و جوانکارو بەدیهێنەرتان ببەن ، هەر ئەو زاتە بپەرستن ( چونکە مردن و گەڕانەوەتان نزیکە ).

دیارە خوای گەورە سەرسامی خۆی لە رەفتاری نامۆی ئەو کەسە دەردەبڕێ کە کەم دەبەخشێت و زوو دەست دەگرێتەوە و دەترسێ لەوەی هەژار بکەوێت لە حاڵێکدا رەفتاری لەو شێوەیە نابێ لە کەسی باوەڕدار بوەشێتەوە، چونکە ـ بەخشین ماڵ و سامان کەم ناکات ـ جگە لەوەش ئەو جۆرە کەسانە خۆشارەزای غەیب و داهاتوو نین، جا چۆن مرۆڤی ئیماندار نازانێ سبەی چی بەسەر دێت و شارەزای لە ئایندەش نیە، بۆیە دەبێت بەردەوام لە بەخشیندا بێت و دەست

نەگرێتەوە،چونکە خەمخۆری بۆ ئایندەو کارو کردەوە چاکەکان و وەفاداری یەکەی بۆ خواوەندی بەدیهێنەری و ئومێدی بە قبوڵ کردنی کردەوە چاکەکانی و لێخۆشبوونی ئەو زاتە لە گوناهەکانی، ئەوپەڕی ئاواتیەتی، ئاشکرایە کە ئەم ئاینە دێرینە، سەرەتاو کۆتایی پێکەوە پەیوەستە، بناغەو پایەکانی مەحکەمو دامەزراوە، بەردەوام پەیامەکانی پشتیوانی یەکدی دەکەن ، دووری کات و شوێن کاری تێناکات،

راستیەکان لە پەیامەکەی ئیبراهیم و موسا تۆمارن، ئەو ئیبراهیمەی کە ئەوپەڕی وەفاو ئەمەکداری نواند هەموو شتێکی بەخشی لە پێناوی پەیامەکەیدا بە شێوازێکی رەها کە شایستەبوو ئەو ستایشە لەلایەن پەروەردگاریەوە بکرێت، وەفاش لە بەرانبەر دەست نوقاوی و پێنەزانیەوە هاتووە ئایەتەکە بەو شێوازە زەق و توند هاتووەکە: کەس گوناهی کەس هەڵناگرێ ، کەس باری کەس سوک ناکات، کەس ناتوانێ باری سەنگینی خۆی سوک بکات، هەروەها لە قیامەتدا کەس ناتوانێ پیاوەتی بکاتو کۆڵە گوناهی کەس هەڵگرێو باری شانی سوک بکات.

ئەمەش پەیامێکی ترە کە هەرکەس بارمتەی کارو کردەوەی خۆیەتی، کردەوەکانی نە زیاد دەکەن ، نە کەم، ژیانی دنیاش تاکە فرسەتە کە بەخشراوە پێی تا هەوڵ و کۆشش بدات، کاتێ کە مرد فرسەتەکەی لەدەست دەردەچێ، هەروەکو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: هەرکاتێ ئادەمیزاد مرد، کارو کردەوەکانی دەوەستێ ، تەنها لە سێ رێگەوە نەبێت : ((نەوەیەکی چاکو پاك

کە بەردەوام نزای خێری بۆ بکەن، خێرو چاکەیەکی بەردەوام کە سوودی هەبێ بۆ خەڵکی، زانستێك کە خەڵك دوای خۆی سوودی لێ وەربگرن))

گەر بە وردی سەرنج بدەین لە ڕاستیدا ئەوانە هەریەکەیان بەجیا ، یاخود تێکڕای هەموویان هەر لە کردەوەکانی خودی ئەو باوەڕدارە خۆیەتی ..

(ابن کثیر) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت : هەر بۆیە پێشەوا شافعی وتویەتی کە پاداشتی خوێندنی قورئان ناگات بە مردوو، چونکە کردەوەی خۆی نیە ، پێغەمبەر(ﷺ) هانی ئوممەتی نەداوە بەو شێوەیە، هیچ کام لە هاوەڵانیش (رضي الله عنهم) کاری وایان نەکردووە، دیارە ئەگەر خێری تێدا بوایە ئەوان پێش ئێمە ئەو کارەیان دەکرد، بۆیە لە ئەنجامدانی کردەوە چاکەکاندا دەبێ پەیڕەوی لە دەق بکرێت، بەڵام دۆعاکردن و خێرکردن بۆ مردووان ئەوە دەقی لەسەرە و کارێکی پەسەندە ..

بێگومان هیچ هەوڵ و کۆشش و کارو کردەوەیەکی باش بە زایە ناچێت، هیچ شتێك لای خوای گەورە ون نابێت بە پێوەرە وردەکانی هەمووشت دەکێشێ و دەپێوێ، هەرکەس پاداشتی خۆی بە تێرو تەواوی وەردەگرێت بە دوور لە کەمو کوڕی و ستەم .

شایانی باسە لێرەدا بە تەواوی دەردەکەوێت کە هەرکەسە بارمتەی کاروکردەوەی خۆیەتی ، شان بەشانی دادپەروەریی ڕەها لە پاداشتدا. ئەوسا هەر مرۆڤێك نرخی مرۆڤ بوونی خۆی دەزانێت، بە تایبەت کاتێ کە دەبێتە کەسێکی پێگەیشتوو بەرپرسی خۆی، کاتێ دەبێتە خاوەنی کارو بەرهەمو کەسێکی بەخشندە، پاشانیش دڵنیایە لە پاداشتی دادپەروەرانە، دادپەروەری

رەها کە ئارەزووبازی کاری تێناکات، چاوپۆشی لە کەم و کوڕی یەکانیش دەکرێت، هەرچەندە هەمووشتەکان ئاشکراو دیارن و هیچ شتێك نەزانراوو پەنهان نیە.

شایانی باسە هەموو ڕێگەو ڕێبازەکان بەناچاری لای زاتی پەروەردگارت کۆتایی دێت و لەوێ لەنگەر دەگرێت، هیچ پەنایەك نیە جگە لە پەنای ئەو، شوێن نیە جگە لەو شوێنەی ئەو زاتە ئامادەی کردووە ـ یاخود لێرەوە بۆ خۆمان ئامادەمان کردووە ـ کە یان نازو نیعمەتی ڕازاوەیە لە بەهەشتدا، یان ئاخ و داخ و حەسرەت و پەشیمانییە لە دۆزەخدا، بێگومان زانینی ئەم ڕاستی یە کاریگەری خۆی هەیە لەسەر بیروبۆچوون و هەست و نەستەکانی مرۆڤ ..

کاتێ کە بە دڵنیاییەوە مرۆڤ هەست دەکات کە گەڕانەوە و لەنگەرگرتنی هەمووشت بۆلای خوای پەروەردگارە، هەمووشتێك، هەمووکەسێك، هەر لە سەرەتای ڕێگەوە هەست دەکات کە کۆتاییەکەی چۆن دەبێت ناتوانێ لێی رابکات، یان خۆی لێ دوور بخاتەوە، ئەوسا ئیتر ناخی خۆی و کردەوەکانی لەسەر بنەماکانی ئەو حەقیقەتە دادەڕێژێ، یاخود هیچ نەبێ چەندە توانی هەوڵ دەدات، بۆیە هەر لە سەرەتاوە بەدڵ چاوی بڕیوەتە ئەو سەرەنجامە!!

دوای ئەوەی ڕێڕەوی ئایەتەکان دڵی مرۆڤی بەرەو سەرەنجام و کۆتایی برد، جارێکی تر هێنایەوە بۆ ژیانی دنیا، تا ئاسەواری ویستی خوای گەورەی لە هەموو قۆناغێك و لە هەموو حاڵەتێکدا نیشان بدات بۆیە دەفەرموێت: ﴿ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَضۡحَكَ وَأَبۡكَىٰ ﴿٤٣﴾ ﴾ بێگومان لە سایەی ئەم ئایەتەدا شتی زۆر خۆی نومایان

دەكات، لە توێی ئەوانەشدا وێنەو سایەی كاریگەرو زیندو ئاشكرایە: پێكەنین و گریان، ئەم دوو دیاردەیە ئاشكرایە كە هەر خوای گەورە بەخشیویەتی بە مرۆڤەكان، كە هەر یەكەیان نهێنی یەكن لە نهێنی یەكانی پێكهاتەی ئەم ئادەمیزادە، كەس نازانێ لە چۆنیەتی دروست بوونیان، وە چۆن لەم دەزگا ئاڵۆزەدا روودەدەن، كە پێكهاتەی دەروونی زۆر ئاڵۆزترە لە پێكهاتەی جەستەی، زۆر جار كاریگەریەكانی دەروون‌و كاریگەریی ئەندامەكانی جەستە تێكەل دەبن‌و كارلێك لە نێوانیاندا دروست دەبێت‌و دەبێتە هۆی پێكەنین، یان گریان .. هەروەها هۆكاری پێكەنین و هۆكاری گریانیشی پێكهێناوە كە بە هۆی نهێنی یە ئاڵۆزەكانەوە بۆئەم شتە، یان ئەم باسە، یان ئەم نوكتەیە پێكەنین دروست دەبێت، یاخود بۆ لێقەومان‌و ئازارو پێشهاتێكیش دەگری، لەوانەیە سبەی پێكەنینی بێت بەوەی كە ئەمڕۆ بۆی گریاوە، یاخود ئەمڕۆ دەگری بۆ ئەو حاڵەتەی دوێنێ بۆی پێدەكەنی، بێ ئەوەی شێت بووبێ یان تێكچووبێ، بەڵكو حاڵەتی دەروونی یە كە بە خێرایی گۆڕانی بەسەر دێت .. هەروەها پێوەرو پاڵنەرو هۆكارو حساب كردن بۆ دەوروبەر وای لێ دەكات كە لەسەر حاڵەتێك نەمێنێتەوە بۆیە پێدەكەنێ و دەگری، جاری وا هەیە لە چركەساتێكدا ئەو دوو حاڵەتە پێش دێت بەهۆی رووداوەكانی دەوروبەریەوە، جاری وا هەیە هەندێك بە شتێك پێدەكەنن، بەڵام هەندێكی تر بە هەمان شت دەگرین، چونكە كاریگەریی رووداوەكان بۆ سەر ئەوان ، وەك كاریگەرییەكەی نیە بۆ سەر ئەمان!! شتەكەش وەكو خۆیەتی، بەڵام جاری وا هەیە تێكەڵ دەبن!

بەڵێ؛ ئەوە هەر زاتی خوایە ئەم دیاردەی پێکەنین و گریانەی لە مرۆڤدا دابین کردووە، جاری وا هەیە ئەمڕۆ بەشتێك پێدەکەنێ سبەی کاتێ دەرەنجامەکەی رووی تێدەکات دەست دەکات بە گریان. ئاوات دەخوازێ کە ئەو کارەی نەکردایە و پێنەکەنیایە، چونکە چەندەها کەس لە دنیادا پێدەکەنن، بەڵام لەو جیهان زۆر دەگرین، گریانیش سوودی نیە و فریایان ناکەوێت!!

لە ڕاستیدا ئەم هەموو وێنەو سایەو هەستو حاڵەتانەو زیاتریش لەو دەقە قورئانیەدا کۆبۆتەوە ، خۆی بۆ هەستو نەست نومایان دەکات ، بەردەوام لە توێی ئەو ئایەتەدا شتی زۆر هەڵدەقوڵێ و شتی زۆری لێ دەخوێنرێتەوە؛ کاتێ کە دەروون دەبێتە خاوەنی ئەزموونی زۆر، بەتایبەت هەرکات هۆکارەکانی پێکەنین و گریان نوێ بوونەوە ..

بەڕاستی ئەوە موعجیزەیە کە لە تابلۆیەکدا لە تابلۆ هەمە چەشنەکانی قورئاندا خۆی نومایان دەکات :

﴿ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَمَاتَ وَأَحْيَا ﴿٤٤﴾ ﴾.. لەم ئایەتەشدا وێنەی بێ شومار دێتە بەرچاوو هەروەکو لە سورەتی (الملك) فەرمویەتی : ﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ ﴿٢﴾ ﴾ بەڕاستی ئەم دوودیاردەیە دوو شتی ناسراون، بەتایبەت چونکە بەردەوام دووبارە دەبنەوە، لە هەمان کاتدا بە تەواوی شاراوەن کاتێ کە کەسانێك هەوڵدەدەن لە سروشتو نهێنیان تێبگەن کە شاراوەیە لە زیندووەکان ..

مردن چییە ؟ ئەی ژیان چییە؟ حەقیقەت و نهێنیان چییە کاتێ کە لە باسی دەستەواژەو شێوازیان تێدەپەڕن؟ چۆن ژیان پێش هاتوو کرا بە بەری

زیندووەکاندا؟ داخۆ بریتی بێت لەچی؟ لەکوێوە هات؟ چۆن خۆی کرد بەبەری ئەم زیندەوەرانەدا؟ چۆن ڕێڕەوی ژیانی گرتە بەر بەنیسبەت ئەم هەموو زیندەوەرە هەمە جۆرانەوە؟! ئەی مردن چییە؟ لەکوێوە پەیدابوو؟ پێش ژیان و زیندوێتی لەکوێ بوو؟ ئەی دواتر لەکوێ دەبێ؟

بەڕاستی ئەوە نهێنی یەکی خوایی یە لە پشتی پەردە دادراوەکانەوە، تەنها و تەنها بەدەست خوای گەورەیە.

چونکە هەر ئەو زاتە دەتوانێ زیندوان بمرێنێ و گیان بکات بەبەری مردووەکاندا، ملیۆنەها شێواز لە مردن و ژیان، لە چرکەساتێکدا لە جیهانی سەرجەم زیندووەکاندا بەرپا بکات .

لە یەك چرکەساتدا ملیارەها زیندەوەر دەمرێت، ملیارەهای تریش دێنێتە سەر گۆڕەپانی ژیان و ئەم نهێنی یە دەکرێت بە بەر زیندەوەراندا؛ خۆیشمان نازانین چۆن ، مەگەر هەر خوای گەورە خۆی بزانێ .. لە هەمان کاتدا چەندەها دەمرن و دەبنە هۆی سەرلەنوێ ژیان بۆ دروستکراوانی تر! ..

داخۆ بە درێژایی زەمان و پانتایی زەمین چەندە لەم حاڵەتانە پێشهاتبێ، کاتێ کە بیردەکەینەوە لە رابوردوویەکی تولانی و دوور و درێژ، کە پێش پەیدابوونی مرۆڤ لەسەر ئەم هەسارەیە هەبووە، داخۆ لەسەر هەسارەکانی تریش زیندەوەر هەبووبێت، لە شێوازە جیاوازەکانی مردن و ژیانیان بەسەر هاتبێ کە هەر بە خەیاڵی مرۆڤدا نەهاتووە و نەهاتبێ!!

بەڕاستی وێنەگەلێکی بێ شومارو لە ژمارە نەهاتوون، کە لەم چەند وشە کورتانەدا خۆیان نومایان دەکەن، دڵی مرۆڤ لە ناخەوە دەهەژێنێ ، ئیتر خۆی بۆ ناگیرێت لەبەردەم کاریگەرییە جۆراوجۆرە هەمەچەشنەکانیدا ..

﴿وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰ ﴿٤٥﴾ مِن نُّطْفَةٍ إِذَا تُمْنَىٰ ﴿٤٦﴾﴾

بەڕاستی ئەمەشیان حەقیقەتێکی زۆر گەورە و فراوانە کە لە هەموو چرکەساتێکدا روودەدات، کەچی ئادەمیزاد بەهۆی دووبارەبوونەوەیەوە فەرامۆشی دەکات، لەڕاستیدا ئەم رووداوە لە هەمووشت سەیرو سەمەرە ترە، کاتێ کە مرۆڤ بیری لێ دەکاتەوە! جۆرە ئاوێك دەڕژێت، کە یەکێکە لە بەرهەمە هەمەچەشنەکانی جەستەی مرۆڤ ، وەکو فرمێسك و ئارەق و لیك و ... . کەچی دوای ماوەیەك کە هەر مەگەر بەخوا بکرێ دەبێتە چی؟ دەبێتە مرۆڤ !! کە دەبێتە ئەم ئادەمیزادەی کە یان نێرە یان مێ ! ئەمە چۆن روویدا، چۆن ئەم زیندەوەرە سەرسوڕهێنەرە پەیدابوو کە پێشتر نەبوو، گەر نەماندیبا کەس بە خەیاڵیدا نەدەهات !! ئەم مرۆڤە ئاڵۆز و پێچیدەیە لەکوێ و ، ئەو ئاوە لەکوێ کە لە بەشێك لە نیو ملیۆنەها بەشیدا ئەم زیندەوەرەی لێ پەیدا بوو؟ بەشەکانی جەستەی لە کوێدا بوو، ئێسك و گۆشت و پێستی، دەمارەکانی، مووەکانی،نینۆکەکانی، شێواز و روخسارو تایبەتمەندییەکانی؟ رەوشت و سروشت و تواناکانی؟

ئەم خانەیەی کە مەگەر بە میکرۆسکۆب ببینرێت کە مەلەیان دەکرد لەنێو ملیۆنەهای وەکو خۆیدا، کەچی یەکێکیان بە ویستی خوای گەورە لەگەڵ هێلکۆکەدا یەك دەگرن و تایبەتمەندی یەکانی نێر ، یان مێ لەو خانەیەدا لەخۆ دەگرن، کە دواتر دەبێتە کۆرپەلە و دەردەکەوێت کە کام رەگەزە؟!

باشە داخۆ چ دڵ و دەروون و هزرێك لە بەرانبەر ئەم حەقیقەتانەدا خۆی بۆ دەگیرێت - بیر لەو زاتە دروستکارە جوانکارە ناکاتەوە - بە (صدفە) و رێکەوت

ناوزەدی دەکات !! ـ یاخود بڵێت: ئەم شتانە هەروا لە خۆیانەوە روودەدەن!! ئەم گۆڕانکاریانە لە خۆیانەوە پێش دێن، هەر لە خۆیەوە ئەم نەخشە ڕێگایە پیادە دەبێتو روودەدات!! ، یاخود خۆی بە خوێندەوار بداتە قەڵەم و بڵێت:ئەم کۆرپەلەو بەچکانە ئەم نەخشە ڕێگایە بۆیە پیادە دەکەن چونکە ئەو توانایەیان تێدا دابین کراوە، تا بەردەوام نەوەکانیان نوێ ببنەوە، هەروەکو هەموو ئەو زیندەوەرانەی کە ئەم توانایەیان تێدا دابین کراوە .. بێگومان ئەم ڕاو بۆچوونانە پێویستی بە روون کردنەوە هەیە .. باشە؛ کێ ئەم توانایانەی پێبەخشیووە ؟ کێ خواست و هەستی تێدا دابین کردووە تا جۆری خۆی بپارێزێتو بەردەوام نوێی بکاتەوە، ئەی کێ توانای پێداوە لەگەڵ بچوکی و لاوازیدا تا ئەو کارە بکات؟! کێ نەخشەرێگای بۆ کێشاوە تا بەرێكو پێکی و بێ لادان دروست ببێت؟! کێ تایبەتمەندی یەکانی جۆری خۆی تێدا دابین کردووە تا دووبارەی بکاتەوە ؟! باشە ئەم خواستەی چۆن بۆ دروست بوو، تا بەرژەوەندی خۆی لە نوێبوونەوەی خۆیدا ببینێتەوە؟! ئەگەر ویستێکی شارەزا و بەتوانا و زانا نەبێت کە کاری بەو کارانە هەبێت وە نەخشەرێگای بۆ دابرێژێت؟!

پاشان لە دروست بوون و پەیدابوونی یەکەم جارەوە کە ئاشکراو روونە و دەبینرێت، یەکسەر باس لە پەیدابوونی دوهەم جاری دەکات : ﴿وَأَنَّ عَلَيۡهِ ٱلنَّشۡأَةَ ٱلۡأُخۡرَىٰ ۝٤٧﴾ بێگومان دروستبوونەوەی دووهەم جار غەیب و نهێنی یە ، بەڵام دروستبوونی یەکەم جار بەڵگەیە لەسەر دروستبوونی دووهەم جار، ئەویش بەوەی کە پێشهاتنی ئاسانە، چونکە ئەو زاتەی کە مرۆڤی بە جووت، بە نێرو

مێ دروست کردووە لە نوتفەیەك گەر ویستی لەسەر بوبێت، ئەوە گەشەی کردووە وسەرەنجام بۆتە مرۆڤ، هەر ئەو زاتە بەبێ گومانو دوودڵی زۆر بەچاکیو بە ئاسانی دەتوانێ جارێکی تر دروستی بکاتەوە، دوای ئەوەی بۆتە ئێسكو پروسکی رزیوو، چونکە ئەو ئێسكو پلوسكو روفاتانە لە ئاوی رژاو کەمتر نین، بەڵکو بەڵگەن لەسەر پێشهاتنو روودانی، چونکە ئەو نەخشە رێگایەی کە بە نهێنی ئاراستەی خانەیەکی بچوکی زیندوو دەکات، لەو رێبازە دوور و درێژو سەختەدا بۆ ئەوەی نێرێك یان مێ یەك دروست ببێت، خاوەنی ئەو نەخشەیە دیارە کە کارێکی گرنگی بەم دروستکراوەی هەیە کە لە گەشتی سەرزەویو ژیانی دنیای تێدەپەڕێت، چونکە تەنها لێرە کارەکە تەواو نابێ ، چاکەخواز پاداشتی چاکەکانی بە تەواوەتی وەرناگرێت، هەروەها خراپکارو تاوانبار پاداشتی خراپکاریو تاوانەکانی بە تەواوەتی وەرناگرێت، بەڵکو ئەم نەخشە دارێژراوە پێویستی بە ژیانێکی تر هەیە تا هەموو کەس مافی خۆی وەربگرێت، یاخود تۆڵەی لێ بسەنرێت.

بێگومان پەیدابوونی یەکەمجاری بەڵگەیە لەسەر پەیدابوونەوەی دوهەم جاری، هەر بۆیە باسی هاتووە بەو شێوەیە: ﴿وَأَنَّهُۥ هُوَ أَغۡنَىٰ وَأَقۡنَىٰ ۝٤٨﴾

دیارە هەر ئەو زاتەی کە مرۆڤی بەدی هێناوە بۆ هەر کەس ویتسبێتی بە جۆرەها شێوازی دەوڵەوەندیی بێ نیازی کردووە: هەیە ماڵ و سامانی پێبەخشیووە، هەیە تەندروستی، هەیە نەوەی زۆری پێداوە، هەیە نەفس بەرزیو دڵ دەوڵەمەندیی، هەیە بیرتیژی و ژیری، هەیە دەوڵەمەندو دڵخۆشی




کردووە بەوەی کە پەیوەندی بە پەروەردگاریەوە زۆر بەهێزو بتەوە، کە ئەمەیان هیچ بەخششێکی تری ناگاتێ..

هەروەها هەیە لەقیامەتدا ، لە بەهەشتی بەریندا ئەوەندەی پێ دەبەخشێ سەرو سامانی خۆی نازانێ!!

هەروەها هەندێکیش کە ئەو زاتە ویستی وابێ هەژاری دەکاتو بە هەژاری تاقیدەکاتەوە، یاخود لە قیامەتدا هەژارو بێ بەشی دەکات لە هەموو نازو نیعمەتێکی ئەوێ! خەڵکیش هەموو هەژارن و ئاتاجی بەخششەکانی خوای گەورەن کە لە گەنجینە بێ پایانەکانی رزقو رۆزی هەموو جۆریان پێ ببەخشێ، کەواتە هەر ئەو زاتەیە کە دەوڵەمەندی دەبەخشێ، یان هەژاری و کەم دەستی پێش دەهێنێ، ئەمەش شتێکە لەو (واقع) ە هەڵدەقوڵێ کە دەیزانن، کە دڵیان لەلایەتی و چاویان تێبڕیووە، ئەمەش بۆ ئەوەی چاو ببڕنە تاکە سەرچاوەو لە گەنجینە پڕ لە بەرەکەتەکانی داوای پێداویستی یەکانیان بکەن،چونکە گەنجینەکانی تر بەتاڵن لە بەرانبەریەوە!!

﴿ وَأَنَّهُۥ هُوَ رَبُّ ٱلشِّعۡرَىٰ ﴿٤٩﴾ ﴾

(شعری) ئەستێرەیەکە بیست ئەوەندەی خۆر سەنگینترە، رووناکی یەکەی پەنجا ئەوەندەی رووناکی خۆرە، ماوەی نێوان زەوی و ئەو ئەستێرەیە ملیۆن ئەوەندەی ماوەی زەوی و خۆرە، خەڵکانێك هەبوون ئەو ئەستێرەیەیان پەرستووە، خەڵکانێکی تر چاودێریان کردووە وبە ئەستێرەیەکی گرنگیان زانیوە.. جاکاتێ خوای گەورە حەقیقەتەکەی رادەگەیەنێتو پێمان دەفەرموێت کە هەر زاتی خوای پەروەردگار و بەدیهێنەر ئەسێرەی (شعری)یە ، ئەمەش

پەیوەندی بە سەرەتای سورەتەکەو باسی ئەستێرەوە هەیە، بەتایبەت کاتێ کە لە خولگەکەیان دەترازێن و بەردەبنەوە، هەروەها پەیوەندی بە گەشتەکەی پێغەمبەرەوە(ﷺ)هەیە کە خوای گەورە پێی کرد بۆ جیهانە بەرزو بڵندەکان ، هەروەها بیروباوەڕی یەکخواناسی دەچەسپێنێ و بیروباوەڕی شیرکی پوچ و بێ بنەما رادەماڵێت ..

ئا بەو شێوەیە ئەو گەشتە بەنێو دڵ و دەروون و ئاسۆکاندا کۆتایی پێ دێت ، تا گەشتێکی تر دەست پێبکات بە باسی خەڵکانی تیاچووی رابوردوو، کاتێ کە بەهۆی پێغەمبەرانەوە بێدار کرانەوە، کەچی زۆربەیان بڕوایان نەکرد، وەکو موشریك و هاوەڵگەران لە هەموو سەردەمێکدا بە مەرجێ نیشانەی دەستەڵاتداری خوای گەورەو توانای بێ سنوریەتی بەسەر یەکە یەکەی ئەو خەڵکەدا هەمیشە نومایانە.

﴿ وَأَنَّهُۥٓ أَهْلَكَ عَادًا ٱلْأُولَىٰ ﴿٥٠﴾ وَثَمُودَا۟ فَمَآ أَبْقَىٰ ﴿٥١﴾ وَقَوْمَ نُوحٍ مِّن قَبْلُ ۖ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ هُمْ أَظْلَمَ وَأَطْغَىٰ ﴿٥٢﴾ وَٱلْمُؤْتَفِكَةَ أَهْوَىٰ ﴿٥٣﴾ فَغَشَّىٰهَا مَا غَشَّىٰ ﴿٥٤﴾ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكَ تَتَمَارَىٰ ﴿٥٥﴾ ﴾

ئەم ئایەتانە بە خێرایی گوزەر دەکات بەسەر تیاچوونی هەریەك لەو گەل و هۆزە نالەبارانە، بە شێوازێك کە دەچزێ بە هەست و نەستداو وەکوئەوەی سیخورمەی لێدەیت!! لەڕاستیدا ئەو کەسەی قورئان دەور دەکاتەوە لە چەندین سورەتدا باسی قەومی عادو ثمود و نوح ی بەرچاو دەکەوێت، هەروەها باسی قەومی شەڕواڵ پیس و بۆگەنی (لوط)یش کە خوای گەورە ژێرەو ژووری کردن و بەرد بارانیشی کردن، ئەوانە بەڵایەکیان بەسەرهات مەگەر هەر بەسەر ئەوان هاتبێ،

بێگومـان لـە سـەدای وشـەکاندا کاولکـاریو وێرانکـاریو بـەڵای گـەورە بـەدی دەکرێت کە هەموو خەڵكو شوێنەواریانی وێران کردووە!!

کەواتە لە کام لە نیعمەتەکانی خوای گەورە گومانتان هەیە، مەگەر لەناوبردنی خەڵکانی خراپو بێ دینو ستەمکارو شەڕواڵ پیس نیعمەت نیە کە خوای گەورە جار لەدوای جار زەوی لێ پاك کردۆتەوە.. {ئومێدە لەم سەردەمەشدا کوردواتەنی خوای گەورە دەروونی بێتە جۆشو سەرزەوی یەکەی پاك بکاتەوە لە ستەمکارو بێ دینو شەڕواڵ پیس و داوێن پیسو گەندەڵەکان، چونکە ئەو خوایە هەر ئەو زاتەیە کە ستەمکارانی دێرینی لەناو برد زۆر بە ئاسانی دەتوانێ ستەمکارانی ئەم سەردەمەش لەناو بەرێت} ..

بەڵێ سەرەنجام خوای گەورە حەق دەماڵێ بەسەر بەتاڵ و ناحەقیداو تەفرو تونـای دەکـات ــ چـونکە ماوەیـەك مۆڵـەت دەدات بـە زاڵـمو سـتەمکاران، تـا ئیمانداران پێدەگەن وتێدەگەن ـ کەواتە نابێ گومانمان لە نیعمەتی لەناوچوونی شەڕ و پایەداری خێر هەبێت.. ئەمەش گوتارێکە روو بە هەموو کەس ، هەموو خاوەن دڵێك، هەموو ئەوانەی کە سەرنجی دروستکراوان دەدەن، چونکە خەڵکی بە بەڵای دەزانێت ئیماندار بە نیعمەتی دەزانێت !!

پاشان دوای باسی لەناوبردنی قەومە پێشووەکان کە بڕوایان بە پێغەمبەرانو هەڕەشـەکانیان نـەکرد، دوای باسـی ویسـتو ئـیرادەی خـوای گـەورە و ئاسەوارەکانی لـە دەروون و ئاسـۆکاندا، بەشـێوازێکی بـەهێزو تونـد ، پـێش روودانی کارەساتە گەورەکە دەیەوێت خەڵکی بێدار بکاتەوە، بۆیە دەفەرموێت :

﴿هَٰذَا نَذِيرٌ مِّنَ النُّذُرِ الْأُولَىٰ ﴿٥٦﴾ أَزِفَتِ الْآزِفَةُ ﴿٥٧﴾ لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ اللَّهِ كَاشِفَةٌ ﴿٥٨﴾﴾

ئەم پێغمبەرەی کە ئێوە گومانتان لە پەیامو بێدارکەرەوەکانی هەیە، ئەمیش پەیامەکەی هەروەك پەیامە پێشووەکان وایە ! - ئەم کۆتا پێغەمبەرە و - یەکێکە لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی رۆژی قیامەت کە کاتێ بەرپابوو هەمووشت رادەماڵێ، چونکە پێشهاتێکی زۆر سەختو دیژوارە، ئەم پێغەمبەرەمان رەوانە کردووە کە ئاگادارتان بکاتەوە لە نزیکبوونەوەی، کە مەگەر هەرخوا بزانێ چ کارەساتێکەو کەی روودەدات، مەگەر هەر ئەو زاتە بتوانێ زەرەر و زیانی لە باوەڕداران دوور بخاتەوە..

بەلام لە کاتێکدا ئەومەترسیە بەرێوەیە، بێدارکەرەوەی دڵسۆزیش بانگتان دەکات بۆ رزگاری ، کەچی بێ باكو بێ منەتن، سەرگەرمی رابواردنی خۆتانن، بێدار نابنەوە، دا ناچڵەکێن - زانستی سەردەمو دەزگای ناسای ئەمریکی پێش بینی کارەساتی گەورە دەکات کە لە ئانو ساتدا بۆ زەوی پێش بێتو کۆتایی بە هەموو شتێك بێنێت، بەلام زۆربەی خەڵك بێ خەمو بێ باکن ..

﴿ أَفَمِنْ هَٰذَا ٱلْحَدِيثِ تَعْجَبُونَ ﴿٥٩﴾ وَتَضْحَكُونَ وَلَا تَبْكُونَ ﴿٦٠﴾ وَأَنتُمْ سَٰمِدُونَ ﴿٦١﴾ ﴾

بە مەرجێ ئەم باسانە زۆر گرنگن، ئەرکی گەورە دەخەنە سەرشانو ئەستۆی خەڵکی، لە هەمان کاتدا ئاراستەیان دەکات بەرەو بەرنامەیەکی تێرو تەواو ..

کەواتە ئەمانە لەچی سەرسامن؟ بەچی پێدەکەنن؟ لە کاتێکدا کە بابەتەکە زۆر گرنگە، ئەرکەکە زۆر سەنگینە، چونکە بەرپرسن لە ژیانی دنیایان .. ئەوەندە ئایندە سەختە گریان بۆی لەپێشترە .. هەر بۆیە وەك داخوازی یەك کە هەموو گەردوون لەگەڵیدا دەنگ دەداتەوە هاوارێك، ئاراستەی دەزگای بیستنو دڵ و

دەروون و ناخیان دەکات، تا فریای خۆیان بکەون، چونکە لەسەر لێواری هەڵدێرن :

﴿ فَٱسْجُدُواْ لِلَّهِ وَٱعْبُدُواْ ۩ ﴿٦٢﴾ ﴾

بەڕاستی بانگەوازو داخوازی یەکی تەکاندەرە کە لە کۆتایی ئەم سورەتەداو لەم سایەیەدا هاتووە، دوای ئەو هەموو پێشەکی یە دوورو درێژە، کە دڵان دێنێتە لەرزە.

هەر بۆیە کاتی خۆی ئیمانداران، هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانبەردار بوون خێرا بەڕوودا کەوتن و سوژدەیان برد، سەیر لەوەدایە کە موشریك و هاوەڵگەرانیش کە گوێ بیستی ئەم سورەتە بوون، کە پێدەچێ پێغەمبەر(ﷺ) بە دەنگی پڕ لە سۆزو موبارەکی خوێندبێتیەوە، ئەوانیش بێ پەروا سوژدەیان بردووە، لە کاتێکدا کە ئەوان گومانیان لە (وحی)، لە قورئان هەبوو، قسەیان هەبوو لەسەر خوداو لەسەر پێغەمبەرەکەی(ﷺ) !!

دیارە سوژدەکەیان بەهۆی سەدای بەردەوامی ئایەتەکانی قورئان و کاریگەریی لەسەر دڵیان؛ بۆیان پێش هات، بە تایبەت کاتێ کەلە کۆتایی سورەتەکەدا فەرمان بە سوژدە هاتووەو پێغەمبەریش(ﷺ) سوژدەی بردووە، ئەوسا ئیتر کەس خۆی بۆ نەگیراوەو تێکڕا ئامادەبووان بە باوەڕدار و موشریکەوە سوژدەیان بردووە، چونکە نەیانتوانی بەرانبەر کاریگەریی بەهێزی ئایەتەکان خۆیان بۆ بگیرێت، پاشان کە هاتنەوە هۆش موشریکەکان سەرسامبوون لە سوژدە بردنەکەیان .

بەڵام مەخابن دواتر روایەتی زۆر هەڵبەسترا دەربارەی ئەو پێشهاتەو هۆکاری سەیرو سەمەرەی بۆ تاشراو دەروون نەخۆشەکان لە ئەوسا و ئێستادا لێکدانەوەی هەڵەیان لۆکرد. کە بەپێویستی نازانین باسی بکەین، رۆژهەڵات ناسەکانیش بە نەزانین یان بە مەبەست قۆستیانەوە!!

بەڵام لای من روونە کە موشریکەکان سوژدەیان بردووە و بوونە هۆی گەڕانەوەی کۆچبەران لە حەبەشە. {چونکە هەواڵیان پێ گەیشت کە دانیشتوانی مەککە موسڵمان بوون!! } .جا لێرەدا باسی گەڕانەوەی کۆچبەران بۆ مەککەو دواتر گەڕانەوەیان بۆ حەبەشە لەگەڵ چەندەها کەسی تردا ناکەین،،

بەڵکو دەمەوێت باسێك لەو سوژدەیە بکەم..

لە ڕاستیدا من ماوەیەك لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونم بۆ هۆکاری ئەو سوژدەیە کرد لەلایەن موشریكو هاوەڵگەرانەوە، جاری وا هەبوو لە دڵی خۆمدا دەموت : رەنگە هەر ڕووی نەدابێت .. تا رۆژێکی لەگەڵ هەندێ لە برایاندا خەریکی قسەو باس بووین، کتوپڕ گوێ بیستی کەسێك بووین لە نزیکمانەوە سورەتی (النجم)ی دەوردەکردەوە، قسەکانمان بڕیو بێ دەنگ بووین و گوێمان بۆ هەڵخست، قورئان خوێنەکەش بە دەنگێکی کاریگەرو بە جوانی دەیخوێند..

وردە وردە چوومە ناو ئەو باسانەوە کە دەیخوێندەوە، ژیام لەگەڵ دڵی محمد(ﷺ) کاتێ کە گەشتی کرد بۆ جیهانە بڵندەکان ..

لە خزمەتیا بووم کاتێ کە فریشتە جوبرەئیلی بینی لە شێوەی فریشتەییدا(سلاوی لێ بێت)، وە پێکەوە شەوڕەوی میعراجیان کرد، ژیام لە خزمەتیا لەو گەشتە بڵندو رەهاو مەزنەدا، تا گەیشتنە (سدرة المنتهی) و (جنة

المأوى) چەندە بیرکردنەوەم توانی، وە بۆچوونم بۆی چوو، چەندە هەست و نەستم توانی لەخۆی بگرێت لە خزکەتیاندا بووم..!!

ئینجا گوێ بیستی باسی فریشتەکان بووم کە موشریکەکان چۆنیان دەناسن، چۆن دەیانپەرستن و کێشەیانە دەربارەیان داخۆ نێر بن یا مێ؟!

ئینجا باسەکان چوو بۆ سەر باسی مرۆڤ و پەیدابوونی لە خاکی زەویدا دواتر باسی پەیدابوونی کۆرپەلە لە سکی دایکاندا، هەروەها زانستی خوای گەورە و گرنگی پێدانی بەم مرۆڤە بچوک و بێ دەستەڵاتە ..

من موچرکە بە گیانمدا دەهات بە تایبەت دەربارەی نهێنی و شاراوەکان کە هەر خوای گەورە پێی دەزانێ، هەروەها کارو کردەوە تۆمارکراوەکان کە بێ لێپرسینەوە و پاداشت نیە، سەرەنجام گەڕانەوەی یەکجاریی بۆلای خوای گەورە .. هەروەها دیمەنی خەڵکێکی بێ شومار هاتنە بەرچاوم کە قاقا پێدەکەنن، خەڵکێکی بێ شوماریش بە کوڵ دەگریان ..

هەروەها دیمەنی بێ شوماری مردووان و کاروانی بێ شوماری زیندووەکان، هەروەها دیمەنی ئەو نوتفەیەی کە لە تاریکستاندا ڕێڕەوی خۆی دەگرێتە بەرو بەرەوپێش دەچێت و هەنگاو دەنێ و وردە وردە نهێنی یەکانی خۆی دەردەخات و سەرەنجام دەبێتە کۆرپەلەیەکی نێر یا مێ !! .

ئینجا باسی دروستکردنەوەی مرۆڤ لەو جیهان سەرنجی ڕاکێشام ، هەروەها تیاچوونی قەومە نالەبارەکان، بە تایبەت شەڕواڵ پیس و بەدڕەوشتەکان کە چۆن بوون بە پەند!!

سەرەنجام گوێ بیستی کۆتا ئاگاداری پێش کارەسات بووم کاتێ کە ئەم ئایەتانەی خوێندەوە :

﴿ هَٰذَا نَذِيرٌ مِّنَ النُّذُرِ الْأُولَىٰ (٥٦) أَزِفَتِ الْآزِفَةُ (٥٧) لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ اللَّهِ كَاشِفَةٌ (٥٨) ﴾

دواتر هەستم کرد کۆتا هاوارو بێداری یە ، هەموو گیانم هاتە جۆش و خرۆش لەبەردەم ئەم کۆتا ئاگاداری یە سامناکەدا:

﴿ أَفَمِنْ هَٰذَا الْحَدِيثِ تَعْجَبُونَ (٥٩) وَتَضْحَكُونَ وَلَا تَبْكُونَ (٦٠) وَأَنتُمْ سَامِدُونَ (٦١) ﴾

دواتر هەر کە گوێ بیستی کۆتا ئایەت بووم ﴿ فَاسْجُدُوا لِلَّهِ وَاعْبُدُوا ۩ (٦٢) ﴾ دڵە لەرزێ گەیشتە هەموو ئەندامەکانی جەستەم و بوو بە شتێکی موجەسەم و خۆم بۆ نەگیرا، هەموو گیانم هاتە ژان و پەشۆکان، دەستەڵاتم بەسەر خۆمدا نەما، ئەسرین بە خوڕەم لە دیدەم دەهاتەخوارێ ، هەرچەندە زۆر هەوڵمدا خۆم بگرم[1] .

جا کە ئەمە لەو کاتەدا لە خۆم روویدا بۆم دەرکەوت کە رووداوی سوژدەبردنی موشریکەکان لەگەڵ ئیمانداراندا حەقیقەتی هەیەو روونکردنەوەی ئاسانە ..

ئەویش لە توێی کاریگەریی و دەستەڵاتی ئەم قورئانەدایە ، چونکە رێرەوی ئایەتەکان و شێواز و داڕشتنیان تەکاندەرە، خۆ ئەمە یەکەمجار نەبوو ئەم سورەتە بخوێنم، یان گوێ بیستی بم، بەڵام ئەمجارە ئەو کاریگەرییەی هەبوو لەسەرم، وە ئەو حاڵەتەی بۆ پێش هێنام.. ئەمەش یەکێکە لە نهێنی یەکانی قورئان..

---

[1] خوێنەری بەڕێز، کێ دەڵێ کاتێ تۆ ئەم چەند دێڕە دەخوێنیتەوە منیش لەژێر خاکدا نیم .. لێت ناشارمەوە مەگەر خوا بزانێ بەندەش لەگەڵ . سید . ی ئازیزدا چەندە ئەسرینم رشت کاتێ کە تەرجەمەی ئەو هەست و ئەستە پیرۆزەیم دەکرد، منیش خۆم بۆ نەگیرا سوژدەم برد ، ئەسرین سارێژبوو لە دیدەم تا خوا حەز بکات .. سا خوایە گیان ئەو ئەسرینانەمان بخەیتە تەرازووی چاکەکانمانەوەو بیکەیتە قەڵغان لە ئاگری دۆزەخ .

لەڕاستیدا هەندێ کاتی تایبەت هەیە؛ ئیماندار خۆی بۆ ئامادە نەکردووە، بەڵام دەبینی ئایەتێك ، یان سورەتێك کارلێك دروست دەکات لەگەڵ ناخ و دڵ و دەرووندا و بەو شێوەیە کاریگەری دادەنێ ، ڕۆح و جەستە ئاوێتەی یەکدی دەبن و ئەوە ڕوودەدا کە باسم کرد ..

دیارە حاڵەتێك بەو شێوەیە کاریگەریی لەسەر ئامادەبووان داناوە، کاتێ کە محمد(ﷺ) بە دل و بە کوڵ و بە دەنگە پڕ لە سۆز و سازەکەی، ئەم سورەتەی خوێندۆتەوە، کارلێکی تەواو لە ناخیدا دروست بووە بەرانبەر ئایەتەکانی، دەنگی پیرۆزی کاریگەریی داناوە لەسەر هەموو گوێ بیستان، لەبەر ئەوە کاتێ کە فەرمانی خوای گەورە دەفەرموێت هەمووان گوێ بیستی دەبن.. پێغەمبەر (ﷺ) سوژدە دەبات و سەرجەم ئامادەبووان سوژدە دەبەن..

لەوانەیە یەکێك بڵێ : تۆ باسی حاڵەتێك دەکەیت کە لە خۆت ڕویداوەو ئەزموونێکە بۆ خۆت پێش هاتووە، لەکاتێکدا کە تۆ موسڵمانیت، باوەڕت بە قورئان هەیە وکاریگەریی تایبەتی لەسەر تۆ داناوە .. بەڵام زۆربەی ئامادەبووانی ئەو کاتە موشریك بوون و باوەڕیان پێی نەبووە؟!

جا لێرەدا دوو تێبینی گرنگە بیخەینە ڕوو لەبەرانبەر ئەو بۆچوونەدا:

**تێبینی یەکەم**: بیرمان نەچێت ئەوەی ئەو کاتە قورئانی خوێندووە محمدی پێغەمبەر بووە(ﷺ) کە ڕاستەوخۆ لە سەرچاوەکەی وەری گرتووە، لەگەڵیا ژیاوە و بەو ژیاوە، ئەوەندە خۆشەویست و نازدار بووە لای کاتێ گوێ بیستی کەسێك بووبێ کە لە ماڵەوە دەوری دەکاتەوە، هەنگاوەکانی هێواش کردۆتەوە و لەلایەکی دەرگاکەوە وەستاوە و گوێی بۆ ڕادێراوە تا لێبۆتەوە !! بەتایبەت لەم

سورەتەدا ئەو چرکەساتانەی هاتۆتەوە یاد کە لە جیهانە بەرزو بڵندەکاندا بردیە سەر، لە خزمەت بەدیهێنەری زەمان و مەکاندا، ئەو یادی گەشتەکەی دەکرد لەگەڵ جوبرەئیلی ئەمیندا، لەسەر شێوازەکەی خۆی - کە ئاسۆی پڕکردبوو - بەڵام من لە قورئان خوێنێك گوێ بیستی ئەم سورەتە بووم .. بێگومان جیاوازی یەکە زۆر فراوانە .

تێبینی دوهەم : ئەو موشریکانە ئەوەندەش دڵمردوو نەبوون کە قورئان کاریگەریی نەبێت لە سەریان و موچڕکە و تەزوو نەیەت بە گیانیاندا، بەتایبەت ئەوان راستەوخۆ گوێ بیستی محمد(ﷺ) دەبوون، بەڵام عینادیو سەرسەختیو گێلی وای لێ کردبوون کە تەسلیم نەبنو باوەڕ نەهێنن ..

ئەم دوو ڕوداوەش شایەتن لەسەر ئەوەی کە قورئان، یاخود نزای پێغەمبەر(ﷺ) کاریگەریی هەبووە لەسەریان و بڕوایان پێی هەبووە .. بۆ نموونە: ڕۆژێك (عتبە)ی کوڕی (أبو لهب) بڕیاری دا کە بچێت بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) وە دڵی ئازار بدات بەوەی کە بە شێوازێکی نادروست ڕەخنە لە خوای پەروەردگار بگرێت، کاتێ کە چوو ، وە ئەوەی کە لە دڵیدابوو وتی : پێغەمبەر(ﷺ) نزای لێ کردو فەرمووی : خوایە دڕندەیەك لە دڕندەکانتی بۆ بنێرە..دواتر گەڕایەوە بۆلای باوکیو چی وتبوو بۆی گێڕایەوە،(أبو لهب) لێی پرسی : ئەی چی وت ؟(عتبە) وتی : نزای لێ کردم و وتی : خوایە دڕندەیەك لە دڕندەکانتی بۆ بنێرە..

(أبو لهب) ترس چووە دڵی و وتی : کوڕم بەخوا نزاکەی گیرایە!.

کاتێ کە لەگەڵ کارواندا کوڕەکەی چووبۆ سەفەر لە خەڵوەتگەکەی (راهب) ێك لایاندا .. (راهب)ەکە وتی: ئەوە عەرەبینە بۆچی هاتوون بۆ ئێرە؟! ئەم ناوە وەکو رانە مەڕ شێری لێیە .. (أبو لهب) رووی کردە کاروانچیان و وتی : ئێوە دەزانن من پیربووم و مافم بەسەرتانەوە هەیە ، ئەو کابرایەش - مەبەستی

پێغەمبەر(ﷺ) بوو ـ نزایەکی لە کوڕەکەم کردو؛ دەترسم گیرا بوێت، هەرچیتان پێیە بیبەن بۆ خەڵوەتگەکە، جێگایەك لە ناوەڕاستا بۆ کوڕەکەم داخەن، جێگەی خۆشتان بەدەوریدا، کاتێ ئەوەمان کرد ـ شەو ـ شێرێك هات بۆنی یەکە یەکەمانی کرد ، پاشان بازیدا بۆ ناوەڕاست و بۆنێکی (عتبە)ی کرد، پەلامارێکی داو سەری ورد و خاش کرد.. (ابو لهب) کە حاڵەتەکەی بینی وتی : زانیم ئەو لە نزای محمد رزگاری نابێت!!

ئەوە (ابو لهب) کە زۆر دوژمنایەتی پێغەمبەری کرد و سورەتی (المسد) دەربارەی نازڵ بوو، ئاوا بڕوای بە پاکی و گیرابوونی نزای پێغەمبەر(ﷺ) هەبوو رووداوی دوهەمیش کە لە شوێنێکی تردا بە درێژی باس کراوە ، هەندێ روایات دەڵێت (عتبە)ی کوڕی (ربیعە) بووەو هەندێکیش دەڵێن (ولید)ی کوڕی (مغیرە) بووە کاتێ پێشنیاری سەرۆکایەتی و سامان و کیژی ناوازە دەکەن بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ، ئەویش دوای لێبوونەوەیان (١٣)ئایەتی سەرەتای سورەتی (فصلت) دەخوێنێتەوە تا دەگاتە : ﴿ فَإِنْ أَعْرَضُوا فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَاعِقَةً مِّثْلَ صَاعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ ﴿١٣﴾ ﴾..

کابرا دادەچڵەکێت و دەست دەنێ بە زاری پێغەمبەردا و بە ترسەوە دەگەڕێتەوە بۆ لایان و دەڵێت : محمد درۆ ناکات .. ترسام سزایەکی سەخت یەخەتان بگرێت !!

ئا بەو شێوەیە هەندێ کەسیان متمانەیان بە قورئان و بە محمد(ﷺ) هەبووە ، بەڵام سەرسەختی و خۆ بە شت زانین رێگری لێ کردوون، کەواتە ئەو جۆرە کەسانە کە گوێ بیستی سورەتی (النجم) دەبن لە زاری پیرۆزی (محمد)ەوە(ﷺ) دوور نیە کاریگەری هەبووبێت لەسەریان و خۆیان بۆ نەگیرابێ و لەگەڵ سوژدە بەراندا سوژدەیان برد بێت ..

ـ بەڵام دواتر کوردواتەنی گەڕاونەتەوە سەر بای بەرەی کۆن ـ

# ﴿سورەتی (القمر)﴾

ئەم سورەتە لە سەرەتایەوە تا کۆتایی هێرشێکی سامناکە بۆ سەر دڵو دەروونی ئەو کەسانەی کە بڕوایان بە بێدارکردنەوەو ئامادەباشی نیە و باکیان لە قیامەت و لێپرسینەوە نیە، لە بەرانبەریشدا دڵنیاییەکی تەواوپڕ لە متمانە دەبەخشی بە دڵە پڕ لە ئیمانەکانو ئەوانەی کە بڕوایان بە پەیامەکانی خوای گەورە هەیە، سورەتەکە دابەش کراوە بە چەند ئەڵقەیەك هەر ئەڵقەیەکیش دیمەنێ لە دیمەنەکانی سزادانی بێ باوەڕان نیشان دەدات، دوای هەر ئەڵقەیەکیش فشار بۆ هەستی مرۆڤ دێنیو رایدەوەشێنێ وپێی دەفەرموێت : سەرنج بدەن و تێفکرن و بزانن، چۆن بوو سزاو تۆڵەو خەشمو قینی من لەو یاخی بووانە؟!

پاشان دوای ئەو فشارو راوەشاندنە ئازادی دەکات و پێی دەفەرموێت : لە ڕاستیدا ئێمە قورئانمان ئاسان کردووە بۆ ئەوەی سەرنجی ئایەتو باسەکانی بدەن، ئایا کەسانێك هەن بیر لەم بەسەر هات و رووداوانە بکەنەوەو ئامۆژگاریان لێ وەربگرن؟

شایانی باسە؛ بابەتەکانی ئەم سورەتە لە گەلێك لە سورەتە مەککیەکاندا هاتووە، لە سەرەتاوە باسی بەرپابوونی قیامەتە، لە کۆتاییدا لە وردەکاری لێپرسینەوە دەدوێتو سەرەنجامی تەقواداران و خواناسان باس دەفەرموێت کە چۆن لەسایەی رەحمی خوادا لە بەهەشتی بەریندا ژیانی پڕ لە شادیو کامەرانی دەبەنە سەر.

لەو نێوانەشدا لە تیاچوونی قەومی (نوح و عاد و ثمود و لوط و فرعون )و دارو دەستەی باس دەفەرموێت، کە بەسەرهاتیان لە گەلێك سورەتی مەککیدا هاتووە..

بەڵام لەم سورەتەدا بە شێوازێکی تایبەت باس دەکرێن و نومایان دەبن، زۆر بەخێرایی بەڵا و کارەساتیان بەسەردێت، زوو یەکلایی دەکرێنەوە سامناکی و ترسناکی بەڵا و ئەو رووداوانەی کە بە سەریاندا دێت بە روونی بەدی دەکرێت، ترس و بیمێکی زۆر دایان دەگرێت، سایەی وێرانی و کاول کردن و زیرەپێکردنیان نومایانە!!

یەکێك لە تایبەتمەندی یە هەرە گرنگەکانی ئەو باسانە ئەوەیە کە هەر یەکەیان زۆر بەخێرایی ئەڵقەیەك لە سزایەکی سامناك نیشان دەدات کە لێقەومان و کارەساتێکی بێ وێنە یەخەی ئەو خوانەناسانە دەگرێت، وەکو ئەوەی کە بێباوەڕان لە هەر سەردەمێکدا خۆیانی تێدا دەبیننەوە، قامچی و ئێش و ئازارەکانی دەچێژن، کاتێ کە ئەڵقەیەك تەواو دەبێت و خەریکە هەناسەیەکیان پێدا دێتەوە خێرا ئەڵقەیەکی تازە و سامناکتر و ترسناکتر دێت بە شوێنیدا، ئا بەو شێوەیە حەوت ئەڵقە باس دەفەرموێت لە کەش و هەوایەکی پڕ لە ترس و بیم و خنکێنەردا..

تا سەرەنجام دیمەنی کۆتایی دێت، کەش و هەوایەکی تره، سایەیەکی تری هەیە، ئارامی و هێوری و دڵنیایی یە، سەرەنجامی تەقواداران و خواناسانە کاتێ کە دەفەرموێت : لەڕاستیدا تەقواداران و خواناسان ژیانی پڕ لە شادی و کامەرانی لە بەهەشتەکان و لە پاڵ روبار و ئاوە سازگارەکاندا دەبەنە سەر، شوێنی ئەوان لەلای پەروەردگاری ئازیزیاندایە، پاشای دەستەڵاتدار و هەمیشە بەتوانا..

ئەو بەختەوەرانە ژیانێکی ئاوا دەبەنە سەر لە کاتێکدا کافرو خوانەناسان لەسەر روویان کێش دەکرێن بۆناو ئاگری دۆزەخ. ئەو حاڵ و گوزەرانە لەکوێ و، ئەم حاڵ و گوزەرانە لەکوێ؟! ئەم دیمەنە لەکوێ و ئەو دیمەنە لەکوێ؟!

ئەو خەڵکە لەکوێ و ئەم خەڵکە لەکوێ؟! ئەو چارەنووسە لەکوێ و ئەم چارەنووسە لەکوێ ؟!

* * *

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ ﴿١﴾ وَإِن يَرَوْا ءَايَةً يُعْرِضُوا وَيَقُولُوا سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ ﴿٢﴾ وَكَذَّبُوا وَٱتَّبَعُوٓا أَهْوَآءَهُمْ وَكُلُّ أَمْرٍ مُّسْتَقِرٌّ ﴿٣﴾ وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّنَ ٱلْأَنۢبَآءِ مَا فِيهِ مُزْدَجَرٌ ﴿٤﴾ حِكْمَةٌۢ بَٰلِغَةٌ فَمَا تُغْنِ ٱلنُّذُرُ ﴿٥﴾ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ يَوْمَ يَدْعُ ٱلدَّاعِ إِلَىٰ شَىْءٍ نُّكُرٍ ﴿٦﴾ خُشَّعًا أَبْصَٰرُهُمْ يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ كَأَنَّهُمْ جَرَادٌ مُّنتَشِرٌ ﴿٧﴾ مُّهْطِعِينَ إِلَى ٱلدَّاعِ يَقُولُ ٱلْكَٰفِرُونَ هَٰذَا يَوْمٌ عَسِرٌ ﴿٨﴾﴾

خەڵکینە ئاگاداربن ، ڕۆژی قیامەت نزیك بۆتەوەو یەکێك لە نیشانەکانی لەت بوونی مانگە: (موشریکانی مەککە ، وەکو بیانویەك داوای لەت بوونی مانگیان لە پێغەمبەرﷺ کرد، ئەویش پەنجەی موبارەکی ئاراستەی مانگ کردوە ، ئەو کاتە مانگ بە ویستی خوای گەورە بوو بەدوو لەتی یەکسان ، چینی یەکان لە وڵاتی خۆیان ئەو دیاردەیەیان تۆمار کردووە ، ئەو وێنانەی لەودیوی نادیاری مانگ گیراون بە هۆی مانگە دەستکردەکانەوە ئاسەواری ئەو لەت بونەی بە ڕونی دەرخستووە ، سەنتەری ناسای ئەمەریکی دانی بەو ڕوداوەدا ناوە ، بەڵام

دەیشارنەوەو پەردەپۆشی دەکەن چونکە بەڵگەیەکە لە هەزار بەڵگە لە سەر راستیو دروستی قورئان و پێغەمبەری ئیسلام ، جگە لەوەش کاتێ کە قیامەت بەرپا دەبێت ، مانگ و زەوی و خۆرو ئەستێرەو هەسارەکان هەموی دەتەقێنەوەو وردو خاش دەبن و سەرلەنوێ خوای گەورە بە شێوازێکی نوێ بونەوەر دروست دەکاتەوە).

(٢) بەڵام ئەو خەڵکە بێباوەڕە ، هەر موعجیزەو بەڵگەیەك ببینن پشتی تێ دەکەن و ڕوی لێ وەردەگێڕن و دەڵێن: ئەم شتانە جادوویەکی بەردەوامە!!

(٣) حەقیقەت و ڕاستیەکان بە درۆ دەزانن و شوێنی ئارەزوو حەزەکانیان دەکەون ، بە مەرجێك هەموو شتێك تەواو دەبێت و هەمو کارێك کۆتایی دێت و سەرئەنجام دنیا نامێنێت و قیامەت لەنگەر دەگرێت.

(٤) بێگومان ئەو خەڵکە ئەوەندە هەواڵی تیاچونی ستەمکارانیان پێگەیشتووە و کە پێی داچڵەکێن و تێفکرن و لە چەوتی دەست هەڵگرن..(ئاسەواری خەشم وقینی خوا ئاشکرا و ڕوونە لەسەریان)..

(٥) ئەو بەسەر هات و ڕوداوانە حیکمەت و پەندو ئامۆژگاری زۆری تێدایە ، بەڵام بۆ خەڵکانی ناپوخت و بێ دین و خراپ هەموو ئەو بێدار کردنەوانە بێ سودە .

(٦) جا تۆ ئەی محمد ﷺ گوێ مەدە بەو ناپاکانە ، چونکە ڕۆژێك دێت کە بانگ بێژێك بانگ دەکات لەسەرجەم ئەو خەڵکە تا ئامادەبن بۆ لێپرسینەوە لە بارو دۆخێکی زۆر ناخۆش و نالەبارو سامناکدا ...

(٧) خوا نەناسان لەو ڕۆژەدا چاویان شۆڕەو شەرمەزارن لە ناخی زەویەوە پۆل پۆل دێنە دەرەوە وەك لێشاوی کوللەی بێ شومار بڵاو دەبنەوەو ڕوکاری زەوی دادەپۆشن.

(٨) ئەوسا بە دەنگی بەرز بانگیان دەکرێت ، ئەوانیش زۆر بە پەلەو شپرزییەوە بە دەم بانگهێشتی کۆکردنەوەیانەوە دەچن ، کافرو خوا نەناسان بە یەکتر دەڵێن: وا دیارە ئەمڕۆ ڕۆژێکی زۆر دژوارو سەخت و سامناکە !! (ئەمڕۆ ئەو ڕۆژەیە کە پێغەمبەران و باوەڕداران باسیان دەکرد ، بەڵام ئێمە گاڵتەمان پێیان دەهات و باوەڕمان پێی نەبوو ).

*           *           *

بەڕاستی سورەتەکە بەسەرەتایەکی سەرنج ڕاکێش دەست پێدەکات، ڕووداوێکی گەردوونی گەورە ڕوودەدات، پێشەکییەکە بۆ پێشهاتێکی زۆر گەورە کە بەراورد ناکرێت لەگەڵ ئەو پێشهاتەی پێشوودا چونکە قیامەت نزیکەو مانگ لەت بووە، بەڕاستی پێشەکی هەواڵێکی سامناکە ..

دیارە عەرەبەکانی ئەو سەردەمە ئەو موعجیزەیەیان بینیوە، ماوەتەوە ڕووداوە گەورەکە پێش بێت.

ڕوایاتی زۆر و هەمەجۆریش هەیە دەربارەی موعجیزەی لەت بوونی مانگ. هەرچەندە بوونی مانگ خۆی موعجیزەیەکە ، قەبارەی، سوڕانەوەی بە دەوری زەویدا بەشێوەیەکی ڕێك و پێك بە (٢٩.٥) ڕۆژ شێوازی، سروشتی ، هەروەها خولانەوە و دانانی بەو شێوەیە لە بۆشایی ئاسماندا، جگە لەوە ئەم زەوی یە، ئەم خۆرە، ئەم سەد ملیۆن گەلەئەستێرە و کاکێشانەی کە ئاسمانی تەنیوە و هەر یەکەیان ملیارەها ئەستێرەو هەسارەی لەخۆ گرتووە، هەموو ئەوانە موعجیزەن و زانایانی گەردوون ناسی حەپەساندووەو، دەڵێن : بەدیهێنەری ئەم گەردوونەو ئەم هەموو دروستکراوە سەیرو سەمەرانە هیچ جۆرە گومانێکی

نەهێشتۆتەوە کە زاتێکی زۆر زانا و زۆر بەتوانا و زۆر دانایە، دەستەڵاتی بێ سنوور و ڕەهایە، گەر بە چاویش بە دیداری شاد بین ئیمان و باوەڕمان پێی هەر وەکو ئێستایە و زیاتر نابێت!!

شایانی باسە کۆتا پەیامی خوای گەورە بۆ مرۆڤایەتی زۆر گرنگی بە موعجیزە ماددیەکان نەداوە، ئەوەندەی کە هەوڵی داوە لەڕێگەی قورئانەوە وەکو پەیامێکی گشتی بۆ خوێندەوارو نەخوێندەوار زانا و وەستا و کرێکارو جوتیارو هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵ کە بیر بکەنەوە لە خودی قورئان؛ لە داڕشتنی، وە لەڕێگەی ئەویشەوە سەرنجی کتێبی گەورە و کراوە و زەبەلاحی گەردوون بدەن و لە ڕێگەی زانستەوە بەدیهێنەری بناسن و بیپەرستن و پەیڕەوی لە فەرمانەکانی بکەن.

موعجیزەکانی رابوردوو بۆ کاتێکی دیاریکراوو کۆمەڵێ خەڵکی دیاریکراو بووە، بەڵام موعجیزە بەردەوامەکان کە لەسەر زەویدا بەدی دەکرێن لە جیهانی مرۆڤ و باڵندەو ئاژەڵ و مادە و مێژوو ڕوەك و ... تد . کە لە ژمارە نایەن، هەروەها کە لە خۆرو مانگ و ئەستێرە و گەردووندا زانست ئەندازەیەکی بۆ باس کردووین ، هەمیشە و بەردەوام بۆ کەسانێ کە سەرنج بدەن وتێفکرن و بیر بکەنەوە نومایان و ئاشکران.

لەبەر ئەوە گەر بە دڵ سەرنجی هەر دروستکراوێك بدەین هەتا ئەوەش کە مرۆڤ دوای هەزاران تاقیکردنەوە و بەشداری هەزاران زانا و پسپۆرو ئەندازیار دروستی دەکات، ئەوەش هەر دەستی قودرەت و توانای خوای گەورەی تێدا بەدی دەکەین، هەر لە فڕۆکە زەبەلاحەکانەوە، بگرە تا کەشتی ئاسمانی و دەزگا

ئەلکترۆنیە پێچیدەکان، هەتا کەرەستەکانی ناو ماڵ و شوێنە گشتی یەکان، هەر هەمووی بەڵگەن لەسەر بوونی خواوەندی جوانکارو دروستکار ..

چونکە مرۆڤ خۆی؛ خۆی دروست نەکردووە، پاشان کەرەستە خاوەکان ، کانزا هەمەجۆرەکان، زەوی و ئاوو هەوا و هەموو پێداویستیەکان، هەر هەمووی بەخششی خوای بەخشندەن، تا ئەم مرۆڤە بیناسێتو سوپاسگوزار بێتو لە چاکەو خێردا بەکاریان بێنێ.

گەر سەرنج بدەین جوانیەکان تێکەڵن لەگەڵ داهێنانە سەرسوڕهێنەرەکاندا ناخ و دڵ و دەروون دەهەژێننو ئیمان دەجۆشێنن بەشێنەیی و بە قوڵی قەناعەت دەکەین کە پەروەردگارێکی تەواو جوانکارو کاربەجێ هەیە لە پشتی هەموو دروستکراوەکانەوە.

جا لە سەرەتای ئەم سورەتەدا ئاماژە بە نزیکبوونەوەو بەرپابوونی قیامەت دەکاتو لەت بوونی مانگیش دەکا بە یەکێ لە نیشانەکانی کە دڵی مرۆڤ رادەوەشێنێ، کاتێ کە هەست دەکات وا قیامەت بەرێوەیەو بەردەوام لێی نزیك دەبێتەوە، وە بیردەکاتەوە لە لەتبوونی مانگ کە روویداوە، ئینجا بیردەکاتەوە لەو گۆڕانکاریە گەردوونیانەی کە روودەدەن، هەروەها دەبێ ئەو کەسانەی کە ئەو دیمەنەیان بینیوە چەند سەرسام بووبن.

پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموویەتی ( بعثتُ انا و الساعة كهاتين) .. واتە : رەوانەکردنی من و بەرپابوونی قیامەت وەکو ئەم دوانە وایە، پەنجەی شایەتمانو ناوەڕاستی بەیەکەوە جووت کردووە ..

جا کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) پێش پتر لە (١٤٣٧)ساڵ ئەمەی فەرموویێ دیارە ئێمە لە دوای تێپەڕبوونی ئەو ماوەیە پەیدا بووین، دەبێ چاك خۆمان ئامادە بکەین و بە (حلم و صبر)ی خوای گەورە خۆمان ڕەنجەڕۆ نەکەین..

زۆر هەن کە سەرسەختن و سوورن لەسەر گومڕایی، لە هەڕەشەکان ناترسن و بە هیچ موعجیزە و بەڵگەیەك باوەڕناکەن!

کاتی خۆی کافرەکانی بە ئاشکرا لەتبوونی مانگیان بینیوە قوڕەیش ڕوویان وەرچەرخاندووە و وتویانە جادوی لێ کردووین، ، هەمان گوفتاری نابەجێیان کە بە قورئانیان وتووە، گوایە جادووە، بەو ڕووداوە سەرسوڕهێنەرەش کە لەسەر داواو بیانوی خۆیان بە ویستی خوای گەورە پێش هاتووە، هەمان شتیان وتووە!!

چونکە ئایەتەکانی قورئان لە ژیانی پێغەمبەردا بەردەوام و ناو بەناو نازڵ بووە، ئەو ناحاڵیانە وتوویانە: ئەمە جادوویەکی بەردەوامە!! بیریان نەدەکردەوە و بە دڵ گوێ بیستی نەدەبوون و لایەکیان بەلای بەڵگە بەهێزەکاندا نەدەکردەوە، بڕوایان بە هیچ شتێك نەدەکرد لەوەی کە قورئان ئاماژەی بۆ دەکات و باسی دەفەرموێت ..

شوێن ئارەزووەکانیان دەکەوتن و هیچ بەڵگەیەکیان پێ نەبوو، کەڕوکاس بوون لە ئاستی ئەم هەموو بەڵگانەدا کە دەوری داون ـ هەروەکو ئێستا چۆن ئەم هەموو داهێنانە لە بواری تەکنۆلۆژیادا بە ئازایەتی و زانستی مرۆڤی دەزانن، بیر ناکەنەوە لەو زاتەی کە مرۆڤەکانی بەدی هێناوە و هەرچی پێداویستی یە بۆی دابین کردوون و هەر خۆیشی توانای فێربوونی پێبەخشیون ..-

دیارە خوای گەورە هەموو شتێکی لەم بونەوەرە گەورە و فراوانەدا لە جێگەی خۆیدا داناوە، مەگەر خوای گەورە بیەوێت جێ گۆڕکێیان پێ بکات یان لای ببات، یاخود لەناوی ببات، هەروەها دروستبوونی ئەم گەردوونە لەسەر بناغەی حەزو ئارەزوو،یان رێکەوت نەبووە، بەڵکو بە نەخشەو پلانێکی تۆکمە لەلایەن زاتێکی تەواو زاناو بەتواناوە بەدی هاتووە ..

مرۆڤ هەست دەکات ، هەموو دروستکراوانی دەوروبەری مەحکەم و تۆکمەن و هەموو شتێك لە جێگەو رێگەی خۆیدا دانراون، رێکوپێکی و تۆکمەیی لە هەموو شتێکدا نومایانە، لە سوڕانەوەی زەوی لە بۆشاییدا بەدەوری خۆیدا، وە بەدەوری خۆردا، لەگەڵ خۆر و کۆمەڵەی خۆردا .. سوڕانەوەی مانگ بە دەوری زەویدا، هەروەها یاساکانی ژیان لەسەر زەویدا لە جیهانی مرۆڤ و ئاژەڵ و روەکدا، بەڵکو لە ئەندامەکانی جەستەی هەر دروستکراوێکدا، کە هیچ مرۆڤێك جورئەتی نەکردووە و نایشیکات کە خۆی توانیبێتی یان دەتوانێت بەشێکی بچوك لە جەستەی خۆی دروست بکات ..

بەڵام بەداخەوە مرۆڤەکان هەموو ئەم شتانە دەبینن و دەیزانن، تا زانست پێش بکەوێت زیاتر دەستی قودرەتی خوایی خۆی نومایان دەکات ـ زانایانی گەردوونناسی بە تایبەتی و زانایانی بوارەکانی تر بە گشتی بەوپەڕی ملکەچی و سۆزەوە لەو بەدیهێنەرە دەستەڵاتدارو جوانکارو دروستکارە دەدوێن، کەچی خەڵکانێکی تر کە زانیارییەکی کەم و سنووردراریان هەیە ئینکاری دەکەن ، یان خۆیان لە باسی دەستی قودرەتی ئەو زاتە هەڵدەبوێرن ـ دەبینین زۆربەی ئەو خەڵکە سەرگەردانن، ستەمکارن ، ئارەزووهەڵیان دەپەڕێنێ، لە کۆکردنەوەی سامان تێرناخۆن، بەتایبەت کە رێژەیەك دەستەڵاتیان هەبێ !! ـ

بەمـەرجێ لـەم قورئانـەدا باسـی گـەردوونی زۆر تێـدا کـراوە، هـەروەها باسـی خەڵکانی یاخی وبێباوەڕ زۆر هاتووە، کە خوای گەورە پێغەمبەرانی ڕێزداری بۆ ڕەوانە کردوون، ساڵەها مۆڵـەت دراون، سـەرەنجام خـوای گـەورە پێغەمبـەران و باوەڕدارانی رزگار کردووە و تاوانبارانی لەناو بردووە..

- بەڵکو لە سەردەمی خۆیشیاندا ستەمکارو ملهوڕەکان دەبینن کە چۆن گەلان و میللەتان لێیان رادەپـەڕن، یاخود بە شێوازێکی توند لە ناویـان دەبەن، یاخود کورسی و کۆشك و تەلارەکانیان پێجێدێڵن!!

سـەیرە!! سـتەمکارانی دواتـر داناچڵەکێن، بیرناکەنـەوە،دڵیان داخـراوە، بێـدار نابنەوە ..

لەڕاسـتیدا ئیمـان و بـاوەڕی ڕێکوپێـك بەخششـی خـوای گەورەیـە بـۆ مـرۆڤ و بەجوانی بەرچاوی روون دەکاتەوە..

جا کاتێ کە هیچ شتێك سوودی نیە و ئەوانە هـەر تێنـافکرن و تێناگـەن، خـوای گـەورە داوا لـە پێغەمبـەر(ﷺ) دەکـات کـە وازیـان لێ بێنـێ بـۆ ئـەو رۆژەی کـە بەڕێوەیە و لەت بوونی مانگ نیشانەی نزیك بوونەوەیەتی .. !!

دیـاردەی لـەت بـوونی مـانگ دیمـەنێکی سەرسوڕهێنەر بووە لـە کـاتی خۆیـدا، سایەی ئەو توندی یە لەم سورەتەدا نومایانە، بەتایبەت کە مانگ لەت بووە وەکو ئاگادار کردنەوەیەك کە بەرپابوونی قیامەت نزیکە - ئەڵبـەت ئەو نزیکی یە بە تەمـەنی کـورتی مرۆڤـەکان نـاپێورێ، هـەر ئەوەندەیـە کـە ئێمـە دڵنیـابین کـە تێپـەڕبوونی هـەر رۆژ و هـەر حەفتـە و هـەر مـانگ و هـەر ساڵێك لـەو دەرەنجامـە نزیکمان دەکاتەوە - .

جا بیربکەرەوە لەو خەڵکە بێ شومارەی کە لـە توێی خاکدا وون بوون کاتـێ کـە فـوو دەکـرێ بـە دەزگـای (صـور)دا هـەموویان لـە یـەك کاتـدا وەکـو کوللـە بێنـە

دەرەوە، ئەڵبەت زوربەی زۆریـان جگە لە باوەڕداران چاویان شۆڕە و زەلیلیو ریسـواییان پێـوە دیـارە ، لـە سـامناکی ئـەو رۆژە و لـە بەدەمـەوە چـوونی ئـەو دەنگەی کە داوای گردبوونەوەی بەپەلەیان لێ دەکات، هەر بۆیە کافران بە یەکدی دەڵێن، وادیارە ئەمڕۆ رۆژێکی سەختە ، ئەمڕۆ ئیتر هەمووما‌ن گیردەخۆین ، دیارە بە تەواوەتی هەست دەکەن کە بارودۆخێکی سامناك دەوری داون.

* * *

پاشان دوای ئـەو چەپکە ئایەتـە توندو سامناکە ، دوای باسـی لێقـەومانی بێ باوەڕان لە قیامەتدا دێتە سەر باسی ئەو بەڵاو نەگبەتیانەی کە لـە دنیـادا پـێش قیامـەت هـاتووە بەسـەر بێباوەڕانـدا .. سـەرەتا بـە باسـی قـەومی نـوح دەسـت پێدەکات :

﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ فَكَذَّبُوا عَبْدَنَا وَقَالُوا مَجْنُونٌ وَازْدُجِرَ ﴿٩﴾ فَدَعَا رَبَّهُ أَنِّي مَغْلُوبٌ فَانتَصِرْ ﴿١٠﴾ فَفَتَحْنَا أَبْوَابَ السَّمَاءِ بِمَاءٍ مُّنْهَمِرٍ ﴿١١﴾ وَفَجَّرْنَا الْأَرْضَ عُيُونًا فَالْتَقَى الْمَاءُ عَلَىٰ أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ ﴿١٢﴾ وَحَمَلْنَاهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلْوَاحٍ وَدُسُرٍ ﴿١٣﴾ تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا جَزَاءً لِّمَن كَانَ كُفِرَ ﴿١٤﴾ وَلَقَد تَّرَكْنَاهَا آيَةً فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٥﴾ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿١٦﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٧﴾﴾

(٩) پێش ئەم خەڵکە بێدینە ، خـوا نەناسەکانی قەومی نوح یش بڕوایان بە نوح پێغەمبەر نەکردو پەیامی ئەو بەندە چاکەی ئێمـەیان بە ناڕاسات ناوزەد کـردو وتیان: شێتە!! زۆریش ئازارو ئەشکەنجەیان داو سوکایەتیان پـێ کـردو پیایـدا هەڵشاخان.

(١٠) (ئـەویش دوای ٩٥٠ ساڵ لـە بانگـەوازو ژیان لـە گەڵیاندا) ڕۆژێکی هاناو هاواری بۆ پەروەردگاری بردو وتی: خوایە گیان ئیتر من شکستم خواردووە ، مەگەر هەر خۆت سەرکەوتنم پێ ببەخشیت.

(١١) ئەوسـا ئـیتر ئێمـەش دەروازەکـانی ئاسمانمـان کـردەوە هـاوڕێ لەگـەڵ بارانێکی لێزمە و خوڕەمدا...

(١٢) هـەمو سـەر زەویشـمان کـردە کانیـاوو لـە هـەموو شـوێنێکەوە ئـاو هـەڵقوڵا ، ئـاوی ئاسمان و زەوی یەکیانگرت بە ویست و ئیرادەیەك کە پێشتر نەخشەی بۆ کێشرابوو.

(١٣) ئەوسـا ئـیتر ئێمـە نـوح و ئیمانـدارانمان لەسـەر چـەند تەختـەو بزمارێـك هەڵگرت..!! کە مەبەست کەشتیەکەیە.

(١٤) پاشان کەشتیەکە لـە ژێـر چاودێری ئێمـەدا بەسـەر ئەو تۆفان و زریانـەوە گەشتی دەکرد... ئا بەو شێوەیە ئێمە سەرکەوتنمان پێبەخشی کاتێك کە ئەو هەموو ماوە دووروو درێژە دژایەتی کرا و بڕوای پێ نەکرا ).

(١٥) لـە ڕاسـتیدا ئێمـە دەنـگ و باسـی ئاسـەواری ئەو ڕوداوەمـان هێشـتەوە لـە مێـژودا ، تـا ببێتـە بەڵگـەو پەنـدو ئامۆژگـاری بـۆ هـەموو نـەوەکان ، تـا ببینـن و دەرکـەوێت کـە: ئایـا خـەڵکی پەنـدو ئامۆژگـاری وەردەگـرن؟! لـە تۆڵـەی ئێمـە دەترسن؟! بیردەکەنەوە؟! تێدەفکرن؟!

(١٦) سەرنج بدەن و تێفکرن چۆن بوو سزاو تۆڵەو خەشم و قینی من لەو یاخی بوانە!!

(١٧) جا ئـیتر ئێمـە ئـەم قورئانـەمان ئاسـان کـردووە بـۆ تێگـەیشتن و تێڕامـان و پەندو ئامۆژگاری وەرگرتن ، باشە ئایا خەڵکانێك هەن کە دەرکی حەقیقەت و ڕاستیەکان بکەن؟! پەندو ئامۆژگاری وەربگرن؟!

بەڵێ پێش ئەم بێ دین و موشریکانەی ئێستا قەومی (نوح)یش باوەڕیان بەو کەسایەتیە دڵسۆزو راستگۆیە نەکرد، بەڵکو تۆمەتی شێتیان دایە پاڵی ، زۆر پیایدا هەڵشاخان و پیلانیان دژی چنی و سوکایەتی زۆریان پێکردو ئازاری زۆریان دا لە ماوەی نۆسەد و پەنجا ساڵدا، هەروەکو ئێستا قوڕەیش بە محمدی دڵسۆز و راستگۆ دەڵێن (ﷺ)، گاڵتەی پێ دەکەن و ئازاری دەدەن و پیایدا هەڵدەشاخێن .. لە باتی ئەوەی بیربکەنەوە و تێفکرن، (نوح - علیه السلام) دوای ئەو ماوە زۆرە هانای بۆ پەروەردگاری برد، ئەو پەروەردگارەی کە ئەرکی گەیاندنی ئەو پەیامە بە نرخەی پێسپاردبوو، سکاڵای کرد و فەرمووی پەروەردگار (ئیتر من شکستم خواردووە و داوا لە تۆی باڵادەست دەکەم کە سەرکەوتنم پێ ببەخشیت ..

چونکە ئیتر توانام نەماوە، هەوڵەکانم بە بنبەست گەیشتووە، هێزم لێ بڕاوە، شکستم خواردووە، داواکارم کە زاتی خۆت بارودۆخەکە یەکلایی بکەیتەوە، بانگەوازەکەت سەرخەیت هەق و بەرنامەکەت پیرۆز بکەیت، پەیام پەیامی خۆتە، بانگەواز بانگەوازی خۆتە، ئیتر رۆڵی من کۆتایی هاتووە!!

جا هەر کە ئەو وشە پیرۆزانە لە زاری پێغەمبەر (نوح - علیه السلام) دەردەچێت وە تەواوکردنی کارەکە دەداتە دەست خواوەندی باڵادەست و خەشمگیر لە ستەمکاران، ئەو زاتە فەرمان دەدات بە گەردوون - بە تایبەت ئەو بەشەی کە پەیوەندی بە زەوی یەوە هەیە - کە دەروازەکانی ئاسمان بکاتەوە هاوڕێ لەگەڵ بارانێکی خوڕەمدا ، هەموو زەویش دەتەقێنێتەوە و دەیکاتە کانیاو، ئاو لە هەموو شوێنێکەوە هەڵدەقوڵێ، ئاوی ئاسمان و زەوی بەیەک دەگەن بە شێوازێك کە پێشتر نەخشەی بۆ کێشرابوو.. بەڕاستی ئەو رووداوە جوڵانەوەیەکی

گەردوونی زەبەلاح بوو ، قورئان بە وشەی تایبەت و هەڵبژاردە وێنای دەکات..

سەرەتا وا هەست دەکەیت کە خوای پەروەردگار؛ بەو هەموو شکۆمەندی یەوە کە هەیەتی خۆی دەروازەی ئاسمان دەکاتەوە تا بارانێکی زۆر و خوڕەم ببارێنێ، هەروەها هەر خۆشی زەوی دەکاتە کانیاو و لە هەموو شوێنێکەوە ئاو هەڵدەقوڵێت، ئیتر ئاوی ئاسمان و زەوی یەکدەگرن بە ویست و بڕیاری خوای گەورە ، هەموو بونەوەر ملکەچ و فەرمان ئەنجام دەدات ..

جا ئەو کاتەی کە ئەوبارانە بێ وێنەیە بو بە زریانێك کە هەموو شوێنێکی داپۆشی و گرمە و ناڵەی دەهات، هەموو رووی زەوی گرتەوە، ئەو پیس و پۆخڵییەی کە بەشێك لە رووکاری زەوی داپۆشیبوو رایماڵی، چونکە ئیتر بە (نوح پێغەمبەر ـ علیه السلام) نەدەکرا، هیچ چارەیەکی نەما ، ئەو کات ئەو دەستە پڕ لە سۆزو میهرە فریای پێغەمبەرەکەی و شوێنکەوتووانی کەوت و بەرێزەوە لەژێر چاودێری خوادا رزگاری کردن لەسەر ئەو کەشتیەی کە (نوح ـ علیه السلام) لەژێر چاودێری خۆیدا کاتی خۆی دروستی کردبوو، هەرچی کافرو ستەمکاروبێ دین و بت پەرستێك هەبوو هەمووی رامالی و بووبە پاداشتێك بۆیان!! یاخود تۆڵەیەك لێیان ..

دەبا ئیتر هەر گاڵتە بکەن و هەر باوەڕی پێ نەکەن ..

هەروەها ئەم ئایەتانە ئەوەش دەردەخات کە ئەوەی بۆ خوا گونجاوە و بۆ خوا صوڵحاوە و بۆلای خوا بانگەواز دەکات، چ زاتێکی دەستەڵاتدار پشتیوانیەتی، بە تایبەت کاتێ کە هەست دەکات شکستی خواردووە و دەستەڵاتی شەڕو نەفامی بە ئارەزووی خۆیان تەراتێن دەکەن لەسەر زەوی خواداو هیچ حسابێك بۆ ئەو زاتە ناکەن !!

بەڕاستی ئیماندار دەبێ دڵنیا بێ كە هێزە گەردوونیەكان ئامادەیە هاوكاری بكات و سەری بخات، خوای گەورەش بە دەسەڵاتی بێ سنور و ڕەهای لە پشتی هەموو هێزەكانەوەیە.

جا كاتێ قورئان ئەو دیمەنانە بە زیندویەتی دەخاتە ڕوو، لە هەمان كاتدا ڕوودەكاتە خوێنەران و گوێ بیستانی قورئان لە هەموو زەمان وزەمینێكدا، كە ئەوە بەڵگەو نیشانەیەكە لە نیشانەكانی دەستەڵاتی ڕەهای خوای پەروەردگار، ئایا كەس هەیە بیری لێ بكاتەوە، دەرس و پەندو ئامۆژگاری لێ وەربگرێت؟!

پاشان پرسیاریش دەكات و دەفەرموێت : بیربكەنەوە، چۆن بوو سزاو تۆڵەی من، چۆن هەڕەشەكانم دوای ماوەیەك ئەنجامدا؟!

بەڵام سەیرە، قورئانە لەبەر دەستدایە ، ئاسان دەست دەكەوێت، تێگەیشتن لێی ئاسانە، جێگەی سەرنج و تێڕامانە، ڕاستگۆیی و ئاسانی تێدا نومایانە، لەگەڵ فیترەتدا یەك دەگرێتەوە، سروشتی مرۆڤ ـ گەر بە دڵ گوێ بیستی بێت ـ دەهەژێنێ، نهێنی و شتە سەیر و سەرنج ڕاكێشەكانی تەواو نابن، بە هۆی زۆری خوێندنەوە و دەوركردنەوەی هەرگیز لە ئیماندار نابێزرێت، هەر كات بە دڵ دەور بكرێتەوە توێشووی تازەی لێ وەردەگیرێت، هەتا مرۆڤی باوەڕدار لە خزمەتیا بێت ، زیاتر هۆگری دەبێت و پێی ئاسوودەیە، چونكە خوای گەورە خۆی دەفەرموێت : ئێمە قورئانمان ئاسان كردووە، تا مرۆڤەكان یاداوەری لێ وەربگرن و سوودی لێ ببینن و خێری هەردوو جیهانیان دەست بكەوێت ...

﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٧﴾ ﴾

شایانی باسە ئەم دوو ئایەتە دوای بەسەرهاتی هەموو قەومە پێشووەكان دووبارە دەبێتەوە ، هەموو جارێكیش بۆ ئەوەیە كە دڵەكان بێدار بكاتەوە،

تێفکرن، دوای ئەوەی هەموو جارێك ئەڵقەیەك لەو سزا بە ئازارو ئێشانە یەخەی قەومە پێشووەکانی گرتووە کاتێ رێبازی کوفرو ستەم و بێ دینی و ناپوختییان گرتۆتە بەر ..

لە راستیدا ئەو ژمارە کەمە لە ئیمانداران لە شوێنکەوتوانی نوح ـ سڵاوی خوای لێ بێت ـ کە هەندێ ریوایات دەڵێ دوانزە کەس بوون بەرهەمی رەنجی بانگەوازی نوح بوون لە ماوەی هەزار ساڵ پەنجا ساڵ کەمدا ـ واتە ٩٥٠ ساڵ ـ هەروەکو تاکە سەرچاوەی راستو دروستی دڵنیابەخش ئاماژەی بۆ کردووە .

بێگومان ئەو ژمارەیە بەرهەمی ئەو تەمەنە درێژە و ئەو هەوڵە گەورەیە بووە ، هەر بۆیە شایستەی ئەوە بوون کە خوای گەورە یاسا گەردونیەکانیان بۆ بگۆڕێت ، وە ئەو زریان و تۆفانە بەرپا بکات کە هەموو شتو هەموو زیندەوەران لە ئاوەدانیەکانی ئەو سەردەمە لەسەر زەویدا داپۆشێت. لە هەمان کاتدا ئەو ژمارە کەمە بکاتە نیشتەجی لەسەر زەویدا و بیکاتە بنەتۆو بۆ ئاوەدانی و جی نشینی سەر لە نوێ ..

بێگومان ئەوە روداوێکی زۆر گرنگو گەورە و مەزن بوو لە راستیدا کاتێ کە دەبینی پێشەنگی کاروانی ئیسلامیەت و دینداری سەری هەڵداوە و نەفامی بە هەموو توانایەوە لە هەموو سەرزەویدا دژایەتی دەکات ، لە هەمان کاتدا هەست بە غەریبی و نامۆیی دەکات لە نێو نەفاماندا ، هەروەها روبەڕوی ئەشکەنجە و ئازار و مەینەتی و دەربەدەری و لەناوبردن دەبێتەوە.. لە راستیدا ئەو پێشەنگە دەبێ زۆر هەڵوێستە بکات لە بەرامبەر ئەو پێشهات و روداوە گەورە و گرنگانەوە ، لە بەرانبەر ئەو ئاماژانەی کە شایستەی ئەوەن کە ئیماندار لە بەرانبەریانەوە زۆر تێفکرێت و بیریان لێ بکاتەوە.

بێگومان بونی ئیماندار لەسەر زەویدا شتێکی زۆر مەزن و گەورە و بەنرخە لای خوای گەورە و شکۆمەند .. شتێکە کە شایستەیە ئەو زاتە هەرچی دام و دەزگای نەفامیە لە ناوی بەرێت، بە سەر زەمین و ئاوەدانیەکانەوە ، بە دام و دەزگا و کارخانەکانیانەوە ، بە هەموو هێز و توانا لوجستیەکانیانەوە، لە هەمان کاتدا ئەو رێزدارانە شایستەن کە خوای گەورە بەرەکەت بخاتە نێوانیانەوە و چاودێریان بکات هەتا بە سەلامەتی بمێننەوە و رزگاریان بێت و سەر لە نوێ ببنە هۆکاری ئاوەدان کردنەوەی زەوی .

بێگومان (نوح) ـ سڵاوی خوای لێ بێت ـ لە ژێر چاودێری و رێنوێنی و نیگای خوایی دا، کە بە فەرمانی خوا دەستی کرد بە دروست کردنی کەشتیەکە ، هەروەك خۆی فەرمویەتی:

﴿ وَٱصۡنَعِ ٱلۡفُلۡكَ بِأَعۡيُنِنَا وَوَحۡيِنَا وَلَا تُخَٰطِبۡنِي فِي ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ إِنَّهُم مُّغۡرَقُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾ هود

واتە: دەست بکە بە دروست کردنی کەشتیەکە لە ژێر چاودێری و نیگای ئێمەدا، کاتێ کە زریانەکە بەرپا بوو تۆ دەربارەی ئەوانەی کە ستەمیان دەکرد داوای هیچم لێ مەکە چونکە بەڕاستی ئەوانە لە زریانەکەدا نوقوم کراون !!

بەڵێ : کاتێ کە خەڵکەکە ئازار و ئەشکەنجە و بوختانیان بۆ نوح زیادی کرد ، دەستی کردە پاڕانەوە و رو بە پەروەردگاری وتی ، هەروەکو خوای گەورە لە سورەتی (القمر)دا باسی دەفەرموێت :

﴿ كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ قَوۡمُ نُوحٖ فَكَذَّبُواْ عَبۡدَنَا وَقَالُواْ مَجۡنُونٞ وَٱزۡدُجِرَ ﴿٩﴾ فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَغۡلُوبٞ فَٱنتَصِرۡ ﴿١٠﴾ ﴾

واتە: پێش ئەم موشریکانە ، قەومی نوح یش باوەڕیان بە پەیامەکەی نەکرد و پەیامی بەندەی ئێمەیان بە راست نەزانی و وتیان : کابرایەکی شێتە و زۆر

سەرزەنشت کراو سوکایەتی پێکرا .. ئەویش هانا و هاواری بۆ پەروەردگاری برد و تی: خوایە گیان بەراستی من ئیتر شکستم خواردوە و داواکارم سەرکەوتنم پێ ببەخشیت.

جا ئەوە بوو کاتێ نوح هانای برد بۆ پەروەردگاری و بە ئاشکرا وتی ( من ئیتر شکستم خواردووە) لە هەمان کاتدا داوای لێکرد کە ( سەرکەوتنی پێ ببەخشێت) ، دیارە کە ئەوە خوای گەورەیە و پێغەمبەرەکەی شکستی خواردووە !! ئەو کاتە ئیتر خوای گەورە هێزە گەردونیەکانی خستە گەڕ ، تا لە خزمەت بەندەی شکست خواردویدا بێت.

جا کاتێ کە نوح پەنای برد بۆ پەروەردگاری و رایگەیاند کە (( شکستی خواردووە)) وە داوای لێکرد کە (( سەرکەوتنی پێ ببەخشێت)) ئیتر ئەوە خوایە و پێغەمبەرەکەی شکستی خواردووە !! ئەو کاتە ئیتر خوای گەورە هێزە گەردونیە زەبەلاحەکانی بۆ خستە کار ، تا لە خزمەت بەندەی شکست خواردویدا بن : ﴿ فَفَتَحْنَآ أَبْوَٰبَ ٱلسَّمَآءِ بِمَآءٍ مُّنْهَمِرٍ ﴿١١﴾ وَفَجَّرْنَا ٱلْأَرْضَ عُيُونًا فَٱلْتَقَى ٱلْمَآءُ عَلَىٰٓ أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ ﴿١٢﴾ ﴾

واتە: ئەو کاتە ئێمە یەکسەر دەروازەکانی ئاسمانمان کردەوە هاوڕێ لەگەڵ لێزمە بارانی خوڕەمدا، وە زەویشمان کردە کانیاوی هەڵقوڵاوی خوڕەم، ئەوسا ئاوەکان یەکیان گرت بە فەرمانێك کە بە راستی بڕیاری لەسەر درابوو، خوای گەورە نەخشەی بۆ کێشابوو، ئا لەو کاتەی کە ئەو هێزە زەبەلاحانە دەست بەکار بوون لە سەر ئەو ئاستە گەردونیە سەیرو سامناکە، خوای گەورە بە زاتی پایەدارو بەرز و بڵند و شکۆمەندی خۆی لەگەڵ بەندەی شکست خواردوی خۆیدا بوو :

﴿وَحَمَلْنَٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلْوَٰحٍ وَدُسُرٍ ﴿١٣﴾ تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا جَزَآءً لِّمَن كَانَ كُفِرَ ﴿١٤﴾﴾

واتە : ئێمە ئەومان هەڵگرت لەسەر چەند تەختە و بزمارێك ـ كە مەبەست كەشتیەكەیە ـ وە لە ژێر چاودێری ئێمەدا بە زریانەكەدا هاتوچۆی دەكرد ، بێگومان ئەو بەسەر هاتە تۆڵەیەك بوو كە لە كافر و خوانەناسان كرایەوە .

ئا ئەمە ئەو دیمەن و رواوە گەورە و گرنگ و سامناكەیە كە پێویستە پێشەنگی كاروانی بێداری ئیسلامی لە هەموو شوێنێك و لە هەموو سەردەم و كاتێكدا لە بەردەمیدا هەڵوێستە بكات ، بەتایبەت ئەو كاتەی كە دام و دەزگای نەفامی راوەدوی دەنێ یاخود لە رواڵەتدا زاڵە بە سەریدا .

ئەو پێشەنگە با بزانێ كە شایستەیە كە خوای گەورە هەندێ لە هێزە گەردونیە زەبەلاحەكانی بۆ بخاتە كار ، مەرجیش نیە تۆفان و زریان بێت ، چونكە زریان و تۆفان شێوازێكن لە شێوازەكانی هێز و دەسەڵات ﴿وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ ﴿٣١﴾﴾ المدثر

واتە : سەربازانی پەروەردگاری تۆ هەر خوا خۆی دەیانزانێت .

هەر بۆیە ئەو پێشەنگە تەنها ئەوەی لەسەرە كە بە شێوازێكی تۆكمە و رێك و پێك بەردەوام بێت لەسەر رێبازەكەی ، وە بزانێ كە لە كاتی پێویستدا دەبێ هانا بۆ كێ بەرێت ، هێز و یارمەتی لە كێ داوا بكات، هەروەها پێویستە خۆ گر و خۆ راگر بێت هەتا بریاری خوای گەورە ئەنجام دەدرێت، وە دڵنیا بێت كە خوا یارمەتیدەر و بەدەسەڵات هیچ شتێكی لا ئەستەم نیە لە زەوی و ئاسماندا ، وە یار و یاوەرانی خۆی ناداتە دەست دوژمنانی مەگەر ماوەی ئامادەكاری و تاقیكردنەوە، جا هەركات ئەو پێشەنگە ئەو ماوەیەی تێپەڕاند ئەوە خوای گەورە لەسەر زەویدا پێشهاتی گەورە و رواوی گرنگی بۆ دەسازێنێت، وە دەیكاتە هۆكاری خێر و بەرەكەت ـ بۆ مرۆڤایەتی ـ بەو شێوازەی كە دەیەوێت .

بەڵێ !! ئا ئەمە خۆی لە خۆیدا پەند و ئامۆژگارییەکی گەردونی گەورە و گرنگە هەر بۆیە هیچ ئیماندارێك بۆی نیە وا بیر بکاتەوە کە خوای گەورە دەست بەرداری دەبێت کاتێ کە بەرەنگاری نەفامی دەبێتەوە، لە حاڵێکدا ئەو پەیامی یەکخواناسی رادەگەیەنێت پەیامی تاك و تەنهایی پەروەردگار باس دەکات ..

هەروەها نابێ هێز و تواناکانی خۆی بەراورد بکات لەگەڵ هێز و توانای نەفاماندا و گومان ببات کە خوای گەورە دەیداتە دەست ئەو هێز و دەستەڵاتانە ، لەکاتێکدا ئەو بەندەیە بەتەمای بەدەست هێنانی سەرکەوتنە لەلایەن خوای گەورەوە ، بە تایبەت کاتێ هەست بە شکست دەکات و ناچار دەبێ کە هانا و هاوار هەر بۆ ئەو زاتە بەرێت و بڵێت :

﴿أَنِّي مَغْلُوبٌ فَانتَصِرْ ⑩﴾ ..

شایانی باسە لە رواڵەتدا هێزەکان وەك یەك یان نزیك بە یەك نین، چونکە نەفامی هێزێکی مادی زەبەلاحی هەیە ، بەڵام بانگخواز بۆ لای خوا پشت بە هێز و دەستەڵاتی خوای گەورە دەبەستێ ، بێگومان ئەو زاتەش توانای هەیە کە هەندێ لە هێزە گەردونیەکان ـ هەر کات بیەوێت و هەر چۆن بیەوێت ـ بخاتە کار، کە سادەترینی ئەو هێزانە دام و دەزگای نەفامی رادەماڵێ بە شێوازێك کە هەر بە خەیاڵیدا نەهاتبێت !

جاری وا هەیە ماوەی تاقیکردنەوەکە درێژە دەکێشێت چونکە ویستی خوای گەورەی لەسەرە .. ئەوەتە نوح لە نێو قەومەکەیدا هەزار ساڵ پەنجا ساڵ کەم ماوەتەوە پێش ئەوەی ئەو ساتەوەختە بێت کە خوای گەورە بڕیاری لەسەر داوە ، بە مەرجێ بەرهەمی ئەو ماوە دوورو درێژە تەنها دوانزە ئیماندار بووە ..

بەلام ئەو ژمارە کەمە لە مرۆڤە باوەڕدارەکان بە پێوەری خوایی شایستەی ئەوە بوون کە ئەو هێزە زەبەلاحانەیان بۆ بخرێتە کار، وە خەڵکانی گومڕا و سەرگەردان مالوێران بکات و تیا بچن، لە هەمان کاتدا ئەو ژمارە کەمە لە کەسایەتیە چاك و پاکەکان سەرلە نوێ ببنەوە بە هۆکاری ئاوەدان کردنەوە ورنیشتەجێ بوون لەسەر زەویدا .

لە راستیدا وەنەبێ سەردەمی موعجیزە و سەراسیمەکان بەسەر چووبێت ، چونکە بەردەوام لە هەموو چرکە ساتێکدا پێش دێن ـ بە ویستی بێ سنوری خوایی ـ بەلام ئەو خوایە شێوازی موعجیزەکان دەگۆڕێت ، بە شێوەیەك کە بگونجێ لەگەڵ واقیعی هەموو سەردەمێك و پێداویستیەکانی، جاری وا هەیە ئەو موعجیزانە ئەوەندە وردن ، هەندێ لە هزر و بیر و هۆشەکان دەرکی ناکەن و لێی تێناگەن ، بەلام ئەوانەی کە پەیوەندیان بە خوای گەورەوە هەیە هەمیشە دەستی قودرەتی ئەو خوایە دەبینن، وە هەست بە ئاسەواری جوانی و قەشەنگی دەکەن.

جا ئیتر ئەوانەی کە رێباز و رێڕەویان بۆلای خوای گەورە گرتۆتە بەر با هەوڵ بدەن بە هەموو توانایان ئەرکی سەرشانیان بە چاکی و تەواوی ئەنجام بدەن پاشان بەوپەڕی دڵئارامی و دڵنیایی یەوە دەرەنجامی کار و هەوڵەکانیان بدەنە دەست خوا ، کاتێکیش کە هەست دەکەن شکستیان خواردووە با روو بکەنە ئەو زاتەی کە سەرکەوتنی بەدەستە و دێت بە هانایانەوە، با خۆیان بدەنە پەنای ئەو خوایە و داوای یارمەتی هەر لەو بکەن ، هەروەکو بەندەی چاك و پاکی، (نوح) هانا و هاواری بۆ برد و فەرمووی ﴿أَنِّي مَغْلُوبٌ فَانتَصِرْ ۝١٠﴾ پاشان با چاوەڕێ بن کە خوای گەورە بەم زوانە دەروی خێریان لێ دەکاتەوە .

بێگومان چاوەڕوانی دەرووی خێر لەلایەن خوای گەورەوە جۆرێکە لە خواپەرستی ، ئەوانیش لەسەر ئەو چاوەڕوانیە پاداشت دەدرێنەوە[1].

پاشان بەسەرهاتێکی مێژوویی تر دێت :

﴿ كَذَّبَتْ عَادٌ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿١٨﴾ إِنَّا أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِي يَوْمِ نَحْسٍ مُسْتَمِرٍّ ﴿١٩﴾ تَنزِعُ النَّاسَ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ مُنقَعِرٍ ﴿٢٠﴾ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٢١﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُدَّكِرٍ ﴿٢٢﴾ ﴾

(١٨) قەومی عادیش بڕوایان بە پێغەمبەرەکەیان نەکرد جا سەرنج بدەو بزانە تۆڵەی ئێمە چۆن بوو لەو یاخی بوانەو چۆن کردومانن بە پەندی زەمانە ؟!

(١٩) ئێمە کاتی خۆی ڕەشەبایەکی زۆر ساردی بەهێزمان هەڵکردە سەریان لە ڕۆژگارێکی شومدا (بۆ ماوەی یەك حەفتەی تەواو بە شەو و ڕۆژەکانیەوە ، ئەو هێزە نادیارە تەفروتونای کردن و شارو شارۆچکەی کاول کردن و بەلم دایپۆشین ) ...

(٢٠) خەڵکی هەموی لە بێخ دەرهێناو لە پێی خستن و هەمویانی تەختی زەوی کرد هەروەکو قەدی دارخورمای کلۆر و وشکەڵ.

(٢١) سەرنج بدەن و تێفکرن چۆن بوو سزاو تۆڵەو خەشم و قینی من لەو یاخی بوانە!!

(٢٢) جا ئیتر ئێمە ئەم قورئانەمان ئاسان کردووە بۆ تێگەیشتن و تێڕامان و پەندو ئامۆژگاری وەرگرتن ، باشە ئایا خەڵکانێك هەن کە دەرکی حەقیقەت و ڕاستیەکان بکەن؟! پەندو ئامۆژگاری وەربگرن؟!

[1] ئەم بەشەی دوایی لە بەسەرهاتی (نوح) لە سورەتی (هود) (سلاوی خوایان لێ بێت ) وەرگیراوە

ئەمە ئەڵقەی دوهەمو دیمەنی دوهەمە کە دەریدەخات خوای گەورە دوای لەناوبردنی قەومی نوح زۆر بە توندی سزای قەومی عادیشی داوە، چونکە ئەمانە باوەڕیان بە هیچ کام لە پێغەمبەران نەبووە، بۆیە خوای گەورە دەپرسێ بیربکەنەوە و بزانن چۆن لەناوم بردون و کردومنەتە پەندی زەمانە، چونکە قەومی عادیش بڕوایان بە پێغەمبەرەکەیان نەکرد، بۆیە جارێکی تر خوای گەورە پرسیار دەکات لە خوێنەرو گوێ بیستانی قورئان تا بیربکەنەوە چۆن ئەو زاتە سزای دان و تۆڵەی لێ سەندن.. پاشان زاتی خۆی روونی دەکاتەوە : ڕەشەبایەکی زۆر ساردو بەهێزی هەڵکردە سەریان، وشە قورئانی یەکە دەنگی گرمەو توندی و تەزینی لێ دێت، لە ڕۆژگارێکی پڕلە سەختی و نەگبەتیدا ـ ئەوان زۆر شانازیان دەکرد بە هێزو توانا و لێهاتوییانەوە، کەچی خوای گەورە بە هێزێکی نادیار ، بە جوڵەی هەوا ـ ڕەگ و ریشەی دەرهێنان هەروەکو دارخورمای وشك دەیدان بە زەویدا.

لەڕاستیدا دیمەنەکە ترسناك و سامناکە، بەهێزو توندە، خوای گەورە بیەوێت هەوا دەجوڵێنێ و دەیکاتە یەکێك لە سەربازە گورج و گۆڵ و کاراکانی خۆی، لەچوارچێوەی ئەو بەرنامەیەدا کە هەر خۆی بۆی دیاری کردووە ـ زانایان دەڵێن گەر خێراییەکەی ببێتە (٧٠٠ یان ٨٠٠)کم لە سەعاتێکدا، کام تاوەرەی بەرزو بڵندە لە ڕەگ و ریشە دەری دێنێ!! ..

بێگومان خوای گەورە گەر بیەوێت هاوئاهەنگی دروست دەکات لەنێوان جوڵەی هەواو وێران کردنی شارو کارخانەو دام و دەزگاکانی ستەمکاری لەسەر زەوی یەکەیدا، هەرچەندە نەفامان بە مۆڵەت و حیلم و پەلەنەکردنی ئەو زاتە غەڕابوون

و وادەزانن تاسەر هەر ئاوا بۆیان دەچێتە سەر، هەر بۆیەش قورئان هەڕەشەکان لە ستەمکارو بێدینەکان دووبارە دەکاتەوەو دوپاتی دەکاتەوە ..

﴿ كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِالنُّذُرِ ﴿٢٣﴾ فَقَالُوا أَبَشَرًا مِّنَّا وَاحِدًا نَّتَّبِعُهُ إِنَّا إِذًا لَّفِي ضَلَالٍ وَسُعُرٍ ﴿٢٤﴾ أَأُلْقِيَ الذِّكْرُ عَلَيْهِ مِن بَيْنِنَا بَلْ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٌ ﴿٢٥﴾ سَيَعْلَمُونَ غَدًا مَّنِ الْكَذَّابُ الْأَشِرُ ﴿٢٦﴾ إِنَّا مُرْسِلُو النَّاقَةِ فِتْنَةً لَّهُمْ فَارْتَقِبْهُمْ وَاصْطَبِرْ ﴿٢٧﴾ وَنَبِّئْهُمْ أَنَّ الْمَاءَ قِسْمَةٌ بَيْنَهُمْ كُلُّ شِرْبٍ مُّحْتَضَرٌ ﴿٢٨﴾ فَنَادَوْا صَاحِبَهُمْ فَتَعَاطَىٰ فَعَقَرَ ﴿٢٩﴾ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٣٠﴾ إِنَّا أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ صَيْحَةً وَاحِدَةً فَكَانُوا كَهَشِيمِ الْمُحْتَظِرِ ﴿٣١﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٣٢﴾ ﴾

(٢٣) هۆزی (ثمود)یش هەموو بێدار کردنەوەو ئاگادار کردنەوەیەکیان پشتگوێ خست و بە ڕاستیان نەزانی و بڕوایان پێی نەبوو...

(٢٤) ئەو دەمبازو ناپوختانە وتیان: ئێمە چۆن شوێنی تاکە کەسێك بکەوین ، کە خۆمان چاکی دەناسین!! ئێمە ئەگەر بڕوا بە کەسێکی وا بکەین دیارە کە گێل و شێت و گومڕاین!!

(٢٥) هەروەها دەیانوت: کەی ڕاستە لە نێوان هەموماندا وەحی و نیگا بۆ ئەو ڕەوانە بکرێت؟ نەخێر بڕوا ناکەین ، چونکە ئەو بە کابرایەکی زۆر درۆزن و خۆپەرست دەزانین ، دیارە ئەو حەز لە گەورەیی دەکات..!!

(٢٦) جا سبەی دەزانن و بۆیان دەردەکەوێت کە کێ درۆزن و خۆپەرست و خۆ بە گەورەزانە.

(٢٧) هەرچەندە ئێمە ئەو بیانوەشمان بڕین ، کاتێ داوای وشترێکیان کرد کە لەبەرد بۆیان پەیدا بکەین ، ئێمە دەستبەجێ بۆمان بەدی هێنان و کردمان بەهۆی تاقیکردنەوەیان ، جا ئیتر تۆ ئەی ـ صالح ـ چاودێرییان بکەو بزانە چی

دەکەن ، هەوڵبدە خۆگرو ئارامگریش بیت لەبەرانبەر هەڵوێست و کارو کردەوەی ناشیرینیانەوە.

(٢٨) ئاگاداریشیان بکە: ئاوەکە بەشکراوە لە نێوانیاندا (ڕۆژێك بۆ وشترەکەیەو ڕۆژێکیش بۆ ماڵاتەکانیانە) جا لە ڕۆژی نۆبەی وشترەکەدا هەمو بەکارهێنانێکی ئاو قەدەغەیە ...

(٢٩) (قەومی ناڵەبار لە تاقیکردنەوەکەدا شکستیان هێنا) یەکێك لە زەبەلاحەکانی خۆیانیان بانگ کردوو هانیاندا بۆ سەربڕینی وشترەکە ، ئەویش خۆی سەرخۆش کردو پەلاماری شمشێریداو سەری بڕی و گوێی نەدا بە هەڕەشەی صالح پێغەمبەر !!

(٣٠) سەرنج بدەن و تێفکرن چۆن بوو سزاو تۆڵەو خەشمی من لەو یاخی بوانە

(٣١) لە ڕاستیدا ئێمە بە یەك دەنگی بەهێزی سامناك ٠دڵی هەموویانمان پچڕاندو مێشکیانمان تەقاند) ئیتر وەك گژوگیای وشك کە کۆ دەکرێتەوەو ژێر پێ دەکەوێت لە ناومان بردن .

(٣٢) جا ئیتر ئێمە ئەم قورئانەمان ئاسان کردووە بۆ تێگەیشتن و تێڕامان و پەندو ئامۆژگاری وەرگرتن ، باشە ئایا خەڵکانێك هەن کە دەرکی حەقیقەت و ڕاستیەکان بکەن پەندو ئامۆژگاری وەربگرن؟!

هۆزی (ثمود) هۆزێکی دەستەڵاتدارو پایەدار بوون دوای هۆزی (عاد) پەیدابوون لە دورگەی عەرەبدا، (عاد) لە ناوچەکانی خواروی بوون، (ثمود) لە ناوچەکانی سەروی پەیدابوون، هۆزی (ثمود)یش وەك هۆزی (عاد) بڕوایان بە پەیامی پێغەمبەرەکەیان نەکرد، پەندو ئامۆژگاریان لە تیاچوونی هۆزی (عاد) وەرنەگرت

کە ناوبانگی تیاچوونیان دەنگی دابۆوە لە هەموو دورگەی عەرەبدا، وتیان چۆن ئێمە شوێنی تاکە کەسێك لە خۆمان دەکەوین خۆ ئێمە گوکڕاو شێت نین ؟!! .. چۆن پەیامو یاداوەری بۆ ئەو دێت لەناو هەموومان‌دا؟ نەخێر، ئەو درۆزنێکی خراپو ناباشە!! مەخابن ئەوە گومان‌و قسەوقسەلۆکی بێباوەڕان بووە بە درێژایی مێژوو، ئەوە لە دوای ئەوە دووبارەیان کردۆتەوە، هەروەها خۆ بەگەورە زانین‌و خۆ بەشت زانین وبیرنەکردنەوە لە حەقیقەتی پەیام و بانگەوازەکە، تەنها بیریان کردۆتەوە لە خودی بانگخوازەکە : چۆن شوێن کەسێك لە خۆیان دەکەون ؟!! باشە چی تێدایەو چ نەنگیەك هەیە لەوەداکە خوای گەورە یەکێك لە بەندەکانی هەڵبژێرێت، بەمەرجێ ئەو زاتە چاك دەزانێ کێ شایستەیە و کێ شایانی ئەو ئەرکە گرنگ‌و پیرۆزەیە، تا پەیامو نیگای بۆ بنێرێت تا خەڵکەکە ئاراستەی خێر بکات.. بەڕاستی گومانێکی نابەجێ یە و دڵ و دەروون نەخۆشەکان نەبێ کەس گومانی وا نابات.

خاوەنی ئەو دڵو دەروونانەی کە سەرنجی بانگەوازەکە نادەن، تا بۆیان دەربکەوێت چەندە راست‌و دروستە بەڵکو هەر بیر لە بانگخوازەکە دەکەنەوە و فو دەکەنە خۆیان و بە پەسەندی نازانن شوێن یەکێك لە خۆیان بکەون!! چونکە وا دەزانن کە ئەوە ئەوی پێ گەورە دەبێت، ئیتر دەیکەنە بیانوو تەسلیم نابن‌وموسڵمان نابن، بەڵکو خۆیان بە گومڕاو شێت‌و خەڵەفاو ناوزەد دەکەن گەر باوەڕی پێ بکەن!!

هەر بۆیە ئەوکەسەی کە خوای گەورە هەڵیبژاردووە بۆ هیدایەتدانیان بە درۆزن‌و تەماعکارو خراپ ناوی دەبەن ، شایانی باسە رەنگە ئەم تۆمەتە رووبکاتە هەر

بانگخوازێـکو گومـان ببـەن کـە بۆخـۆی هەوڵـدەدات و بەرژەوەنـدی خـۆی دەپارێزێت، لەحاڵێکدا ئەمە بوختانی کەسانی ناپوختو دەروون نەخۆشە کە نازانن چی پاڵنەری کەسێکی ئیمانداره تا بانگخوازیی بکاتو چی هاندەری ئەو خاوەن دڵ و دەروونە پاکانەیە کە خۆیان دەخەنە زەحمەتەوە، تا پاداشتو رەزامەندی خوای پەروەردگار دەستەبەر بکەن ..

تـا ئێـرە قورئـان سەرگوزشتـەیان دەگێڕێتـەوە بەڵام کتوپڕ دەفـەرموێت: ئـەوان سبەی بۆیان دەردەکەوێت، کێ درۆزنو تەماعکارە ..

ئـەم شـێوازە یەکێکـە لـەو شـێوازانەی کـە قورئـان لـەکاتی باسـی بەسـەرهات و رووداوەکانـدا بـەکاری دێنـێ ، دیـارە کـە ئـەم شـێوازە چیرۆکو بەسـەر هاتەکـە زینـدوو ڕادەگرێـتو لـە چـیرۆکێکەوە کـە دەیگێڕێتـەوە دەیکـات بـە باسـێکی زیندوو، وە دەیخاتە بەردیدی گوێ بیستان، وایان لێ دەکات چاوەڕێ بن سبەی چی روودەدات بەسەر ئەواندا کە خۆیان درۆزنو تەماعکارن ..

ئەوانە سبەی هەموو شتێکیان بۆ روون دەبێتـەوەو رزگار نابن لـەو بەڵایـەی کە بەسەریان دێت ..

پێش هاتنی بەڵاکە، خوای گـەورە لەسـەر داخوازیو بیـانووی خۆیـان وشترێکی تایبەتیان وەك موعجیزەیەك لە تاشەبەردێك بۆ پەیدا دەکات ودەیکاتـە هۆکاری تاقیکردنـەوەیان، ئینجـا فـەرمان دەدات بـە پێغەمبەرەکـەیان کـە خـۆگر بێـتو چاوەڕوان بێت بزانێ چی روودەدات!!

ئـەویش خـۆی دەگرێـتو چاوەڕێی دەرەنجامی تاقیکردنەوەکە دەکاتو پێیان رادەگەیەنێت : کە ئـەو ئاوەی کـە هەیـە دەبێ دابـەش بکرێـت لـە نێوان ئـەوان و

وشترەکەدا.. دیارە کە وشترێکی تایبەت بووەو بۆتە موعجیزەیەك‌و شیرێکی زۆریشی بۆ بەرهەم هێناون!! پاشان باس لە دوای ئەو تاقیکردنەوەیە دەکات کە دیارە ستەمکاران و ناپوختان بەو مەرجە سەغڵەت بوون بۆیە خراپترین و ناڕەسەنترین کەسیان هەڵناو هانیاندا بۆ سەربڕینی حوشترەکە، ئەویش خۆی سەرخۆش کرد تا جورئەت پەیدا بکات بۆ تاوانکردن وسەربڕینی ئەو حوشترە تایبەتەکە، (صالح) پێغەمبەریش ئاگاداری کردبوون کە نەکەن ئازاری بدەن!! چونکە ئەوە نیشانەی سوکایەتی کردنە بە فەرمانی خوای گەورە و نیشانەی بێدینی یە، دواجار سزایەکی بە ئێش‌و سەخت یەخەتان دەگرێت!!

بەڵام خەڵکەکە بە گشتی و ئەو نۆ باندە ناپوختەی کە لەنێو شاردا دژایەتی پەیامی خوایان دەکرد بە تایبەتی ئەو کەتنەیان کردو خوای گەورە تەنها سێ ڕۆژ مۆڵەتیدان، بە یەك دەنگی سامناك هەموویانی لەناوبردو وەك پوش و پەڵاشی پاوەنی لێکردن ..

قورئانیش باسی چۆنیەتی ئەو دەنگە گەورە و سامناکە ناکات، بەڵام لە سورەتی (فصلت)دا بە دەنگێکی گەورە وەك هەورە تریشقە ناوزەدی دەکات، کە دەکرێت دەنگ‌و تریشقەکە یەك شت بووبن، ئیتر ئەو خەڵکە یاخی‌و خۆبەشت زان و گەندەڵ و ناپوختە وەکو چیلکەو پوش و پەڵاش لێی لاڵ و پاڵ کەوتن‌و دواتر داڕزان و بوونە خۆراکی کرم‌و مار و ئاژەڵانی کێوی ..

هەر بۆیە قورئان دوای ئەو بەسەر هاتەش بیری گوێ بیستان دەخاتەوە؛ کە ئێمە قورئانمان بۆ یاداوەری‌و یادخستنەوە ئاسان کردووە، تا خەڵکانی دوایین پەندو ئامۆژگاری لێ وەربگرن و توشی ئەو بەڵایانە نەبن کە تووشی خەڵکانی

پێش هاتوون.. جا ئیتر داخۆ کەسانێك هەن کە دەرکی ئەو راستیانە بکەن و لێی تێبگەن!!

*　　*　　*

ئینجا پەردە دادەدرێتەوە بەسەر ئەو پوش و پەڵاش و چیلکەو چەواڵەدا، وە ئەو کارەساتە ئاسەوارێکی بەهێزتر لەسەر دڵ و دەروون دادەنێت. قورئانیش مەبەستێتی یاداوەری‌و بیرکردنەوە لە مرۆڤدا دروست بێ !!

*　　*　　*

ئینجا پەردە هەڵدەدرێتەوە لەسەر ئەڵقەیەکی مێژوویی تر کە هەر لە نزیک دورگەی عەرەبدا روویداوە :

﴿ كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ بِالنُّذُرِ ﴿٣٣﴾ إِنَّا أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ حَاصِبًا إِلَّا آلَ لُوطٍ نَّجَّيْنَاهُم بِسَحَرٍ ﴿٣٤﴾ نِّعْمَةً مِّنْ عِندِنَا كَذَٰلِكَ نَجْزِي مَن شَكَرَ ﴿٣٥﴾ وَلَقَدْ أَنذَرَهُم بَطْشَتَنَا فَتَمَارَوْا بِالنُّذُرِ ﴿٣٦﴾ وَلَقَدْ رَاوَدُوهُ عَن ضَيْفِهِ فَطَمَسْنَا أَعْيُنَهُمْ فَذُوقُوا عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدْ صَبَّحَهُم بُكْرَةً عَذَابٌ مُّسْتَقِرٌّ ﴿٣٨﴾ فَذُوقُوا عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٣٩﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٤٠﴾ ﴾

(٣٣) قەومی (لوط)یش بڕوایان بە هیچ بێدار کردنەوەیەك نەکردو دژایەتی (لوط) پێغەمبەریان کرد.

(٣٤) ئێمە ئەوانیشمان بەردباران کرد (جگە لەوەی کە شارو شارۆچکەیان ژێرەو ژوور کرا) تەنها (لوط) و خاوو خێزانی ئیمانداری لە بەرەبەیاندا ڕزگار کران (جگە لە هاوسەرەکەی کە باوەڕی پێی نەبوو).

(٣٥) ئەو ڕزگار كردنە نازو نیعمەتێكی تایبەتیی بوو لە لایەن ئێمەوە ، بێگومان هەر بەو شێوەیە پاداشتی ئەو كەسە دەدەینەوە كە سوپاسگوزاریی بكاتە پیشەی و چاكەی ئێمەی لەبەرچاو بێت .

(٣٦) هەرچەندە (لوط) پێغەمبەر پێشتر ئاگاداری كردبوون ئەگەر بەردەوام بن لەسەر بەدڕەوشتیان لە تۆڵەی توندو بەهێزی ئێمە دەرباز نابن ، كەچی گومانیان هەبوو لەو ئاگاداری یەو بڕوایان پێی نەبوو .

(٣٧) ئەو خەڵكە بەدرەوشتە چاویان بڕیبووە میوانەكانی و دەیانویست دەستدرێژیان بكەنە سەر ، ئێمەش كوێراییمان هێنا بەسەر چاویاندا ، دە بچێژن سزاو تۆڵەی من (لە دنیادا ، لە قیامەتیشدا سزای زۆر سەختیان بۆ ئامادە كراوە) .

(٣٨) بێگومان سەر لە بەیانیەكی زوو سزای توندو بە ئێش چوار دەوری گرتن و هەموویانی داگرت .

(٣٩) دە بچێژن سزاو تۆڵەی من (ئەی بەدڕەوشت و ناپوختەكان) .

(٤٠) جا ئیتر ئێمە ئەم قورئانەمان ئاسان كردووە بۆ تێگەیشتن و تێرامان و پەندو ئامۆژگاری وەرگرتن ، باشە ئایا خەڵكانێك هەن كە دەركی حەقیقەت و ڕاستیەكان بكەن؟! پەندو ئامۆژگاری وەربگرن؟!

دیارە باسەكە باسی (لوط) پێغەمبەرە (علیه السلام) كە لە هەندێ سورەتی تردا بە درێژی باسی هاتووە، بۆیە لێرەدا بە كورتی باسی دەفەرموێت، چونكە خوای گەورە دەیەوێت پەندو عیبرەت لە دەرەنجامی یاخی بوون بخاتە ڕوو، سزای توندی بێ دینو شەڕواڵپیسان نومایان بكات، كاتێ كە باوەڕ بە

بێدارکەرەوەکان ناکەن، کاتێ کە گاڵتە بە پەیامی پێغەمبەران دەکەن، چۆن خوای گەورە خەشمی لێ گرتن، ژێرەو ژووری کردن و بەردبارانیشی کردن!!
تەنها(لوط) و خانەوادەکەی رزگاریان بوولە بەرەبەیانێکی سامناکدا، دیارە رزگاربوونیان نیعمەتێکە لەلایەن خوای گەورەوە کە هەردەم پاداشتی سوپاسگوزاران بەو شێوازە دەداتەوە با دوای ماوەیەکیش بێت.
ئاشکرایە خوای گەورە ئەو رەفتارە قێزەونەی زۆر لەلا نەنگ و خراپ و نادروست بووە بۆیە لەلایەکەوە ژێرەوژووری کردن، لەلایەکی تریشەوە بەرد بارانێکی سەختیی کردن ، تەنها(لوط) و خانەوادەکەی رزگاریان بوو، ئەویش بەبێ هاوسەرەکەی کە ئافرەتێکی نالەبار بوو باوەڕی پێی نەبوو!!
جا خوای گەورە مژدە دەدا بە هەموو کەسانێکی چاك کە سوپاسگوزاری نازو نیعمەتەکانی خوای گەورەن، کە سەرەنجام وەکو (لوط) و خانەوادەکەی رزگاریان دەکات و پاداشتی پاکی و رەوشت بەرزی و دینداری و خواناسییان دەداتەوەو لە سزای بە ئێشی هەردوو جیهان ، لە هەموو ترس و بیمێك رزگاریان دەکات..
جێگەی سەرنج و تێرامانە دوای ئەوەی خوای گەورە باسی هەردوو جەمسەری بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە، جەمسەری بێباوەڕی و دژایەتی و شەڕواڵپیسی، پاشان یەکسەر باسی تیاچوون و بەردباران و لەناوبردن، جارێکی تر دێتەوە سەرباسی هۆکاری تیاچوونیان کە ئەمەش شێوازێکی ناوازەیە لە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکاندا.

دێتەوە سەرباسی هەوڵەکانی (لوط) (علیه السلام) لەگەڵیان تا واز لەو ڕەفتارە قێزەونە بێنن، چونکە ئەوە هۆکاری خەشم و قینی خوا دەبێت لێیان و گەر بەردەوام بن بەتوندی تۆڵەیان لێ دەستێنێ، کەچی باوەڕیان نەکردو لە بێدارکردنەوەکانی بەگومان بوون ..

بەڵکو ئەوەندە بێ شەرم و بەدڕەوشت بوون، کاتێ زانیان هەندێ میوانی جوانخاسی هاتووە بە سمکۆڵ هاتن بۆ بەرماڵەکەی و دەستیان کرد بە پرمەو گاڵە و داوایان دەکردن!! زۆریان بۆ (لوط) هێنا و هەرچی حەیاو شەرمە وەلایان نا، هەرچی نەجابەتە خستبوویانە ئەولاوە و حسابیان بۆ ماڵی پیرۆزی پێغەمبەرەکەیان نەکرد..

ئەوکاتە ئیتر فریشتەکان دەستبەکار بوون و بە فەرمانی خوا کوێراییان هێنا بەسەر چاوی ناپوختیاندا، هیچیان نەدەبینی، جا باسی ئەم حاڵەتە تەنها لێرەدا هاتووە، کە لە شوێنێکی تردا فریشتەکان (لوط)یان دڵنیا دەکردو دەیانوت : خەمت نەبێ ئێمە فریشتەی ڕەوانەکراوی پەروەردگاری تۆین .. ئەوان ناتوانن بێنە ئێرە، دیارە بەهۆی ئەو کوێربوونەیانەوە بە بۆڵە بۆڵ پاشەکشەیان کردووە.
پاشان دەگەڕێتەوە سەرباسی تۆڵەسەندنی خوای گەورە لێیان و ڕووبەوان دەفەرموێت : دەبچێژن سزای بە ئێشی من، خۆ ئێوە بڕواتان بەم بەسەرهاتانە نەبوو..

ئا بەو شێوەیە لە دەمەوئێوارەدا خوای گەورە کوێرایی بەسەر چاویاندا هێنا و لە بەرەبەیانیشدا سزاو بەڵایەکی بەسەر هێنان مەگەر هەر بەسەر ئەواندا هاتبێت ..
ئەوسا خوای گەورە ئەو ناوچەیەی پاك کردەوە لەو پیس و بۆگەنان و گەندەڵانەو جارێکی تر ڕوو بەوان و ئەوانەی لەوان دەچن دەفەرموێت : ئێمە

قورئانمان ئاسان کردووە بۆ ئەوەی دەرس و پەندو ئامۆژگاری لێ وەربگیرێت..
ئایا کەسانێك هەن کە ئەم بەسەرهاتانە شی بکەنەوەو دەرس و پەندو ئامۆژگاری لێ وەربگرن[1] ..

*　　*　　*

٤ ئینجا دێتە سەرباسی روداوێك کە لە دەرەوەی دورگەی عەرەبدا رویداوەو بە ئاماژەیەکی خێرا باسی تیاچوونی فیرعەون و دارو دەستەی دەفەرموێت :

﴿وَلَقَدْ جَاءَ آلَ فِرْعَوْنَ النُّذُرُ ﴿٤١﴾ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا كُلِّهَا فَأَخَذْنَاهُمْ أَخْذَ عَزِيزٍ مُّقْتَدِرٍ ﴿٤٢﴾﴾

(٤١) بێگومان بۆ فیرعەون و دەست و پێوەندیشی پێغەمبەرانی بێدار کەرەوەمان رەوانە کرد.

(٤٢) کەچی بڕوایان بەهەر هەموو نیشانەو بەڵگەکانی ئێمە نەکرد ، ئیتر ئەوە بوو راپێچمان کردن و لەناومان بردن ، ئەویش بە دەستی قودرەتی خوایەکی تەواو بالآ دەست و بەتوانا.

ئا بەو شێوازە و زۆر بە کورتی بەسەرهاتی فیرعەون و هەوڵوێستی و تیاچوونی باس دەفەرموێت .. باس لە بێدارکردنەوەی بە بەڵگەو موعجیزەی هەمەجۆر، وە

---

[1] لەم سەردەمەدا وە بەناوی ئازادی یەوە لە ئەمریکا و هەندێ وڵاتان بەیاسا ئەم کارە قێزەونە و ئەم رەفتارە ناشیرینە پەسەند کراوە، کە ئەمە ستەمێکی گەورە و پێشێل کردنی مافی مرۆڤەو هەرەشە قورئانیەکەش لەو جۆرە ستەمکارانەوە دوور نیە کاتێ کە لە سورەتی (هود)دا باسی ژێرەوژوور کردنی شارو دێهاتی ئەو ناپوختانەو بەردباران کردنیان هاتووە: لە کۆتاییدا خواوەندی بالآدەست دەفەرموێت ﴿وَمَا هِيَ مِنَ الظَّالِمِينَ بِبَعِيدٍ ﴿٨٣﴾﴾ هود، وە نەبێ ئەو تۆڵەیە لە ستەمکارانی هاوشێوەیانەوە بەدوور بێت !!

باوەڕنەکردنیان بە پێغەمبەرەکەیان پاشان تیاچوونیان بە دەستی قودرەتی زاتێکی باڵادەستو بە توانا. شایانی باسە ئامارژە بە دەستەڵاتداریو توانایی نیشانەی ئەوەیە کە زۆر بە توندی لەناو براون لە بەرانبەر ئەوەی کە فیرعەون وا خۆی دەنوان کە باڵادەستو دەستەڵاتدارەو توانای زوڵمو ستەمی هەیە.

ئیتر باڵادەستیەکەی پوچەڵ بۆوە، توانای خەیاڵاوی کەوتو نەما .. بەڵکو خوای گەورە زۆر بە توندی خۆیو دارو دەستەی بە ئاشکرا لەناو برد. بەشێوازێك کە بەرانبەر بێت لەگەڵ زوڵمو ستەمو خۆبەشت زانینو پەلاماردانیان بۆ خەڵکە بێ دەستەڵاتەکە ..

جا ئیتر دوای باسی تیاچوونی فیرعەونی زۆردار جارێکی تر پەردە دادەدرێتەوە.

* * *

ئینجا دوای پەردە دادانەوە لەسەر کۆتا دیمەنی سزاو تیاچوون، بێباوەڕانیش تەماشادەکەنو ئەم دیمەنانە کاریگەریی خۆی هەیە لەسەر هەستو نەستیان - کە بیربکەنەوە و تێفکرن - ئا لەو کاتەدا کە ئەو بەسەر هاتانە هێشتا لە خەیاڵیاندا کاریگەریی ماوە و فشاری لەسەر دەروونیان بەردەوامە، دەبینین کە فەرمایشتەکان روو دەکاتە ئەوانو دایان دەچڵەکێنێ پێش ئەوەی لەو جۆرە بەڵایانە روویان تێبکات، بەڵکو هەڕەشەی سەختترو تا ڵتریان لێ دەکات و دەفەرموێت :

﴿ أَكُفَّارُكُمْ خَيْرٌ مِّنْ أُولَٰئِكُمْ أَمْ لَكُم بَرَاءَةٌ فِي الزُّبُرِ ﴿٤٣﴾ أَمْ يَقُولُونَ نَحْنُ جَمِيعٌ مُّنتَصِرٌ ﴿٤٤﴾ سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ ﴿٤٥﴾ بَلِ السَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَالسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ ﴿٤٦﴾ إِنَّ الْمُجْرِمِينَ فِي ضَلَالٍ وَسُعُرٍ ﴿٤٧﴾ يَوْمَ

يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ ﴿٤٨﴾ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾ وَمَا أَمْرُنَا إِلَّا وَاحِدَةٌ كَلَمْحٍ بِالْبَصَرِ ﴿٥٠﴾ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا أَشْيَاعَكُمْ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٥١﴾ وَكُلُّ شَيْءٍ فَعَلُوهُ فِي الزُّبُرِ ﴿٥٢﴾ وَكُلُّ صَغِيرٍ وَكَبِيرٍ مُّسْتَطَرٌ ﴿٥٣﴾

(٤٣) باشە ، (ئەی هۆزی قورەیش) ئایا کافرەکانی ئێوە ئازاترو لێهاتوترن لەو خەڵکە یاخیەی کە پێشتر لەناومان بردن؟ یان پەیمانتان دراوەتێ لە نامە ئاسمانیەکاندا کە توشی ئەو بەڵایانە نابن کە باسکران؟!

(٤٤) یان دەڵێن ئێمە هەموومان کۆین و سەرکەوتوین و شکست ناهێنین ، ئەوەندە تواناو دەستەڵاتمان هەیە!!

(٤٥) زۆری پێ ناچێت لە ئایندەیەکی نزیکدا لەشکرو کۆمەڵیان شکست دەهێنێت و بە پەلە هەڵدێن و گۆڕەپانی جەنگ بەجێ دەهێڵن.

(٤٦) جگە لەوەش قیامەت ، ڕۆژی لێپرسینەوەیانە ، بێگومان ئەو ساتەوەختە زۆر سەختترو تاڵترو سامناکترە .

(٤٧) لە ڕاستیدا تاوانکارو تاوانباران لە گومڕایی و سەرلێشێواوی و شێتییەکی ناهەمواردا لە دنیادا دەژین و لە قیامەتیشدا گیر دەخۆن .

(٤٨) بە تایبەت ئەو ڕۆژەی کە کێش دەکرێن لە نێو ئاگری دۆزەخدا لەسەر ڕوخساریان و سوکایەتیان پێ دەکرێت و پێیان دەوترێت: دە بچێژن تاڵاوو زوخاوی دۆزەخ .!!

(٤٩) بێگومان ئێمە هەموو شتێکمان بە ئەندازەو نەخشەیەکی دیاریکراو بەدی هێناوە ، کارو فرمانی ئێمە هەڕەمەکی و بێ بەرنامە نیە...

(٥٠) فەرمانی ئێمە تەنها یەك وشەی دەوێت، هەركاتێك بڵێین بەهەر شتێك ببە دەست بەجێ دەبێت و بەقەدەر چاوتروكانێكی دەوێت ، بەڵكو كەمتریش!!

(٥١) بێگومان ئێمە خەڵكانی زۆرمان لە خوانەناسان كە وەك ئێوەی یاخی موشریك و، سەركەش و سەرسەخت بوون لەناو بردووە ، باشە ئایا كەس هەیە پەندو ئامۆژگاری وەربگرێت؟! (یاخود بیربكاتەوە و تێفكرێت؟! شوێنی پەیامی خوای گەورە بكەوێت).

(٥٢) جا هەرچی ئەو خەڵكە دەیكەن لە دۆسیەی تایبەتدا لە (لوح المحفوظ) دا تۆمار كراوە...

(٥٣) هەرچی شتی وردو گەورەشە لەو كارو كردەوانەی كە خەڵكی ئەنجامی دەدەن دێر بە دێری نوسراوەو تۆمار كراوە .

بەڕاستی ئەوە ئیتر هەڕەشەیە بە سزاو تۆڵەی هەردوو جیهان؛ كە ئیتر هیچ بوارێك ناهێڵێتەوە تا گومان هەبێت لە دەرەنجامی یاخی بووان، هەموو كەلێنێكیان لێ دەگرێت، بواری خۆدزینەوە و هەڵاتن ناهێڵێتەوە، لەو جیهانیش بوار بۆ پاكانەو درۆو دەلەسەو راكردن لە تۆڵە نامێنێتەوە. ئەوە ئیتر سەرەنجامی بێ باوەڕانە، كێ دەڵێ ئێوەش بەدوورن لەو بەلایانە، بۆچی كافرەكانی ئێوە گەورەترو گرنگترن لەوان، ئێوە خۆتان بەچی دەنازن؟! ..

ئایا لە هیچ كتێبێكدا هاتووە كە ئێوە رزگار بن لە تاوانی كوفرو بێ باوەڕیی؟ بێگومان نە ئەمیان و نە ئەویان ئێوە ناگرێتەوە، ئێوە چاكترو گرنگترنین لەوان، وە لە هیچ كتێبێكیشدا باسی ئەوە نیە كە ئێوە بەدوور بن لەو چارەنووسەی كە بەسەر كافرەكانی پێشیندا هاتووە..

ئینجا باس لە بۆچوونی گشتیان دەکات کە گوایە زۆرن‌و دەسەڵاتدارن‌و سەرکەوتن هەر بۆ ئەوان دەبێت‌و هەرگیز شکست ناهێنن!!

هەر بۆیە خوای گەورە بە ئاشکرا دەفەرموێت:

کۆمەڵ و دەستەی ئێوە لە ئایندەیەکی نزیکدا شکست دەهێنن‌و هەڵدێن‌و بە پەلە پشت لە بەرگری دەکەن، کۆمەڵ و ژمارەتان هێزو جبەخانەتان فریاتان ناکەوێت، ئەوە بڕیاردادەی خوای گەورەیە کە دەسەڵات‌و توانای بێ سنورە بەرانبەر هەموو ملهوڕو ستەمکارو تاوانبار و زۆرداران ـ کە لەم سەردەمەدا بە ئاشکرا پیلانی زەبەلاح دەگێڕن دژی ئیسلام‌و موسڵمانان، هەر ویستی خوای گەورەش زاڵەو درەنگ بێت یان زوو باوەڕداران سەردەخات‌و شکست بە زاڵم‌و ستەمکاران دێنێ ودایەریان لێ دەبڕێت ـ ان شآء الله.

دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژی غەزای بەدردا لە ژێر گومەزەکەیدا دەستەکانی بەرز کردبۆوەو دەیفەرموو : خوایە گیان داوای ئەنجامدانی بەڵێنەکەت لێ دەکەم، خۆ ئەگەر بتەوێ لەمڕۆ زیاتر تۆ ناپەرسترێیت لەسەر زەویدا..

(ابوبکر ﷺ) دەستی پێغەمبەری گرت و وتی: بەسە ئەی پێغەمبەری خوا زۆر پێداگریت کرد لە پەروەردگارت!

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) هاتە دەرەوە و دەیکێشا بە قەڵغانەکەیداو دەیفەرموو: ئەمڕۆ ئەو لەشکرە شکست دەهێنن‌و هەڵدێن!!

لە ڕوایەتێکی تردا هاتووە کە (عمرﷺ) کاتێ کە ئایەتی ﴿ سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ ﴿٤٥﴾ ﴾ نازڵ بووە، پێدەچێ لە دڵی خۆیدا وتبێتی: باشە کام کۆمەڵ شکست دەهێنێ و کام کۆمەڵ سەردەکەوێ؟!

پاشان دەڵێت کاتێ کە پێغەمبەرم بینی(ﷺ)، لە قەڵغانەکەی دەداو دەیفەرموو:

﴿ سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ ﴿٤٥﴾ ﴾ ئەو کاتە لە تەفسیرەکەی تێگەیشتم، جا ئەمە شکست هێنانە لە دنیادا، بەڵام کۆتا شکستیان نیە، ئەمە هێشتا شکستە سەختو پڕ لە ناسۆرەکە نیە بەڵکو شکستی گەورەو سامناك و تاڵ لە قیامەتدایە کە بەراورد ناکرێت لەگەڵ سزاکانی دنیادا .. ئەو شکستەیان ئەوەندە تفتو تاڵە بەراورد ناکرێت لەگەڵ زریان و رەشەبای زۆر ساردو سەختو بومەلەرزەو دەنگی سامناكو بەربارانیدا چونکە ئەوان لە سەرگەردانی و نائومێدی یەکدا دەژین کە دڵ و دەروون و بیرو هۆشیان سزا دەدات، پێستو جەستەیان هەڵدەقرچێنێ، لە بەرانبەر ئەوەدا کە لە دنیادا باوەڕیان نەدەکرد بە پێغەمبەرەکانیان و باوەڕهێنانیان بە گومڕایی و سەرگەردانی و شێتی ناوزەد دەکرد!! ئێستە ئیتر بۆیان دەردەکەوێت شێتی و سەرگەردانی راستەقینە چی یە و کامەیە؟!! بە تایبەت کاتێ کە بە زۆر و دەمەوڕوو، وە بەوپەڕی توندوتیژی و سوکایەتی پێکردنەوەکێش دەکرێن بۆ نێو دۆزەخ، ئەمەش لە بەرانبەر لووت بەرزی و خۆ بەشت زانین و دەستەڵاتیان لە دنیاداو فیزکردن و خۆ بەگەورە زانینەوە پێیان دەوترێت: دە بچێژن سزای نێو ئاگری دۆزەخ..

سەیرە ! شێوازی داڕشتنی ئایەتەکە جۆرێکە، دەڵێی هەر ئێستە وا لە دۆزەخدان و کارگوزارانی دۆزەخ بە سوکایەتی پێکردنیانەوە؛ بە زاڵم و ستەمکار و گەندەڵەکان دەڵێن : دەی بچێژن تاڵاوی دۆزەخ!!

جا لەژێر سایەی ئەو دیمەنە سامناکە تەکاندەرەدا، خوای گەورە روو بە خەڵکی بە گشتی و، خەڵکانی سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) بە تایبەتی دەفەرموێت

: کە ئێمە هەموو شتێکمان بە رێکوپێکیو بە ئەندازەی تایبەتی خۆی، لە چوارچێوەی حیکمەتو داناییدا بەدیهێناوە، ئەو شکست هێنانە لە دنیاداو ، ئەم سزایە لە ئایندەو قیامەتدا، وە هەموو ئەو بەسەرهاتو پێشهاتانەی کە بەسەر گەردوون و بەسەر زەویدا هاتووە، ناردنی ئەم پەیامو نامانە وئەم قورئانە و هەرچی روودەدا لەم بونەوەرەدا هیچی لە ویست و ئیرادەی ئێمە بەدەر نیە و هەمووی لە چوارچێوەی نەخشەو پلانی ئێمەدایە!!

هەموو ئەوانەو هەرچی دروستکراوانی وردو درشتە، هەمووی بە ئەندازەیە، هەمووی بە ویستو ئیرادەیە، هەمووی لە چوارچێوەی حیکمەتو داناییدایە، هیچ شتێك هەڕەمەکی نیە، هیچ شتێك بێ هودە نیە، هیچ شتێك رێکەوتو بێ بەرنامە نیە!!

﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾﴾

هەر هەمووشت، هەموو وردو درشتێك، هە موو شتێکی گۆیاو هەموو شتێکی بێ دەنگ، هەموو شتێکی جوڵاو و هەموو شتێکی وەستاو ، هەرچی رابوردووە و هەرچی ئێستا هەیە، هەرچی ئاشکرایەو روونە، هەرچی ناڕوون و شاراوەیە، هەموو شت ئێمە بە ئەندازەو پێوەرو لە کاتو ساتی خۆیدا دروستمان کردووە ودروستی دەکەین، پێشمان هێناوە و پێشی دەهێنین..

ئەو شتو مەكو پێشهاتانە هەر خوای گەورە سنوریان بۆ دادەنێ، هەر ئەو زاتە تایبەتمەندیو سیفاتیان ، ئەندازەو قەبارەیان، شوێنو کاتیان، پەیوەندیان بە دەوروبەریانەوە، کاریگەرییان لەسەر بونەوەر دیاری دەکات!!

لەڕاستیدا ئەم دەقە قورئانیە کورتە ئاماژەیە بۆ ڕاستییەکی زۆر گەورەو گشتگیرو فراوان، ئەم گەردوون و بونەوەرە شایەتن لەسەری، ئەمە حەقیقەتێکە خاوەنی دڵی زیندوو هەستی پێدەکات کاتێ کە بە هۆشیارییەوە دەژی لەم بونەوەرەداو کاریگەرییان لەسەر یەکدی هەیەو، شتی زۆری لێ دەخوێنێتەوەو هەست دەکات کە ئەمیش دروستکراوێکی تەواو گونجاوە لەگەڵ دەوروبەرو بونەوەرو گەردووندا، هەموو ئەندامەکانی جەستەی، هەموو هەستو نەستی، هەموو شتێکی ڕێکخراوە بە شێوازێکی ڕەهاو بێ سنور، دڵە باوەڕدارو زیندووەکەی بە تەواوی هەست بە سایەی دەستەڵاتی خوای گەورە دەکات لەم بونەوەرەدا ..

پاشان لێکۆڵینەوە و ئەزموون و وردبوونەوەی بەردەوام ئەو ئەندازەیە زیاترو زۆرتر دەکات، ئەوەندەی کە بیرو هۆشو هزری مرۆڤ دەرکی بکاتو لێی تێبگات، بەڵام بیرمان نەچێت کە لە پشت ئەو ئەندازەیەی کە ئێمە تێیدەگەین و دەرکی پێ دەکەین جیهانی زۆر گەورە و فراوانتر هەیە، فیترەتی مرۆڤ دەرکی دەکات ئەم گەردوونە، ئەم بونەوەرە، زۆر ڕێكو پێكو هاوئاهانگە ..

بێگومان زانستو زانیاری نوێ توانیویەتی شتێك لەو قەدەرو ئەندازەگیریو ڕێکوپێکی یە پەی پێببات، بەهۆی ئەو هۆکارانەوە کە بەدەستی هێناوە..

توانیویەتی شتێك بزانێ لە دوریو قەبارەو جوڵەو چڕیو هێزی ڕاکێشانی هەندێ لە ئەستێرەو هەسارەکان، شوێنی هەندێ ئەستێرەشیان بۆ دەرکەوتووە ـ کە کاتی خۆی هەبوون و ئێستە نەماون، دوای کەمتر یان پتر لە ملیۆنەها ساڵی ڕوناکی تیشکەکەیان گەیشتووە؛ یان دەگاتە زەوی ـ هەروەها زانایان

بۆیان دەرکەوتووە کە ئەو ئەستێرەو هەسارە زەبەلاحانە زۆر بە وردی دابەش کراون لە بۆشایی فراوانی ئاسماندا، هیچ ناڕێکی و ناتەواوی یەك بەدی ناکرێت هەروەها هاوئاهەنگی لە پێکهاتەکانی ئەم زەوی یەی کە لەسەری دەژین تا لەبار بێت بۆ ئەو جۆرە لە ژیانەی کە بە ویستی خوای گەورە بەرپا بووە، بە شێوازێکە کە کەمەترین کەمو کوڕی هەموو ژیان لەسەری لەناو دەبات، یاخود ژیان هەر نەدەبوو!!

بۆ نموونە شێوازو قەبارەی زەوی ، دووری لە خۆرەوە، پێکهاتەو قەبارەی خۆرو پلەی گەرماکەی، شێوازی بوونی زەوی لە بەرانبەریدا ، ئەندازەی خێرایی سوڕانەوە بە دەوری خۆیداو بە دەوری خۆردا .. هەروەها دوری مانگ لە زەوی یەوە، قەبارەو شێوازی، هەروەها دابەشبوونی روکاری زەوی بە بەشێکی زۆر لە ئاو و بەشێکی کەم لە وشکانی، لەوێوە بیربکەرەوە لە هەزاران و هەزار رێژەو ئەندازە لە هەموو بوارەکاندا .. کە ئەگەر کەمو کوڕی ؛ یان ناهاوسەنگی روویدا کاریگەری لەسەر هەموو شتەکان دروست دەکات، هەمووی بە شێوازێك رێکخراوە کە لەگەڵ ماوەی ژیانی مرۆڤ لە دنیادا، وە لەسەر زەویدا گونجاو بێت لە ڕاستیدا ئەوەندە هاوئاهەنگی یەکە رێکوپێك و تێرو تەواوە، بۆتە هۆی رێکخستنی ژیان بۆ هەموو زیندەوەران ، ژینگەیەك بۆ هەموو جۆرەکان رەخساوە، پەیوەندی نێوانیشیان رێك خراوە تا هیچ جۆرە دەستەیەك ئەوانی تر لەناو نەبات، بەڵکو چۆن ژیانی رێکخستووە، مردنیشی رێك خستووە، بە مەرجێ جۆری هەریەك لە زیندەوەران بە مرۆڤیشەوە لەسەر زەوی نابڕێتو بەردەوام هەن بە شێوازێك کە لەگەڵ پێداویستی ژینگەدا بسازێن !! .

رەنگە ئەگەر ئاماژەیەکی خێرا بکەین بە هاوسەنگی نێوان زیندەوەران و هەندێ نموونە بێنینەوە لە پەیوەندی نێوانیان، زیاتر بابەتەکەمان بۆ روون دەبێتەوە..

بۆ نموونە: ئەو باڵندانەی کە خۆراکیان باڵندە بچوکەکانە ژمارەیان کەمە و لە شوێنی سەخت و بەرزو تایبەتدا دەژین، بەڵام تەمەنیان درێژە، جا ئەگەر ئەوانە ژمارەیان زۆر بوایە لەگەڵ تەمەن درێژیاندا و لە هەموو شوێنێکدا هەبونایە، هەرچی باڵندە بچوکەکانە دەخوران و نەدەمان، کە سەرچاوەی خۆراکن بۆ زیندەوەرانی ترو بۆ مرۆڤیش و ئەو رۆڵەی کە هەیانە لەسەر زەویدا نەیاندەما و نا هاوسەنگی یەکی زۆر دروست دەبوو .. ئەمەش بێ حیکمەت نیەو بەو شێوازە خوای گەورە هاوسەنگی راگرتووە!!

لەولاشەوە مێش ملیۆنەها گەرا دادەنێت، بەڵام تەمەنی تەنها دوو حەفتەیە، خۆ ئەگەر چەند ساڵێك ـ بگرە چەند مانگێك ـ بژیایە و بەو رێژەیە گەرای دابنایە ئەوە مێش رووی زەوی دادەپۆشی، ئەوسا ژیانی زۆربەی زیندەوەران بە مرۆڤیشەوە ئەستەم دەبوو!!

بەڵام رەورەوەی هاوسەنگی تێك ناچێت و ئەو دەستی قودرەتەی کە گەردوونی رێکخستووە نێوانی زۆری ژمارەو تەمەنی؛ هاوسەنگ کردووە بەو شێوەیەی کە دەیبینین!! لەلایەکی ترەوە میکرۆب لە هەموو زیندەوەران ژمارەیان زۆرترە ، لە هەمووشیان خێراترن لە زۆربووندا و زیانیشیان زۆرە، بەڵام لاوازو بێ دەستەڵات و تەمەن کورتن، بە ملیارەهایان لێ لەناو دەچێت بە سەرما و گەرما و روناکی و ترشەڵۆك و دەرزی و حەب و دەرمان، دەتوانن زیان بە ژمارەیەکی کەم لە مرۆڤ وزیندەوەران بگەیەنن، خۆ ئەگەر لەوەندە زیاتر بیانتوانیایە بەرگە بگرن و تەمەن درێژ بن ئەوە ژیان و زیندەوەرانیان لەناو دەبرد!!

هەر زیندەوەرێکیش چەکی تایبەتی خۆی هەیە بۆ بەرگری کردن لە هێرشی دوژمنانی تا بنەبڕ نەبێت، چەکەکانیش جیاوازو هەمەجۆرن .. زۆری ژمارەو هێزی پەلاماردانو ـ راکردنو ژەهری هەمەجۆرو ... هتد ـ چەکی هەمەجۆری زۆر لەو نێوانەدا هەیە.

تولە مارەکان بە زەهرەکانیان، یان بە خێرایی رۆیشتنیان بەرگری لەخۆیان دەکەن، مارە گەورەکانیش ماسولکەی بەهێزیان هەیە و کەمتر زەهراوین!

جۆرە قالۆنچەیەکیش هەیە مادەیەکی بۆن ناخۆش دەڕژێنێو بخۆرانی بێزاردەکاتو خۆی لە دوژمنانی رزگار دەکات!!

ئاسکیش دەتوانێ زۆر بە خێرایی رابکات و بازبدات .. لەولاشەوە شێرو پڵنگ بەهێزنو لەڕاودا کارامەن!

ئا بەو شێوەیە زیندەوەرانی بچوکوگەورە تایبەتمەندیو هۆکاری خۆیان هەیە، لە ئادەمیزادەوە بگرە هەتا ئاژەڵانو باڵندەکانو سەرجەم زیندەوەران.. بۆ نموونە ئاژەڵان کە گیان لە بەرانێکی بێ زیانن پێدەشتو لاپاڵی چیاکان بۆتە سفرەو خوان بۆیان، بەڵام دڕندەکان زۆر بە زەحمەت نێچیریان دەست دەکەوێت!!

هێلکۆکە دوای پیتاندنی خۆی دەلکێنێ بە دیواری ناوەوەی منداڵدانەوە و برینداری دەکات و گۆمێکی بچوک لە خوێن بۆ خۆی دروست دەکاتو دەست دەکات بە هەڵمژینیو خۆگەورەکردن .. دواتر یۆڵاش دروست دەبێتو بە ریخۆڵەیەك پەیوەست دەبێت بە کۆرپەلەوە لە ڕێگەی ناوکییەوە، هەتا رۆژی لەدایك بوونی نە ئەوەندە درێژە خۆراکەکەی کە پێیدا تێدەپەڕێت تێك بچێت، نە

ئەوەندە کورتە کە بە خێرایی بگات و زیان بە کۆرپەلە بگەیەنێت !! ـ دوای بڕینی ئەم سەرچاوەیە دوو کانی شیر لەسەر مەمکی دایك پەیدا دەبێت ـ مەمکەکانی دایکیش لە سەرەتای هاتنە دنیای کۆرپەلەدا شیرێکی زەردباو دەردەکات ـ کە لە کوردەواریدا پێی دەڵێن ژەك ـ ئەو ژەکە بریتی یە لە مەوادی کیمیاوی کە بەرگری دەبەخشێ بە کۆرپەلە دژی گەلێ نەخۆشی، پاشان لە دوهەم ڕۆژ بەدواوە شیر پەیدا دەبێ!!

جا ئەو زاتەی کە هەموو ئەو شتانە ڕێك دەخات ڕۆژ بە ڕۆژ بەرهەمی شیر بۆ کۆرپەلە زیاد دەکات هەتا دەگاتە لیترو نیوێك لە ڕۆژدا لە ساڵی یەکەمدا، لە حاڵێکدا لە سەرەتاوە زۆر کەمە!!

جا وەنەبێ موعجیزەکە تەنها لە چەندێتیدا بێت بەڵکو چۆنیەتیەکەشی دەگۆڕێت بە گەورە بوونی منداڵەکەو پێداویستی یەکانی بۆ دروست بوون و گەورەبوونی ئەندامە جیاوازەکانی جەستەی..

لەلایەکی ترەوە گەشەکردنی دەزگاوکۆئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ وکارو فەرمان و ئەرکیان، ڕۆڵی هەریەکەیان، تەندروستی و بەردەوامی ژیان جێگەی سەرنج و تێڕامانە. بەتایبەت هەر بەشێکی ناوەوەو دەرەوەی پێمان دەڵێ کە دەستی قودرەتی خوایی بەدی هێناوم!!

پێویستی هەر تاکێك و هەر ئەندامێکی جەستەی ئامادەکراوە، بەڵکو هەموو خانەیەکی پێویستی بە چاودێری و سەرپەرشتی بەردەوامی ئەو زاتە هەیە ـ تا نەبێتە خانەیەکی شێرپەنجە ـ هەندێ کەسیشی کەم ئەندام و نەخۆش خستووە ، تا ساغەکان قەدری ئەندامەکانی جەستەیان و لەش ساغی بزانن هەموویشی بۆ تاقیکردنەوەی ئەمانیش و ئەوانیشە ـ .

بێگومان ئێمە لێرەدا ناتوانین هەموو نهێنی یەکان باس بکەین، بەڵکو زۆر بە کورتی ئاماژەیەکی خێرا تەنها بە لوە ڕژێنەکان دەکەین .. لەڕاستیدا ئەوانە کارخانەی مەوادی کیمیاوی بچوکن‌و بەردەوام جەستە چی پێویست بێت لە پێکهاتە کیمیاویەکان بۆی دابین دەکەن‌و پێیدەبەخشن.

پێکهاتە کیمیاویەکانیشی هێندە گرنگ‌و ئاڵۆزن کە یەك بەش لە بلیۆن بەشیان کاریگەری مەترسیداریان هەیە لەسەر جەستەی مرۆڤ !!

هەموویشی کاری یەکتری تەواو دەکات، ئەوەی تا ئێستا زانراوە لە پێکهاتەی ڕژێنی ئەو لوانە ئەوەیە کە پێکهاتەکانیان زۆر ئاڵۆزن، هەر ناڕێکی‌و ناتەواوی یەکیش لە پێکهاتەکانیاندا دروست بێ گەر بۆ ماوەیەکی کورتیش بێت کاریگەری خراپی دەبێ لەسەر هەموو جەستەو دەیخاتە مەترسی یەوە!!

گیانلەبەران‌و زیندەوەرانیش هەردەستەو تاقمێکیان حسابێکی ورد بۆ ژینگەو چۆنیەتی ژیانیان کراوە..

بۆ نمونە: شێرو پڵنگ‌و گورگ‌و چەقەڵ و هەموو ئاژەڵە گۆشت خۆرەکان کە لە شوێنی چۆڵ و دارستان‌و چیاکاندا دەژین‌و ناچارن ڕاوی نێچیر بکەن ، ناودەمیان پڕە لە کەڵبەو دانی تیژو شەویلکەی بەهێز، هەروەها چونکە دەبێ ڕابکەن تا ڕاو بکەن پێویستییان بە ماسولکەی بەهێز هەیە لەبەر ئەوە ماسولکەی قاچیان زۆر بەهێزەو، دەست‌و پێیان بە چرنوکی بەهێز کۆتایی هاتووە، گەدەشیان ترشەلۆکی بەهێزی تێدایە کە بە ئاسانی گۆشت‌و ئێسك هەرس دەکات.

بەڵام ئەو ئاژەڵانەی کە کاوێژ دەکەن، کۆئەندامی هەرسیان بە شێوازێکە کە لەگەڵ لەوەڕگاو ژینگەکەیاندا گونجاوە.. دەمیان گەورەیە، کەڵبەیان نیە،

دانەکانیان بە شێوازێکە کە بتوانن بە ئاسانی گەڵا و گژوگیا بخۆن و قوتی بدەن ، تا دواتر بتوانن خزمەت بە مرۆڤ بکەن لە زۆر ڕووەوە.
دیارە کە بەدیهێنەریان کۆئەندامێکی سەرسوڕهێنەری هەرسی پێ بەخشیون، سەرەتا گژوگیایەکی زۆر دەخۆن و کۆی دەکەنەوە لە گەدەیاندا، پاشان دادەنیشن و ئەوەی خواردویانە کەم کەم دەیهێننەوە دەمیان وجارێکی تر لەسەر خۆو بە کاوەخۆ کاوێژدەکەن و دەیجونەوە ئینجا قوتی دەدەنەوە و دەچێت بۆ شوێنێکی ترو بە دەزگاکانی تری هەرسدا تێدەپەڕێت،جا لەنێوان گژوگیای هەرس کراو کە خوێن هەڵی دەمژێ کاتێ کە بە دەزگای گوانی ئاژەڵە شیربەخشەکاندا تێدەپەڕێت، دەبێتە شیرێکی پاک و بێگەردو ئامادە بۆ خواردنەوەی مرۆڤەکان، کە لەو شیرە جۆرەها خۆراکی خۆش مەزەو بەتامی تر دروست دەکرێت.
باڵندە گۆشت خۆرەکانیش وەکو هەڵۆو کونەبەبو دەنوکی کەوانەیی و چڕنوکی تیژیان هەیە بۆ پارچە پارچەکردنی گۆشت، بەڵام قازو مراوی دەنوکی پانیان هەیە کە لەبارە بۆ پەیداکردنی خۆراک لەناو قوڕو ئاودا، ئەملاولای دەنوکیشیان زبریەکی هەیە وەکو مشار یارمەتی دەدات بۆ بڕینی گژوگیا..
بەڵام مریشک و کۆترو ئەو باڵندانەی کە دانەوێڵە لەسەر زەوی هەڵدەگرنەوە دەنوکیان کورت و تیژە تا بە ئاسانی خۆیان تێر بکەن.
بەڵام لەق لەق و ئەو باڵندانەی کە بەشەخۆراکیان لە ئاودا پەیدا دەکەن، دەنوکیان درێژەو هەندێکیان تورەکەیەك لەژێر دەنوکیاندایە، وەکو تۆڕی ماسی گرتن تا بە ئاسانی ڕاوی ماسی پێبکەن!!

دەنوکی دارکونکەرەو پەپوش نەختێ درێژن ، تا بتوانن کرمو مێرووی بچوک راو بکەن کە بە زۆری لە کونو کەلەبەری زەویدان ..

زانایان دەڵێن: سەرنجی دەنوکی هەر باڵندەیەك بدەیت دەزانیت چ جۆرە خۆراکێك دەخوات .. بێگومان کۆئەندامی هەرسی هەر دەستەیەك لە باڵندە دەزگایەکی سەیرو ئاڵۆزە، چونکە دانیان نیە؛ خوای گەورە چیکڵدانی پێبەخشیون تا خۆراکی تێدا هەرس بکەن، جاری وا هەیە بەردو شتی رەق قوت دەدەن بۆ ئەوەی یارمەتیدەر بێت بۆ هەرسی خۆراکەکانیان!!

جا ئەگەر درێژە بدەین بەو باسانە کۆتاییان نایەت !!

با سەرنجی زیندەوەری ئەمیبا بدەین کە لە تاکە خانەیەك پێك دێتو بەچاو نابینرێت، بزانین چۆن خوای گەورە چاودێری ئەویش دەکات..

ئەم زیندەوەرە لە گۆماو و زەلکاوەکاندا یان لەسەر بەردی بن گۆمەکاندا دەژی، شێوازی خۆیشی دەگۆڕێت، کاتێ دەڕوات بەشێك لە جەستەی درێژ دەکات و وەکو پێ بەکاری دێنێ بۆ گواستنەوەی خۆی .. گەر خۆراکی دەست بکەوێت دەیپێچێتەوەو مادەیەکی بەسەردا دەکاتو ئەوی بە کەڵکی بێت هەڵیدەمژێتو ئەوی تری فڕێ دەدات!!

ئەمیبا هەناسەش دەدات، ئۆکسجین لە ئاو وەردەگرێت .. جا بیربکەرەوە لەم شتە بچوکە کە دەجوڵێتو خۆراك دەخواتو هەناسە دەدات، کاتێ کە گەورە دەبێت دەبێتە دووبەش ، دوو زیندەوەر..

هەروەها جیهانی روەکیش کەمتر نیە لە جیهانی زیندەوەران، ئەوانیش جیهانێکی سەیرو سەمەرەن، کەمتر نین لە جیهانی مرۆڤ و ئاژەڵ و باڵندە، هەر

بەشێکیان، هەر جۆرێکیان بەڵکو هەربەش لە هەر روەکێکدا جیهانێکە لە نهێنیی و دەزگـای سەرسـوڕهێنەر ، زانایـانی پسپۆڕی سەرسـام کـردووە، بـە ئاشـکرا ئەندازەگیری و رێكو پێکیـان تێدا دیارەو دەستی قەدەر و قودرەتی خوایی تیایاندا نومایانە.

*　　*　　*

لەڕاسـتیدا بابـەت و شـت و رووداوەکـان زۆر لـەوە گـەورەتر و فـراوانترن لـە ئەندازەگیری فراوانیاندا، کاتێ کە پسپۆڕان هەوڵدەدەن شارەزابن لێیان!!.
جوڵەو سوڕانەوەی ئەم گەردوونە ، رووداوەکانی، تەوژمەکانی، سوڕانەوەکانی، وردو درشتی کاروباری هـەر هەمووی بە ئەندازەی دیاریکراوو ویستی خوای گەورەیـە، رووداوەکـانی مێـژوو، حاڵەتـە جیاوازەکـانی نـاخ و دڵ و دەروون، هەناسـەکان، هـەموو کـاتی دیـاریکراوی خـۆی هەیـە، شـوێنی دیـاریکراوو بـارودۆخی دیـاریکراوی خـۆی هەیـە، بەسـتراوەتەوە بـە یاسـاکانی بونـەوەرو جوڵـەکانی گەردوونـەوە، ئەندازەگیرییـەکی وردی بـۆکراوە تـا هاوئاهـەنگ بێـت لەگـەڵ دەوروبـەردا هـەروەکو چـۆن حسـاب بـۆ رووداوە گـەورە و گرنگـەکان کراوە!!
ئەو چڵە دارەی کە لە سوچێکی بیاباندا رواوە ، ئەویش بە قەدەر و ویستی ئەو زاتەیە، کاری خۆی ئەنجام دەدات و دابڕاو نیە لە بونەوەر! ئەم مێرولەیـە، ئەو تەپ و تۆزە، ئەو زیندەوەرەی کە لە تاکە خانەیەك پێك هاتووە و لە ئاودا مەلە دەکـات، هـەروەکو ئـەو ئەسـتێرەو هەسارە گـەورە و زەبەلاحانـە وایـە کـە لـە بۆشاییدا لە چەرخ و خولدان.

هەمووشت لە کاتو شوێنی خۆیدا، بە ئەندازەی دیاریکراوی خۆی ڕوودەدات، شێوازی هەموو شتێکی، هەموو کاروبارێکی بۆ دیاری کراوە!
بۆ نموونە: کێ دەیزانی کە هاوسەرگیری (یعقوب) پێغەمبەر(علیه السلام) لە دایکی یوسفو بنیامین، هەروا ڕووداوێکی سادەیەو نابێتە هۆی ئێرەیی براکانی و نایخەنە بیرەوە، تا کاروانچی بیباتو لە میسر بیفرۆشێتو ڕێی بکەوێتە نێو کۆشکی عەزیزی میسرو توشی گەڕپێکردنی هاوسەرکەی ببێ و ئەویش تەسلیم نەبێت؛ لەسەر پاکێتی زیندانی بکرێت.. ئەمانە بۆچی؟ تۆ بڵێی بۆ ئەوە بێت خەونەکانی کارگوزارانی پاشا لە بەندیخانە لێکبداتەوە؟! تا ئێرە بابەتەکە ڕوون نیە بۆچی؟!
بێگومان خەڵکانێك پرسیاریان بۆ دروست دەبێت؟ باشە خوایە گیان بۆچی یوسف ئاوا لە ناخۆشیو زینداندا ژیان بەسەر بەرێ؟ بۆچی (یعقوب)ی باوکی ئەو هەموو خەفەتەی بۆ پێش بێ؟ تا دەگاتە ئەوەی لە خەفەتا بینایی چاوەکانی لەدەست بدات؟ بۆچی یوسف توشی ئەو هەموو کێشەو گرفتە ببێ؟
دوای نزیکەی چارەکە سەدەیەك وەڵامەکەی سەرهەڵدەدات.. دیارە نەخشەی قەدەر ئامادەی دەکات تا کاروباری وڵاتی میسر بگرێتە ئەستۆو فریای گەلی میسر و گەلانی دراوسێشی بکەوێت لەو حەوت ساڵەدا کە گرانی ڕوودەدات! پاشانیش باوکیو براکانی و خانەوادەکەی بێنو لە میسر نیشتەجی بنو ئەوەی ئیسرائیلیان لێ دروست ببێ..
تا دواتر فیرعەون دژایەتیان بکاتو موسا پەیدا ببێو ـ لە کۆشکی فیرعەوندا گەورە ببێ و ئەو هەموو قەدەرە و ڕووداوانە پێش بێت ، دواتر گەلی جولەکە

پەیدا ببێ کە بە درێژایی زەمان' بەتایبەت لەم سەردەمەدا ڕۆڵی ناباشیان هەبێت لە سەر زەویدا، سا بەڵکو بە پشتیوانی خوای گەورە ئوممەتی ئیسلام بێدار بێتەوە کە بەشێك لە (عقیدە)و بیروباوەڕی باوەڕبوونە بە موسا و عیسا (سڵاوی خوایان لێ بێت)، وە بەو تەورات و ئینجیلەی کە بۆ ئەوان نازڵ بووە و شێواندویانە.

هەروەها باپیری (یعقوب) ، (ابراهیم) کاتێ رێی دەکەوێتە میسرو لەوێ دەبێتە هاوسەری (هاجرة) کێ دەڵێ، ئەوە ڕووداوێکی ئاسایی تاکە کەسی یە، ئاشکرایە بۆ (ابراهیم) عێراقی بەجێ هێشتو کۆچی کرد بۆ میسر تا (هاجرة) ببێ بە نسیبیو لەو هاوسەرگیری یە (اسماعیل) لە پاڵ (بیت الحرام)دا لە دایك ببێو لەوێ نیشتەجێ ببێو تاقیکردنەوەی سەربڕینەکە پێش بێتو دواتر (بیت الحرام) بە دووقۆڵی دروست بکەنەوەو مەککە ببێتە ئەو شارەو لە نەوەی (اسماعیل) (محمدﷺ) پەیدا ببێ، دواتر لەوێوە پەیامی ئیسلام سەرهەڵبدا، کە لەبارترین شوێنە بۆ ئەو پەیامە پیرۆزە، کە گەورەترین ڕووداوە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا!!

بەڕاستی ئەوە هەمووی بەشێکە لە قەدەرو ویستی خوای گەورە کە هەرخۆی نەخشەکانی پیادە دەکات بۆ هەموو شتێكو هەموو ڕوداوێك، هەموو چارەنووسو هەموو پێشهاتێك، هەموو هەنگاوێكو هەموو گۆڕانکاری یەك، بێگومان هەموو ئەو شتانە و هەرچی پێش دێت بەبێ ویستی خوای گەورە ڕوونادات کە گشتگیر و وردو قوڵە ..

جاری وا هەیە خەڵکی هەندێ بەشی ڕووداو و پێشهاتەکان دەبینن ، ئەوسەر و کۆتاییەکەی بەدی ناکەن، جاری واش هەیە زەمانێکی تولانی لەنێوان سەرەتای

رووداوەکـانو دەرەنجـام و چارەنووسـەکەی تێدەپـەڕێت و لـە تەمـەنی کـورتی مرۆڤدا بارودۆخەکە گۆڕانکاری یەکی ئەوتۆی بەسەر نایەت، حیکمەتو تەکبیرو نەخشەی خـوایی بـەدی ناکرێت، بۆیـە خـەڵکی پەلـە دەکـەن ، پێشنیار دەکـەن، رقیان هەڵدەستێ، لە سنور دەردەچن!! .

بۆیە خوای گەورە لە رێگەی ئەم قورئانەوە دەیەوێت خـەڵکی کاروبارەکان بدەنە دەست ئـەو زاتـەی کـە هـەموو کاروبارەکانی بەدەستە، دەیـەوێ دڵنیـاو ئاسودە بنو، لەگەڵ قەدەری خواییدا رێ بکەن و خۆیان بگونجێننو خۆیان بسازێننو ـ چیان لەدەسـت دێ لـە چاکەو دینـداریو بـانگخوازی ئـەنجامی بـدەن، ئەوسـا لەگەڵ قەدەردا بڕۆن هەنگاو بە هـەنگاو بەوپـەڕی ئارامیو دڵنیـاییو دامـەزراوی یەوە ـ .

* * *

بێگومان خوای گەورە لەگەڵ قەدەر و رێکخستنی کاروباردا؛ دەسـتەڵاتی رەهـای هەیە، بە فەرمان و ئاماژەیەك گەورەترین رووداو و پێشهات پێش دەهێنێ ..

﴿وَمَآ أَمۡرُنَآ إِلَّا وَٰحِدَةٞ كَلَمۡحِۭ بِٱلۡبَصَرِ ۝٥٠﴾

بەڵێ بە ئامـاژەیەك، بـە دەربڕینـی وشـەیەك، خـوای گـەورە کاروبـارو گۆڕانکـاریی سەرسوڕهێنەر پێش دەهێنێ، کاری گەورەو بچوك بۆ ئـەو زاتـە چونیەکە، خۆی لەڕاستیدا گـەورەو بچـوك نیـە بـە نیسـبەت ئـەو زاتـەوە، بـەڵکو ئـەوە بۆچـوونو پێـوەری خـەڵکی یـە، کارەکـانی خـوای گـەورە زەمـەنی هـەر ناوێـت، چاوتروکاندنێکیشی ناوێت ئەوە تەنها بۆ ئەوەیـە کـە ئـەو خەڵکە تێبگـەن، ئـەوە

مرۆڤەکانن هەست بە کات و تێپەڕبوونی دەکەن، بەهۆی سوڕانەوەی زەوی یە بچکۆلانەکەیانەوە دروست دەبێت!! لە ڕاستیدا بە پێوەری خوایی ڕەها هیچ حسابێکی بۆ ناکرێت .

بە یەك ویستی ئەو زاتە ئەم گەردوونە هاتۆتە بوون، بە یەك ویستی تر گۆڕانکاری دروست دەکات، یەك ویستی ئەو زاتە هەموو گەردوون لە کەمتر لەچرکەیەکدا لەناو دەبات، بە یەك فەرمان هەموو مردوان لە توێی خاکدا دێنە دەرەوە و زیندویان دەکاتەوە، بە یەك فەرمان هەموو زیندوان دەمرێنێ، بە یەك فەرمانیش قیامەت بەرپا دەکات و سەرجەم مردوان لە توێی خاکدا دێنێتە دەرەوە بەو شێوازەی کە خۆی دەیەوێت، بە یەك فەرمانیش هەمووان لە گۆڕەپانی (محشر) و لێپرسینەوە کۆ دەکاتەوە .

یەك فەرمان هیچ ماندوبوونێکی ناوێت، هیچ کاتی ناوێت، یەك فەرمان، ئەوپەڕی دەستەلات و هێزو توانا و ئەندازەگیری تێدایە؛ هەموو کارەکان بەوپەڕی ئاسانی پێش دێن .

*　　*　　*

بێگومان هەمیشە بە درێژایی زەمان بە فەرمانێکی کتوپڕ خوای گەورە درۆزن و بێباوەڕانی لەناو بردووە :

﴿ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا أَشْيَاعَكُمْ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٥١﴾ وَكُلُّ شَيْءٍ فَعَلُوهُ فِي الزُّبُرِ ﴿٥٢﴾ وَكُلُّ صَغِيرٍ وَكَبِيرٍ مُّسْتَطَرٌ ﴿٥٣﴾ ﴾

(٥١) بێگومان ئێمە خەڵکانی زۆرمان لە خوانەناسان کە وەك ئێوەی یاخی موشریك و، سەرکەش و سەرسەخت بوون لەناو بردووە ، باشە ئایا کەس هەیە

پەندو ئامۆژگاری وەربگرێت؟! (یاخود بیربکاتەوە و تێفکرێت؟! شوێنی پەیامی خوای گەورە بکەوێت).

(٥٢) جا هەرچی ئەو خەڵکە دەیکەن لە دۆسیەی تایبەتدا لە (لوح المحفوظ) دا تۆمار کراوە...

(٥٣) هەرچی شتی وردو گەورەشە لەو کارو کردەوانەی کە خەڵکی ئەنجامی دەدەن دێڕ بە دێڕی نوسراوەو تۆمار کراوە .

ئیتر ئەوەتە روون و ئاشکرایە شوێن و جێگەو رێگەی ئەوانەی بڕوایان نەکرد بە پەیامەکانی ئێمە، لە ئایەتەکانی ئەم سورەتەدا هەندێکی لە توێی ئەم سورەتەدا باس کرا، باشە داخۆ کەسانێك هەن کە دەرکی ئەم راستیانە بکەن‌و لێی تێبگەن؟! پەندو ئامۆژگاری لێ وەربگرن؟

دەبا ئەمانیش وەك ئەوان نەکەن، تا وەکو ئەوان بە ئازارەوە تیا نەچن، چونکە دوای ئەو کارەساتانەی کە لە دنیادا بەسەریان دێت؛ دواتر لێپرسینەوەی سەختیان لەگەڵ دەکرێت‌و کەس ناتوانێ خۆی بدزێتەوەو خۆی بشارێتەوە، هەموو شتێکیش لە دۆسیەی تایبەتداو لە دەزگای پێشکەوتوودا لەسەریان تۆمار کراوەو نەخشێنراوە لە لاپەڕەی تایبەتدا بۆ رۆژی لێپرسینەوە، هیچ شتێك فەرامۆش نەکراوەو پشتگوێ نەخراوە لە بچوك‌و لە گەورە تۆمار کراوە .

*　　*　　*

تا ئەم سنورەیە باسەکان و بەدواداچوونەکان ..

ئینجا رێڕەوی ئایەتەکان بە شێوازێك دەگۆڕێت، وەکو ئەوەی ئاوڕێك بداتەوە لە کەسانێکی تر جگە لە بێباوەڕان، وێنەیەکی تر پڕ لە ئاسایش و ئارامی و هێمنی، وێنەی تەقواداران‌و خواناسان‌و دینداران باس دەفەرموێت :

﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٍ وَنَهَرٍ ﴿٥٤﴾ فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍ ﴿٥٥﴾ ﴾

(٥٤) بێگومان سەرئەنجام تەقواداران و دینداران ، خواناسان و پارێزکاران لە نێو باخ و جۆگەو ڕوبارو تاڤگەی ڕازاوەدا (لە ناو کۆشك و تەلاری هەمە جۆردا لە کەشتی ڕازاوەتر لە تایتانیکدا) ژیانی پڕ لە شادی و کامەرانی دەبەنە سەر .

(٥٥) لە شوێنی ڕێزدارو پاك و شایستە و بێگەردا ، لە لای پەروەردگاری ئازیزو پادشای بە دەسەڵات و بە تواناداا .

ئەم حاڵەتە لە کاتێکدا باس دەفەرموێت کە ناپاکان لەنێو ئاگری دۆزەخدا لەتاو ئێش و ئازار شێت بوون بە ڕاکێشان و دەمەوڕوو کێش دەکرێن و بەوپەڕی سوکایەتی پێکردنەوە ، وە پێیان دەوترێت: دە بچێژن ئازاری ئەو دۆزخەی کە گاڵتەتان پێی دەهات و باوەڕتان پێی نەبوو ..

بەڵام لەملاوە وێنەی حاڵەتێکی پڕ لە نازو نیعمەت دەکات لەلایەکەوە مادی یەو بەهەشت و باخە ڕازاوەکان و کۆشك و تەلارەکانیەتی، لەلایەکی ترەوە ئەو پلە و پایەیەی کە پێیان بەخشراوە لەلایەن شاهی شاهانەوە لەلایەن پادشای باڵادەست و دەستەڵاتدارەوە.

ئەوان لەو نازو نیعمەتانەی کە بە هەستەکان پەی پێ دەبرێ لە عەیش و نۆشدان .. لە بەهەشتی ڕازاوە و لەپاڵ تاڤگەو کانی و فوارەو ڕوباری جواندا ـ لەگەڵ حۆری و غیلمان و ویلداندا لەگەڵ کەسوکاری دیندارو خواناسدا هەمیشە لە سەیرانن ـ هەموو ئەمانە لەو دوو وشە قورئانی یەدا ، بەڵکو زۆر زیاتریش بەدی دەکرێت، نازو نیعمەتی هەمەجۆر، بۆ هەر کوێ دەچن بە هەر هۆکارێك، بەڵکو لەنێو هۆکارەکاندا لە هەمووجۆرە نازو نیعمەتێك بەهرەمەندن .. وشەی ( نَهَرْ)

خۆی واتای زۆری لە خۆ گرتووەو سەداکەی نازو نیعمەتی هەمەجۆرو هەمە چەشنی لێ دەبارێت ..

پاشان باسی ئەو نازو نیعمەتانە دێت کە بە دڵ و بە رۆح هەستیان پێ دەکرێت، بە تایبەت هەستکردن بە نزیکیان لە خوای گەورە، بە مەکانەتیان لای شاهی شاهان، بە گرنگیدانی ئەو زاتە پێیان، بە رێزدانانی بۆیان، بە قەدر گرتنیان، بەو دڵنیایی و خۆشیو شادی یەی کە هەستی پێ دەکەن ..

ئەم پلەو پایەیەشیان بۆیە دەست کەوتووە چونکە لە دنیادا دیندارو تەقوادارو خواناس بوون، لە خەمی دەستەبەر کردنی رەزامەندیی پەروەردگاریاندا بوون، هەوڵیان داوە کە لێیان نەرەنجێت، ترساون لەوەی لێیان زیز و زویر ببێت، خوای گەورەش دوو ترس کۆناکاتەوە، ئەوانەی لە دنیادا لێی ترساون ، لە قیامەتدا نایانترسێنێ، ئەوەی لێرە حساب بۆ ئەو زاتە بکات، ئەوە لەوێ ترسی نامێنێ و لەوپەڕی شادیو کامەرانیو بەختیاریدا ژیانی هەمیشەیی دەباتە سەر..

* * *

جا ئیتر لێرەداو بەو شێوازە هێمنە، لەژێر ئەو سایە خۆشەدا کۆتایی بە سورەتەکە دێت کە پڕبوو لە باسی کارەساتو لێقەومان کە بەسەر خوانەناساندا هاتووە، پاشان ئەم سایە هێورو خۆشیو شادی یە بەلەزەتو بەتامە دێت ..

ئەمەیە پەروەردەی تەواو لەلایەن خواوەندی داناو زاناوە بە پێچ و پەناکانی ناخو دڵ و دەروون، ئەوەیە قەدەری ورد لەلایەن ئەو زاتەوە کە هەموو شتێکی رێکخستووە ئەو زاتەی کە بە لوتف و نازککارە، تەواویش ئاگادارە دەستەڵاتدارە بەسەر هەموو دروستکراوانیدا .

# ﴿ سورەتی ( الرّحمن ) ﴾

ئەم سورەتە بە ئاسانی تێبینی دەکرێت؛ کە شێوازێکی تایبەتی هەیە لە گەڵ رووەوە.. ئەم سورەتە بریتی یە لە راگەیاندنێکی گشتی لە گۆڕەپانی بونەوەری گەورەدا، ناساندنی نازو نیعمەتی هەمەجۆرە دیارو ئاشکراکانە؛ کە نومایانە لە جوانی دروستکاریدا، لە ناوازەیی دروستکراوانیدا، لە زۆری و ساڕێژبوونی نازو میعمەتانیدا، لە رێکخستنی بون و هەبوودا، ئایەتەکانی ئەم سورەتە دەیانەوێت مرۆڤەکان هەموویان رووبکەنە روخساری پیرۆزو بەنرخی خواوەندی میهرەبان..

هەروەها شایەتی یەکە بەسەر دەستەی جنۆکەو ئادەمیزادەوە کە لە بنەڕەتدا هەر روو بەو دوو دەستەیە دەدوێت، کە لە گۆڕەپانی بوون و هەبودا، وە بە ئاگاداری هەموو دروستکراوان (تحدا)یان دەکات کە ئەوانە بە کام لە نازو نیعمەتەکانی خوا بڕواناکەن و کامیان بە ناڕاست دەزانن .. وە ئەم (تحدا)یە دوای باسی هەموو نازو نیعمەتێك دووبارە دەکاتەوە، هەموو گەردوونیش دەکاتە پێشانگایەك بۆ نازو نیعمەتەکان، سەرەڕای نازو نیعمەتەکانی ئەو جیهان.

لە ڕاستیدا دەنگی راگەیاندنی راستیەکان لە دارشتنی سورەتەکەدا بە تەواوی دیارو ئاشکرایە، هەروەها لە شێوازی کۆتایی ئایەتەکانیدا، لە بەش بەشی ئایەتەکاندا، سەرنجی کۆتایی هەر ئایەتێك بدە کە پێویستی بە درێژکردنەوە هەیە، وەکو ئەوە وایە دەنگەکە ئاراستەی دوور بکرێت؛ هەر لە سەرەتاو یەکەم

وشەی پیرۆزیدا روون و ئاشکرایە کە دەیەوێت ئەو دوو دەستەیە، ـ دەستەی ئادەمیزادو جنۆکە ـ داچڵەکێنێ؛ تا چاوەڕێ بکەن‌و سەرنج بدەن‌و بزانن دواتر باسی چی دێت ..

﴿الرَّحْمَٰنُ ①﴾ خواوەندی میهرەبان ، یەکەم ئایەت بریتی یە لە یەك وشەی پیرۆز کە سۆز و رەحمەتی لە خۆ گرتووە، دەنگدانەوەی وشەکە شێوازێکە لە سەرەتایەك بۆ ئیعلان‌و ئاگاداری کە دواتر دەردەکەوێت ئەم سورەتە پێشانگایەکە بۆ دەرخستنی رەحمەت‌و نازو نیعمەتە جۆراوجۆرەکانی خواوەندی میهرەبان ..

پێشانگای نازو نیعمەتەکان بە باسی ئەوە دەست پێدەکات کە ئەو زاتە قورئان؛ کەلامی شیرینی خۆی فێری ئیمانداران کردووە و دەیکات، لەڕاستیدا گەر مرۆڤەکان هەست بکەن کە بە فێربوون‌و پیادەکردنی ئەم قورئانە چۆن ئایندەیەك بۆ خۆیان دەستەبەر دەکەن. هەموو ژیانیان لە فێربوون‌و پیادەکردنیدا بەسەر دەبرد..

دیارە بێ حیکمەتیش نیە کە باسی پەیدابوونی مرۆڤ دوای فێرکردنی قورئان دێت، دوای ئەوەی کە فێری ئاخاوتنی کردووین، کە سیفەتێکی تایبەتیی مرۆڤە..

پاشان دێتە سەرباسی لاپەڕەکانی گەردوون، کە هەمووی بە زمانی حاڵ ئاماژە دەکەن بەوەی کە بەخشش و دروستکاری خواوەندی میهرەبانن، خۆرو مانگ‌و ئەستێرەکان، دارو درەخت، ئاسمانی شین بەڕاسەرمانەوە، تەرازو و پێوەرە تایبەتیەکان بۆ کێشان و پێوانی کاروکردەوەی مرۆڤەکان، سازاندنی زەوی بۆ ژیان، بۆ بەرهەم هێنانی جۆرەها میوە، بۆ پێگەیشتنی جۆرەها دارخورما، بۆ رواندنی جۆرەها دانەوێڵە، بۆ بەرهەم هێنانی جۆرەها روەکی بۆن خۆش‌و تام

خۆش و رەنگ جوانو قەبارە جیاواز،هەروەها ئامارەی بۆ دەستەی جنۆکەو ئەوەی ئادەم کردووە لەگەڵ باسی دووجۆر دەریاشی کردووە کە بەربەست لەنێوانیاندایەو تێکەڵ نابن!! وە ئەو نازو نیعمەتانەی کە لێیان دەردەهێنرێ.

جا کاتێ کە باسی ئەم هەموو شتە گەورە و بەنرخانە دەفەرموێت یەکسەر باسی لەناوچوونیشیان باس دەکات، وە مانەوەی تەنها زاتی گەورەو شکۆمەندو پایەداری خۆی دووپات دەکاتەوە، کە دوای دروستکردنی جیهانی نوێ هەموودروستکراوان ملکەچو فەرمانبەرداری دەبن، زاتی خۆی چی بڕیار بدات هەر ئەوە ئەنجام دەدرێت .

جا لە سایەی باسی نەمانی رەهای دروستکراواندا، وە مانەوەی زاتی خوای گەورەدا بۆ هەمیشەو هەتا هەتایی، هەڕەشەیەکی سامناك لە دەستەی جنۆکەو ئادەمیزاد دەکات، بەوەی کە رۆژێکی تایبەتی تەرخان کردووە بۆ لێپرسینەوەی وردو درشتی کاروکردەوەیان.

ئینجا کۆتا دیمەن باس دەفەرموێت ، دیمەنی قیامەت، سورهەڵگەڕانی ئاسمان، سزادانی تاوانباران‌و پاداشتی تەقواداران‌و دینداران بە دوورو درێژی، تا دەگاتە کۆتا ئایەت‌و دەفەرموێت: ﴿ تَبَٰرَكَ ٱسۡمُ رَبِّكَ ذِى ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ ﴿٧٨﴾ ﴾

موبارەك‌و پیرۆزو شکۆمەندە ناوی جوان‌و بەنرخی پەروەردگاری تۆ ئەی محمد(ﷺ)، ئەی ئیماندار کە خاوەنی رێز و شکۆداری یەو شایستەی هەموو جۆرە رێزو پێزانینێکە..

﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ ﴿١﴾﴾ خواوەندی میهرەبان.

خوای گەورە ئەم سەرەتایەی بە مەبەست داناوە، سەدای وشەکە بە گشتی درێژکردنەوەی پیتی ئەلف بە تایبەتی دەنگ دانەوەیەکی کاریگەری هەیە لە گەردووندا، لە هەموو پێچ و پەناکانی بونەوەردا..

دیارە سەدا و دەنگ دانەوەی وشەی پیرۆزی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ ۝١﴾ دەڕوات بۆ دوور هەموو گەردوون و بەشەکانی بونەوەر دەلەرێنێتەوە، هەموو هەبوو دەدوێنێ، هەموو دروستکراوان ئاوڕ لە سەدای پیرۆزی دەدەنەوە، لە کاتێکدا کە بۆشاییەکانی ئاسمانەکان و زەوی پڕدەکاتەوەو، دەگات بە دەزگاکانی بیستن و دڵ و دەروون..

بەڵێ ئەو ئایەتە پیرۆزە دەفەرموێت ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ ۝١﴾ ئیتر تەواو دەبێت، هەموو بونەوەر بێدەنگ دەبێت، دەزگاکانی بیستن گوێ دەگرن و چاوەڕێی هەواڵی گەورەو گرنگن، چونکە ئەو دەستپێکە مەزنەو سەرجەم بونەوەر بۆی دەشنێتەوە، دڵی بۆی لێدەدات..

* * *

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ ۝١ عَلَّمَ ٱلۡقُرۡءَانَ ۝٢ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ ۝٣ عَلَّمَهُ ٱلۡبَيَانَ ۝٤ ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ بِحُسۡبَانٖ ۝٥ وَٱلنَّجۡمُ وَٱلشَّجَرُ يَسۡجُدَانِ ۝٦ وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ ٱلۡمِيزَانَ ۝٧ أَلَّا تَطۡغَوۡاْ فِي ٱلۡمِيزَانِ ۝٨ وَأَقِيمُواْ ٱلۡوَزۡنَ بِٱلۡقِسۡطِ وَلَا تُخۡسِرُواْ ٱلۡمِيزَانَ ۝٩ وَٱلۡأَرۡضَ وَضَعَهَا لِلۡأَنَامِ ۝١٠ فِيهَا فَٰكِهَةٞ وَٱلنَّخۡلُ ذَاتُ ٱلۡأَكۡمَامِ ۝١١ وَٱلۡحَبُّ ذُو ٱلۡعَصۡفِ وَٱلرَّيۡحَانُ ۝١٢ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ۝١٣﴾

(١) ئەو خوایەی ئەم پەیام و قورئانە پیرۆزەی ناردووە خاوەنی سۆزو میهرەو کانگای ڕەحمەت و بەزەیی بێ سنورە.

(٢) هەر ئەو زاتە خۆی توانای فێربون و لەبەر کردنی قورئانی بەخشیوە بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، وە بە سەرجەم ئیمانداران کە پیرۆزترین نازو نیعمەتە لە دنیاداو بەرەو بەهەشت ئاراستەیان دەکات .

(٣) ئادەمیزادیش هەر ئەو زاتە بەدی هێناوە (لە سەرەتاوە ، دواتریش هاوسەرەکەی ، لەو دوانەش پیاوان و ئافرەتانی زۆر بەدی هاتوون و پەیدا دەبن ، هەر بەو یاساو نەخشەیەی کە ئەو زاتە ویستی لەسەریەتی) .

(٤) هەر خوای گەورەش ئادەمیزادی فێری ئاخاوتن و قسەو گفتوگۆ کردووە (قسەو گفتوگۆ کردن موعجیزەیەکە ، ژێکان ، جوڵەی بۆری هەوا ، زمان ، لێوەکان ، لە بەشی تایبەتی مێشکەوە زۆر بەخێرایی ئاراستە دەکرێن ، پیتەکان دەکەنە ووشەو وشەکان دەکەنە ڕستەو ، رستەکان ڕێك دەخەن ، تا ئەوەی لە ناخ و دەرونماندا هەیە دەری بڕین!!)

(٥) خۆرو مانگیشی بە قەبارەو چڕی و دورو نزیکییەکی حساب بۆ کراو لە خولگەی خۆیاندا داناوە ، زەوی بە دەوری خۆردا ساڵی جارێك دەسوڕێتەوە مانگیش بە دەوری زەویدا مانگی جارێك دەسوڕێتەوە تا کاتێکی دیاریکراو .

(٦) ئەستێرەو هەسارەکانیش ، روەکە بێ قەدو درەختە بەرزەکانیش هەمویان سوژدە دەبەن و لە نەخشەی دیارکراوی بەدیهێنەریان دەرناچن و ناترازێن .

(٧) ئاسمانیشی بەرزو بڵند ڕاگرتووە بێ کۆڵەکەو ستون ، تەرازو و پێوەری بۆ هەموو شتێك داناوە (هەموشت بە ئەندازەو یاسایە ، هیچ شتێك لەم بونەوەرەدا

بێ مەبەست و هەڕەمەکی نیە ، (بۆیە ئیمانداریش پێویستە پابەندی بەرنامەی خوای گەورە بێت ، چونکە لادان و یاخی بونی دەبێتە هۆی ستەم و نەگبەتی بۆی لە هەردوو جیهاندا) .

(٨) ئێوەش ئەی نەوەی ئادەم با تەرازوو پێوەرتان ڕێك و پێك بێت و ستەم لە یەکتر مەکەن .

(٩) هەوڵبدەن لە کێشان و پێواندا تەرازو بازی مەکەن و کەم فرۆشی و گرانفرۆشی ئەنجام مەدەن.

(١٠) ئەو خوایە سەرجەم زەویشی بۆ خەڵکی ملکەچ و فەرمانبەردار کردووە ، بۆ هەرچی بەکاری دێنن بەئاسانی دێت بە دەستیانەوە .

(١١) جۆرەها میوەی لەسەر زەویدا دێتە بەرهەم کە لە تام و بۆن و ڕەنگ و قەبارەدا جیاوازن، بەڵکو جیاوازی لەهەر جۆرە میوەیەکدا هەیە ، جگە لە جیاوازی میوەی وڵاتان و ناوچەکان!! هەروەها دارخورمای خاوەن دەفرە گوڵدانی بۆ بەرهەم هێناون ، (ئەویش پتر لە سەد جۆرە).

(١٢) جگە لە جۆرەها دانەوێڵەی جیاواز ، کە بە توێکڵ و پوش و بەرگ ڕازێنراوەتەوە و بە بۆنی خۆش بۆنخۆش کراون.

(١٣) جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزاد و پەری ، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندو چاك نیە (کاتێ پەری و جنۆکە ئیماندارەکان گوێ بیستی ئەم ئایەتە بون هەموو جارێك دەیانوت: ئێمە باوەڕمان بە هەموی هەیە ئەی خوای میهرەبان) .( شایەنی باسە ئەم ئایەتە ٣١جار لەم سورەتەدا هاتووە هەشت جاری لە دوای باسی بەدیهێنراوەکانەوەیە

حەوت جاری دوای ئایەتەکانی دۆزەخە ، هەشت جاری لە دوای نازو نیعمەتەکانی بەهەشتی پلە یەکە ، هەشت جاری تریش دوای نازو نازو نیعمەتەکانی بەهەشتی پلە دووە ، دۆزەخ حەوت دەرگای هەیە ، بەلام بەهەشت هەشت دەروازەی فراوانی هەیە!!) .

ئاشکرایە ئایەتەکان باسی نازو نیعمەتو بەخششەکانی خواوەندی میهرەبان دەکەن کە یەکەمیان ئەوەیە کە قورئان؛ گوفتارو کەلامی شیرینی فێری ئادەمیزاد کردووە ..

ئەم نیعمەتە گەورەیەی کە سۆزو میهری خواوەندی میهرەبان بۆ ئادەمیزاد نومایان دەکات .. ئەم قورئانەی کە هەموو یاساکان و هەموو شتێکمان لەم گەردوونو بونەوەرەدا بۆ روون دەکاتەوە، باس لە بەرنامەکانی ئاسمانو زەوی دەکات؛ ئەو بەرنامانەی کە خەڵکی سەرزەوی پەیوەست دەکات بە یاساکانی گەردوونەوە، بیروباوەڕو بۆچوونو پێوەرو بەهاو یاساو کاروباریان لەسەر بنچینەیەکی بتەوو دامەزراو رێك دەخات کە لەگەڵ بونەوەرو دەروبەردا سازگارو سازاو بێت .. هەر لە دنیادا کارئاسانیو ئاسانکاریو دڵنیاییو تێگەیشتنو هاوئاهەنگییان پێدەبەخشێت لەگەڵ هەموو یاساکانی گەردووندا .

قورئان هەستو نەستیان والادەکات تا تێبگەن لەم گەردوونە جوانە، هەروەکو ئەوەی تازە بە تازە شارەزای ببنو یەکەم جار بیبیستن، ئەوسا هەستیان نوێ دەبێتەوە بەرانبەر بوونی خودی خۆیان ـ لەسەر زەویدا، لە دنیادا، پرسیان پێنەکراوە هاتوون، پرسیان پێ ناکرێ کە دەبێ لە کاتو ساتو شوێنی دیاریکراودا بار بکەنو لە توێی خاکدا مەنزڵ بگرن!! تێدەگەن بۆ تاقیکردنەوە،

بۆ ماوەیەکی دیاریکراو لێرەن، ژیانی هەمیشەیی و نەبڕاوە لەودیو مردنەوەیە مرۆڤ ؛ وەکو رێزێك سەرپشك کراوە ئایا هەوڵدەدات بەهەشتو بەختیاری بۆخۆی دەستەبەر بکات، یان دۆزەخو بەدبەختیو چارەڕەشی -

هەروەها قورئان هەستو نەستی مرۆڤ بەرانبەر گەردوون نوێ دەکاتەوە، وا هەست دەکات کە هەمووشت زیندووەوهاوکارە لەگەڵیدا، دۆستو هاوڕێیە، برادەرو خۆشەویستی یەکترن، بۆ هەرکوێ دەچن ، لە هەرکوێ دەبن بە درێژایی ژیانیان لەسەر ئەم هەسارەیە میوانداریان لێ دەکرێت !!

قورئان تێیان دەگەیەنێت کە خوای گەورە نیشتەجێی کردوون لەسەر زەویدا، ئەوان رێزدارن لای ئەو زاتە، هەڵگری ئەو ئەمانەتەن کە ئاسمان و زەوی و کێوەکان هەڵیان نەگرتولە خۆیان رانەبینی هەڵیگرن، بەڵام ئەمان هەڵیانگرت دیارە کە زۆر بەنرخن لای ئەو زاتەی کە بەدی هێناونو مرۆڤ بوونو ئادەمی بوونیان لەو زاتەوە سەرچاوەی گرتووە، تەنها بەیەك هۆکاریش دەتوانن پەیوەندیان بەردەوام بێت: ئەویش ئیمانە کە هەستو رۆحیان هەمیشە بە زیندویەتی دەهێڵێتەوە، چونکە خوای گەورە لە رۆحێکی تایبەت کە خۆی خاوەنیەتی بەخشیویەتی پێیانو کردوونی بەم مرۆڤە ئاڵۆزو سەرسوڕهێنەرو سەیرو سەمەرەیە، بێگومان ئەو ئیمانە گەورەترین و بەنرخترین نیعمەتە بۆ ئینسان .

هەر بۆیە باسی فێرکردنی قورئانی پێش دروستکردنی ئینسان باس فەرمووە، بۆ ئەوەی مرۆڤ واتای ئینسان بوونو مرۆڤ بوون لە خۆیدا بێنێتە دی ـ دووربێ لە سیفاتی ئاژەڵیەوەــ بەڵێ ؛ خوای گەورە ئینسانی دروستکردو فێری

ئاخاوتن‌و قسەکردنیشی کرد، بەڕاستی قسەکردنی مرۆڤ موعجیزەیە، باسی ناخی خۆی دەکات شت روون دەکاتەوە، تێدەگات‌و وەڵامی کەسانی دەوروبەر دەداتەوە، لەڕاستیدا ئێمە بەهۆی راهاتنمانەوە ئەم موعجیزە گرنگەمان فەرامۆش کردووە، بەڵام خوای گەورە دەیەوێت لە رێگەی قورئانەکەیەوە سەرنجمان راکێشێ بۆلای زاتی خۆی، - باشە چۆن ئەم پیتانە دەکەینە وشە، دەیکەینە رستە دەیکەینە باس‌و خواس، چۆن دەم و لێوو زمان و دانەکان‌و ژێکانی قورگ هەمووی هاوئاهەنگ دەبێت بۆ قسەکردنمان بۆ ئاخاوتنمان، لە یەك چرکەساتدا، بۆیە رەوا و شیاوە جار جارە کاتێ کەسێکی کەڕولاڵ دەبینین ، زۆر سوپاسی خوای گەورە بکەین -

ئەی مرۆڤ خۆی لە چی پێك هاتووە؟ سەرەتای دروستبوونی چۆن بووە؟ چۆن قسەو ئاخاوتن فێربووە؟

لەڕاستیدا سەرەتای خانەیەکی زۆر بچوك بووە ، لەگەڵ هێلکۆکەدا ئاوێتەی یەکدی بوون، ئەوەندە بچوك بووە بە هۆی میکرۆسکۆبەوە بینراوە، بەڵام ئەم پێکهاتەیە بەرەبەرە بووە بە کۆرپەلە کە لە ملیۆنەها خانەی جۆراوجۆر پێك هاتووە، کۆمەڵێکی ئێسکەو کۆمەڵێکی کرکراگەیەو کۆمەڵێکی ماسولکەیەو کۆمەڵێکی رەگەو پێستەو گۆشتەو...هتد. هەروەها لەو سەرەتایەوە چوارپەل‌و هەستەکان‌و کارو ئەرکیان لەو پێکهاتە بچوکەدا ئاخنراوە، پاشان لە دەزگاکانی بیستن‌و بینین‌و تام کردن‌و بۆن کردن‌و هەست کردن بەهرەمەند کراوە، پاشان نهێنیەکی گرنگ‌و سەرسوڕهێنەری پێ بەخشراوە کە ئەویش نهێنی تێگەیشتن‌و هەست‌و نەست‌و لێکدانەوەیە.. هەموو ئەمانە لە خانەیەکی زۆر بچوك‌و سادە دا

کە بە رەحمەت، وە بە دەزگای تایبەت نەبێ نابینرێ، ئەمە کەی؟ لە کوێوە پەیدابوو؟ دیارە ئەوانە لەلایەن خوای میهرەبانەوەیە، دەست کردی پەروەردگاری جوانکارو میهرەبانە .

لە ئایەتێکی تردا بیرمان دەخاتەوە و دەفەرموێت

﴿ وَٱللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۙ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٧٨﴾ ﴾ النحل .

واتە: ئەوە هەر خوای گەورەیە کە لە سکی دایکتان دەرتان دەهێنێ هیچ شتێکتان نەدەزانی؛ پاشان هەر ئەو زاتە دەزگای بیستن و بینین و لێکدانەوەی پێبەخشیوون .

بەڕاستی دەزگای قسەکردن و ئاخاوتن شتێکی سەیرەو تێڕوانین و بیرکردنەوە لێی کۆتایی نایەت .. ئەم زمانە، ئەم دوو لێوە، چەناگە، دانەکان، قوڕگ و بۆری هەواو بەشەکانی و سییەکان، هەر هەمووی بەشدارە لە ئالیەت و میکانیزمی قسەکردندا و بەشێکە لە بەشەکانی قسەکردن - کەسانێك هەن هەموو ئەو دەزگایانەیان هەیە بەڵام لاڵن و قسە ناکەن - دیارە ئەو دەزگایانە پەیوەستن بە مێشك و بەشەکانی ترەوە .. پاشان بە ئاوەزو عەقڵەوە؛ کە هەر ناوەکەی دەزانین، لە حەقیقەت و چۆنیەتی و پێکهاتەی هیچ شارەزاییەکمان نیە، لە چۆنیەتی کارو شێوازی کارکردنی هەر خەریکە هیچ نەزانین!!

باشە کەسێك وشەیەك دەڵێت؛ چۆن چۆنی بۆی دێت؟! بەڕاستی کارێکی ئاڵۆزەو بە قۆناغی زۆردا تێدەپەڕێت، بە دەزگای سەیرو سەمەرەدا گوزەردەکات، هەندێکی ئێستەشی لەگەڵ بێت شاراوەیە لە زانستی مرۆڤ ..

سەرەتا هەست کردن بەوەی کە پێویستە قسە بکەیت و شتێکی دیاریکراو بڵێیت بە مەبەستێکی دیاریکراو .. ئەم هەستە نازانین چۆن پەیدا دەبێت، ئایا لەرێگەی ئاوەزو عەقڵەوەیە، یان لە رۆحەوە دەبێت بەکارێکی هەستی و خانە تایبەتیەکانی مۆخ دەهەژێنێ و بە رێگەی تایبەتی خۆی فەرمان دەدات بۆ هەموو ئەندامانی پەیوەندیدار ـ لە کەمتر لە ١/١٠٠٠ی چرکەیەکدا ـ فەرمان ئەنجام دەدەن و وشەو رستەو باسەکان رێکدەخەن !! ـ

وشەکانیش هەر خوای گەورە مرۆڤی لێ شارەزا کردووە ـ هەر وەکو چۆن کاتی خۆی باوکە گەورەمانی فێرکردووە :﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ...﴿٣١﴾﴾ البقرة..

سییەکان هەندێ هەوا دەردەکەن، تا لە بەشەکانی سییەکانەوە دەرچن بەرەو بۆرییە سەرەکی یەکان و پاشان بۆ قورگ و ژێیەکانی دەنگ کە ئەوانیش شتێکی سەیرن و ئامێرەکانی میوزیك، هەرگیز ناگەنە ئەوان، ئەوسا قورگ و ئەو تاڵانە جۆرێك خۆیان ساز دەدەن کە عەقڵ داوای لێ کردوون ، بەرز بێت یان نزم، خێرا بێت، یان هێواش، زبر بێ یان ناسك، ئەستور بێ یان باریك، چەندە جۆر دەنگ هەیەو تایبەتمەندییان چۆنە .. ئەمانەش هەمووی بە هاوکاری قورگ و زمان و لێوەکان و چەناگەو دانەکان، ئەم دەنگە بە یارمەتی هەموو ئەو ئەندامانە پێك دێت، هەموویان ساز دەبن بەو شێوازە بۆ هەر پیتێك، بە تایبەت زمان کە هەوڵدەدات کۆنترۆڵی هەموویان بکات.

ئەوە بۆ دەربڕینی پیتێك، جا بیربکەرەوە لە رستەیەك لە بیرۆکەیەك، لە دەربڕینە هەست و ئەستێك بەرانبەر رووداوێکی رابوردوو یان داهاتوو، هەر هەمووی دنیایەکە لە نهێنی و شتی سەرسوڕهێنەر، کە بە هەمووی ئەم مرۆڤە سەیرە

نامۆیەی لێ پێك هاتووە؛ كە دروستكراوی خواوەندی میهرەبانە، وە بە فەزڵی پەروەردگاری میهرەبان هاتۆتە سەر گۆڕەپانی ژیان .

*　　*　　*

ئینجا ئایەتەكان دەست پێدەكات بە باسی بەخشین‌و دروستكراوەكانی خۆی لە پێشانگای گشتی بونەوەردا، باس لە خۆرو مانگ دەكات كە بە شێوازێكی ورد دروست كراون‌و لە خولگەكانیاندا دانراون تا خزمەت بە زەوی‌و نیشتەجێكانی بكەن .. ئەندازەگیری ورد ئاشكرایە كە زانایانی گەردوونناسی سەرسام كردووە، هەروەها قەبارەو پێكهاتەو دوری‌و نزیكیان لە زەوی، هەموو ئەوانە مرۆڤی هۆشیار سەرسام ئەكات‌و هەست بە گەورەیی‌و گرنگی ئەو ئامارژە قورئانی یە دەكات، كە چەندەها حەقیقەتی قوڵ و سەرسوڕهێنەری لە خۆ گرتووە !!

بێگومان ئەم خۆرەی ئێمە گەورەترین ئەستێرە نیە لە ئاسماندا لە بۆشایی گەردووندا ئەوەندە گەلە ئەستێرە هەیە ـ ئێستاشی لەگەڵ بێت ـ بە تەواوی نەزانراوە، باس لە سەد ملیۆن گەلە ئەستێرە دەكەن كە هەریەكەیان ملیارەها ئەستێرەو هەسارەی لەخۆ گرتووە، ئەستێرەی زەبەلاحی وایان تیایە كە قەبارەی هەزاران ئەوەندەی خۆر دەبێت‌و گەرمی‌و روناكیشی هەزارەها ئەوەندەی گەرمی‌و روناكی خۆرە، بەلام بەهۆی دووری بێ ئەندازەی وەكو چرایەكی كز لە قولایی ئاسماندا خۆی دەنوێنێ ـ .

بۆ نموونـە ئەستێرەی (شعری)قـەبارەی بیسـت ئەوەنـدەی خـۆرە، روناکیشـی پەنجا ئەوەندەیـەتی، ئەستێرەی (سماك) هەشتا ئەوەنـدەی خۆرە روناکیەکـەی هەشتا هەزار ئەوەندەیەتی ، ئەستێرەی (سهیل)دووهەزارو پێنجسـەد ئەوەنـدەی خۆرەو روناکیەکـەی نەزنراوە .. ئا بـەو شێوەیە تا دێـت زانایـان ئەسـتێرەی گەورەو زەبەلاحی سەرسوڕهێنەری تریان بۆ دەردەکەوێت ..

بەڵام بیرمان نەچێت کە خـۆر گـرنگترین ئەستێرەیە بۆ ئێمـە، ئێمـەی دانیشوانی ئـەم هەسـارە بچـکۆلەیە!! چـونکە ئێمـەو سـەرجەم دانیشـتوانی، روەكو پێکهاتەکانی پێویستیمان بە گەرمیو هێزی راکێشانیو روناکیەکەیـەتی بۆ زۆر شت بەتایبەت بۆ پێکهاتنی سوڕی ئاو لە سروشتدا!!

هەروەها مانگ کە شـوێنکەوتەیەکی بچوکی زەوی یـەو کاریگـەریی هەیە لەسـەر هەڵکشانو داکشانی ئاوی دەریاکان.

قـەبارەی خـۆر، پلـەی گـەرمیی، دوری لێمانـەوە، سـوڕانەوە و خولانـەوەی لـە خولگەی خۆیدا، هەروەها قەبارەی مانگو دوریـیەکەی لە زەوی یەوە، ئەو کاتەی کـە بەسـەری دەبـات لـە سـوڕانەوەی بـەدەوری زەویـدا، دانانیـان لـە بۆشـایی ئاسماندا، بۆ هەموو ئەوانەو زۆر شتی تریش ئەندازەگیری ورد کراوە!!

جا با ئێستە هەندێك لەو ئەندازەگیریو وردەکاریانە بخەینە روو، خۆرو مانگ پەیوەندییەکی گرنگیان بە هەسارەکەی ئێمەوە ، بە ژیانو زیندەورانەوە هەیە؟ دوری خۆر لە زەوی یەوە پترە لە نەوەدو دوو ملیۆن میل ـ نزیکەی سەد و پەنجا ملیۆن کیلۆمەتر ـ گەر نزیکتر بوایە زەوی دەسوتاو دەتوایەوە و دەبوو بە هەڵم! گەر دوورتریش بوایە هەمووشت دەیبەستو هەرچی زیندەوەرانە دەمردن..

ئەو گەرمیەی کە لە خۆرەوە پێمان دەگات یەك بەشە لە دوو ملیۆن بەشی گەرماکەی، هەر ئەوەندەش لەبارە بۆ ژیانی ئێمە، خۆ ئەگەر لەجیاتی خۆر ئەستێرەی (شعری)بوایە ئەوە زەوی دەبوو بە هەڵم و پەرش و بڵاو دەبۆوە!!

هەروەها مانگ . قەبارەکەی، دووری لە زەوی یەوە، ئەگەر گەورەتر بوایە لە قەبارەکەی ئێستای، ئەوە هەڵکشانی ئاو دەبوو بە زریانێك و هەموو زەوی دادەپۆشی ، هەروەها ئەگەر نزیکتر بوایە کارەساتی دروست دەکرد، دیارە کە بە حسابێکی ورد دانراوە و بە ئەندازەی تاڵە مویەك لای نەداوە.

هێزی راکێشانی مانگ و خۆر بۆ زەوی ئەندازەگیری وردی هاوسەنگی بۆ کراو، بۆیە بەو شێوازە دانراوە، رێرەوو خولگەی لە بۆشایی گەورە و فراواندا بۆ دیاری کراوە، کە لەگەڵ هەموو کۆمەڵەی خۆردا لە چەرخ و خولدایە بە خێرایی بیست هەزار میل لە سەعاتێکدا و هەموویشی بە یەك رێرەودا بەرەو بورجی (الجبار) دەڕوات، لەگەڵ ئەوەشدا ملیۆنەها ساڵە ئەو رێرەوەی گرتۆتە بەر لەگەڵ یەك ئەستێرەدا پێکدادان روی نەداوە.

جا لەو بۆشایی یە فراوان و گەورەیەی ئاسماندا رێرەوی هیچ ئەستێرەیەك بەقەد تاڵە مویەك تێك ناچێت و ناترازێ، لە وردەکاری لەنگەرو هاوسەنگی لە قەبارەو جوڵەدا توشی ترازان و شێوان نابێت .

﴿ الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ ۝٥ ﴾

بەڕاستی خوای گەورە راستی فەرمووە کاتێ کە فەرمویەتی خۆرو مانگ بە قەبارەو دوورو نزیکی و چڕی و شێوازو هێزی راکێشانیانەوە بە ئەندازەگیرییەکی ورد دروست کراون و لە خولگەکانیاندا دانراون.

هەروەها کاتێ کە فەرمویەتی : ﴿ وَالنَّجْمُ وَالشَّجَرُ يَسْجُدَانِ ۝٦ ﴾..

واتە ئەستێرەو درەختەکان بەردەوام سوژدە دەبەنو ملکەچ و فەرمانبەرداری پەروەردگاریانن .. ئەوە ئاماژەیە بۆ روگەو مەبەست لە دروست بوونی گەردوونو هەموو ئەو شتانەی کە لەسەریەتی کە هەمووی بۆ یەك مەبەست دروست کراو.

لەڕاستیدا ئەم بونەوەرە پەیوەندییەکی بتەوی هەیە بەو زاتەی کە بەدیهێناون، ئەو زاتەی کە دروستکارێکی داهێنەرە، ئەستێرەو درەخت دوو نموونەن لە داهێنراوەکانی؛ بەڵگەن لەسەر ئاراستەی هەموو دروستکراوان..

هەندێ لە (مفسرين) (نجم)ی بە ئەستێرەی ئاسمان تەفسیر کردووە، هەیشە بەو روەکانە تەفسیری کردووە کە لەسەر زەویدا پەل دەهاونو قەدو باڵایان نیە، جا ئەمیان بێت یان ئەویان، ئەم دەقە ئاماژەیە بەوەی کە ئەم گەردوونە پەیوەستە بە یەك حەقیقەتو روگەوە ؛ پەیوەندیان بە یەکترەوە هەیە - هەموویان ملکەچو فەرمانبەردارن - .

بە دەقی قورئان هەموو دروستکراوان لەم گەردوونەدا زیندون و هەر جۆرێکیان شێوە گیان و زیندویەتیەکی تێدایە، هەرچەندە دیمەنو شێواز و قەبارەیان جیاواز بێت، حەقیقەتی هەموویان هەر یەکێکە، لەدێر زەمانەوە مرۆڤە ئیماندارەکان هەستیان بەوە کردووە کە هەموو شتەکان روو بە پەروەردگاریانن، بە فیترەتی پاکیان بە نیگاو ئیلهامیان هەستیان پێکردووە، بەڵام کاتێ کە پەنای بردووە بۆ عەقڵی سنورداری کە قەتیس کراوە بە ئەزموونی هەستەکانی؛ تەمو مژ ئەو هەستە ناسکەی داپۆشیوە ..

ـ ئەوەتـە داود پێغەمبـەر(علیـه السـلام ) پێکـەوە لەگـەڵ کێوەکـان و باڵنـدەکان تەسبیحات و ستایشی پەروەردگاریان کردووە، هەروەکو لە ئایەتی ژمارە(١٠)ی سورەتی (سبأ)دا باسی فەرمووە ـ

لەم ساڵانەی دواییدا زانایان بۆیان دەرکەوتووەکە ئەم گەردوونە و ئەم بونەوەرە بێ شومارانە لە ئەتۆم پێکهاتوون، بەڵام تا ئێستە و ـ رەنگە تا قیامـەتیش ـ لە نهێنی رۆح تێنەگەن، پەی بە نهێنی رۆح و ژیان و زیندەگی نەبەن، بەڵکو تـەنها هەر کار لەسەر ئاسەوارەکانی بکەن ـ

جا سـەیر لەوەدایە کە ئـەتۆمیش بە وزە و تیشك و روناکی لێك دەدەنەوە، کە شـتێکی هاوبەشـە لـە نێـوان هـەموو دروسـتکراواندا!! لەگـەڵ بـوونی جوڵـەی بەردەوام لە هەموو بونەوەردا ..

جا داخۆ ئەم گەردوون و بونەوەرە بەم جوڵە و سوڕانەوە بەردەوامەی بەرەو کوێ دەچێت؟

قورئـان پێمـان دەڵێـت : هـەموو دروسـتکراوان بە رۆحیـان بـەرەو لای ئـەو زاتـە دەڕۆن کە بەدیهێناون، رۆحیش بنەچەیە بۆ جوڵـەی مـادە، هـەر رۆحـیْ شتەکانە جوڵەیان پێدروست دەکات، وەکو ئەم ئایەتانە ئاماژەی بۆ دەکەن :

﴿ وَٱلنَّجۡمُ وَٱلشَّجَرُ يَسۡجُدَانِ ۝٦ ﴾

﴿ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبۡعُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ وَإِن مِّن شَيۡءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمۡدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِيحَهُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا ۝٤٤ ﴾ الأسراء.

واتە: حەوت چین ئاسمان و زەوی و هەرکەس کە لە سەریان دەژی تەسبیحات و ستایشی پەروەردگاریان دەکەن ، هەرچی شتە تەسبیحات و ستایشی ئەو زاتە دەکات و سوپاسگوزاریەتی، بەڵام ئێوە لە تەسبیحات و ستایشیان تێناگەن !!

﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالطَّيْرُ صَافَّاتٍ كُلٌّ قَدْ عَلِمَ صَلَاتَهُ وَتَسْبِيحَهُ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٤١﴾ ﴾ النور.

واتە: ئەی مرۆڤ! مەگەر نابینی کە هەرچی لە ئاسمان‌و زەویدا هەیە تەسبیحات و ستایشی خوای گەورەیان دەکەن، هەروەها باڵندەکانیش بەریز سەرگەرمی تەسبیحاتن، هەریەکەیان چاك دەزانێ چۆن‌و بە چ زمانێك ملکەچی‌و سۆزو رێز دەربرێت بۆ پەروەردگاری‌و ملکەچی بنوێنێ‌و بیپەرستێ‌و ستایشی بکات!

جا ئێستە سەرنجی ئەم راستییە بدە، بەدواداچوون و پەیگیری گەردوون و بونەوەر بکە لە پەرستنی پەروەردگاریدا، لە ستایشی زاتی بەدیهێنەریدا، ئەوکات چێژێکی رۆحی‌و مەعنەوی هەست پێدەکەیت ـ ئەسرینی شادی‌و خۆشەویستی بۆ زاتی پەروەردگارو بەدیهێنراوەکانی لە دیدەت دەبارێت ـ

چونکە هەست دەکەیت کە هەموو ئەو شتانەی دەوری داویت زیندون و تۆشیان خۆش دەوێت، وە تۆ و ئەوان بە ملکەچی وەستاون و فەرمانبەرداری زاتی بەدیهێنەرتانن، هەمووتان هەست‌و رۆحتان هەیە.. ئەوسا دەبنە براو هاورێی یەکتر لەم گەشتەدا کە لە دنیادا لەسەر زەوی یەکەی دەیبەنە سەر..

بەراستی ئەو ئایەتانە ئاماژەی تایبەتی‌و قوڵ و سەرنجراکێشمان پێدەبەخشن:

﴿ وَالسَّمَاءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ الْمِيزَانَ ﴿٧﴾ أَلَّا تَطْغَوْا فِي الْمِيزَانِ ﴿٨﴾ وَأَقِيمُوا الْوَزْنَ بِالْقِسْطِ وَلَا تُخْسِرُوا الْمِيزَانَ ﴿٩﴾ ﴾

لێرەدا جارێکی تر ئاماژە بۆ ئاسمان دەکات ـ چونکە بەراستی ئەم گەردوونە زۆر فراوان و سەرسورهێنەرە، زانایانی گەردووناسی سەرسام کردووە و دەڵێن زاتی خوای گەورە زۆر روونە لای ئێمەو خەریکە دەیبینین!!

هەمیشە خوای گەورە بە باسی ئاسمان دەیەوێت غافڵەکان بە ئاگا بێنێتەوە، رزگاریان بکات لە حاڵەتی راهاتن لەگەڵ دروستکراواندا، ئەو زاتە دەیەوێت ناخی مرۆڤەکان دابچڵەکێ و بە قوڵی بیربکەنەوە لە زاتی دروستکار..

دەیەوێت هەمووکەس بە چاوی دڵ سەرنج بدات و بیربکاتەوە لەم گەردوونە زەبەلاح و فراوانە، سەیرێکی جوانی و رێکوپێکی بکات، بیرێك بکاتەوە لەو دەستە بە دەستەڵاتەی کە ئەم هەموو شتە جوانەی بەوپەڕی رێکوپێکی بەدیهێناوە.

جا ئاماژە بە ئاسمان، بە هەر واتا و مەبەستێك بێت ئەوەیە کە مرۆڤ سەیری سەرەوەو بڵندیی بکات، ئەم بۆشایی یە گەورە و فراوانەی کە گەردوونناسان سنوری نازانن، بە ملیارەها ئەستێرەو هەسارەی گەورەو زەبەلاح لە نێویدا لە چەرخ و خولدان، کەچی دوانیان بەریەکتر ناکەون، دوو گەلە ئەستێرە گەر بە ئاراستەی پێچەوانە بەنێو یەکتردا تێپەڕن هیچ جۆرە پێکدادانێك روونادات!!

بە مەرجێ کۆمەڵەی وایان هەیە لە هەزار ملیۆن ئەستێرە زیاترە، وەکو ئەم کاکێشانەی کە کۆمەڵەی خۆری خۆمانی لەخۆ گرتووە، ئەستێرەو هەسارەی وای تێدایە یان بچوکترە لە خۆر یان گەورەترە بە هەزاران ئەوەندە، بە مەرجێ تیرەی خۆرەکەی ئێمە پتر لە ملیۆنێك وسێ سەد هەزار ملیۆنێك (کم) دەبێت!!!

ئەی ئەم هەموو ئەستێرانەو گەلە ئەستێرانە کە هەمووی بە خێرایی یەکی ترسناك لە چەرخ و خولدان.. بەڵام ئەوەندە خوای گەورە بۆشایی گەورەی بۆ رەخساندوون. وەکو گڵۆپی بچوکی بێ شومار لە یەکتر دوور دەنوێنن، ناگەن بە یەکتروپێکدادان دروست نابێت..

جا لەپاڵ ئەو دەستەڵاتو گەورەیی یەدا کە لەبەرز ڕاگرتنی ئاسمانی فراواندا هەیە تەرازوو پێوەری حەقی داناوە، تەرازوی مەحکەمو بتەوو دامەزراوی داناوە، دایناوە بۆ کێشانو پێوانی هەموو شتێك بۆ هەڵسەنگاندنی مرۆڤ و ڕووداوو شتەکان، تا ڕاستکردنەوەیان نەشێوێ، کێشیان نەلەقێ، تا شوێن نەفامی و ئارەزووپەرستی و شتی لاوەکی نەکەون .. ئەم پێوەرە لە فیترەتو لە بەرنامەی خواییدا دانراوە کە هەموو پەیامەکانو قورئانیش لە خۆی گرتووە، پێوەری داناوە تا خەڵکی لە پێوەرەکانی خۆیاندا لەسەر زەوی ستەم نەکەن، کەم فرۆشی و خیانەت نەکەن، هەموو شتو هەموو هەڵسەنگاندنەکان دادپەروەرانە ئەنجام بدەن، بەبێ ستەمو بەبێ زیان.

ئەوسا ئیتر هەمیشە لەژیانی خەڵکیدا حەق پەیوەست دەبێ بە پێکهاتەی گەردوون و یاساکانیەوە، پەیوەست دەبێ بەو ئاسمانەوە کە لەوێوە پەیامە پیرۆزەکانی لەلایەن خوای گەورەوە ئاراستە کراوە، ئینجا لەو گۆشە نیگایەوە دەردەکەوێت کە ئەم گەردوونە؛ وە بە فەرمانی خوا چەندە گەورە و تۆکمەو دامەزراوە، ئەوسا ئیتر ڕوون دەبێ ئەم پەیامەو ئەم گەردوونە چەندە گرنگو بەنرخن ..

﴿ وَٱلۡأَرۡضَ وَضَعَهَا لِلۡأَنَامِ ﴿١٠﴾ فِيهَا فَٰكِهَةٞ وَٱلنَّخۡلُ ذَاتُ ٱلۡأَكۡمَامِ ﴿١١﴾ وَٱلۡحَبُّ ذُو ٱلۡعَصۡفِ وَٱلرَّيۡحَانُ ﴿١٢﴾ ﴾

جا چونکە ئێمە وەکو مرۆڤ ماوەیەکی زۆرە ژیان لەسەر زەوی دەبەینە سەر، وە ڕاهاتوین لەگەڵ بارودۆخو دیاردەکانیدا خەریکە هەست بەو دەستەڵاتە نەکەین کە زەوی بەم شێوازە بۆمان سازاندووەو ژیانی بە گشتی لەسەری ئاسان

کردووە، زۆرجار خەریکە هەست بە بەهاو نرخی نازونیعمەتەکانی خوای گەورە نەکەین لە سەرمان مەگەر جار بەجاریّ گرکانێك یان زەوی لەرزەیەك رووبداتو دامانچڵەکێنیّ و شپرزەمان بکات؛ ئەوسا بیربکەینەوە لەوزاتەی کە ساڵەهایە ئاوا بە مەحکەمی و تۆکمەیی رایگرتووە..

لەڕاستیدا خەڵکی حەق وایە لە هەموو چرکەساتێکدا ئەم حەقیقەتە فەرامۆش نەکەن، بەتایبەت کاتیّ کە دەزانن ئەم زەوی یەی کە لەسەری دەژین تۆزقاڵێکە لەو بۆشاییە فراوانەی کە خوای گەورە بەدیهێناوەو بەردەوام لە چەرخو خولی هەمەجۆردایە!!

زەوی بە دەوری خۆیدا بە خێرایی هەزار میل لە کاژێرێکدا دەسوڕێتەوە ـ لە بەردەم خۆردا تا شەوو رۆژمان بۆ پێش بێنێت ـ هەروەها بە خێرایی شەست هەزار (کم) لە سەعاتێکدا ؛ لە هەمان کاتدا دەسوڕێتەوە ـ تا چوار وەرزمان بە شێوازی پێچەوانە لە سەرو؛ وە خواروی زەویدا بۆ پێش بێنیّ ـ لە هەمان کاتدا بە خێرایی بیست هەزار میل لە سەعاتێکدا لەگەڵ خۆرو کۆمەڵەی خۆردا لە بۆشایی ئاسماندا بەرەو بورجی(الجبار) دەڕوات!!

بەڵیّ! ئەگەر ئەو خەڵکە ئەم راستیانە بزانن‌و هەمیشە لە یادیانا بێت کە ئەوان لەسەر ئەم تۆزقاڵە زەوی یەن کە بەو شێوازە لە ئاسماندا لە چەرخو خولدایە ، وە بەو خێرایی یە زۆرانە، باشە، ئەگەر دەستی قودرەتی خوا نەبیّ، چ هێزێك دەتوانیّ بیپارێزێت ـ لە کاتێکدا زانایانی گەردونناسی دەڵێن (١٤) جوڵەو سوڕانەوەی هەیە بە خێرایی جیاواز، ئەگەر ئەو خەڵکە بیربکەنەوە لەم حاڵەتە بەردەوام دەستیان لەسەر دڵیان دەبێتو لەرزیان لیّ دێت، وە هەست دەکەن هیچ

پەناو لایەك نیە پاڵی پێوە بدەن جگە لە پەنای خواوەندی تاكو تەنهاو ئەو زاتەی كە دەسەڵاتی رەهای بەسەر هەموو شتێكدا هەیە، ئا لەو هەموو بارودۆخە سامناكەدا لەنگەری ئەم زەوی یەی راگرتووە بۆ خەڵكی و وا هەست دەكەن كە هیچ جوڵەیەكی نیە !!

لەڕاستیدا خوای گەورە لەسەر زەویدا ئەوپەڕی ئاسانكاری فەراهەم هێناوە بۆ ژیانی مرۆڤەكان، لەكاتێكدا كە ئەوان لەسەری بە ئارامی ژیان دەبەنە سەر، زەوی بەوانیشەوە سەرگەرمی گەردش و چەرخ و خولی خۆیەتی بە دەوری خۆیدا، بەدەوری خۆردا، لەگەڵ خۆرو كۆمەڵەی خۆردا بەو خێراییانەی كە باسمان كرد ..

هەروەها جۆرەها رزق و رۆزی و میوەهاتی بۆ دابین كردوین، بەتایبەت لێرەدا ناوی خورمای هێشوداری خاوەن دەفری شێوە گوڵدانی فەرمووە كە دیمەنی جوان و خورمای تەڕو ناسكی پێوەیە، هەروەها ئاماژە بۆ دانەوێڵەی لاسكدار دەفەرموێت، كە ئەو لاسكەی كاتێ دەبێتە پوش و پەڵاش و ئاژەڵ دەیخوات و - ئەویش جۆرەها خزمەت دەكات - هەروەها روەكە بۆن خۆشەكان، كە ئەویش هەندێكی بۆ خواردنی مرۆڤەو هەندێكی بۆ ئاژەڵەو هەندێكیشی جۆرەها بۆنی خۆشی لێ وەردەگیرێت ..

ئینجا لە كۆتایی ئەم بڕگەیەدا - یاخود ئەم كۆپلە ئایەتەدا - لە ئاماژەكردن بۆ هەندێ لە نازو نیعمەتەكانی پەروەردگاری بەخشندە لە فێربوونی قورئان و دروستكردنی خۆمان و فێربوونی قسەو ئاخاوتن، هاوئاهەنگی خۆرو مانگ و بەرزكردنەوەی ئاسمان و دانانی تەرازوو میزان - پێوەری هەمەجۆر بۆ ئەو

خەڵکە لە قیامەتدا تا کارو کردەوەو گوفتارو بەخشینو نیەتو هەموو چالاکیەکانی پێ بکێشرێت و بپێورێت، بۆ ئەوەی خەڵکی لە دنیادا حسابی جدی بۆ بکەنو پێوەرەکانیان دادپەروەرانە بێت .

هەروەها ئاماژەی بۆ میوەجاتو خورماو دانەوێڵەو روەکی بۆنخۆش فەرمووە .. دوای ئەمانە هەمووی روو بە دەستەی جنۆکە و ئادەمیزاد دەفەرموێت ..

﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٣﴾ ﴾

بێگومان هیچ کام لە دەستەی جنۆکەو ئادەمیزاد ناتوانن بڕوایان بە نازو نیعمەتەکانی خواوەندی میهرەبان نەبێت کە هەمووی دیارو ئاشکراو نومایانە.

*  *  *

ئینجا لە باسی نازونیعمەتەکان لە گەردووندا دەگوێزێتەوە بۆ باسی خودی خۆیان کە چین و لە چی دروست کراون ..

﴿ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِن صَلْصَٰلٍ كَٱلْفَخَّارِ ﴿١٤﴾ وَخَلَقَ ٱلْجَآنَّ مِن مَّارِجٍ مِّن نَّارٍ ﴿١٥﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٦﴾ ﴾

(١٤) جا ئەو خوایە ئادەمیزادی دروست کردووە لە سەرەتاوە لە قوڕێکی وشك ، وەك فەخفوری.

(١٥) جنۆکەشی لە بڵێسەی ئاگر بەدی هێناوە.

(١٦) جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزاد و پەری ، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندو چاك نیە (کاتێ پەری یە ئیماندارەکان گوێ بیستی ئەم ئایەتە بون هەموو جارێك دەیانوت: ئێمە باوەڕمان بە هەموی هەیە ئەی خوای میهرەبان).

لەڕاستیدا بوون و پەیدابوونمان کرۆکی نازونیعمەتەکانە، نێوانی ئەو دوو حاڵەتە بە هیچ پێوەرێك ناکێشرێت و ناپێورێت، چونکە پێوەرەکانی مرۆڤ بۆ بەراورد کردن لە نێوان ئەو شتانەدایە کە هەن و زانراو و ناسراون .. لەبەر ئەوە بەراوردی بوون و نەبوون هەرگیز ناکرێت، ڕەنگە بۆ دەستەی جنۆکەش هەر وابێ، چونکە ئەوانیش دروستکراون و پێوەری دروستکراوان دەیانگرێتەوە، بۆیە کاتێ خوای گەورە منەت دەنێتە سەر دەستەی ئادەمیزاد و جنۆکەو پەری بە پەیدابوونیان، ئەوە نیعمەتێکە لە سەروو تێگەیشتنەوەیە پاشان باس لەوە دەفەرموێت کە ئەم دوو دروستکراوەی لە چی دروست کردووە.. یەکێك لە قۆناغەکانی دروستبوونی سەرەتای مرۆڤ ، قوڕێکی وشکبووی وەك فەخفوری بووە، کە بە ئاستەم پیایدا دەماڵرێ زرنگەی لێوە دێت، کە ئەوە ئاماژەیە بەوەی کە مرۆڤ لە مادەی زەوی دروستکراوە ..

زانستی نوێش سەلماندوویەتی کە جەستەی مرۆڤ لەو ماددانە دروست بووە کە لەسەر زەویدا هەیە: لە کاربۆن و ئۆکسجین و هایدرۆجین و فۆسفۆر و گۆگرد و ئازۆت و کالیسیۆم و یۆد و فلۆرین و کۆباڵت و زینك و سلیکۆن و ئەلمنیوم؛ کە ئەمانە هەمووی خاکی زەوی پێك دەهێنن، هەرچەندە ڕێژەکەیان لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر وە لە خاکێکەوە بۆ خاکێکی تر دەگۆڕێت.

ئەڵبەت دەبێ ئەوە فەرامۆش نەکەین کە نابێت دەقە قورئانیەکان هەمیشە ببەستین بەو شتانەی کە مرۆڤ لەڕێگەی زانستەوە دەستی دەکەوێت، کە گریمانەی ڕاست یان هەڵەی هەیە، یان ڕاستکردنەوە و گۆڕین ، چونکە بەردەوام زانست بەرەو پێش دەچێت ـ کە بەخششی خوای تەواو زانایە بە مرۆڤەکان ـ

زۆر کەس پەلە دەکات لە هەندێ شت کە هێشتا تیۆری یان گریمانەیە دەیکاتە هۆکار بۆ سەلماندنی ئیعجازی قورئان، دەبێ بیرمان نەچێ قورئان خۆی موعجیزەیە ئەگەرچی زانستیش هێشتا نەگەیشتبێتە تەفسیری هەندێ لە ئایەتەکانی ..

بێگومان ئایەت و موعجیزەکانی خوای گەورە زۆرن لە ناخ و دەروونی مرۆڤەکاندا، وە قورئان ئامارژە دەکات بەوەی کە خەڵکانی تر لە زانایانی ناموسڵمان زۆر شت کەشف دەکەن، هەنا وایان لێ دێ قەناعەتی تەواویان بۆ دروست دەبێ کە قورئان پەیامی خوای گەورەیە، وە ئەو زاتەش حەق و حەقیقەتە و زانایان لەسەرجەم بوارەکانی زانستدا ناتوانن نکوڵی لێ بکەن، ئەوەتە دەفەرموێت :

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْـَٔافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴿٥٣﴾ ﴾ فصلت .

مرۆڤ دەربارەی دروستکردنی جنۆکە لە بڵێسەی ئاگر هیچ جۆرە زانستییەکی نیە، تەنها سەرچاوەش کە بە راست و دروستی باسیان بکات قورئانە، باس لەوە دەکات کە خوای گەورە هەرخۆی دەزانێ چی دروستکردووە و لە چی دروستیکردووە و چۆنی دروستکردووە ..

ئەوەی کە دەیزانین دەستەی جنۆکە وەکو دەستەی ئادەمیزاد توانای ژیانیان لەسەر زەویدا پێدراوە، بەڵام نازانین چۆن دەژین و بەچی دەژین، بەڵام ئەوەی گرنگە کە قورئان باس لەوە دەکات کە ئەوانیش بەرپرسیارن وەکو لە سورەتی (الجن) و (الأحقاف) و لەم سورەتەشدا باس کراون.

خـوای گـەورە لـە سـورەتی(الرحمن)دا بـە ئاشـکرا روو بـە هـەردوولا دەدوێـت و نیعمـەتی بوونیـان هەریـەك لـە سەرچاوەی تایبـەتی خۆیـەوە بیردێنێتـەوە، ئەو بوونەی کە هەموو نیعمەتەکان بەوەوە پەیوەستن ئینجا هەمان ئەو ئایەتە پیرۆزە دووبارە دەکاتەوە : ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٣﴾ ﴾

*　　*　　*

﴿ رَبُّ ٱلۡمَشۡرِقَيۡنِ وَرَبُّ ٱلۡمَغۡرِبَيۡنِ ﴿١٧﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٨﴾ ﴾

(١٧) هـەر خـوای گـەورە خـۆی پـەروەردگاری هـەردوو ڕۆژهـەڵات و هـەردوو ڕۆژئاوایە (کە لە هەردوو وەرزی هاوین و زستاندا زۆر ئاشکران) .

(١٨) جـا ئـیتر ئـەی گـرۆی ئـادەمیزاد و پـەری ، بـەکام لـە نـازو نیعمەتـەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندو چاك نیە .

ئەمەش ئاماژەیەکە کە دڵ و دەروون ساڕێژ دەکات لە هەست کردن بە بـوونی خـوای گـەورە، ئـادەمیزاد روو لـە هـەرکوێ دەکـات، ئـاوڕ لـە هـەرکوێ دەداتـەوە، سەرنجی هەر ئاسۆیەك دەدات، کە هەڵهاتن و ئاوابوونی لێ دیار بێت، هەست بە شـکۆمەندی خـوای گـەورە دەکـات کـە هـەر خـۆی خـاوەن و پـەروەردگارو دەستەڵاتدارە و هەموو شتەکان و هەموو کاروبارەکان بە نور و ئاراستەو ویستی ئەو زاتە ئەنجام دەدرێت..

دەکرێ خوای گەورە مەبەستی لە بوونی دوو ڕۆژهەڵات و دوو ڕۆژئاوا هـەڵهاتن و ئاوابوونی خۆرو مانگ بێت، کە هەردووکیان دوو دانە نیعمەتی ئاشکرای خـوای گەورەن و هۆکارن بۆ بەرهەم هێنان و پەیدابوونی زۆر نازونیعمەت..

یاخود دەكرێ مەبەست هەڵهاتنی جیاوازی خۆر بێت لە زستان و هاویندا ـ دەكرێ هەردوو شێوازی باس كرابێت ـ
بەهەر حاڵ مەبەستی خوای گەورە لەم ئاماژەیەدا لاكردنەوەی مرۆڤەكانە لەوم دیاردانە، لەو سایەو سێبەرەی كە ئەو دوو دیاردەیە دروستی دەكەن ـ كاتێ كە بەر شاخ و كێوو دارو دروخت و شت و مەك و مرۆڤەكان دەكەون ـ ئینجا هەست كردنە بە زاتی خوا كە بەو هۆیەوە سێبەرەكان كورت و درێژ دەكات و دیمەنەكان دەگۆڕێت، لەوێشەوە بیركردنەوە لە گەردوون، لە ئەستێرە و هەسارەی بێ شومار، هەروەها هەست كردنە بە نوری پەروەردگارێتی و خاوەنداریەتی ئەو زاتە لەسەرجەم ئاسۆكاندا، لێرەو لەوێش، ئەو سوودو سەرمایەیەش كە دڵ و دەروون لە سەرئەنجامی سەرنجدان و تێفكران دەستی دەكەوێت لە بیركردنەوە و تەماشاكردنی رۆژهەڵات و رۆژئاواكاندا بریتی یە لە گۆڕانێكی ئەرێنی كە دەڕژێت بەسەر هەست و شعوردا، رۆح و دەروونی پێ پوخت و پاكیزە دەبێت.
دیارە كە خاوەنداریەتی و پەروەردگاریەتی خوای گەورە بۆ هەردوو خۆرهەڵات و خۆر ئاوا، هەندێكن لە نازو نیعمەتەكانی ئەو زاتە لەم گەردووونەدا، بۆیە ئایەتی :

﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾

جارێكی تر سەرنجی دەستەی ئادەمیزاد و جنۆكە رادەكێشێ تا هەردەم نازو نیعمەتەكانی پەروەردگاری بەخشندەیان لەیاد نەچێت و ببنە مایەی خێرو خۆشی بۆ سەرجەم دانیشتوانی سەر زەوی و بیركردنەوە كە هەر خۆرهەڵاتێك ئاوابوونێكی لەدوایە، وە ئەگەر ئەم دیاردە و نیعمەتە بوەستێ ئەوە ژیان كۆتایی دێت!!

جارێکی تر قورئان لەو ئاسۆ دوورانەوە دەمانهێنێتەوە بۆ زەوی و ئەو ئاوەی کە خوای گەورە دابینی کردووە لەسەری بە ئەندازەی پێویست، لە جۆری ئاوەکەو چەشنەکانی لە سروشتدا باس دەفەرموێت، کە سوودی جۆراوجۆری لێ وەردەگیرێت :

﴿ مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ ﴿١٩﴾ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ ﴿٢٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢١﴾ يَخْرُجُ مِنْهُمَا ٱللُّؤْلُؤُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٢٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٣﴾ وَلَهُ ٱلْجَوَارِ ٱلْمُنشَـَٔاتُ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَـٰمِ ﴿٢٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٥﴾ ﴾

(١٩) ئاوی هەردوو دەریای ڕەها کردووەو بە یەکی گەیاندون ، کەچی لە هەمان کاتدا تێکەڵیش نابن (ئەم دیاردەیە لە تەنگەبەری چیای (طارق) و (باب المندب) دا ئاشکرایە کە ئاوی دەریای سپی تێکەڵ بە زەریای ئەتڵەسی نابێت ، هەروەها ئاوی دەریای سور تێکەڵ بە دەریای عەرەب نابێت ، ئەو دیاردەیە بو بە هۆی موسوڵمان بوونی کاپتن کۆستۆی فەرەنسی ، زانای دەریاناس) ...

(٢٠) چونکە لە نێوانیاندا بەربەستێك لە تەوژمی ئاو هەیە نایەڵێت تێکەڵ بن .

(٢١) جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزاد و پەری ، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندوچاك نیە .

(٢٢) لەو دوو جۆر دەریایە مرواری و مەرجان دەردەهێنرێت ( کە دوو جۆر گەوهەری بەنرخن) .

(٢٣) جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزاد و پەری ، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندو چاك نیە.

(٢٤) ئەو کەشتیانەش کە بە دەریاکاندا وەك کەژو کێوی گەورە هاتوچۆ دەکەن هەر خوای گەورە خاوەنیانە (ئەو کانزیانەی لێی دروستکراون ، ئەو وزەیەی پێی دەڕۆن ، کەشتیەوانەکان ، وەستاو کرێکارەکان......تد) هەرهەمویان دروستکراوی خوای گەورەو بە توانان .

(٢٥) جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزاد و پەری ، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندو چاك نیە.

ئەو دووجۆر دەریایەی کە قورئان ئاماژەی پێدەکات دەریای سوێرو دەریای سازگارە، یاخود یەکەمیان مەبەست دەریاکانە ، دوهەمیش مەبەست روبارەکانە، جا هەر ئەو زاتە دەریاکان بەیەك دەگەیەنێت لە هەمان کاتدا تێکەڵیش نابن[١] .

دیارە دەریاکان رۆڵی بەرچاویان هەیە لە خزمەتی مرۆڤدا، بێگومان داپۆشینی رووکاری زەوی بەو پانتاییە فراوانە لە ناو بەرێکەوتو بێ مەبەست نیە، بەڕاستی ئەندازەگیرییەکی زۆر وردکراوە، پتر لە سێ بەش لە چوار بەشی گۆی زەوی داپۆشیوە هەموویشی پەیوەستە بە یەکترەوە، تەنها چواریەکی زەوی وشکانیە دیارە ئەم پانتایی یە پێویستە بۆ پاکژکردنەوەی هەوای زەوی و هێشتنەوەی بە پاکی تا بە کەڵکی ژیان بێت..

---

[١] کاپتن کۆستۆ زانای دەریاوانی فەرەنسی لە شەستەکاندا بەهۆی ئەم ئایەتەوە هیدایەتی وەرگرت، چونکە بۆی دەرکەوت لە تەنگەبەری (جبل طارق)و( باب المندب) دا لەژێرەوە تەوژمێکی ئاو هەیە نایەڵێت دەریای سپی تێکەڵ بە دەریای ئەتڵەسی بێ، هەروەها دەریای سوور تێکەڵ بە ئۆقیانوسی هندی بێ !!

کاپتن کۆستۆ وتبووی: خۆ محمد (ﷺ)دەریاوان نەبووە ئیتر چۆن ئەم نهێنی یەی زانیوە؟! ..

دیارە کە خوای محمد (ﷺ) دروستکاری دەریاکان لە قورئانەکەیدا ئەو زانیارییەی پێراگەیاندووە !!

هەرچەندە گازی زیانبەخشی زۆر بەردەوام ـ بەتایبەت لەم سەردەمەدا ـ بەرز دەبێتەوە و ئەو رێژەیەی کە بۆ ژیانی مرۆڤ پێویستە گۆڕانکاری بەسەردا نایەت، دیارە کە لە ئالیەت و میکانیزمێکی زۆر گەورە بەردەوام لەکاردایە، کە چەشنێکی سەرەکی ئەو دەریا و زەریا فراوانانەیە بۆ پاکژ کردنەوەی کەش و هەوا، کەواتە دەریا و زەریا و روبارەکانیش هەندێکن لە نازو نیعمەتی پەروەردگاری بەخشندە، کە یەکێك لەو نازو نیعمەتانەی کە لێیان دەردەهێنرێت مرواری و مەرجانە ..

مرواری شتێکی سەیرە ، لە سەرەتاوە زیندەوەرێکە لە قوڵایی دەریاکاندا دەژی لە قۆزاخەیەکی کلسیدا خۆی دەشارێتەوە تا لە مەترسی لەناوچوون خۆی بپارێزێت ! شایانی باسە ئەم زیندەوەرە جیاوازە لە زیندەوەرانی تر لە پێکهاتە و شێوازی ژیانیدا، چونکە تۆڕێکی وردی هەیە وەکو تۆڕی راوچی ، بەڵام بە شێوازێکی سەیر چنراوە، وەکو پاڵاوگە وایە رێگەی ئاو و هەوا و خۆراك دەدات تا بیخوات و نایەڵی لم و چەوو شتی تر پیایدا تێپەڕێت ، جا سەیر لەوەدایە لە پشتی تۆڕەکەوە خۆی مەڵاس دەدات تا بەهۆی دەمەکانیەوە بژێوی خۆی دابین بکات!!

هەر دەمێکی چوار لێوی هەیە، ئەگەر دەنکە چەوێکی بچوك، یان لمێك ، یان زیندەوەرێکی بچوك خۆی کرد بە قۆزاخەکەیدا خێرا ئەو زیندەوەرە مادەیەکی لینج دەڕژێ بەسەریداو دایدەپۆشێ، پاشان دەمەیێت و دەبێت بە مرواری!!..

مەرجانیش لە دروستکراوە سەیرو سەمەرەکانی خوای گەورەیە ئەویش لە قوڵایی (٥-٣٠٠مەتر)دا دەژی و خۆی دەبەستێ بە بەردێك یان چڵە گیایەکەوە،

دەمیشی لەسەروی جەستەوەیەتی، کە هەندێ شتی زیادەی پێوەیە، بەکاری دەهێنێ بۆ پەیداکردنی خۆراك، هەرکاتێك زیندەوەرێك بەر ئەو شتە زیادانە دەکەوێت، توشی شەلەل دەبێ و پەکی دەکەوێت، زیاتر لەو زیندەوەرانەن کە قەبارەیان بچوکە، وەکو کێچی ئاوی، ئیتر پێیدا دەنوسێ ، ئەوسا خوار دەبێتەوە بۆ ناو دەمی و دەیخوات ..

سەیر لەوەدایە نێرەکانی ئەم زیندەوەرە جۆرە خانەیەکیان لێ دەردەچێ کە دەبنە هۆی پیتاندنی هێلکۆکەکان، سەرەنجام هەر هێلکۆکەیەك وەکو کۆرپەلە وەکو باوانی خۆی دەلکێنێ بە بەردێك یان چڵە گیایەکەوە و بۆخۆی پێدەگات هەروەکو دایكو بابی!!

یەکێکی تر لە بەڵگەکانی دەستەڵاتداری و وردەکاری خوای گەورە ئەوەیە کە زیندەوەری مەرجان بە شێوازێکی تریش زۆر دەبێ ئەویش ئەوەیە کە لەگەڵ نەوەکانیدا پێکەوە دەلکێنو درەختێکی مەرجانی قەد ئەستور دروست دەکەن بە درێژی (٣٠سم) و بە تەنیشت یەکترەوە دورگەیەك لە مەرجانی زیندوو دروست دەکەن کە لە دەریاکاندا دەبینرێن بە رەنگی زەردی پرتەقاڵی، یان سورێکی گەش، یان شینێکی کراوە، یان خۆڵەمێشیەکی کاڵ. مەرجانە سورەکان رەق دەبن دوای مردنی بەشە زیندووەکانیان وەکو کۆمەڵە بەردی فراوانیان لێ دێت لە ژێر دەریادا!!

جا لەو کۆمەڵە بەردانە زنجیرەی گەورە و فراوان دروست دەبێت، وەکو ئەوەی کە لە سەرووی رۆژهەڵاتی ئوسترالیا دروست بووە و درێژی یەکەی (٢٣٥٠ میل)ە کە لە سەرەتاوە لەو زیندەوەرە بچوکانە دروست بووە!!

جا لەو مرواری و مەرجانە خشڵی زۆر بەنرخ دروست دەکرێت‌و دەبێتە هەندێ لەو نازو نیعمەتانەی کە خوای گەورە بیری مرۆڤەکان و جنۆکەکانیش دەهێنێتەوە ، تا قەدری نیعمەتەکانی پەروەردگاریان بزانن‌و دڵنیا بن کە هەموو ئەوانە دەستی قودرەتی خواوەندی جوانکار بەدی هێناوە .

پاشان خوای گەورە ئاماژە بە گشتی دەکات کە بە ئاسانی بە دەریاکاندا هاتوچۆیانە، هەندێکیان ئەوەندە گەورەن دەڵێی کەژ و کێون و کەچی زۆر بە ئاسانی هاتوچۆ دەکەن ..

﴿ وَلَهُ ٱلْجَوَارِ ٱلْمُنشَـَٔاتُ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَـٰمِ ﴿٢٤﴾ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٥﴾ ﴾

دیارە کە خوای گەورە خۆی دەکاتە خاوەنی ئەو کەشتیانەش، چونکە لە بنەڕەتدا هەر خۆی ئەو مادانەی بەدی هێناوە کە کەشتیەکانیان لێ دروست کراوە، هەر خۆی وزەی هەمەجۆری بۆ دابین کردووە، هەر خۆی ئەو مرۆڤانەی دروست کردووە کە وەکو ئەندازیار و کرێکار توانیویانە ئەو کەشتیانە دروست بکەن، پێشتریش هیچیان نەدەزانی بەڵام هەر زاتی خۆی توانای فێربوونی تێدا دابین کردوون، پاشان دەریاکانی واڵێ کردووە کە ئەو کەشتیە زەبەلاحانە بە ئاسانی هاتو چۆی لەسەر بکەن و لە قوڵایی دەریاو لەنێو شەپۆلەکاندا پارێزراو بن، کەشتیەکان تا ئێستەش گەورەترین نازو نیعمەتن بۆ بازرگانی و گەشت‌و گوزارو پەیداکردنی رزق‌و رۆزی هەمەجۆر، بۆیە رەوایە کە فەرامۆش نەکرێن‌و قەدری ئەو نیعمەتە گەورەیە بزانرێت‌و مرۆڤەکان بەدنمەك نەبن و پێزان بن‌و سوپاسی خوای گەورەی لەسەر بکەن .

جا ئێستە کاتێ ئەو گەشتە بەنێو گەردوونی بینراودا، بەنێو دروستکراوانی خوادا کۆتایی دێت، تارمایی هەرچی دروستکراوانە ون دەبێت، دنیا چۆڵ و هۆڵ و بێ زیندەوەران دەبێت، روخساری پیرۆزی خاوەندی هەربوو هەڵدێت، هەر تەنها خۆی دەمێنێ، تاکو تەنها لە شکۆمەندیدا بە هەموو دەستەڵات و توانا رەهاکانیەوە، ئینجا لە هەستو نەستی گوێ بیستانی قورئاندا حەقیقەتی مانەوەی بەردەوام جێگیر دەبێ، کاتێ کە سایە و سێبەری نەمان بەسەر هەموو شتێکدا دێت :

﴿ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ۝٢٦ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ ۝٢٧ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ۝٢٨ ﴾

(٢٦) هەرکەس لەسەر روکاری زەوی دەژی ، دەبێ لە ساتە وەختێکی دیاریکراودا کۆتایی بە ژیانی بێت و دەبێت بمرێت ، لە توێی خاکدا مەنزڵ بگرێت تا کاتێکی دیاریکراو).

(٢٧) سەرئەنجام تەنها پەروەردگاری تۆ دەمێنێتەوە کە خاوەنی بڵندی و شکۆمەندی و رێزداری یە .

(٢٨) جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزاد و پەری ، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندو چاك نیە.

* * *

لە ڕاستیدا لە سایەی ئەم دەقە قورئانیەدا هەناسە هێواش دەبێتەوە، دەنگەکان لەرزۆك و ئارام دەبن، پەل و پۆ لە جوڵە دەکەون، کاتێ کە تیاچوون هەموو زیندەوەرێك بگرێتەوە، هیچ جوڵەیەك نەمێنێو ئەم روداوانەش هەموو

ئاسمانەکان‌و زەوی بگرێتەوە، روخساری پیرۆزی شکۆمەندی هەربووی زاتی (ذو الجلال) هەموو ناخ‌و دەروونەکان هەموو کات‌و شوێنەکان دادەپۆشێت، ئەو کاتە و هەموو کات شکۆمەندی‌و سەنگینی و شایستەیی زاتی خۆی هەموو بونەوەر دادەگرێت ..

بەڕاستی دەربڕین‌و دەستەواژەکانی ئێمە ناتوانێ وێنای ئەو حاڵەتە بکات، ناتوانێ دەربڕینێکی جوانتر لە دەقە قورئانیەکە دابڕێژێت، کە بێدەنگی‌و ئارامی بە شێوازێکی ملکەچانە سارێژ دەکات، شکۆمەندی ئەو زاتە بونەوەر دادەپۆشێ، بێدەنگییەکی سامناك، دیمەنی نەمانی بێ جوڵەو چالاکی، دیمەنی مردن کە جوڵەی لە هەمووان بڕیوە، هیچ جوڵەو چالاکیەك لە گەردووندا نەماوە کە جاران پڕبوون لە جوڵەو ژیان، لە هەمان کاتدا بوونی هەمیشەیی و بەردەوام وێنا دەکات‌و دەینەخشێنێ بە مەرجێ مرۆڤ ئەزموونی مانەوەی هەمیشەیی نازانێ و نەیدیوە، بەڵام لە توێی ئەم دەقە سەرسوڕهێنەرە پیرۆزەدا بە قوڵی دەرکی ئەو حەقیقەتە دەکات!!

دیارە بەشوێن باسی ئەو حاڵەتە قوڵەدا بە هەمان ئایەت روو بە دەستەی جنۆکەو ئادەمیزاد حەقیقەتی نازو نیعمەتەکانی خوای گەورەیان دەهێنێتەوە یاد.. ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾

بەڕاستی بوونمان نیعمەتێکەو هەڵقوڵانی بوونی ئەو زاتەیە کە هەمیشەو بەردەوامە، یاساکانی، تایبەتمەندیەکانی ئاشکرایە، هەڵسەنگاندن‌و بەهاکانی‌و دەرەنجام و پاداشتەکانی روونە ـ بێگومان بوون لەگەڵ ئیمانی دامەزراودا، لەگەڵ خواپەرستی بەسۆز و جۆش و خرۆشدا چێژو واتای تەواو دەدا بە ژیان ـ

دیارە کە زاتێکی هەمیشە زیندوو؛ هەربوو، هەرچی بیەوێ دروستی کردووە و دروستی دەکات ، هەر خۆیشی داهێنەرە، ئەو دەیانپارێزێ و رۆزییان پێدەبەخشێ، هەر ئەویش لێپرسینەوە ئەنجام دەدات و پاداشتی ئامادەیە، هەر ئەوە کە لە ئاسۆی هەبووی خۆیەوە سەرپەرشتی جیهانی تیاچوو دەکات، کەواتە لە حەقیقەتی ئەو زاتەوە هەموو نازو نیعمەتەکان هەڵقوڵاون، لەڕاستیدا جیهان حەساوە نابێت و دنیا راست نابێتەوە هەتا باوەڕی دامەزراوی بەم راستی یە نەبێت، کە ئەو زاتەی کە بونەوەری هێناوەتە گۆڕەپانی بوون زاتێکی هەر بووە وهەر دەبێ و هەر دەمێنێ ـ پاداشتی باوەڕداران بە بەهەشت و بێباوەڕانیش بە دۆزەخ دەداتەوە ـ

جا لە حەقیقەتی مانەوەی هەمیشەیی خوای گەورە و نەمانی هەرچی دروستکراوانە، حەقیقەتێکی تر سەر هەڵدەدا، ئەویش ئەوەیە کە هەرچی دروستکراوانە لە مانەوە و بوونیاندا ئاتاجی زاتی تاک و تەنها و تاقانە و جێبەجێکاری هەموو پێویستیەکانە، دەستەڵاتی گشتگیرە و بالا دەستە هەروەکو فەرمویەتی :

﴿ يَسْأَلُهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ ﴿٢٩﴾ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٠﴾ ﴾

هەر کەس لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەمووی ـ بە زمانی حاڵ ـ داوای ئەنجامدانی پێداویستیەکانی خۆی دەکات، چونکە ئەو زاتە دەتوانێ سەرجەم داخوازییەکان ئەنجام بدات، رەوا نیە جگە لەو زاتە داوای ئەنجامدانی پێداویستیەکان لە کەسی تر بکرێت، چونکە لەناوچووە و دەمرێت، ئەوەی داوای پێداویستیەکانی لە خوای گەورە بکات نائومێدی ناکات و کەسیش داوای

ئەنجامدانی پێداویستیەکانی لە غەیری خوا ناکات مەگەر گومڕاو سەرلێشێواو بێت، چونکە کەسە تیاچووەکان دەتوانن چی بکەن بۆ تیاچووەکان، ئەوانەی خۆیان ئاتاجن دەتوانن چی بکەن بۆ تیاچووەکان، ئەوانەی خۆیان ئاتاجن دەتوانن چی بکەن بۆ ئاتاجەکان .

بەڵام ئەو زاتە پاك و بێگەردە هەموو ڕۆژو هەموو ساتێك، بەڵکو هەموو چرکەساتێك گۆڕانکاری بێ سنور لە گەردوون و بونەوەرو سەر زەویدا دەکات، بە ویست و فەرمانی خۆی، هەروەها هەموو مرۆڤێك بە تەنها؛ بەڵکو هەر ئەندامێك لە ئەندامەکانی جەستەی، هەر خانەیەك و هەر ئەتۆمێك دوور نیە گۆڕانکاری بەسەردا نەیەت، دروستکراوان چیان پێویستە بۆیان دابین دەکات، کاروباریان ڕێك دەخات، ئینجا چاودێریشیان دەکات لە کاتی ئەنجامدانی کارو فەرمانیاندا ..

ئەم حاڵەتە لە سەرپەرشتی سەوزبوون و زەرد بوونی هەموو گەڵایەك دەگرێتەوە، دەنکە تۆوێك لە تاریکایی ژێر زەویدا، تەڕبێ یان وشك، ئاگاداری ماسی هەیە لە ڕوبارو دەریاکاندا، کرمەکان لەژێر زەویدا، مێروو لە کون و کەلەبەرەکانیدا هەموو هێلکە و گەرایەك، هەموو جوجك و بێچوویەك، بەڵکو باڵەکانیان، پەڕەکانیان، خانەی جەستەیان ..

دیارە ئەو زاتەی کە ئاگاداری ئەم هەموو شتەیە لە بونەوەرەکەیدا هیچ شتێك فەرامۆش ناکات، ئاشکراو نادیار لای ئەو زاتە چونیەکە ..

پاشان خوای گەورە ئەم نیعمەتەش بیری گرۆی جنۆکە و ئادەمیزاد دەخاتەوە و دەفەرموێت :﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾

جا بە هۆی بڕیاردان و چەسپاندنی حەقیقەتی ژیانی بەردەوام دوای مردن، هەروەها حەقیقەتی ئەوەی کە هەموو خەڵك و هەموو دروستکراوان رویان لەو زاتە تاقانەیە کردووە کە هەمیشە و هەربووە، لەگەڵ پەیوەست کردنی ویستی ئەو زاتە پاك و بێگەردە بە سەرجەم دروستکراوانیەوە، هەروەها رێکخستنی کاروباریان، کە هەموو ئەوانە فەزڵ و بەخششی ئەون بەسەر بەندەکانەوە ..

ئیتر لەو روانگەیەوە نمایشی گەردوونی کۆتایی پێ دەهێنێ و کاتی لێپرسینەوەی گروپ و دەستەی جنۆکە و ئادەمیزاد دەست پێدەکات، بارودۆخێکی نوێ دەست پێدەکات کە هەڕەشە و گوڕەشەی لێ بەدی دەکرێت، هەڕەشەیەکی ترسناك و سامناك کە دڵ دێنێتە لەرزە و ئارامیی لێ هەڵدەگرێت، پێشەکییەکە رێنای سامناکی قیامەت دەخاتە بەرچاو کە هەردوو گرۆ و تاقمەکە دەگرێتەوە !

﴿ سَنَفْرُغُ لَكُمْ أَيُّهَ الثَّقَلَانِ ﴿٣١﴾ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٢﴾ يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ إِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا مِنْ أَقْطَارِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ فَانفُذُوا لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَانٍ ﴿٣٣﴾ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٤﴾ يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا شُوَاظٌ مِّن نَّارٍ وَنُحَاسٌ فَلَا تَنتَصِرَانِ ﴿٣٥﴾ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٦﴾ ﴾

(٣١) ئەی گرۆی ئادەمیزاد و جنۆکە . ئێمە رۆژێکی تایبەت تەرخان دەکەین بۆ لێپرسینەوەتان (دیارە کە خوای گەورە هەڕەشە لەم دوو دەستەیە لە دروستکراوانی دەکات ، کە لە هەندێ روەوە سەرپشکی کردوون و ئازادی پێ بەخشیون . کەچی زۆربەیان رێبازی یاخی بون و ستەم هەڵدەبژێرن ، قوڕ بەسەر یاخی و ناپوختەکان لەو رۆژەدا) .

(٣٢) جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزاد و پەری ، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندو چاك نیە.

(٣٣) ئەی گرۆی جنۆکەو ئادەمیزاد ئەگەر توانیتان بە مەملەکەتی ئاسمانەکان و زەویدا بگەڕێن و لە بۆشایی ئاسماندا بسوڕێنەوەو بە ناخی زەویدا بڕۆنە خوارەوە ، ئەوە ئازادن و هەوڵبدەن ، بەڵام دڵنیابن کە دەزگای ماددی پێشکەوتوو ، وە توانای مەعنەوی بەهێزی دەوێت (وەکو کەشتیە ئاسمانیەکانی ئەم سەردەمەو کەسانی مەشق پێکراو) .

(٣٤) جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزاد و پەری ، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و، کامەیتان لا پەسەندو چاك نیە (کاتێ پەری یە ئیماندارەکان گوێ بیستی ئەم ئایەتە بون هەموو جارێك دەیانوت: ئێمە باوەڕمان بە هەموی هەیە ئەی خوای میهرەبان).

(٣٥) هەرکاتێکیش لەو سنورەی کە بۆتان دیاریکراوە ترازان ، ئەوە بڵێسەی ئاگرو مسی تواوەتان تێ دەگیرێت ، ئیتر شکست دەخۆن و تیا دەچن و سەرکەوتوو نابن.

(٣٦) جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزاد و پەری ، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندو چاك نیە.

بەڕاستی رۆژێکی سامناكو ترسناكو تەکاندەرە، نە گرۆی جنۆکە و نە گرۆی ئادەمیزاد بەرگەی ناگرێت، کێوە سەختەکان بەرگەی ناگرن، ئەستێرەو هەسارەکان خۆی بۆ ناگرن!!

(ﷻ) خاوەنـدی شـکۆمەند، بـەهێزو بـەتوانا، دەسـتـەڵاتدارو گـەورە و بڵنـدو پایەدار؛ بەو هەموو شکۆیەی کە هەیەتی گۆڕەپانی مەحشەرو لێپرسینەوە ساز دەکـات بـۆ لێپرسـینەوەی ئـەم دروسـتکراوە بچـوك و لاوازو بـێ دەسـتـەڵاتانە، دەستەی جنۆکەو ئادەمیزاد؛ لە تویێی هەڕەشـەو تۆڵەسـەندندا ـ بەهۆی لاری و لاساری و سەرکەشیانەوە ـ بەڕاستی رووداوێکـی گـەورە و گرنگـە ، کارەساتە لەسەرو هەموو بۆچوون و گریمانەو توانایەکەوەیە ..

جـا وەنـەبێ خـوای گـەورە و پـاك و بێگـەرد سـەرگەرمی کـاری تـر بووبـێ و نەیپەرژابێ تا ئەو کاتە، بەڵکو ئەو زاتـە دەیەوێت ئـەو رووداوو پێشهاتە بخاتە چوارچێوەیەکەوە کە ئێمەی مرۆڤ لێی تێبگەین، بۆیە هەڕەشـەکە بە شێوازێکی ترسناکو تۆڵە ئامێز وێنا دەکات، هـەر بیرکردنـەوە لێـی ئادەمیزاد پـان و پلیش دەکاتـەوەو لـەناوی دەبات، چـونکە ئـەم بونـەوەرو گەردوونـەی بـە یـەك وشـەی کورت، تەنها بە فەرمانی بوون هێناوەتە کایەوە، وێران کردن و هەڵوەشانەوەشی تەنها یەك وشەی دەوێت کە لـە چاوتروکانێك کـەمترە، جا ئیتر دەبـێ حاڵی ئەم دوو دانە گرۆو دەستەیە چۆن بێت!! کاتێك خـوای گەورە تۆڵـەی ستەمکاری و تاوان و خوێن ڕشتن وگەندەڵی و گوناهـەکانیان لێ دەکاتـەوە، جا لـەو بارو دۆخە سامناکەدا پرسیاریان لێ دەکات : ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾

ئینجـا (تحـدا)یان دەکـاتی، تـا ئەگـەر دەتـوانن بـا گەشـت بکـەن بـە نێـو دروستکراوانی خوادا لە ئاسمانەکان و زەویداو وە ئاگاداریشیان دەکات کە ئەو کارەیان هۆکاری مەحکوم و بەهێزی دەوێت .. پاشان پێیان دەفەرموێت :

﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾

باشە داخۆ کەسیان جورئەتیان هەیە وەڵام بداتەوە و شتێك بڵێت ؟!

بەڵام هێرشی خواوەند بۆسەریان بەردەوامە، کە ئەگەر لە سنور دەرچوون ئەوە پارچە ئەستێرەی گڕدارو مسی تواوەیان تێدەگرێت و هەرگیز سەرکەوتوو نابن .. کەواتە :

﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾

ئەم رووداوە گەر پێش بێت زۆر لەسەرو ئەوەوەیە کە خەڵکی یان جنۆکە لەسەری راهاتوون، لە سەرو بیرو بۆچوونی مرۆڤ و هەموو دروستکراوانەوەیە، بەراستی وێنەیەکی تاک و سامناکە و هەڕەشەی وا لە قورئاندا تا ئێستا نەهاتووە.

*  *  *

ئینجا لێرەوە ، وە تا کۆتایی سورەتەکە باسی رووداوەکانی رۆژی قیامەت دەفەرموێت، هەر لە سەرەتای وێرانبوون و گۆڕانکاری یە گەردوونیەکانەوە تا دەگاتە باسی دیمەنەکانی سزادانی تاوانباران و پاداشت دانەوەی بڕواداران :

﴿ فَإِذَا ٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتْ وَرْدَةً كَٱلدِّهَانِ ﴿٣٧﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٨﴾ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُسْـَٔلُ عَن ذَنۢبِهِۦٓ إِنسٌ وَلَا جَآنٌّ ﴿٣٩﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٠﴾ يُعْرَفُ ٱلْمُجْرِمُونَ بِسِيمَٰهُمْ فَيُؤْخَذُ بِٱلنَّوَٰصِى وَٱلْأَقْدَامِ ﴿٤١﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٢﴾ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِى يُكَذِّبُ بِهَا ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٤٣﴾ يَطُوفُونَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ حَمِيمٍ ءَانٍ ﴿٤٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٥﴾ ﴾

(٣٧) ڕۆژێك دێت کە ئاسمان سور هەڵدەگەڕێت وەکو گوڵی سور لە ڕەنگدا ، وەکو ڕۆنی قرچاو لە ڕواڵەت و گەرمی و تواوەییدا ( کە ئەمەش قۆناغێکە لە قۆناغەکانی تێکچونی لە سەرەتای قیامەتدا) .

(٣٨) جا ئیتر ئەی گروّی ئادەمیزاد و پەری ، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندو چاك نیە.

(٣٩) ئەو ڕۆژە ئیتر هەمووشت ڕون و ئاشکرایە ، پرسیار لە گوناهەکانی ئینسانەکان و جنۆکەکان ناکرێت!! (قۆناغێکە لە قۆناغەکان ، هەر بەهۆی ڕوخساریانەوە جیا دەکرێنەوە) .

(٤٠) جا ئیتر ئەی گروّی ئادەمیزاد و پەری ، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندو چاك نیە.

(٤١) ئەوسا تاوانکارو تاوانباران هەر بە ڕوخساریاندا دەناسرێنەوە ، فریشتەکانی دۆزەخ دەستیان گیر دەکەن لە ناوچەوانیان و قاچیان و گلۆلەیان دەکەن و بە توندی فڕێیان دەدەنە ناو ئاگری دۆزەخەوە ...

(٤٢) جا ئیتر ئەی گروّی ئادەمیزاد و پەری ، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندو چاك نیە.

(٤٣) ئەوسا ئیتر پێیان دەوترێت: ئەمە ئیتر ئەو دۆزەخەیە کە جاران تاوانبارو تاوانکاران بڕوایان پێی نەبوو......

(٤٤) ئەوەتە چاك گیریان خواردووە لە نێوان ئاگرو ئاوی لە کوڵداو هەر دەخولێنەوەو ئەمسەرو ئەوسەر دەکەن .

(٤٥) جا ئیتر ئەی گروّی ئادەمیزاد و پەری ، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندو چاك نیە.

بەڵێ ! ئاسمان وەکو گوڵی سووری لێ دێتو ڕەنگی تێك دەچێت یاخود وەکو ڕۆنی قرچاوو شلی لێ دێت ..

دیارە هەموو ئەو ئایەتانەی کە دەربارەی گەردوون هاتووە لە سەرەتای بەرپابوونی قیامەتدا هەمووی ئاماژەیە بۆ ویرانی و گۆرانکاری یەکی گشتگیر کە هەموو گەلە ئەستێرەو هەسارەکان دەگرێتەوەو ئەم یاسایانەی کە ئێستا رایگرتون شیرازەی هەمووی تێك دەچێت، هەمووی لە خولگەکەی دەترازێت هەروەك لە سەرەتای سورەتی (الواقعة) و (القيامة) و (التكوير) و (الأنفطار) و (الأنشقاق) و گەلێ سورەتی تردا هاتووە..کە هەمووی بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە ویران کردنی گەردوون بە چەند قۆناغێکدا تێدەپەرێت مەگەر هەر خوای گەورە خۆی حەقیقەتی بزانێ و ئەوکاتە هیچ کەس نامێنێ گەر بشمێنێ کەس جورئەتی باوەرنەبوون و ئینکاری راستی یەکانی نیە!!

لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی قیامەتدا پرسیار لە تاوان و گوناهەکانی دەستەی ئادەمیزادو جنۆکە ناکرێت ، وا دیارە لێپرسینەوەی تاوانباران بۆ ماوەیەك کە مەگەر هەر خوای گەورە خۆی بزانێ؟ دوا دەخرێت،یاخود پشتگوێ دەخرێت و حسابیان بۆ ناکرێت!! دواتر خوای گەورە دەست بە لێپرسینەوە دەکات، بەلکو مۆلەت دەدات کە هەندی کەس پاکانە بکات!! .. هەندێ قۆناغیش هەیە کەس چرکەی لێوە نایەت ..

دیارە رۆژی قیامەت رۆژێکی تولانی و درێژەو هەموو ئەو بارودۆخانە تیایدا روودەدات، کە یەکێکیان ئەمەیە کە لێرەدا قورئان باسی دەفەرموێت .. ئەو رۆژە روخساری ئیمانداران و بەختەوەران سپی و جوان و گەشە، بەلام روخساری کافران و تاوانباران رەش و دیزو ترش و تالە .. لەو رۆژەدا کەس جورئەتی دەمە دەمی و قسەی بێ تام و دەمەهەراشی نابێت..

لەو رۆژەدا تاوانباران بە روخسارياندا دەناسرێنەوە ، دیارە فریشتەکانی سزا زۆر بۆیان داخ لـە دڵـن، بۆیـە چـنگ گـیر دەکـەن لـە چـڵەپۆپەی سـەریان و قولوقاچیان؛ گلۆڵەیان دەکەن و فڕێیان دەدەنە نێو ئاگری دۆزەخەوە ..

هەروەها ئەو دیمەنە ئاشکرا بێت و تاوانباران بەو شێوازە توندە فڕێ بدرێنە نێو ئاگری دۆزەخەوە، دەڵێی تەماشاچیان سەیری ئەو دیمەنە سامناکە دەکەن، بۆیە دەفەرموێت ئەمە ئەو دۆزەخەیە کە کاتی خۆی لە دنیادا تاوانبارو تاوانکاران بڕوایان پێی نەبوو، ئەوەتە سەیریان بکەن چۆن گیریان خواردووە لە نێوان ئاگر و ئاوی زۆر لەکوڵدا .. جا ئیتر کێ جورئەتی ئینکاری و بێ باوەڕی هەیە !!

ئینجا پـەردە دادەدرێتـەوە لەسـەر ئـەو تاوانبارانـەو پەردەیـەکی ئاوریشـم هەڵدەدرێتـەوە لـە سـەر بەختـەوەران، ئەوانـەی کـە لـە دنیـادا لـە لێپرسـینەوەی پـەروەردگاریان دەترسـان و حسـابی (جـدی)یان بـۆ دەکـرد، سـەیر کـەن، سـەنج بدەن، ئەو بەختەوەرانە لە چ نازو نیعمەتێکدان :

﴿ وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴿٤٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٧﴾ ذَوَاتَآ أَفْنَانٍ ﴿٤٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٩﴾ فِيهِمَا عَيْنَانِ تَجْرِيَانِ ﴿٥٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥١﴾ فِيهِمَا مِن كُلِّ فَٰكِهَةٍ زَوْجَانِ ﴿٥٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٣﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ فُرُشٍۭ بَطَآئِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَقٍ ۚ وَجَنَى ٱلْجَنَّتَيْنِ دَانٍ ﴿٥٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٥﴾ فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ﴿٥٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٧﴾ كَأَنَّهُنَّ ٱلْيَاقُوتُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٥٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٩﴾ هَلْ جَزَآءُ ٱلْإِحْسَٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَٰنُ ﴿٦٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦١﴾ ﴾

(٤٦) لەولاشـەوە بـۆ ئـەو بەختەوەرانـەی کـە کـاتی خـۆی لـە مـەقام و دیـداری پەروەردگاریان بیمیان هەبوو ، دەترسان لەوەی کە پەروەردگاریان لێ بڕەنجێت ، دوو دانە بەهەشتی رازاوەی پڕ لە باخی جوان ئامادەیە .

(٤٧) جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزاد و پەری ، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندو چاك نیه .

(٤٨) باخەکانیش پڕن لە درەختی گەڵا ئاسکی جوان کە میوەکانیان شۆڕ بۆتەوەو دیمەنێکی دڵڕفێنیان هەیە.

(٤٩) جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزاد و پەری ، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندو چاك نیه.

(٥٠) ئەو دوو بەهەشتە دوو سەرچاوەی سەرەکی ئاوی سازگاری تێدا جاری و ڕەوانەو بە ژێر درەختەکان و بە بەردەم کۆشکەکاندا تێدەپەڕن.

(٥١) جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزاد و پەری ، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندو چاك نیه.

(٥٢) لەو باخانەدا لە هەمو چەشنە میوەیەکی تێدایەو لە هەرچەشنەش دوو جۆری تایبەت خۆی دەنوێنێت .(بەقەبارە و رەنگ و تام و بۆنی جیاواز!!).

(٥٣) جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزاد و پەری ، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندو چاك نیه.

(٥٤) بەختەوەران لەو بەهەشتە خۆشانەدا لەسەر کورسی و قەنەفە ڕازاوەکان بە کەماڵی ئیسراحەت شانیان داداوە کە بە ئاوریشمی تایبەت ئاواخن کراون (دیارە بە بەرگی رازاوەی نەخشینیش ڕازێنراونەتەوە) لێکردنەوەی هەر میوەیەکیش نزیك و ئاسانەو درەختەکان خۆیان سەرفرودێنن بۆ ئەو بەختەوەرانەو میوەکانیان پێشکەش دەکەن !!

(٥٥) جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزاد و پەری ، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندو چاك نیە.

(٥٦) لەو بەهەشتەدا حۆری تێدایە کە تەنها بۆ هاوسەرەکانیان دەڕوانن و تەنها تەماشای ئەوان دەکەن و عەشقی ئەوانن ، پێش ئەمانیش نە ئادەمی و نە پەری دەستی لێیان نەکەوتووەو کەس توخنیان نەکەوتووەو لە گەڵیان جوت نەبووە .

(٥٧) جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزاد و پەری ، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندو چاك نیە .

(٥٨) ئەو حۆریانە لە جوانی و شەنگ و شۆخی و قەشەنگیدا دەڵێی یاقوت و مەرجانن (کە دوو جۆر گەوهەری بەنرخی جوانی نێو دەریان) .

(٥٩) جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزاد و پەری ، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندو چاك نیە.

(٦٠) (بێگومان ئەو بەهەشتە دەبەخشرێت بەو کەسانەی کە لە دنیادا چاك و چاکە کارو چاکە خوازبوون و خەمخۆری دین بوون بۆیە دەفەرموێت) مەگەر پاداشتی چاکەو چاکەکاریی ، چاکەو چاکەکاریی نیە؟!

(٦١) جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزاد و پەری ، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندو چاك نیە.

ئەمە یەکەمجارە قورئان باسی دووجۆر بەهەشت بکات، دیارە دوو پلەی جیاوازن بۆ دوو دەستەی جیاواز لە بڕواداران هەروەکو دواتر لە سورەتی (الواقعة)دا باسیان دەفەرموێت و دەستەیەکیان ئەوانەن کە زوو چوون بەدەم بەرنامەی خواوەو بەردەوام لە خەمی بڵاوکردنەوە و بانگەوازدا بوون بۆی، ئەوانە دووجۆر بەهەشتی نایابیان بۆ ئامادە کراوە..

دەستەیەکیشیان ئیماندارانی سادەن ، فەرمانەکان ئەنجام دەدەن و فەرزەکان بەجێ دێنن و خۆیان له حەرام لادەدەن و هەر کات گوناهێك، یان هەڵەیەکیان کرد خێرا پەشیمان دەبنەوەو تەوبەی راستەقینە دەکەن، خوای گەورە ئەوانیش بەهرەمەند دەکات بەدوو جۆر بەهەشت و نازو نیعمەت ..

به هەر حاڵ خوای گەورە بێ سنور دەوڵەمەندەو خاوەنی بەهەشتی زۆرو نازو نیعمەتی فراوانە.. با ئێمە هەوڵبدەین سەردانێکی خێرای ئەو دوو بەهەشتەی پلە یەك بکەین .. گوڵ و گوڵزاری ئەو دوو بەهەشتە قەدو لق و پۆپی درەختەکانی کورتەو به گەڵاو گوڵی جوان و رازاوە و شەونماوی رازێنراوەتەوە، باخچەکان و پەنجەرەی ڤیلاکان و ژوور و بەلەکۆن و هۆڵەکانی پێرازێنراوەتەوە له ئینجانەی زێڕ و زیوو کریستاڵدا ..

هەروەها له نێو باخچەکان و به بەردەم کۆشکەکاندا له سەرچاوەی دوو کانی گەورە و فراوانەوە ئاوی خوڕەم هەڵدەقوڵێ دیمەنی جوانی دڵرفێن دروست دەکەن ..

هەروەها له هەموو جۆرە میوەیەکی تام خۆش و بۆن خۆش و رازاوەی لێیە، هەر جۆرێکیشیان له شێوازو قەبارەدا یەکێکن بەڵام له تام و بۆندا جیاوازن، ناو بەناو لەسەر سینی ودەفری رازاوە دەیهێنن بۆ بەختەوەران ..

هەروەها نیشتەجێکانی ئەو بەهەشتانە لەسەر کورسی و قەنەفەی رازاوە به کەماڵی ئیسراحەت شان دادەن کە ناواختی ئاوریشمی ئەستورە ، داخۆ بەرگەکانی له چ جۆرە ئاوریشمێك بێت؟!

هەروەها درەختی بەرزو گەڵاجوان که میوەی گەش و رازاوەی پێوەیەو دەوری کورسی و قەنەفەکانی داوە، هەر کات بەختەوەران ئارەزووی هەر میوەیەك بکەن ، لق و پۆپی درەختەکان سەرفرو دێنن تا کامەیان به دڵە لێی بکەنەوە ..

هەروەها بەختەوەران تەنها نین بەڵکو هاوسەری حۆری گوڵئەندام لەگەڵیان دەژین کە عاشقی هاوسەرەکانیانن و چاو بۆ کەسی تر هەڵنابڕن، نە مرۆڤ و نە جنۆکە دەستی بەریان نەکەوتووە .. ئەوان دەڵێی یاقوت و مەرجانن لە ناسکی و جوانی و رازاوەییدا ..

ئەمانە هەموی پاداشتە بۆ ئەو کەسانەی کە لە لێپرسینەوەی خوایی دەترسان و حسابیان بۆ گەورەیی و شکۆمەندیی پەروەردگاریان دەکرد و هەمیشە هەستیان دەکرد کە ئەو زاتە چاوی قودرەتی لێیانەو ئاگادارە بە هەموو هەڵسوکەوتیان .. ئەوانە گەیشتوونەتە پلەی (احسان) کە پێغەمبەر (ﷺ) راڤەی کردووە بەوەی کە بریتی یە لە خواپەرستی بە شێوازێك؛ هەروەکو ئەوەی کە چاوت لە خوای گەورە بێت ! خۆ ئەگەر تۆ چاوت لەو نیە ، ئەو زاتە تۆ دەبینی و ئەو کاتەش پاداشتی ئەو خواپەرستی یەچاك و رێك و پێکە هەر بە چاکەو نازو نیعمەتی تێر و تەواو دەدرێتەوە پاشانیش دەفەرموێت : ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾

* * *

﴿ وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ ﴿٦٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٣﴾ مُدْهَآمَّتَانِ ﴿٦٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٥﴾ فِيهِمَا عَيْنَانِ نَضَّاخَتَانِ ﴿٦٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٧﴾ فِيهِمَا فَٰكِهَةٌ وَنَخْلٌ وَرُمَّانٌ ﴿٦٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٩﴾ فِيهِنَّ خَيْرَٰتٌ حِسَانٌ ﴿٧٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧١﴾ حُورٌ مَّقْصُورَٰتٌ فِى ٱلْخِيَامِ ﴿٧٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٣﴾ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ﴿٧٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٥﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ رَفْرَفٍ خُضْرٍ وَعَبْقَرِىٍّ حِسَانٍ ﴿٧٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٧﴾ تَبَٰرَكَ ٱسْمُ رَبِّكَ ذِى ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ﴿٧٨﴾ ﴾

(٦٢) جا بێجگە لەو دوو بەهەشتەی کە باسکران ، دوو بەهەشتی تریشمان ئامادە کردووە بۆ ئەوانەی کە پلەو پایەیان لە خوار نیشتەجێکانی بەهەشتی پلە یەکەوەیە .

(٦٣) جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزاد و پەری ، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندو چاك نیە.

(٦٤) ئەو بەهەشتانەش بەهۆی چڕی و جوانی باخەکانیانەوە سەوزێکی تۆخی ڕازاوە دەنوێنن .

(٦٥) جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزاد و پەری ، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندو چاك نیە.

(٦٦) ئەو بەهەشتانە دوو سەرچاوە ئاوی هەڵقوڵاوی سازگاری سەرەکیان تێدایە (کە بەژێر درەختەکان و بە بەردەم کۆشکەکاندا تێدەپەڕن) .

(٦٧) جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزاد و پەری ، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندو چاك نیە.

(٦٨) هەروەها درەختی میوەی هەمە جۆرو دارخورمای بەرداری هەمەچەشن و هەناری بەتامی مەزەداری هەمەڕەنگ و هەمە چەشنی تێدایە .

(٦٩) جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزاد و پەری ، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندو چاك نیە.

(٧٠) لەو بەهەشتەدا حۆری جوان و شۆخ و شەنگ و ڕەوشت بەرزی تێدایە .

(٧١) جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزاد و پەری ، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندو چاك نیە.

(٧٢) حۆری چاوگەش و چاورەش کە لە دەوارە تایبەتیەکان کە بۆ بەختەوەران ئامادە کراوە دوور ناکەونەوە (ئەڵبەتە هەر بەناو دەوارە ئەگینا مەگەر هەر خوای گەورە خۆی بزانێت ، چ جێگەو رێگەیەکی فراوان و خۆش و ڕازاوەیە هەروەکو پێغەمبەرﷺ لەفەرموودەیەکدا ئاماژەی پێفەرمووە .)..

(٧٣) جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزاد و پەری، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندو چاك نیە.

(٧٤) ئەو حۆریانە پێش ئەمان نە ئادەمی و نە پەری دەستی لێیان نەکەوتووەو کەس توخنیان نەکەوتووەو لە گەڵیان جوت نەبووە .

(٧٥) جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزاد و پەری ، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندو چاك نیە.

(٧٦) ئەو بەختەوەرانە لە جێگەو رێگەی خۆش و ڕازاوەدا شانیان داداوە ، کە بە پشتی و سەرینی سەوزباوی جوان و دۆشەکی نایاب و تایبەت نەخشێنراوە ، هەموو شوێنێکی بە فەرش و رایەخی تایبەت داپۆشراوە .

(٧٧) جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزاد و پەری ، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندو چاك نیە.

(٧٨) بەڕاستی موبارەك و پیرۆزو رێزدارە ناوی ئەو پەروەردگارە مەزنەی تۆ (ئەی محمدﷺ، ئەی ئیماندار) ، چونکە ئەو خوایە زاتێکە خاوەنی هەموو بەرزی و بڵندی و شکۆمەندیی یەکی بێ سنورە .

ئینجا نۆرەی باسی بەهەشتیانی پلە دوو دێت :

هەردوو بەهەشتەکە سەوزێکی تۆخ دەنوێنن بەهۆی بوونی دارو درەخت و کژ گیا و روەکی چڕەوە ..

دوو سەرچاوەشیان تێدایە کە بەردەوام هەڵدەقوڵێن ، لەم بەهەشتانەدا جۆرەها میوە و خورماو هەناری تێدایە، بەڵام لەوێ هەموو میوەیەك دوو جۆری هەیە ..
لەم بەهەشتانەدا حۆری جوان و چاك‌و پاكیزەیان تێدایە كە لە دەوارە تایبەتەكاندا - چاوەڕێی هاوسەرەكانیانن، ئەڵبەتە ئەوە هەر بەناو دەوارە، مەگەر هەر خوا خۆی بزانێ چەندە گەورە و فراوان و جوان و رازاوە و رێكوپێكەو چەندە كەل و پەلی جوانی تێدا رێكخراوە - ئەو حۆریانەش نە جنۆكە و نە ئادەمیزاد توخنیان نەكەوتوون‌و نزیكیان نەبوونەتەوە ..
نیشتەجێكانی ئەم دووجۆر بەهەشتەش بە كەماڵی ئیسراحەت لەسەر فەرش‌و رایەخی سەوزباو شانیان داداوە، (عبقر) بە واتای كەسانی زۆر وەستاو شارەزا دروستی كردوون - عەرەبەكانی ئەو سەردەمە شتی نایابیان دەدایە پاڵ دۆڵێك كە بە حسابی ئەوان جنۆكەی شارەزای لێیەوناوی (عبقر)بووە، ئێستەش بە كەسانی پسپۆڕ و زۆر شارەزا دەوترێ (عبقری ) -
پاشان بۆدواجار ئایەتە پیرۆزەكە دێت كە روو بە ئادەمیزادو جنۆكە دەفەرموێت : ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾

*            *            *

لەكۆتایی سورەتەكەدا ، دوای ئەوەی خوای گەورە باسی نازو نیعمەتە بێ شومارەكانی كرد لە گەردوون‌و لە دروستكراوانداو هەروەها لەو جیهاندا.
كۆتا ئایەت دێت كە تەسبیحات‌و ستایشی پەروەردگاری شكۆمەندو پیرۆزە ، رێزدارە و خاونی رێزەو رێزدەگرێ لە بەندە چاكەكانی
﴿ تَبَٰرَكَ ٱسْمُ رَبِّكَ ذِى ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ۝٧٨ ﴾

## ﴿ســـورەتی ( الواقــعة ) ﴾

ئەم سورەتە لە سورەتە مەکیەکانە کە گرنگی زۆر دەدات بە باسی عەقیدە و دەیەوێت گەورەیی دەسەڵاتی خوای پەروەردگار بخاتە ڕوو لە لایەك کە دەتوانێت زۆر بە ئاسانی قیامەت بەرپا بکات .. بۆیە لە سەرەتای ئەم سورەتەدا ئیمانداران دەکات بە دوو دەستەوە ، هەروەها لە کۆتایەکەیشیدا بۆ ئەوەی کە ئیمانداران پێشبڕکێ بکەن بۆ بەدەست هێنانی بەهەشتی پلە یەك ، لەلایەکی تریشەوە دەیەوێت سامناکی ئەو ڕۆژەو ئەو بەڵاو ئەشکەنجە و ئازارانەی کە خوای گەورە ئامادەی کردوە بۆ یاخی و سەرکەشەکان، بۆ تاوانبارو تاوانکارەکان، بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان بە بەرپابوونی قیامەت نیە بە ڕوونی بخاتە ڕوو ، وە دیمەنی ئازار وئەشکەنجەدانیان وەك فیلمێکی واقیعی لە توێی ووشە وئایەتە پیرۆزەکاندا بخاتە بەر دیدی سەرجەم مرۆڤەکان تا هیچ کەس بروبیانوی نەمێنێت ...

هەربۆیە هەر لەسەرەتاوە بە باسی ڕوداوە گەورە و سامناکەکە دەست پێدەکات کە تێکچونی ئاسمانەکان و زەوی لێ دەکەوێتەوە ، کە حەقیقەتێکی حاشا هەڵنەگرە ،

﴿إِذَا وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ ﴿١﴾ لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا كَاذِبَةٌ ﴿٢﴾ خَافِضَةٌ رَّافِعَةٌ ﴿٣﴾ إِذَا رُجَّتِ ٱلْأَرْضُ رَجًّا ﴿٤﴾ وَبُسَّتِ ٱلْجِبَالُ بَسًّا ﴿٥﴾ فَكَانَتْ هَبَآءً مُّنۢبَثًّا ﴿٦﴾﴾

زانایانی ئەستێرە ناسی و گەردونناسی تێکچونی هەسارەکان و تەقینەوەیان و دەرچونیان لە خولگەکانیان و پێکدادانیان وەکو شتێکی حەتمی باس دەکەن ،

ئەوکاتە بونەوەر هەمووی نەوی دەبێت و بڵند دەبێت، ژێرەو ژوور دەبێت ، شیرازەی تێك دەچێت زەوی تەكانێكی ترسناكی بۆ پێش دێت و بەتوندی دەلەرزێت و دەشڵەقێت ، کەژ و کێوەکان ووردو خاش دەبن و دەبنە تەپوو تۆز و خۆڵەمێش .

دیارە وەكو لە ئایەتی تردا خوای گەورە ئاماژەی پێ فەرمووە زەوی و ئاسمان بە شێوازێكی تر دروست دەكرێنەوە ، زەوی تەخت وساف و رێك دەكرێت ، ئینجا خوای گەورە سەرجەم نەوەكانی ئادەم زیندوو دەكاتەوە لەسەری وهەموان بەسەر سامیەوە دەڕوانن وخەڵكەكە بەش بەش دەكرێت و خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ وَكُنتُمْ أَزْوَٰجًا ثَلَٰثَةً ﴿٧﴾ ﴾

جا ئێوە دەبنە سێ دەستەوە : ﴿ فَأَصْحَٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ ﴿٨﴾ ﴾

دەستەیەكتان : دەستەی ڕاستەكانن ، ئەوانەی كە نامەی كردەوەكانیان بەدەستی ڕاست وەردەگرن، جا تو چوزانی ئەوانە چەندە دڵخۆش و شادومان و كامەرانن، چەندە ڕوخساریان گەش و ڕوونە .

﴿ وَأَصْحَٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ ﴿٩﴾ ﴾

لەولاشەوە : دەستەیەكی تر كە چەپەكانن ئەوانەی كە بە دەستی چەپیان نامەی كردەوەكانییان وەردەگرن .. جا تۆ چوزانی ئەوانیش چەندە پەست و غەمبار و دڵگرانن .

﴿ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ ﴿١٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴿١١﴾ فِى جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿١٢﴾ ثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ وَقَلِيلٌ مِّنَ ٱلْءَاخِرِينَ ﴿١٤﴾ ﴾

دەستەیەکی تریش لە ئیمانداران لە مەقام و شوێنی تایبەتدان ، ڕێز لێ گیراون زۆر دڵخۆش و شادومان و کامەرانن، چونکە ئەوانە هەر زوو چوون بەدەم بانگەوازی خواوە، کردیانە خەمی گەورەی خۆیان، زۆر هەوڵیانداو زەحمەتیان کێشا لە پێناوی گەیاندن و بڵاوبوونەوەیدا، ئەوانە لە هەموو سەردەمێکدا هەن بەڵام زۆربەیان لە ڕیزەکانی کاروانی پێشین ویەکەمدا بوون، ئەوانە لە نێو بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەتدا ژیانی پڕ لە شادی و کامەرانی دەبەنە سەر .

﴿ عَلَىٰ سُرُرٍ مَّوْضُونَةٍ ﴿١٥﴾ مُّتَّكِئِينَ عَلَيْهَا مُتَقَابِلِينَ ﴿١٦﴾ ﴾

ئەوانە لەسەر کورسی و قەنەفە ڕازاوەکان لەسەر چرپاو سیستەمی نەرمی نایاب بە کەماڵی ئیسراحەت شانیان داداوە و بەرامبەر یەکتر لە چاوپێکەوتنەکاندا دادەنیشن .

﴿ يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ ﴿١٧﴾ بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ﴿١٨﴾ لَّا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنزِفُونَ ﴿١٩﴾ ﴾

منداڵانی جوان و ڕوخۆش و چاو گەش و نەمر دێن بە دەوریاندا و قسەی خۆشیان بۆ دەکەن و سروودی بەتام بە ئاوازی دڵڕفێن دەچڕن ، هەروەها لەسەر سینی ئاڵتون و زێڕ کوپ و دۆلکە و سوراحی و کاسی تایبەتدا شەراب و شلەمەنی تام خۆش و بۆن خۆش و ڕەنگ جوانیان بۆ دێنن، بە ڕوی خۆشەوە پێشکەشیان دەکەن لە سەرچاوە تایبەتەکانەوە کە هەرگیز تەواو نا بێت، بێگومان شەرابەکانی بە هەشت نابنە هۆی سەرئێشە و ئێلنج دان و عەقڵ لە دەست دان .

﴿ وَفَاكِهَةٍ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ ﴿٢٠﴾ وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٢١﴾ ﴾

هەروەها لە هەر میوەیەك كە ئەوان هەڵیبژێرن و بە دڵیان بێت بۆیان دەگێڕن لەسەر سینی و دەفری نایاب، هەروەها لە گۆشتی هەر باڵندەیەك كە حەزی لێ بكەن و ئارەزوی بكەن ، بەشێوازی هەمە جۆر ئامادە كراوەوبۆیان دەهێنرێت و بەو پەڕی ڕێزەوە پێشكەشیان دەكرێت .

﴿ وَحُورٌ عِينٌ ﴿٢٢﴾ كَأَمْثَٰلِ ٱللُّؤْلُوِ ٱلْمَكْنُونِ ﴿٢٣﴾ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾

هەروەها لە پاڵ ئەو بەختەوەرانەدا هەمیشە حۆری چاو گەشی هاوسەریان ئامادەیە دەڵێی مرواری شاراوەو كەس نەدیون و هەرگیز خۆر لێی نەداون، جگە لە هاوسەرانی دونیا كە خوای گەورە سەر لە نوێ لە جوانترین شێوازدا دروستیان دەكاتەوە و شادیان دەكاتەوە بە هاوسەرەكانیان، هەروەها ئیماندارانیش لە ئافرەتان هەروەكو پیاوان لە هەموو ئەو ناز و نیعمەتانەی كە پێشكەش بە پیاوانی ئیماندار دەكرێت، ئەوانیش بەهرەمەند دەبن.

جا هەموو ئەو ناز و نیعمەتانە لە پاداشتی ئەو هەوڵ و كۆشش و خەبات و جیهادە دایە كە ئیمانداران جاران لە ژیانی دنیایاندا ئەنجامیان دەدا .

﴿ لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا تَأْثِيمًا ﴿٢٥﴾ إِلَّا قِيلًا سَلَٰمًا سَلَٰمًا ﴿٢٦﴾ ﴾

جا ئیتر لەو بەهەشتەدا ئیمانداران هەرگیز گوێ بیستی قسەی نابەجێ و تانەو تەشەرێكی نادروست و قسەو قسەڵۆكی بێ خێر نابن، بەڵكو بە ئارەزوی خۆیان و هەركاتێك بیانەوێت بە هۆكاری بوراق ئاسا سەردانی دایك و باوك و براو خوشك و كەس و كاری بەهەشتییان دەكەن، یاخود سەردانی پێغەمبەرانی ئازیز وزەحمەتكێش و ماندونەناس دەكەن، یاخود سەردانی ئیماندارانی

تێکۆشەروخەمخۆر دەدەن، ئەو بەختەوەرانە لە بەهەشتدا توشی هیچ هەڵە و گوناه و تاوانێك نابن ، خوشکانیش ڕەنگە حەز لە سەردانی دایکە حەواو ئاسیە خان و مەریەم خان و خەدیجە خان و فاتمە خان ودایکانی ئیمانداران بکەن ، هەموو سەردانەکانیش سڵاوکردن و وەڵامدانەوەی سڵاوە ، ڕێز وخۆشەویستی دەربڕینە ،میوانداریی بێ وێنەیە ..

سڵاو لە لایەن پەروەردگارەوە بۆ تاکە تاکەی ئیمانداران ئاراستە دەکرێت، سڵاو لە لایەن فریشتەکانەوە، سڵاوی بەهەشتیان لە یەکتری .

﴿ وَأَصْحَابُ الْيَمِينِ مَا أَصْحَابُ الْيَمِينِ ﴿٢٧﴾ ﴾

دەستەی دووەمیش بەهەشتیانی پلە دووە : ئەمانیش ئەوانەن کە کارنامەی خوا پەرستی و دینداری و چالاکییان دەدرێتە دەستی ڕاستیان، جا تۆ چوزانی ئەوانیش لە چ ناو نیعمەتێکدان ،

﴿ فِي سِدْرٍ مَّخْضُودٍ ﴿٢٨﴾ وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ ﴿٢٩﴾ وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ ﴿٣٠﴾ وَمَاءٍ مَّسْكُوبٍ ﴿٣١﴾ وَفَاكِهَةٍ كَثِيرَةٍ ﴿٣٢﴾ لَّا مَقْطُوعَةٍ وَلَا مَمْنُوعَةٍ ﴿٣٣﴾ ﴾

ئەو بەختەوەرانە هەمیشە لە سەیراندان لە ژێر سایەو سێبەری درەختی بێ دڕکدا، لە پاڵ درەختی مۆزی گەیویی بە تامی سەفتەکراودا ، سێبەری ئەو درەختانە تا چاو برکات درێژ بوەتەوە، ناو بەناویش حەوز و فوارەی جوان و ڕازاوە و هاژەی چەم و ڕووباری دیمەن جوان و تاڤگەی ڕازاوە، هاژەو خوڕەی دێت و دیمەنێکی جوان و قەشەنگ و دڵڕفێن پێکدە هێنن، تابلۆیەکی کەس نەدیو دەنەخشێنن ، هەروەها درەختی میوەی هەمە جۆر و زۆر و زەبەندە، کە

میوەکانی لێ نەکراونەتەوە و هیچکامی قەدەغە نیە، خۆیان سەر فرو دێنن بۆ بەختەوەران، هەرکات لێی دەخۆن خێرا دروست دەبێتەوە، تا دیمەنیان بە جوانی و ڕازاوەیی بمێنێتەوە .

﴿ وَفُرُشٍ مَّرْفُوعَةٍ ﴿٣٤﴾ إِنَّا أَنشَأْنَاهُنَّ إِنشَاءً ﴿٣٥﴾ فَجَعَلْنَاهُنَّ أَبْكَارًا ﴿٣٦﴾ عُرُبًا أَتْرَابًا ﴿٣٧﴾ لِّأَصْحَابِ الْيَمِينِ ﴿٣٨﴾ ثُلَّةٌ مِّنَ الْأَوَّلِينَ ﴿٣٩﴾ وَثُلَّةٌ مِّنَ الْآخِرِينَ ﴿٤٠﴾ ﴾

هەروەها لە بەهەشتەکانیاندا جێگە و ڕێگەی بەرز و جوانیان بۆ ئامادە کراوە، کۆشك و تەلار و ڤێلای هەمەجۆری پڕ لە کەل و پەلی ڕازاوە ، لەسەر لوتکەی چیاکاندا لە لاپاڵی کەژ و کێوە بڵندەکاندا خۆیان دەنوێنن، لەگەڵ حۆری یە تایبەتیەکان و ئافرەتە خواناسەکانی دنیا کە خوای گەورە سەر لە نوێ لە جوانترین شێوەدا دروستیان دەکاتەوە – ئەڵبەتە بەهەشت بە دڵی ئەوانیشە، هەموان پێکەوە لەگەڵ هاوسەرە بەهەشتیەکاندا ژیانی پڕ لە شادی و کامەرانی دەبەنە سەر و ئەوانیش وەك پیاوان لێی بەهرەمەند دەبن ، لە بەهەشتدا هاوسەران عاشقی مێردەکانیانن و زۆر یەکتریان خۆش دەوێت و هیچ کێشە و ناکۆکی و دڵ ئێشانێك ڕوو نادات ، بێگومان ئەو ناز و نیعمەتانە هەمووی بۆ ئەو بەختەوەرانەیە کە نامەی کردەوەکانیان بەدەستی ڕاستیان وەرگرت، چونکە لە تاقیکردنەوەی دنیادا دەرچوون وسەرکەوتنیان بەدەست هێنا .

شایانی باسە ئەو بەهرەیە خەڵکانێکی زۆر لە ئیماندارانی دێرین و سەرجەم نەوەکانی داهاتوو لە دینداران دەگرێتەوە .

﴿ وَأَصْحَابُ الشِّمَالِ مَا أَصْحَابُ الشِّمَالِ ﴿٤١﴾ ﴾

ئینجا خوای گەورە دێتە سەر باسی بەد بەخت و چارە ڕەشەکان، فێڵ باز و دەست بڕەکان، بێ دین و بەرەڵاکان و دەفەرموێت : - جادەستەی چەپەکان، نەگبەتەکان، ڕیسواکان مەگەر خوا بزانێت چۆن گیریان خواردووە !!

﴿ فِي سَمُومٍ وَحَمِيمٍ ﴿٤٢﴾ وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ ﴿٤٣﴾ لَّا بَارِدٍ وَلَا كَرِيمٍ ﴿٤٤﴾ ﴾

ئەوان لە نێوان بڵێسەی ئاگرو ئاوی زۆر لە کوڵدا ، لە سایەی سێبەری دوکەڵی چڕ و گەرم و خنکێنەردا، هەرساتەی سەد جار ئاواتی مەرگ دەخوازن گیریان خواردووە، چونکە کاتێ کە گڕ و گەرما زۆریان بۆ دێنێ، بەهەڵە داوان ڕادەکەن بۆ ژێر ئەو سێبەرەی کە ئەویش ئەوەندەی تر گەرم و سوتێنەرە ، ئازار و ناڕەحەتیە، نە تاوێك فێنکیان دەبێتەوە نە تاوێك دەحەوێنەوە .

﴿ إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَٰلِكَ مُتْرَفِينَ ﴿٤٥﴾ وَكَانُوا يُصِرُّونَ عَلَى الْحِنثِ الْعَظِيمِ ﴿٤٦﴾ ﴾

ئینجا خوای گەورە هەروەکو شێوازی هەمیشەیی، ئەم دیمەنانە وەك فیلم دەخاتە بەر چاوو باسیان دەفەرموێت و پاشان پەیوەستی دەکات بە کار و کردەوەی ئەو ناپوختانەوە لە ژیانی دنیایاندا، سا بەڵکو ئەوەی ژیرە زوو فر یای خۆی بکەوێت، پێش ئەوەی ئاوا گیرۆدە ببێت، بۆیە دەفەرموێت : ئا ئەمانەی کە ئێستا ئاوا گیریان خواردووە پێشتر لە دنیادا لە نێو ناز و نیعمەتی خوادا دەتلانەوە، بێ ئەوەی قەدری ئەو زاتە و نیعمەتەکانی بزانن، بەڵکو بەردەوام بەو زاتە دەگەفین و دژایەتی ئاین وبەرنامەو شوێنکەوتوانی ئیسلامیان دەکرد وتانە تەشەریان لێدەدان .

﴿ وَكَانُوا يَقُولُونَ أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَامًا أَئِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿٤٧﴾ أَوَآبَاؤُنَا الْأَوَّلُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾

جا چونکە ئەوانە بڕوایان بەقیامەت لەق بوو ، هەندێ جار دەیانوت : باشە کاتێ ئێمە بوینەوە بە خاك و ئێسك و پروسکی ڕزیوو و داتەپیو زیندو دەبینەوە؟! باوانی دێرینیشمان زیندوو دەکرێنەوە ؟!!

ئەو ناحاڵیانە بیریان نەدەکردەوە ، یاخود لە بیری خۆیانیان دەبردەوە، ئاخر پێشتر چی بوون ؟!! مەگەر لە نێو خاکدا پەرش و بڵاو نەبوون، پاشان لە بەرو بومی خاك دروست نەبوون و بە یاسایەکی ڕێکوپێك گەشەیان نەکرد ؟!!

بۆ بیرناکەنەوە، ئاخر ئەو زاتەی کە لە سەرە مێکوتە و هێلکۆکەیەك دروستی کردن، ئەو هەموو دەزگایەی تیادا دروست کردن مەگەر ناتوانێت دوای مردنیان سەر لەنوێ دروستیان بکاتەوە و زیندویان بکاتەوە ؟ !

﴿ قُلْ إِنَّ الْأَوَّلِينَ وَالْآخِرِينَ ﴿٤٩﴾ لَمَجْمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَاتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿٥٠﴾ ﴾

ئینجا خوای گەورە فەرمان دەدات بە پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەم حەقیقەتە ڕابگەیەنێت کە خەڵکینە دڵنیا بن کە هەمووتان پێشینان و پاشینانتان دەبێ ئامادەبن لە کات و ساتی دیاری کراودا ،

﴿ ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا الضَّالُّونَ الْمُكَذِّبُونَ ﴿٥١﴾ لَآكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ ﴿٥٢﴾ فَمَالِئُونَ مِنْهَا الْبُطُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾

ئەوسا بە گومڕاو سەر لێشێواوەکان دەفەرموێت : ئەی سەرگەردانەکان !! ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان بە پەیامەکانی من و باسی ئەم پێشهاتانە نەبوو، دەبێ لە بەرووبومی درەختی ژەقنە بوت بخۆن و سکتانی لێ پڕ بکەن ،

﴿ فَشَارِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ الْحَمِيمِ ﴿٥٤﴾ فَشَارِبُونَ شُرْبَ الْهِيمِ ﴿٥٥﴾ هَٰذَا نُزُلُهُمْ يَوْمَ الدِّينِ ﴿٥٦﴾ ﴾

ئەوسا ئاگر بەردەبێتە هەناوتان و ناچار دەبن داوای ئاو بکەن، ئاوەکەش ئاوێکی لە کوڵە ، بەڵام ناچارن وەکو وشتری تینو کە تێر ناخواتەوە ، هەر لێی دەخۆنەوە تا ناوسکتان دادەماڵێت .. قوڕ بە سەرتان ئا ئەوە حاڵتانە لە ڕۆژی

قیامەتدا، ئەگەر فریای خۆتان نەکەون، چونکە خوای گەورە بە وردی حاڵەکەی نەك تەنها باس فەرمووە ، بەڵکو وشەکانی قورئانی بە شێوەیەك دارشتوە دەڵێی ...لەمە و تەماشا دەکرێت ، ئیتر قسەتان نابێت و بۆتان نیە بڵێن: نەمانزانی و کەس پێی ڕانەگەیاندین، بە تایبەتی دەها ڕادیۆ و تەلەفزیۆن ڕۆژانە قورئان و واتاکانی بە چەندەها زمان دەدەن بە گوێی جەماوەر وخەڵکیدا، ئەگەر گوێ بگرن و تێفکرن و تێبگەن و داچڵەکێن و فریای خۆتان بکەون، دەتوانن سودی لێ وەربگرن.

بەشی دووهەم و ناوەڕاستی ئەم سورەتە دەیەوێت بیرو باوەڕ و عەقیدەی ژیرەکان دابمەزرێنێت بە تایبەت قیامەت و زیندوکردنەوە بە شێوەیەکی سانایی و ئاسایی کە کاریگەری هەبێت لەسەر دڵ و دەرونەکان و بە ئاسانی تێی بگەن .

﴿ نَحْنُ خَلَقْنَٰكُمْ فَلَوْلَا تُصَدِّقُونَ ﴿٥٧﴾ أَفَرَءَيْتُم مَّا تُمْنُونَ ﴿٥٨﴾ ءَأَنتُمْ تَخْلُقُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾

وادیارە ئادەمیزاد زۆر جار سەرەتای دروستبونی خۆی فەرامۆش دەکات، بیری دەچێت کە لەچی دروست بووە، بۆیە خودی خۆی دەکاتە هۆکار و بیری سەرجەم خەڵکان دێنێتەوە.

چونکە خەڵکی لەسەری ڕاهاتوون و جێگەی سەرنجیان نیە ، بۆیە دەیکاتە هۆکار و یادیان دێنێتەوە، کەبیر بکەنەوەو بە چاوی دڵ سەرنج بدەن، چونکە دەور وبەریان پڕە لە موعجیزەی بێ شومار و دیاردەی سەر سوڕهێنەر، دیارە خوای گەورە نایەوێت بیانداتە دەست ئەو موعجیزانەی کە بەسەر چوون، هەروەها ناشیەوێت خۆیان بگەڕێن بەشوێن وردەکاری دروستکراوەکانیدا وخۆیان لە وردەکاری دیاردە سروشتیەکان بکۆڵنەوە، هەروەها نایانداتە دەست

تیوری و بۆچونە فەلەسەفی و تیتۆڵبازی یە ئاڵۆزو بێ سەرو بنەکان کە هزر و عەقڵ و بیر و هۆش ماندو دەکەن و دڵە ڕاوکێ لە مرۆڤدا دروست دەکەن، بەڵکو دێت لە خۆیان و باسی خۆیان و دروستبوونی خۆیانەوە سەرنجیان ڕادەکێشێ بۆ دەستی پڕ قودرەت و جوانکاریی، پاشان ئاماژە دەکات بۆ دارو درەخت و کشتوکاڵ ئینجا ئەو ئاوەی کە پێی دێتە بەرهەم .

بەڕاستی هەر ئەو شتانەی کە بە سادە دێنە بەرچاو ئەگەر ئادەمیزاد نەختێ قوڵ بیر بکاتەوە دەبینێت هەمووی موعجیزەیە، هەمووی جێگای تێڕامانە هەمووی هۆکارن بۆ ئەوەی باوەڕی زۆر بە تین و بە هێزمان هەبێت بەو خالق و بە دیهێنەرەی کە ئێمەی بەدی هێناوە هەروەها هەموو ئەو شتانەی بۆ خزمەتی ئێمە فەراهەم هێناوە .

نەختێ قوڵ بیر بکەینەوە، دەبینین ، هەموو ئەو شتانە و هەموو دروستکراوانی خوای گەورە بە یاسای ڕێك و پێك دروست بوون و لە ناو دەچن و سەر لە نوێ پەیدا دەبنەوە .

زانایان و پسپۆڕان سەرسامن لە جوانکاری و یاساکانی، لە شتە وردەکان و گەورەکاندا لە جیهانی ئادەمیزاد و ڕووەك و مێروو، لە بێ گیان و گیاندارەکاندا ،مرۆڤەکان هەر ئەوەیان بۆ ماوەتەوە کە ساڵەها بخوێنن تا لە بەشێکی کەم و بچوکدا پسپۆڕیی بەدەست بێنن، چونکە ژیان و تەمەن مەودای ئەوە نادات کە لە چەند بوارێکدا پسپۆڕی بەدەست بهێنن و لە هەموو شتێکدا شارەزا ببن ..

جا چونکە قورئانیش بۆ هەموو چین و توێژەکانی مرۆڤایەتی یە، بۆ هەموو سەردەمەکانە، بۆ هەموو ئاستەکانە ، هەرکەس دەتوانێت بەشی خۆی لێ هەڵگۆزێ و بە قەدەر توانا و زیرەکی و زانستی خۆی بەهرەی لێ وەربگرێت .

بە ڕاستی ئەم قورئانە چاك توانیویەتی و دەتوانێت فیترەت و ناخی ئادەمیزاد بهەژێنێت .... چونكە ئەم بونەوەرەی لە ئەتۆم دروسستكردووە و ئەم هەموو شتە مادی یە سەیر و سەمەرانەی لێ بەدی هێناوە ، هەروەها خانەش كە بچوكترین بەشی جەستەی هەر زیندەوەرێكە ئەو هەموو زیندەوەرە سەیر و سەمەرەیەی لێ بەدی هێناوە، بە مەرجێ ئەتۆم زۆر ورد و بچوكە و بە میكرۆسكۆبیش نابینرێت ، خانەش بچوكە و بە میكرۆسكۆب گەر زۆر گەورە بكرێت دەبینرێت، سەیر لەوەدایە لەو ئەتۆمە بچوكە هەر لە سەر زەویدا چی دروست ناكرێت لە كەل و پەل و پێداویستی یە بێ شومارەكان، وە لەو خانەیەیش خوای گەورە چی دروست نەكردوە و لە ئەندامە جیاوازەكانی جەستەی ئادەمیزاد و گیانلەبەران و زیندەوەرانی سەر وشكانی و ناو ئاو ..

جا ئیتر لەوێوە قورئان هەوڵ دەدات عەقیدەیەكی دامەزراو، بیرو باوەڕێكی مەحكەم و بتەو، بەو خالیقە شكۆمەندە، بەو زاتە جوانكارە، بەو پەروەردگارە گەورەیە، لەناخی ئادەمیزاد دا دروست بكات و دایبڕێژێت .

﴿ نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ الْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ ﴿٦٠﴾ ﴾

پاشان دێتە سەر باسی مردن، دیارە كە هەموو ئەو شتانە ، هەموو ئەو دیاردانە لەبەر چاون، ئەگەر چی ئینسان لە ئەشكەوتا ژیا بێت، لە چۆنیەتی منداڵ پەیدابوون، لە كشتوكاڵ و ڕووەك، لە باران بارین، لە ئاگردان و ئاگر، لە دیمەنی كەسێك كە لەبەرچاوی ئەوانی ترەوە ماڵئاوایی دەكات و ژیان بەجێ دەهێڵێت !! لەو شتە سادانەی كە لەبەرچاو سادەن دەمانبات بۆ سەرنجدانی ئەستێرە و هەسارەكان، بۆ تەماشای گەلە ئەستێرەو خۆرە بێ شومارەكان، كە گەورەیی و

قەبارەیان بۆچون لە ئاستیدا کول وکۆڵە زانایانی ئەستێرە ناسی وا مەزەندە دەکەن کە هێشتا لە سەدا یەکیشیان بۆ دەرنەکەوتووە لە ئاسمانەکاندا !!

هەمویشیان بە شێوەیەکی ئەندازەیی و زانایانە دانراون لە خولگەی تایبەتی خۆیاندا، لەوێوە سەرنجی زانایان ڕادەکێشن بۆلای ئەو زاتەی کە ئەو هەموو دروستکراوە زەبەلاحەی بەدی هێناوە .

وەهەر زانست سەلماندویەتی کەئەو ئەستێرەو هەسارانە سەرەتایان هەیەو کۆتایشییان پێ دێت. وەتێوریە بێ سەرو بنەکانی مادەپەرستان بەدرۆ خرانەوە ،بەتایبەت کە گوایە: مادە سەرەتای نیە و کۆتایشی پێ نایەت !!

﴿ عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَٰلَكُمْ وَنُنشِئَكُمْ فِى مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾ وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْأُولَىٰ فَلَوْلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾

لەبەر ئەوە ئادەمیزاد دەپرسێت: باشە کێ بەدی هێناین؟ چۆن بەدی هاتین؟ بە چ یاسایەك کۆتاییان پێ دێت ؟

بەڵێ ئەو زاتەی کەئەم بونەوەرەی لەئەتۆم دروست کردوە، زیندەوەرانی لەخانەی زیندو بەدی هێناوە، هەر بەو شێوە سادەیە دەیەوێت عەقیدەیەکی پاك و بێگەرد ، بیەو باوەڕێکی قوڵ و دامەزراو لەناخی نەوەکانی ئادەمدا بەر پابکات، چونکە بەحەقیقەت هەر خۆی خوایەو هەرخۆشی چاك دەزانێت چۆن ڕێنمونی بەندەکانی بکات. تا ئازادانە باوەڕ بەگەورەیی و دەستەڵات و زانایی و دانایی و شکۆمەندی ئەو زاتە بکەن. هەربۆیە سەرەتا سەرنجمان ڕادەکێشێت بۆئەو ئاوەی کە نێرینە دەیرژێنێتە ناو منداڵدانی ئافرەتەوە، تا لەگەڵ هێلکۆکەیەکدا یەکبگرن کەهیچ کامیان ئاگایان لێی نیە ، تا لەگەڵ دانەیەك لەسەرە مێکوتەکان یەك بگرێت و سیفاتی بۆماوەیی چەندەها نەوە لەلایەن

نێرینەکەوە ، چەندەها ئەوەش لە لایەن مێینەکەوە سەرلەنوێ بەڕێژەی جیاواز سەر هەڵبداتەوە، جالەو خاڵە بچوکەدا لەو تاریکستانەدا خانەکان دەست دەکەن بەزۆربون، هەندێکیان پەیکەری ئێسك دروست دەکەن، هەندێکی خوێن ،هەندێك چاو ، هەندێك دەزگاکانی تری ناوەوە ، هەندێکی دەرەوە .....هتد. هەریەکەش لەجێی خۆیدا، ئەوانەی بەر پرسی چاون ناچن لەسەر سنگ دروستی بکەن ،ئەوانەی بەر پرسی گوێن ناچن لەسەر شان دایمەزرێنن. بێگومان دایك و باوك، ژن و مێرد، نێرو مێ، ئاگایان لەم کەین و بەینە نیە کاتێك دەزانن دوای نۆ مانگ منداڵێك بەدەم گریانەوە پەیدا دەبێت لەشێوازی ئادەمیزادێکی خنجیلانەی بێ دەستەڵاتدا .

پاشان یەکسەر باسی مردن و کۆتایی ژیان باس دەفەرموێت: کەئەوەش ئاماژەیە بۆکورتی ژیان، کە کۆتا مەنزڵ و حاڵەتی هەموو زیندەوەرێکە لەسەر ڕوکاری ئەم زەویە .. ئەوە حاڵەتێکی سامناکە، کەس لێی دەرباز نابێت ،هەمووکەس لە ئاستیدا دەستەوسانە. بەڕاستی ئەوەش نیشانەی دەستەڵاتی خوای گەورەیە،ئەوەش قۆناغێکە لە قۆناغەکانی بەردەوامی ژیان بەشێوازێکی تر. جا ئەو خودایە بەردەوام گۆڕانکاری لەسەر زەویەکەیدا دروست دەکات و بەیاسایەکی ڕێك وپێك یەکە یەکەمان دەباتەوە، جاری واش هەیە بەکۆمەڵ ئادەمیزادەکان دەگوێزرێنەوە بۆناو خاك و دەنێژرێن هەر وەك تۆوێك بۆماوەیەك لەناویدا دەمێننەوە تا لە گۆڕەپانی مەحشەردا سەر هەڵبدەنەوە بۆ محاسەبەو لێپرسینەوە .

بەڵێ ئا بەو شێوە سادەو ساکارە بەدیهێنەری ئادەمیزاد لەگەڵ فیترەتی هەر ئینسانێکدا دەدوێت و سەرنجی رادەکێشێ بۆلای خودی خۆی، بەدور لە ئاڵۆزی

و فەلسەفەی ئالۆز کە مێشکی ماندو بکات و نەگاتە نێو دەرونی و ناخی نەهەژێنێت .. بەراستی ئەوە هەر لەزاتی خواوەندی میهرەبان دەوەشێتەوە کەبەدیهێنەری بونەوەرە بە ڕێك و پێکترین شێوە، دروستکاری ئینسانە ،وەنێرەرو ڕەوانەکاری قورئانە .

﴿ أَفَرَءَيْتُم مَّا تَحْرُثُونَ ﴿٦٣﴾ ءَأَنتُمْ تَزْرَعُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلزَّٰرِعُونَ ﴿٦٤﴾ لَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَٰهُ حُطَٰمًا فَظَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ ﴿٦٥﴾ إِنَّا لَمُغْرَمُونَ ﴿٦٦﴾ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ ﴿٦٧﴾ ﴾

پاشان جارێکی تر هەربەو شێوازە سادەیە سەرنجی ئینسانەکان ڕادەکێشێت بۆلای کشتو کاڵ. بۆلای ئەو تۆوەی کە دەیچێنن .بۆلای ئەو نەمامەی کەدەینێژن، زۆربەیان بیری لێ ناکەنەوەو سەرنجی نادەن، تێنافکرن .. ئاخر خۆ تۆ بەدیهێنەری هیچ کام لەپێداویستیەکانی بەرهەم هاتنی ڕوەك نیت، نەتیشکی خۆر و نەخاکی زەوی، نەئاو نەهەوا، نەتۆو، نە نەمامەکە. ئەو هۆکارانەش کە زەوی پێ دەکێڵیت گەر بەوردی بیربکەنەوە هەر هەموی بەخششی خواوەندی میهرەبانن .. تۆتەنها تۆو دەچێنی و نەمام دەنێژی جاری واش هەیە تۆوەکە نایەتە بەرو نەمامەکە وشك دەبێت .

باشە کێ کارخانەی بەرهەم هێنانی کاڵەك و شوتی و خەیارو کولەکەو ....هتد. لەو تۆوە بچوکەدا ساز داوە ..

زانایانی ڕوەك ناسی دەڵێن گەر نهێنی وردەکاریەکانی دەنکە تۆوێك بخەیتە سەر لاپەڕەکانی کاغەز بەفۆنتی (١٤) پتر لە سەد ملێون لاپەڕە پڕدەکرێتەوە، کەچی من و تۆ وادەزانین ئەوە شتێکی سادەیە، ئەوە ئەگەر خوای گەورە نەیڕوێنێ و دەزگاسەر سوڕهێنەرەکانی و کارخانە نهێنیەکانی بەبێ دەنگ و بێ

گرمە وگاڵە کارنەکەن. کێ دەتوانێ بەرهەمداریان بکات .چونکە ئادەمیزاد هەرئەوەی لەدەست دێ کە ئەو تۆوەی کە خوای گەورە بەرهەمی هێناوە فڕێی بداتەناو خاکەوە ، ئیتر ڕۆڵی تەواو دەبێت مەگەر جارجارە ئاودێری بکات بەو ئاوەی کەئەویش مادەیەکی کیمیاوی سەرسوڕهێنەرەو ژیانی هەموو زیندەوەرانی پێوە بەندە .ئەو تۆوە لەجیهانی شاراوەی خۆیدا دەکەوێتە خۆی، وەکو شتێکی زۆرزان و شارەزا بە هەموو قۆناغەکانی گەورە بوون، دەبێتە چڵ ،دەبێتە گوڵ، نم دەکێشێ، خۆی هەڵدەپێچێ، هەندێکی بە بچوکی تامی خۆش نیە تا گەورە دەبێت هەیشە تامی بە بچوکی، ناسك و خۆشە ئەو تۆوە هەڵە ناکات. وەکو ئادەمیزادەکان هەڵە دەکەن، ئەوان لانادەن، وێڵ نابن ئامانجیان لێناشێوێت. دەستی قودرەتی خوایی نەخشەی بۆکێشاون ئەوان لەونەخشە سەر سوڕهێنەرە لانادەن، کە بۆچون لەئاستیدا کول و کۆڵ دەبوو ئەگەر مرۆڤ خۆی بەچاوی خۆی نەیدیبا .

بۆنموونە: گەر خۆمان قۆناغی پێگەشتنی دەنکە گەنممان نەدیبا، لەکوێ باوەڕمان دەکرد ئەوەگەڵای هەیەو گوڵ دەکات و جاری واهەیە دەبێتە حەوت گوڵ و هەر گوڵەش سەد دانە دەنکی تێدایە. دەنکە خورمایەك دار خورمایەکی لەناو خۆیدا شاردۆتەوە ،کاتێ دەینێژێت نهێنیەکانی خۆی دەردەخات . ئەوە ئەگەر ویست و دەستەڵاتی خوای گەورە نەیهێنێتە بەرهەم، دەبێتەچیلکە و چەواڵ دەبێتە پوش و پەڵاش، ئەوسا سەرتان سوڕدەمێنێ لە ڕەنجی بێ بەرو ماندوبوونی خەسارتان و دەڵێن : چاك ئەم ساڵ بێ بەش بوین و هەوڵەکانمان بەفیڕۆ چوو .

﴿ أَفَرَءَيْتُمُ الْمَاءَ الَّذِي تَشْرَبُونَ ﴿٦٨﴾ ءَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ الْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ الْمُنزِلُونَ ﴿٦٩﴾ لَوْ نَشَاءُ جَعَلْنَاهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ ﴿٧٠﴾ ﴾.

ئینجا خوای گەورە سەرنجمان ڕادەکێشێت بۆئەو ئاوەی کەسەرچاوەی ژیانەو ڕۆژانە چەندجار دەیخۆینەوە، یان لەگەڵ خواردن و خواردنەوەی تردا سودی لێ وەر دەگرین .. ئەو زاتە دەپرسێت: باشە ئێوە سەرنجی ئەو ئاوە نادەن کەدەیخۆنەوە ؟باشە ئەوە ئێوە لەسەرەتاوە دروستتان کردوە لەدوو ئەتۆم هایدرۆجین و ئەتۆمێك ئۆکسجین ،ئێوە یاسای بون بەهەڵم و چڕبونەوەو دابارینتان پێك هێناوە، ئێوە دەیکەنە بەفرو تەرزەو سەهۆڵ ؟خۆئەگەر خوای گەورە بیەوێت بەئاسانی دەیکاتە خوێیاو ئەوسا نە ئێوەو نەزیندەوەران و ڕوەك سودی لێنابینن و بەرەو تیاچون دەچن. شایانی باسە کەخەڵکانی دێرین ئاویان بەدی دەکرد کەلە هەورەوە دادەبەزێت و شارەزای یاساو نەخشەکانی باران بارین نەبون، کەچی جێگەی سەرنج و پێداهەڵدان و باس و خواسیان بوو لەهۆنراوەکانیاندا .ئێستەش کەزانست ڕوونی کردۆتەوە کەباران بارین بەیاسایەکی وورد دەبارێت حەق وایە خەڵکی زیاتر قەدری نازلکاری باران بزانن و بەدڵ و بەکوڵ سوپاسی بکەن تالە وشکەساڵی و کەم بارانی بەدوربن

﴿ أَفَرَءَيْتُمُ النَّارَ الَّتِي تُورُونَ ﴿٧١﴾ ءَأَنتُمْ أَنشَأْتُمْ شَجَرَتَهَا أَمْ نَحْنُ الْمُنشِئُونَ ﴿٧٢﴾ نَحْنُ جَعَلْنَاهَا تَذْكِرَةً وَمَتَاعًا لِّلْمُقْوِينَ ﴿٧٣﴾ فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ ﴿٧٤﴾ ﴾

دوای باسی ئاو سەرنجمان ڕادەکێشێت بۆلای ئاگر ..ئەوئاگرەی کە یەکەم جار ئادەمیزاد ڕێی لێ کەوت، زۆرسەر سام بوو پێی ،پاشان دەستی کرد بەسوود

وەرگرتن لێی، بۆئاسان کردنی ژیانی، چێشت لێنان وبرژاندنی خۆراکی، بۆ خۆ گەرمکردنەوە لە ڕۆژگاری سەرما و سۆڵەدا ،کەواتە حەق وایە مرۆڤ بپرسێت :کێ ئاگری دروست کرد ،کێ توانای سوتاندن و دانەوەی گەرمای لەڕوەکە جۆراو جۆرەکاندا، وەلەبەردی ئاسندا دروست کرد، کێ پێش ملیۆنەها ساڵ نەوتی بۆدروست کردین و لەنێو بۆشاییەکانی زەویدا بۆی هەڵ گرتین تالەم سەردەمەدا سودی لێ وەرگرین و ببێتە سەرچاوەیەکی گرنگ و بەنرخی وزە .جگە لەسەدەها سوودی تر کەلێی وەردەگیرێت. جا شایانی باسە بەم ئاگرەی ئێرە کەهەندێ جار دەبێتە هۆی کارەسات و سوتانی هەندێ کەس . ئاگری دۆزەخ بیری ئادەمیزاد دێنێتەوە تافریای خۆی بکەوێت و بە تەوبەو خواناسی و دینداری لە خۆی دووربخاتەوە .. هەروەها ئاگری دونیا هۆکارێکە بۆحەوانەوەی کاروان چیان و ئەو کەسانەی کەسەفەر دەکەن، بۆخۆگەرم کردنەوە و ئامادەکردنی خۆراکی هەمە جۆر ..

دوای ئەوە خوای گەورە دەیەوێت بیسەلمێنێت کە ئەم قورئانەی ئەوان باوەڕیان پێی نیە لەلایەن زاتێکەوە نازڵ بووە کەخاوەنی گەلە ئەستێرەی سەر سوڕهێنەرە ،زانایانی ئەستێرە ناسی سەرسام کردوە بۆیە دەفەرموێت : باسوێند نەخۆم بەخولگەو شوێنی ئەستێرەکان بێگومان ئەو سوێند خواردنە ئەگەر بزانن زۆر گەورەو شکۆمەندە .. دیارە سوێند خواردنی خوای گەورە بەو شتانە بۆسەرنج ڕاکێشانمانە ..

بێگومان ئەم قورئانە لەلایەن ئەو زاتەوەیە کەخاوەنی ئەو بونەوەرە فراوانەیە ،لەبەر ئەوە حەق وایە کەس سەر پێچی لە فەرمانەکانی نەکات و بەو بەڵگانەی کەئاماژەی پێ فەرمووە حەق وایە هەموان ملکەچ و فەرمان بەردار بن .

شایانی باسە ئەو سەردەمەی کە قورئانی تیادا نازڵ بوو ،ئەو خەڵکە کەلە ئەستێرەو کاکێشانەکانیان نەدەناسی ،تەنها ئەوە بوو کە لە شەودا ژمارەیەکی بێشومار ڕوناکی ووردیان دەبینی بەئاسمانەوە .. بەڵام ئێستا کەتەلەسکۆبی زەبەلاح دروست کراوەو هابڵ لەبۆشایدا دانراوەو بەردەوام وێنەی بوونەوەر دەگرێت و دەینێرێتەوە بۆسەر زەوی، وەلەوێوە بۆمان دەر دەخات کەکۆمەڵەی خۆری ئێمە بەشێکی بچوکە لەو گەلە ئەستێرەیەی کەلە ملیارێك ئەستێرە پترە، جا خوای گەورە ملیۆنەها گەلە ئەستێرەی لەو شێوەیەی لەبۆشایی بێ سنوردا بڵاو کردۆتەوە، کەئەوەندە بۆشاییەکە فراوانە ،کار کردیان لەسەر هێزی ڕاکێشان و موگناتیسی یەکتر نیە، وەکو دوو کەشتی، یەکێکیان لەدەریای ناوەڕاستدابێت و ئەوی تریان لە ئۆقیانوسی هێمندا بێت و بەیەك ئاڕاستەش بڕۆن چەندە دورە بەیەکدا بدەن، ئەوەندەش دورە ئەو گەلە ئەستێرانەو تاکە تاکەی ئەستێرەو هەسارە کان بەر یەکدی بکەون ( فسبحان الله رب العالمین وتبارك الله احسن الخالقین ) .

پاك و بێ گەردی بۆ ئەو خوایەی کە پەروەردگاری هەموو جیهانەکانە ، بەرز و پیرۆز و شکۆمەندە خوای جوانکاری بونەوەر ) .

جا سەیر لەوەدایە هەمویشی لە خزمەتی ئێمەدان ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٣﴾ ﴾ الجاثية

به دیمەنی جوانیان لە شەوگاردا ، بە ڕاگرتنی لەنگەری بونەوەر ، بە تیشکە بوونەوەریەکان بە کاریگەری ئیجابیان لەسەر ژیان .. هتد .

﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٞ لَّوۡ تَعۡلَمُونَ عَظِيمٌ ﴿٧٦﴾ إِنَّهُۥ لَقُرۡءَانٞ كَرِيمٞ ﴿٧٧﴾ فِي كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ ﴿٧٨﴾ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ ﴿٧٩﴾ تَنزِيلٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾﴾

بە ڕاستی باسی سوێند و نەخواردنی سوێندەکە شێوازێکی کاریگەرە بۆ سەرنج ڕاکێشانی ئادەمیزاد، چونکە ئەوەی کە خوای گەورە دەیەوێت سوێندی لەسەر بخوات زۆر ڕون و ئاشکرایە کە بریتییە لەوەی کە ئەم قورئانە :کتێبێکی گرنگە و پارێزراوە، فریشتەکان لە خزمەتیدان و تەنها دەستی پیرۆزی ئەوانی بەرکەوتووە، بەدوورە لە پۆخڵی شەیتانەکان جا وشەی (لا) بەربەستە لە بەردەم ئەوەدا کە کاری وا ڕوی دابێت، دەستی شەیتانەکانی گەیشتبێتێ، ئەمە (لا)ی قەدەغە کردن نیە ، چونکە ئێمە دەزانین کە ئەم قورئانە لە زەویدا کەسانی خواناس و دیندار دەستی لێ دەدەن و لە خزمەتی دان ، بە دوریش نیە لە دەست لێدانی بێ دین و کافرەکان ..

کەسانی دەست بە دەستنوێژ هەڵی دەگرن و دەوری دەکەنەوە، کەسانی ناپوختیش بە گواستنەوەی یان لە چاپخانەکاندا، یان لە کتێبخانەکاندا دەستیان بەری دەکەوێت .

بەڵام ئێمەی ئیماندار حەق وایە هەمیشە زۆر بە ڕێزەوە لە خزمەتی دابین و دەست بە دەستنوێژ نەبێ دەستی لێ نەدەین و بەبێ دەستنوێژ دەوری نەکەینەوە، مەگەر ناچار بین و بۆمان نەلوێت .

﴿أَفَبِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ أَنتُم مُّدۡهِنُونَ ﴿٨١﴾ وَتَجۡعَلُونَ رِزۡقَكُمۡ أَنَّكُمۡ تُكَذِّبُونَ ﴿٨٢﴾﴾

ئینجا لە شێوەی پرسیاردا ڕوو بە بێ دین و ناحەزان دەفەرموێت : لەگەڵ ئەم هەموو ڕونکردنەوانەدا ئێوە گومانتان هەیە لەم قورئانە، وە کارو کاسپیتان

بوەتە ئەوەی کە درۆ هەڵبەستن دژی و درۆ دەکەنە توێشوو بۆ قیامەتتان و بڕوانەبوون پێی بە پێشکەوتن و مەدەنیەت و شارستانی بون ئەدەنە قەڵەم ؟!

﴿ فَلَوْلَا إِذَا بَلَغَتِ الْحُلْقُومَ ﴿٨٣﴾ وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ ﴿٨٤﴾ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُبْصِرُونَ ﴿٨٥﴾ ﴾

باشە ، ئێوە بیر ناکەنەوە کە کاتێ گیان دێتە گەروتان ، کە هەمیشە بە تێپەڕبوونی کات بەڕێوەیە و لێی نزیك دەبنەوە وەکا یەخەتانی گرت، ئەوسا لرخە لرخ دەست پێ دەکەن ، شێوازتان تێك دەچێت ، زەرد هەڵدەگەڕێن ، لە تەنگانەیەکدان مەگەر هەر خۆتان بزانن چ تەنگانەیەکە ،خەڵکەکەی دەورو بەریشتان دە شڵە ژێن و دەحەپەسێن و دەستەوسانن، بەیەکدا دێن و لە خۆ دەدەن و گریە و زاری دەکەن ، کەس هیچی لەدەست نایەت و کەس هیچی بۆ ناکرێت، جا لەو ساتە وەختانەدا ئێمە بە زانست و زانیاری و دەستەڵاتمان لەو کەسەوە نزیکترین تا ئێوە ، بەڵام ئێوە نابینن، دیارە خوای گەورە دەیەوێت هەست و نەستی خەڵکە زیندوەکە کە ڕێگەیان لە حاڵەتی وا دەکەوێت، بهەژێنێت و زیاتر هەست بە دەستەڵاتی خوای گەورە و هەیبەت و شکۆمەندیی بکەن و چاکتر بگەڕێنەوە بۆ لای و هانای بۆ بەرن پێش ئەوەی ئەوانیش ئاوا گیرۆدە بن ، چونکە ئەوەتە ئەوکەسە نازدارەیان بە بەرچاویانەوە دنیا بەجێ دەهێڵێت و بەرەو ژیانێکی نوێ دەچێت و هیچ شتێکی بەدەست نەماوە ، تەنها ئیمان و باوەڕەکەی، لەگەڵ کارو کردەوەکانی هاوڕێیەتی دەکەن و لەگەڵێدان، جا یان بۆ بەهەشتی دەبەن ئەگەر باوەڕداری کردەوە جوان بوو، یاخود بۆ دۆزەخی دەبەن ئەگەر بێ دین و کردار ناپوخت بوو . ئەوسا خوای گەورە تەحەدایان دەکات و دەفەرموێت بە زیندوەکان :

﴿ فَلَوْلَآ إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ ﴿٨٦﴾ تَرْجِعُونَهَآ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾

ئەگەر ئێوە ئاوا بێ دەستەڵات نەبونایە هەوڵێکتان دەدا بۆ گێڕانەوەی بۆ ژیان، ئەگەر ڕاستە دەستەلات و لێهاتویەکتان هەیە ؟

جا ئا لێرەدا ئەگەر خەڵکی بێ دین تاوێك بیر بکەنەوە، دەبینن، زۆر دەستەوسانن، زۆر ناتەوانن، ئەوە ئیتر وا خۆشەویستەکەیان بە ناچاری دەگەڕێتەوە بۆ لای خالقی بەدی هێنەری بۆ لێپرسینەوە کەچی هیچیان لەدەست نایەت ، کەواتە ئەی بۆ بیرێك ناکەنەوە و فریای خۆتان ناکەون پێش ئەوەی سەرەی ئێوەش بێت .

ئینجا دێتەوە سەر باسی سەر ئەنجام و لە کۆتایی ئەم سورەتە پیرۆزەشدا ئەو خەڵکە دەکاتەوە بە سێ دەستەوە، دوو دەستەیان بەهەشتین و پلەو پایەی جیاوازیان هەیە ،بە هۆی ڕێژەی هەوڵ و کۆشش و خەم خۆرییانەوە بۆ ئاینی خوای گەورە و قورئانە پیرۆزەکەی، دەستەی سێهەمیش: دیارە کە دۆزەخیەکانن، جا بە نیسبەت دەستەی یەکەمەوە لە ئیمانداران دەفەرموێت :

﴿ فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٨٨﴾ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ ﴿٨٩﴾ ﴾

ئەگەر ئەو کەسەی کە لە سەرە مەرگدایە لە نزیکان و ڕێزدارانی لای خوای میهرەبان بوو، ئەوە دیارە کە دەکەوێتە ژیانێکی زۆر خۆش و سازگار و پڕ لە شادی و کامەرانی، شایەنی باسە وشە قورئانیەکان ئاسکی و شادومانیان لێ دەبارێت دەڵێی شەونمیان بەسەرەوەیە . ناز و نیعمەتەکان بێ شومارن، کەس نەدیون، بەهەشتەکان ڕازاوەن، پڕ لە ناز و نیعمەتی هەمە جۆری کەس نەدیون .

﴿وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٩٠﴾ فَسَلَٰمٌ لَّكَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٩١﴾﴾

ئەوانـەش کـە پلـە دوون، ئەوانـەن کـە کارنامـەکانیان بـە دەسـتی ڕاسـتیان وەردەگـرن، ئـەوانیش لـە لایـەن هـاوڕێ و هاوەڵەکانیانـەوە هـەر سـەلامیان لێ دەکرێت و ئەمانیش سەلام دەکەن و وەڵامی سەلام دەدەنەوە، جا ئیتر ئەو سەلام و سڵاوە لەکاتی سەرەمەرگدا، مەگەر هەر خوا بزانێت چەندە بە نرخ و پڕ بایەخە .ئیتر دڵان ئارام دەگرن و دڵنیا دەبن، چونکە ئەوە مژدەی عاقیبەت خێری یە، ئەمە جگە لەو پۆلە فریشتانەی کە دەستە دەستە دێن بۆ سەردانی هەردوو دەستە لە ئیمانداران و سڵاوو ڕێزیان پێ ڕادەگەیەنن و کار و کردەوە چاکەکانیان باس دەفەرموون و دڵخۆشیان دەکەن .

﴿وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٩٢﴾ فَنُزُلٌ مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٩٣﴾ وَتَصْلِيَةُ جَحِيمٍ ﴿٩٤﴾﴾

بەڵام قوڕ بەسەر ئەوانەی کە لە دەستەی چەپەکانن، لەوانەن کە بڕوایان بە بەرنامەی خـوای گـەورە و پێغەمبـەران و قورئانەکـەی و ڕۆژی زیندوبونـەوە نەبووە، گومڕاو سەر لێشێواو بوون، ئەوانە ئیتر دەگەیەنرێنە نێو ئاوی زۆر لە کوڵ و پاشان دەخرێنە نێو ئاگری سوتێنەری دۆزەخ، کە هەر لە سەرە مەرگەوە نیشانیان دەدرێت و لێی دەتۆقن و دڵنیا دەبن کە پاش تاوێکی تر ئەوە ئەو سەرەنجام و دەر ئەنجامەیە کە لە ژیانی دنیادا بۆ خۆیان دەستەبەریان کردووە، شایانی باسە پاداشت و سزاکان هەمووی بۆ نەوەکانی ئادەمە بە بێ جیاوازی لە نێوان نێر و مێیاندا، هەرکەس پابەندی کار و کردەوەی خۆیەتی، ڕوو بە ڕووی دەستپێشکەری خۆی دەبێتەوە .

﴿ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ حَقُّ الْيَقِينِ ﴿٩٥﴾ فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ ﴿٩٦﴾ ﴾

ئینجا لە کۆتایی سورەتەکەدا خوای پەروەردگار ئەوە دوپات دەکاتەوە و پشت ڕاستی دەکاتەوە  کە ئەوەی باس کرا لەم قورئانەدا بە گشتی و لەم سورەتەدا بە تایبەتی حەق  و حەقیقەت و ڕاستەقینەیە و حەق وایە ئەوەکانی ئادەم بە گشتی لێی دڵنیابن و دوو دڵ نەبن لە پێشهاتنی، هەر بۆیە تۆی ئیماندار هەمیشە بەردەوام لە نوێژەکانتداو لە کاتی تریشدا بڵێ ( سبحان ربي العظيم  ) واتە : تەسبیحات و ستایش و پاکی و بێگەردی هەر شایستەی پەروەرگاری خاوەن شکۆ و بەرز و بڵندی منە .

جا بە وروتنی ئەو ستایشە پیرۆزە تۆ فەرمانی پەروەردگارت ئەنجام دەدەیت لە هەموو کڕنوش بردنێکدا و دەڵێیت ( سبحان ربي العظيم وبحمده )

---

﴿ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ ﴿٢٠١﴾ ﴾
﴿البقرة﴾

پەروەردگارە لە دنیادا خێر و چاکە و نازو نیعمەتمان پێ ببەخشەو،
لە قیامەتیشدا لە نازو نیعمەتەکانی بەهەشت بەهرمەندمان بکەو،
لە سزای ئاگری دۆزەخ بمانپارێزە .

---

## ﴿ سورەتی (الحدید) ﴾

ئەم سورەتە بە شێوازێکی گشتی بانگەوازێکە بۆ کۆمەڵ و کۆمەڵگەی ئیسلامی تا لەناو خۆیدا ئیسلام پیادە بکات..

ئەمە حەقیقەتێکە کە دڵ و دەروونی خەڵکی وا لێدەکات کە بە دڵسۆزی و(اخلاص)ەوە بۆ بەرنامەو بانگەوازی خوای گەورە بژین، رەزیلی لە هیچ شتێکدا نەکەن و هیچ شتێك نەشارنەوە، بەڵکو ئامادەبن ماڵ و سامان و گیان لەپێناویدا ببەخشن، ناخ و دڵ و دەروونیان، هەمووشتێکیان بۆ دەستەبەرکردنی رەزامەندی خوای گەورە بەکار بێنن، ئەمەش ئەو حەقیقەتەیە کە وا لە مرۆڤ دەکات هەمیشە دڵی لای خوا بێت هەرچەندە هێشتا لە دنیادا دەژی، پێوەرەکانی پێوەری خوایی بن، ئەو بەهایانەی کە ئەم شانازی پێوە دەکات، ئەو بەهایانەن کە پێوەری کردەوە چاکەکانی پێ سەنگین دەبێت، ئەم حاڵەتەش وا دەکات کە حەقیقەتی خوای گەورە هەمیشە لە دڵەکاندا درەوشاوە بێت، هەر کە ناوی پیرۆزی هێنرا یادی بکات، بەردەوام هەست بە گەورەیی وشکۆمەندی ئەو زاتە بکات، موچڕکەی پیا بێت، هەوڵدەدات کۆسپەکان رادەماڵێ کە رێگرن لە بەرانبەر دەستەبەر کردنی رەزامەندی ئەو زاتەدا ..

جا لە روانگەی ئەو بنەما گەورە و راست و دروستەوە سورەتەکە کۆمەڵگەی موسڵمانان هاندەدات بۆ بەخشین لە پێناوی خوادا، بەخشینی گیان و ماڵ و سامان ..

جا لەگەڵ ئەو بەخشینە بێ وێنانەدا خوای گەورە داوا دەکات لە باوەڕداران کە ببنە کەسانێکی دڵ و دەروون بێدارو زیندوو کە هەمیشە هەست بە گەورەیی و

شکۆمەندی خوای گەورە بکەن، وە بە ئاگایی یەوە یادی بکەن و بەردەوام دڵیان سارێژ بێت لە سۆزو خۆشەویستی ئەو زاتە.

هەروەها لەم سورەتەدا خوای گەورە هەڵسەنگاندن دەخاتە بەرچاو دەربارەی نرخی دنیا و نرخی قیامەت بە پێوەری دروست، وە هانی باوەڕداران دەدات کە بیربکەنەوەو بزانن قازانجیان لەچیدایە؛ بۆ قیامەتیان ئەوە هەڵبژێرن..

لەلایەکی ترەوە پەیوەندی نێوان کۆچبەران و پشتیوانان کە جوانترین نموونە بوون لە بەرجەستەکردنی ئیمان و بیروباوەڕی پاك و بێگەردا، لە بەخشین و قوربانیدان بەگیان و ماڵ بەوپەڕی دڵسۆزی و لێبران و خۆدەربازکردن لە کۆت و زنجیرەکانی زەوی، وە لەو لەمپەرو کۆسپانەی کە حەزو ئارەزووەکان دروستی دەکەن و نایەڵن ئیماندار بە رێکوپێکی رێبازی خوای گەورە بگرێتە بەر، لەپاڵ ئەو دەستە پاکە ناوازە رێزدارەدا لە ریزی کۆمەڵگەی ئیسلامیدا دەستەیەکی تر هەبوون کە لەو ئاستە بەرزو پیرۆزەدا نەبوون،بەتایبەت ئەوانەی کە دوای رزگاری مەککە ودەرکەوتنی ئاینی ئیسلام بەڕوونی ، وە پۆل پۆل موسڵمان بوونی خۆیان راگەیاند، ئەوانە هەیانبوو بەجوانی لە حەقیقەتی گەورەیی و گرنگی ئیمان تێنەگەیشتبوو، وەکو ئیماندارانی پێشەنگ لە خزمەتیدا نەبوون و بۆ ئەو نەژیابوون و قوربانیان لە پێناویدا نەدابوو.

ئیماندارانی نوێ وەکو ئەوانەی بەردی بناغە نەبوون بەخشینیان زۆر نەبوو لە پێناوی ئاینی خوادا، ئەرکەکانی سەرشانیان بەرانبەر بە ئاینی نوێ بە سەخت دەزانی، تا رادەیەك دنیا کاریگەریی هەبوو لەسەریان، بە ئاسانی نەیاندەتوانی خۆیان لە کۆت و داوەکانی رزگار بکەن..

جا ئەم سورەتە هەوڵدەدات ئەوانە وهاوشێوەیان بە پانتایی زەمین و درێژایی زەمان پەروەردە بکات،تا خۆیان رزگار بکەن لە کۆت و زنجیرەکانی دنیا، وە بەرەو ئاستێکی ئیمانی بەرز، بڵند ببنەوە کە هەموو داخوازی یەکانی دنیا لە بەرانبەریدا بچوکەو، هەموو کۆسپێك رادەماڵێت!!

جگە لەو ئیماندارانە ، دەستەیەك لە کەسانی دووڕوو هەبوو، خۆیان تێکەڵی موسڵمانان کردبوو، لە ناخەوە باوەڕیان لاواز بوو لە رواڵەتیشدا موسڵمان بوون، هەندێ جار پڕوپاگاندەو دەنگوباسی ناباشیان لە نێوان موسڵماناندا بڵاو دەکردەوەو بۆ فرسەت دەگەڕان زیان بە موسڵمانان بگەیەنن .. بۆیە قورئان حاڵی ئیمانداران لە قیامەتدا لە بەرانبەر دووڕووەکانەوە لە گۆڕەپانی مەحشەرداو چارەنووسیان لە دۆزەخدا وێنا دەکات..

هەروەها سورەتەکە باسی ئەو جولەکەو گاورانە دەکات کە لە دورگەی عەرەبدا ماونەتەوە، بەتایبەت وێنای ناخی جولەکە دەکات و ئیمانداران هاندەدات کە وەکو ئەوان دڵ ڕەق و فاسق و خوانەناس نەبن..

بەڵام لە ئایەتی (٢٧)دا ستایشی هەڵوێستی هەندێ لە نەسرانیەکان دەکات، هەرچەندە زۆربەیان کەسانی فاسق و لە سنوور دەرچوون .

* * *

بێگومان مەبەستی سەرەکی سورەتەکە چاندنی حەقیقەتی ئیمانە لەنێو ناخ و دڵ و دەروندا، بەشێوازێك کە (خشوع)و (تقوی)و دینداری و خواناسی رەنگ بداتەوە لە کردارو گوفتاردا، وەك (اخلاص)و دڵسۆزی و لێبڕان و بەخشین و بەرخودان و قوربانیدان..

سورەتەکە هەوڵێکە بۆ پەروەردەکردن و بەرجەستە کردنی ئەو جۆرە کەسانە، چونکە بوونیان پێویستە لە هەموو کۆمەڵگەیەکی ئیسلامیدا، تا کاریگەرییان هەبێت لەسەر هەست و نەستی خەڵکانی تر..!!

سەرەتای سورەتەکە شێوازێکی کاریگەرو تایبەتی خۆی هەیە، دەدات لە تاڵ و ژێی دڵان بە کۆمەڵێك سیفاتی خوای پەروەردگار؛ کە دەیانەوێت کاریگەریی دابنێن لەسەر مرۆڤ و دڵسۆزی تێیدا بڕوێنن، لە سەرەنجامی هەست کردن بە گەورەیی و شکۆمەندیو خوایەتی ئەو زاتە تاكو تەنهایە کە دەسەڵاتی بەسەر هەموو بونەوەرەکەیدا هەیە، گەڕانەوەی هەموو کەس و هەموو شتێك هەر بۆلای ئەوە، لە هەمان کاتدا ئاگادارە بە نهێنیو پێچ و پەناکانی دڵ و دەروون، هەروەها دڵنیابوون دروست دەکات دەربارەی ئەوەی کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەر هەمووی تەسبیحات و ستایشی خوای گەورە دەکەن.

دیارە کە ئەم پێشەکیو سەرەتایە بەسە تا شتێك لە مەرامی سورەتەکە بزانین تا بچینە خزمەت ئایەتەکان بە شێوازێکی فراوانتر !

* * *

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ① لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ② هُوَ الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ③ هُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ④ لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الْأُمُورُ ⑤ يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَهُوَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ⑥ ﴾

**(١) هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە ستایش و تەسبیحاتی خوای گەورە دەکات ، ئەویش زاتێکە تەواو بالاّ دەستەو تەواویش دانایە .**

**(٢) هەر ئەو زاتە خاوەنی هەموو ئاسمانەکان و زەوی یەو ، هەرچیان تێدایە بەدیهێنراوی ئەوە ، مردن و ژیانیشی بەدەستە ، هەر خۆی دەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە .**

**(٣) ئەو زاتە یەکەمینەو سەرەتای نیەو هیچ کەس و هیچ شتێك پێش ئەو زاتە وجودو بونی نەبووە ، دواهەمین و کۆتایەو هیچ کەس و هیچ شتێك نامێنێت ، بەلاّم ئەو هەر دەمێنێت، هەروەها ئەو زاتە لە روانگەی دروستکراوی بێ شومارو هەمە چەشن و هەمە رەنگیەوە دیارو ئاشکرایە ، هەروەها ئەو زاتە لەبەر هەزاران هۆو حیکمەت نادیارەو بەچاوی سەر لە دنیادا نابینرێت ، (بەلاّم بە بینایی بیرو هۆش و دڵ و دەرون و فیترەت ئاشکرایە) هەر خۆیشی تەواو زانایە بە هەموو شتێك .**

**(٤) هەر ئەو زاتە خۆی ئاسمانەکان و زەوی لە ماوەی شەش رۆژدا دروستکرد (درێژی ئەو رۆژانە مەگەر خوای گەورە خۆی بزانێ ، رۆژ هەیە هەزار ساڵە و**

هەیشە پەنجا هەزار ساڵ و ...هتد) پاشان لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی خۆی وەستاو خۆی پایەدار کرد هەر خۆی دەزانێت چی دەچێت بە ناخی زەویدا و چیشی لێ دێتە دەرەوە ، چی لە ئاسمان دێتە خوارەوەو چیشی پیا دا سەردەکەوێت ، دڵنیاش بن کە لە هەرکوێیەکدا بن ئەو زاتە ئاگای لێتانەو لە گەڵتاندایە بە زانست و زانیاری خۆی ، هیچ شتێکی لێ ون نابێت ، ئەو خوایە تەواو بینایە بە هەموو کارو کردەوەکانتان .

(٥) خاوەنی هەموو ئاسمانەکان و زەوی یەو هەموو شتێك بۆ لای خوا دەبرێتەوەو هەموو شت بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوەو بە دەست ئەو زاتەیە(هەرچی بوێت، هەر ئەوە پێش دێت).

(٦) هەر خوای گەورە بەشێوازێکی رێك و پێك ، شەو تێهەڵکێشی رۆژ دەکات و رۆژیش تێهەڵکێشی شەو دەکات (بە درێژ بونی یەکێکیان و کورتبونی ئەوی تریان ، یاخود لە بەرە بەیان و ئێوارانا تێهەڵکێش دەبن) ، هەروەها ئەو زاتە تەواو زانایە بە هەرچی لە ناخی دڵ و دەرون و سینەکاندایە .

ئەم سەرەتایە هەڵبژاردەیەکی کاریگەرە، ئەو ژمارە زۆرە لە سیفاتو تایبەتمەندی خواوەندی باڵادەست و بە دەستەڵات بەسەر هەموو شتێکدا، ئاگادار لە هەموو شتێك ، زانا بە هەموو شتێك، داهێنەری هەموو شتێك لەچوارچێوەی ئاسمانەکانو زەویدا، ئاگادار بە هەموو نهێنیو شاراوەکانی ناو ناخو دڵو دەروون ..

ئەم سەرەتایە دڵان رادەوەشێنێ ناخ دەهەژێنێ، گەشتی پێدەکات لە هەموو بونەوەردا جگە لەخوای گەورە کەس بەدی ناکات، هەست بە کەسی تر ناکات،

ناتوانێ خۆی لێ بشارێتەوە، ناتوانێ لە دەستی قودرەتی خۆی قوتار بکات؛ ناتوانێ لە کات و ساتی خۆیدا نەگەڕێتەوە بۆلای، روو لە هەر کوێ دەکات نوری روخساری هەموو بونەوەری گرتۆتەوە..

بەڕاستی هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە ، هەر هەموویان تەسبیحات و ستایشی خوای گەورە دەکەن، ئەو زاتەی کە هەر خۆی بالادەستە و تەواویش دانایە..

سەرەتای ئەم سورەتە بەم شێوازە دەست پێدەکات، دەنگدانەوەی ستایشی دروستکراوانی خوا بە زمانی حاڵ و بە زمانی گۆیا نومایانە، هەموو شتێکی هۆشیار لە ئاسمانەکان و زەویدا دەیلێتەوە، هەرچی دڵە زیندووەکانە گوێ بیستی ئەو تەسبیحات و ستایشەن، رەنگە پێویستیش نەبێ ئەو دەقە بەشێوازی تر لێك بدرێتەوە، ئەوە زاتی خوایە هەندێ لە سیفاتە پیرۆزەکانی خۆی باس دەفەرموێت، ئێمە شارەزایمان لە سروشت و تایبەتمەندی و کاریگەریی ئەو سیفاتانە نیە، ئایەتەکە چی دەفەرموێت، هەر وایە و حەق نیە لێکدانەوەی تری بۆ بکرێت، چونکە دەکرێ ئێمە باوەڕمان وا بێت کە هەرچی لە ئاسمان وزەویدا هەیە، جۆرە زیندویەتیەکی هەبێت و بەدیهێنەری خۆی بناسێت و بەردەوام تەسبیحات و ستایشی بکات، هەروەها ئەزموونی هەندێ لە دڵان کاتێ کە پاك و بێگەردە و پەیوەستە بە حەقیقەتی شتەکانەوە و پشتی شێوازو رواڵەتەکان دەبینێ ، هەست بەو حاڵەتە دەکات..

لەقورئاندا هاتووە کە خوای گەورە فەرمانی داوە بە کێوەکان و باڵندەکان کە تەسبیحات و ستایشی داود پێغەمبەر(علیە السلام)بڵێنەوە ..

پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمویەتی: من بەردێك دەناسم لە مەککەدا لە سەرەتای ڕەوانە کردنم شەوانە سڵاوی لێ دەکردم ..

پێشەوا عەلی(ﷺ) دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەردا دەگەڕاین بە هەندێ شوێنی مەککەدا، ڕووی لە هەر درەخت و کەژێك بکردایە دەیوت : {السلام علیك یا رسول الله }.

( انس)یش دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) هەندێ جار پاڵی دەدا بە قەدی درەختێکەوە، کاتێ کە دوانگەیان بۆ دروست کرد، گوێ بیستی قەدەکە بووین وەکو وشتر دەینالاند، پێغەمبەر (ﷺ) دابەزی و چوو دەستی بەسەردا هێنا، ئینجا بێدەنگ بوو!!

ژمارەیەکی زۆریش ئایەتی ڕوون و ئاشکرا هەیە کە لەم حەقیقەتە دەدوێت بۆ نموونە : ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالطَّيْرُ صَافَّاتٍ ۖ كُلٌّ قَدْ عَلِمَ صَلَاتَهُ وَتَسْبِيحَهُ ...(٤١) ﴾ النور .

﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَسْجُدُ لَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ وَالنُّجُومُ وَالْجِبَالُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ النَّاسِ ...(١٨) ﴾ الحج .

﴿ ...وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ...(٤٤) ﴾ الأسراء .

کەواتە پێویست ناکات ئەو ئایەتانە بە شێوازێکی تر تەفسیر بکرێن، چونکە حەق وایە بۆچوونمان تەنها لە بەدیهێنەری ئەم بونەوەرە وەربگرین چونکە ئەو زاتە تەواو باڵادەستەو تەواویش دانایە، باڵادەستیشی ئاشکرایە و ئەوپەڕی حیکمەتی تێدایە، چونکە دەستەڵاتی ڕەهایەوهەموو شتێکی لەچوارچێوەی دانایی وحیکمەتی خۆیدا ڕێك خستووە..

سەیر لەوەدایە کە هێشتا دڵی مرۆڤی باوەڕدارلە بەهرەی ئەو دەقەی پێشوو تێر نەبووە، لە باسی فیستیڤاڵی بوونەوەر کە تەسبیحاتی خالق و بەدیهێنەری دەکات سەرسامی تەواو نەبووە ، بە ئایەتی دواتر گەشتێکمان بە ئاسمانەکان و زەوییەکەیدا پێدەکات و خاوەنداریێتی خۆی بۆیان دووپات دەکاتەوە، جگە لەوەش ژیان و مردن هەر بەدەست ئەو زاتەیەو ، دەستەڵاتی ڕەهای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە..

بەڕاستی ئەو زاتەی کە لە نەبوون ئەم گەردوونەی بەدیهێناوە، ئەم ئاسمان و زەوی یەی سازاندووە، وە خاوەنیەتی بە هەمو شێوازێك، هیچ هاوتا و شەریکیشی نیە، شتێکی ئاساییە کە هەموو ئەو شتانەی ئەو بەدیهێناون بەردەوام سوپاس و ستایشی بکەن بەتایبەت کە ژیان و مردنیشی بەدەستە، بەڵکو دروستکاری دیاردەی ژیان و مردنە، ئەو کاتی ژیان و کاتی مردنی بۆ هەموو زیندەوەرێك دیاری کردووە، هەرچی ئەو بیەوێ هەر ئەوە پێش دێت..

لەڕاستیدا ژیان شتێکی سەیرە سەرچاوەکەی جێگەی سەرنجە، کەس ناتوانێت چۆنیەتی و شێوازی پەیدابوونی دیاری بکات، هەروەها حەقیقەتی دەرك ناکرێت، قورئان دەفەرموێت ئەوە هەر خوایە کە ژیان بەخشە، کەس ناتوانێ بڵێ من دەیبەخشم، مردنیش وەکو ژیان سروشتی نادیارە ، کەس ناتوانێ پێشی بێنێ بەبێ ویستی خوای گەورە ، لەڕاستیدا ئەم دوو دیاردەیە نیشانەی دەستەڵاتی بێ سنور و ڕەهای خوای گەورەیە کە خاوەنی ئاسمانەکان و زەویشە و دەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، ئەوەی ئەو زاتە بیەوێ هەر ئەوە پێش دێت هیچ شتێك ناتوانێ سنوری بۆ دابنێت..

شایانی باسە هەرچی بە بیرو بۆچوونی خەڵکی ببێتە هۆکار بۆ سنوردانان بۆ ویست و ئیرادەی خوای گەورە ، شتێکی نادروستو ناتەواوە، لەوە سەرچاوە دەگرێت کە توانای بیروبۆچوونەکانی سنوردارن، چونکە ئەمەی کە خوای گەورە یاسا و ڕێسای داناوە لەم بونەوەرەدا بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارو پێشهاتەکان ئەویش هەر لەچوارچێوەی ویستی بێ سنوری ئەو زاتەدایە، چونکە هەر خۆی ئەویاساو ڕێسایانەی هەڵبژاردووە وبەبێ هیچ کۆت و بەندێك، ویستی خوای گەورەش لە سەرو هەموو ئەو یاساو ڕێسایانەوەیە کە هەر خۆی دایناوە..

قورئان بە ئاشکرا زۆر باس لەوە دەکات کە ویستی خوای گەورە لە سەرو هەموو ویستەکانەوەیەو هیچ شتێك ناتوانێ سنورداری بکات، بۆ نموونە حەقیقەتی مانەوەی بەهەشتیان لە بەهەشتاو دۆزەخیان لە دۆزەخدا بۆ هەمیشە و هەتا هەتایی، لە هەردوو حاڵەتدا پەیوەست دەکات بە ویستو بڕیاری خۆیەوە کاتێ کە دەفەرموێت : ﴿...مَادَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ...﴿١٠٨﴾﴾ هود .

کەواتە ئیماندار دەبێ هەموو بیرو بۆچوونەکانی لە قورئان هەڵگۆزێت چونکە ئەو زاتە خۆی یاسا و ڕێساکانی داناوەو زۆر بە ئاسانی دەتوانێ پێچەوانەکەی بکات، هەر بۆیە هەردەم شایستەی تەسبیحات و ستایشە.

* * *

جا سەیر لەوەدایە هێشتا مرۆڤ لەم حەقیقەتە گەورەیە بە تەواوەتی تێنەگەیشتووە، قورئان حەقیقەتێکی گەورەی تر دەدا بە گوێیدا، ئەویش ئەوەیە کە هیچ شتێك لەم بونەوەرەدا بەردەوامی نیە، جگە لە زاتی خوا، کە گەمارۆی هەموو شتێکی داوە وزانایە بە هەموو شتێك!

ئەو زاتەی کە یەکەمینە و هیچ کەس و هیچ شتێك پێش ئەو زاتە نەبووە، دواهەمینەو هیچ شتێك بەدوای ئەو زاتەدا نایەت، دیارو ئاشکرایە لە روانگەی دروستکراوانیەوە کەسیش لە سەرویەوە نیە، نادیارو پەنهانە و بە چاوی سەر لە دنیادا نابینرێت و بێجگە لەو هیچ شتێك نامێنێت..

سیفاتی یەکەمین و دواهەمینی ئەو زاتە حەقیقەتی زەمان دەپێچێتەوە ، هەروەها سیفاتی ئاشکرابوون و پەنهان بوونی حەقیقەتی شوێن و مەکان دەشارێتەوە، کەواتە لەم بونەوەرەدا هەر ئەو زاتە هەیەو، هەرچی هەیە تەمەندار و سنوردارە..

هەمووشت بەرهەمی دەستی قودرەتی ئەو زاتەیە، هەتا ئەو دڵانەی کە هەست بەم حەقیقەتو راستیانە دەکەن، بەشێکن لە دروستکراوە سنوردارەکانی ئەو زاتە کە بە هەموو شتێك تەواو زانایە، بە هەموو نهێنی یەکان شارەزایە، چونکە زانستو زانیاری ئەو زاتە بێوێنەیە و هەر خۆی بەدیهێنەری شتەکانە!!

جا کاتێ ئەو حەقیقەتە لە دڵ و دەروندا جێگیر دەبێت ئیتر مرۆڤی ئیماندار گرنگی ئەوتۆ نادات بە دەوروبەر - لە چوارچێوەی دەستەبەرکردنی رەزامەندی خوای گەورەدا نەبێ - چونکە بە تەواوەتی هەست دەکات کە هەمووشت بەدەست ئەوە، دەستی قودرەتی لە هەموو شتێکدا بەدی دەکات..

لەراستیدا چەسپاندنی ئەو حەقیقەتە لە دڵی باوەڕداردا دەیکاتە بەشێك لێی، پێش ئەوەش با بەردەوام هەوڵ بدات کە لە سایەی ئەو ئایەت و حەقیقەتە پیرۆزانەدا بژی ..

سۆفیە دێرینەکان زۆر رۆچوون لە ناسینی ئەو راستیەدا، هەندێکیان وتویانە کە خوا دەبینن لە هەموو شتێکی ئەم بونەوەرەدا ..

هەندێکی تریان وتویانە : من لە پشتی هەموو شتێکەوە لەم بونەوەرەدا خوای گەورە دەبینم، هەندێکی تر وتویەتی : من لەم بونەوەرەدا تەنها خوا دەبینم و هیچ شتێکی تر نابینم .. جا هەموو ئەم گوتارانە گەر لە روالەتی تێپەڕین نیشانەی هەست کردنە بە بوونی ئەو زاتە لە هەمووکات و هەموو شوێنێکدا ..

تەنها رەخنەیەکی گەورە لەوانە دەگیرێت ئەوەیە کە ئەوان تەنها روالەت دەبینن بەم بۆچوونە گرنگەوە، بیر لە دەوروبەر ناکەنەوە و هەوڵنادەن گۆڕانکاری لە واقعی ژیاندا دروست ببێ و خۆیان سنوردار کردووە، لەڕاستیدا هەر ئاینی پیرۆزی ئیسلامە کە هاوسەنگی رەها دەپارێزێت و دەیەوێت ناخ و دڵی مرۆڤەکان وا لێ بکات بۆ ئەو راستی یە بژین و لە پێناویدا هەوڵ بدەن، لە کاتێکدا کە ئیماندار سەرگەرمی کاری نیشتەجێ بوونەکەیەتی لە سەر زەویداو دەبێ هەوڵ بدات و خۆی ماندوو بکات تا لە هەمان کاتدا بەرنامەی خوای گەورە لەسەر زەویدا بەرپا بکات، ئەوسا دەبێتە مرۆڤێك کە بۆچوونێکی هاوسەنگی بۆ دروست دەبێت و خۆی دەگونجێنێ لەگەڵ فیترەتی خۆی و ئەو گەردوونەدا کە هەردووکیان دروستکاری خوای گەورەن ..

* * *

پاشان دوای رونکردنەوەی ئەو حەقیقەتە مەزنە باسی چۆنیەتی بەرپابوونی ئەم بونەوەرە دەفەرموێت :

لەڕاستیدا حەقیقەتی دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی ، حەقیقەتی وەستانی زاتی خوا لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی و دەستەڵاتداری، زانینی ئەوەی دەچێتە نێو زەوی یەوە و تێکەڵی خاکەکەی دەبێت؛ لەگەڵ ئەوەدا کە لێی دێتە دەرەوە، هەروەها زانینی ئەوەی لە ئاسمان دێتە خوارەوە و ئەوەش کە پیایدا

سەردەکەوێت، وە ئاگاداری ئەو زاتە بە تاکە تاکەمان لە هەر کوێدا بین، سەرەڕای ئەوەی کە هەرچی دەکەین خوای گەورە بینایە پێیی و چاوی قودرەتی لێیەتی، هەموو کاروبارێکیش هەر بەدەست خوایەو سەرەنجام هەر بۆلای ئەو زاتە دەگەڕێتەوە، هەروەها ئەو زاتە لە هەموو شتێکدا ڕۆڵی بەرچاوی هەیە ، زانستی تەواویشی هەیە بەناخی هەموو کەس و هەرچی لە دڵ و دەروون و سینەکاندا حەشار دراوە.. ئەم شتانە هەمووی حەقیقەت و ڕاستەقینەن، هەڵقوڵاوی حەقیقەتی یەکەمن کە زاتی خوایە، باس کردنی ئەو شتانەش لەگەڵ باسی گەردووندا سایەو کاریگەری خۆی هەیە لەسەر دڵی مرۆڤ .. ئاسمانەکان و زەوی بەرەنگاری دڵی مرۆڤ دەبێتەوە بەو هەموو گەورەیی و شکۆمەندییەوە بەو هەموو جوانی و هاوئاهەنگیەوە کە هەیانە، هاوڕێ لەگەڵ ئەو هەمووپاساو ڕێکوپێکی یە لەجوڵەو سوڕانەوەیاندا، لەڕاستیدا بە دیمەنی سەرسوڕهێنەریان، ئەوانیش هەندێکن لە دروستکراوانی خوای گەورە، هەروەکو دڵی مرۆڤەکان، پەیوەندی و خزمایەتی و نزیکییان لە یەکدی هەیە، ئەو دروستکراوانە دەماڵن بە ژێکانی دڵدا و دەیخرۆشێنن بە سۆزو خۆشەویستی بەدیهێنەری هەمووان، بەتایبەت کاتێ کە دڵ دەکرێتەوەو ڕوودەکاتە ئەو زاتەی بەدیهێنەریانە، بە گوێی دڵ گوێ بیستیانە، پێی دەڵێت : من و ئەم دروستکراوانە یەك خالق و بەدیهێنەرمان هەیە، هەر ئەم حەقیقەتەشە کە حەق وایە گرنگی زۆری پێبدرێت!! ئەمەش کە لە شەش ڕۆژداخوای گەورە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە و ماوەی ئەو ڕۆژانە خوای گەورە نەبێت کەس نازانێت، چونکە پەیدابوونی ڕۆژەکانی ئێمە پەیوەندی بە سوڕانەوەی

زەوی هەیە بە دەوری خۆیداو لەبەردەم خۆردا؛ ئەمەش دوای دروست بوونی خۆرو زەوی پەیدا بووە، بێگومان ئەم رۆژانە ئەو رۆژانە نین کە خوای گەورە ئاسمانەکان و زەوی تێدا دروست کردوون ، بۆیە زانیاری ئەو رۆژانە دەدەینە دەست خوای گەورەکە ئەگەر بیەوێ زانیاریمان لەو بارەیەوە پێدەبەخشێت ..

هەروەها بابەتی (عرش)و تەختی فەرمانڕەوایەتی.. ئێمە باوەڕمان بە بوونی هەیە، چونکە خوای گەورە باسی فەرمووە، بەڵام نازانین حەقیقەتی چۆنە، ئەوەش کە باس لە وەستانی لەسەر (عرش)دەکات دەتوانین بڵێین: رەنگە مەبەست دەستەڵاتدارێتی بێت بەسەر ئەو دروستکراوەدا. چونکە لەروانگەی قورئانەوە خوای گەورە گۆڕانی بەسەردا نایەت، ماوەیەك لەسەر عەرش بێت و ماوەیەك لەسەری نەبێت.. بۆیە دەبێت لەو باسانەدا هەر پەنا بۆ خودی قورئان ببەین.. کە بۆچوونمان دەربارەی زاتی خواو سیفاتی روون دەکاتەوە.

جا لەگەڵ دەسترۆیشتویی و زانستیی فراوان و بێ سنوریدا، دەقی قورئان هەندێ لە بوارەکانی زانستی ئەو زاتە باس دەکات کە دڵە زیندووەکان سەرگەرم دەکات بە شێوازێك کە هەرگیز سارد نابێتەوەو ماندو نابێت، چونکە باس لە زانست بە وشکی ناکات، بەڵکو دەیەوێت کاریگەریی لەسەر گۆشەو کەناری ناخ و دەروونندا دابنێت، دڵ دابچڵەکێنێ، بیروبۆچوون بخاتە دنیایەکی پڕ لە گەشت و گوزارەوە ئەوەتە دەفەرموێت : ئەو زاتە لە هەموو چرکەساتێکدا دەزانێ چی بەناخی زەویدا رۆدەچێت لەو شتانەی کە لە ژمارە نایەن لە زیندەوەران و شت و مەك و ماددە جۆراوجۆرەکان؛ هەروەها دەزانێ چی لێ دێتە دەرەوە کە لە ژمارە نایەن لە زیندەوەران و مادە جۆراوجۆرەکان.. لە هەموو چرکە ساتێکدا

دەزانێ چی لە ئاسمان دێتە خوارێ لە باران و تیشك و مادە و فریشتە و قەدەر و نهێنی یە بێ شومارەکان، هەروەها چیش پیایدا سەردەکەوێت لە شتی بینراو و نەبینراو کە مەگەر هەر خوای گەورە بزانێ چین و ژمارەیان چەندە ..

لەڕاستیدا جێی سەرنج و تێڕامانە کە لە دەقێکی کورت و چەند وشەیەکی کەمدا مرۆڤ بۆچوونی ئەو هەموو جوڵە و شتانە لە مزری خۆیدا لێك بداتەوە و بیر لەو شتە بێ شومارانە بکاتەوە کە دەچن بە ناخی زەویدا، یان لێی دێنە دەرەوە، هەروەها ئەو شتە بێ شومارانەی کە بە ئاسماندا سەردەکەوەن؛ یان دێنە خوارەوە، پاشان ئیماندار بیربکاتەوە لە زانست و زانیاری بێ سنوری خوایی کە ئاگاداری هەموو شتێك و هەموو جوڵەیەکە؛ هەموو رووداو و هەموو بەسەرهاتێکە؛ لە کاتی رۆچوون و بڵند بونەوەیاندا!!

شایانی باسە گەر بیرکردنەوەی دڵ ئاوا بێدار بێت، ئیتر ئەوە دەژی و بەردەوام هەست بە نزیکی خوای گەورە، بە چاودێری و ڕێزو سۆزی دەکات، بەردەوام لە گەشتدایە لە نێو دروستکراوانی فراوان و پڕ لە نهێنیدا بەی گەردووندا هاتوچۆ دەکات و بیر لە گەورەیی و شکۆمەندیی خوای گەورە دەکاتەوە بە هەست و نەستێکی پڕ لە سۆزو دڵ و دەروونێکی ناسك و دیدەیەکی پڕ لە ئەسرینەوە، ئا لەو بارودۆخە پڕ لە شەوقەدا کە دڵ بە ئاسمان و زەویدا گەشت دەکات، قورئان دەیگێڕێتەوە بۆلای خودی خۆی کوتوپڕ دەبینێ و هەست دەکات، خوای گەورە بەو هەموو شکۆمەندی یەوە هاوڕێ و هاودەمێتی، تەماشای دەکات، چاودێری دەکات ، چاوی قودرەتی لە هەموو کردەوەکانیەوەیەتی چونکە ئەو زاتە بە تەواوەتی بینایە بە هەموو هەڵسوکەوتی،،

بێگومان ئەمەش حەقیقەتی هەیە، ئایەتەکە روونە و هەر ئەو واتایە هەڵدەگرێت چونکە خوای گەورە لەگەڵ هەموو کەس و لەگەڵ هەموو شتێکدا لە هەموو کات و شوێنێکدا، ئاگای لە کاروکردەوەی بەندەکانیەتی چاوی قودرەتی لێیانە، ئەمەش راستییەکی زۆر گەورە و گرنگە کاتێ کە بەدڵ هەستی پێ دەکرێت، حەقیقەتێکی سەرسامناوەرە لە هەمان کاتدا مایەی سرەوتن و ئارامی یە.. چونکە ئیماندار هەست دەکات کە لەژێر چاودێری و سۆزی زاتێکی خاوەن میهردایە و سایەی سۆزو رەحمەتی هەمیشە لێی نزیکە..

لە ڕاستیدا ئەوەندە بەسە بۆ ئەوەی دڵی مرۆڤ بەرزو پاک و بڵند بێتەوە، ئەوسا ئەو حاڵەتەی لە هە موو شتەکانی دنیا لا بەنرختر دەبێت ، چونکە ئەو حاڵەتە وای لێدەکات کە بەردەوام چاودێری خۆی بکات و ترسی بەردەوامی لە زاتی خوا هەبێ نەوەکو لێی بڕەنجێ ، هەربۆیە بەردەوام دورەپەرێزە لە هەموو پۆخڵی و نا پوختی و هەڵس وکەوتێکی نادروست .

* * *

پاشان جارێکی تر ئاماژە بەوە دەفەرموێت کە ئاسمانەکان و زەوی، هەر هەمووی موڵکی خوای گەورەن، بەڵام ئەم جارەیان ئاماژە بەوە دەکات کە هەمووشت و هەموو کاروبارەکان دەگەڕێتەوەبۆلای خوای گەورەو بەدەست ئەو زاتەیە، ئەمەش پەیوەستە بە خاوەندارێتی ئاسمانەکان و زەوی یەوەو تەواوکاری ئەو حەقیقەتەیە.

بێگومان ئەم هەستەش پاسەوانی لە دڵ دەکات کە ئاوڕ نەداتەوە لە غەیری خوا لە هیچ شتێکدا نە لە سەرەتاو نە لە کۆتاییدا، ئەوکات ئیتر چاو نابڕێتە کەس

جگە لەخوای گەورە، وە هەست بە چاودێری ئەو نەبێ هەست بە چاودێری کەسی تر ناکات، ئەوسا ئیتر لە نهێنیو ئاشکرایدا هەڵسوکەوتی خۆی راستو رێك دەکات، خەتەرەو خەیاڵی کۆنترۆڵ دەکات، چونکە دڵنیایە کە پەنا هەر پەنای خودایە، هانا هەر دەبێ بۆ ئەو زاتە برێت ..

* * *

کۆتایی ئەو کۆپلە ئایەتانە دێت بە باسی ئەو جوڵە ناسکە بێدەنگە کە بەردەوام روودەدات، لەگەڵ زانینی ئەوەی کەلە ناخی دڵو دەروونەکاندا روودەدات ئەویش بەوەی کە خوای گەورە شەو تێهەڵکێشی رۆژ دەکاتو رۆژ تێهەڵکێشی شەو دەکات، لەکاتێکدا کە تەواو زانایە بە هەرچی دەگوزەرێ لەنێو دڵو دەروونو سینەی هەر کەسێکدا.

جا ئەو تێهەڵکێش بوونەی شەو و رۆژ دیارە کە جوڵەیەکی بەردەوامەو بەهۆی سوڕانەوەی زەوی لەبەردەم خۆردا پێش دێت بەبێدەنگی و بە شێوازێك کە هەست بە ئاسەو هەڵتەك هەڵتەك ناکرێت، جوڵەیەکە لە وەرزەکاندا دروست دەبێت بەهۆی درێژبوونی شەو و کورت بوونی رۆژەوە، یاخود بە پێچەوانەوە، هەروەها ئەو حاڵەتە لە دەمەو ئێوارەو بەیاندا نومایانە..

جا هەست کردن بە دەستی قودرەت کە بەو شێوازانە شەو و رۆژ تێهەڵکێشی یەکدی دەکات بەو شێوازە ناسكو رێکوپێکە ئەوە دڵ وا لێدەکات کە سەرنج بداتو بە وردی تێبینی بکات، هەستی ناسك بێتەوە، وەکو ئەو هەستەی کە دەبێت بەرانبەر ئاگاداربوونی خوای گەورە لە خەتەرەو خەیاڵی ناخو دڵ و دەروونی کە لەنێو سینەدا خۆی حەشار داوە!!

ئینجا کۆپلەیەکی پیرۆزتر بە شێوازێکی جیاواز خۆی نومایان دەکات ، دوای ئەوەی کە ئامادەکراوە بۆ وەرگرتنی فەرمانەکان، ئامادەی گوێ گرتنە، هەستی ناسك بۆتەوە بۆیە بە فەرمانی ئیمانو باوەڕداری ڕوو بە باوەڕداران دەدوێت و داوای بەخشینیان لێ دەکات، بە شێوازێکی کاریگەرو ناسكو زۆر جوان:

﴿ ءَامِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَأَنفِقُوا مِمَّا جَعَلَكُم مُّسْتَخْلَفِينَ فِيهِ فَالَّذِينَ ءَامَنُوا مِنكُمْ وَأَنفَقُوا لَهُمْ أَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿٧﴾ وَمَا لَكُمْ لَا تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ لِتُؤْمِنُوا بِرَبِّكُمْ وَقَدْ أَخَذَ مِيثَاقَكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٨﴾ هُوَ الَّذِي يُنَزِّلُ عَلَىٰ عَبْدِهِ ءَايَاتٍ بَيِّنَاتٍ لِّيُخْرِجَكُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَإِنَّ اللَّهَ بِكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٩﴾ وَمَا لَكُمْ أَلَّا تُنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلِلَّهِ مِيرَاثُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ أُولَٰئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ الَّذِينَ أَنفَقُوا مِن بَعْدُ وَقَاتَلُوا وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١٠﴾ ﴾

(٧) خەڵکینە ، ئیمان و باوەڕی دامەزراو بهێنن بە خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی ، هەروەها لەو ماڵ و سامانەیش ببەخشن کە بە ئێوەی بەخشیوە ، بێگومان ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوەو ماڵ و سامانیان دەبەخشن پاداشتی زۆرو گەورەو بێ سنور چاوەڕێیانە .

(٨) خەڵکینە ، ئەوە چیتانە و بۆچی باوەڕی دامەزراوو بتەو ناهێنن بە خوای بەدیهێنەرتان ، لە کاتێکدا پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، بانگتان دەکات بۆ ئەوەی باوەڕ بکەن بە پەروەردگارتانو بیپەرستن ، بیرتان نەچێت خوای گەورە کاتی خۆی لە جیهانی پێش ئەم دنیایە پەیمانی بەندایەتی لێ وەرگرتبون ئەگەر باوەڕتان بەوزاتە هەیە.

(٩) هەر خوای گەورە خۆی ئایەتە ڕون و ئاشکراکانی قورئان ڕەوانە دەکات بۆ بەندەی ڕێزداری خۆی محمد(ﷺ)، تا لە تاریکستانەکانی بێ دینی و گوناهو

تاوان دەرتان بهێنێت و ڕزگارتان بکات و بتانخاتە نێو دەریای نورو روناکیەوە، دڵنیا بن کە خوای گەورە بە نیسبەت ئیماندارانەوە تەواو سۆزدارو میهرەبان و دلۆڤانە .

(١٠) جا ئیتر ئەوە چیتانەو بۆچی ماڵ و سامانتان نابەخشن لە ڕێگەی ئاینی خوادا ، مەگەر نازانن هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە ، هەموی خوای گەورە خاوەنیەتی و هەر بۆ ئەویش دەمێنێتەوە ، بێگومان ئەوانەی کە پێش فەتح و رزگار کردنی مەککە بەخشینیان هەبوو هەروەها توشی جەنگ بوون ، پاداشتیان وەکو ئەوانە نیە کە دوای رزگار کردنی مەککە بەخشینیان هەیەو جەنگاون ، بێگومان ئەوانەی پێشو پلەو پایەو پاداشتیان زۆر زیاترە لە وانەی کە دوای رزگارکردنی مەککە ماڵ و سامانیان بەخشیوەو جەنگاون ، وە بۆ هەر لایەکیان خوای گەورە بەڵێنی پاداشتی چاك و بەهەشتی بەرینی داوە ، بێگومان ئەو خوایە تەواو ئاگایە بە هەموو کارو کردەوەکانتان و هیچ شتێکی لێ ون نابێت .

دیارە خوای گەورە روو بەو دڵانە فەرمایش دەفەرموێت کە هەر خۆی دروستی کردووە، چونکە تەواو شارەزای بارودرخەکەیەتی، بە ڕێگەی چوونە ژوورەوەی نهێنـی یەکانی ئاگادارە .. چاکیش دەزانێ کە پاکی عەقیدەو پوختی دڵ و دامەزراوی حەقیقەتی ئیمان؛ دڵنیایی و ئاسودەیی دەبەخشێ، بە شێوازێك کە ئاسەوارو دەرەنجامی لە واقعی ژیاندا رەنگ دەداتەوە وهانی باوەڕدار دەدات بۆ بەخشین و خەبات کردن و خۆ ماندوو کردن تەنها بۆ دەستەبەرکردنی رەزامەندی خوای گەورە ..

لەڕاستیدا پابەندیی بە ئیمانەوە زۆربەی تواناکانی مرۆڤی باوەڕدار دەبات، چونکە واقعی ژیان پێویستی بە هەوڵ و کۆششی زۆر هەیە، هەر بۆیە ئەم هەموو بابەتانەی بەو شێوازە کاریگەرییە هێناوەتە کایەوە، کاتێ خوای گەورە باسی گەردوون و بوونەوەر دەکات بۆ ئەوەی ئیماندار سەرنجی بداتو کاریگەریی لەسەر دابنێت، وە هەمووشت بە پێوەری فراوانو وردی ئەو زاتە بکێشێ و بپێوێت، هەوڵ دەدات هەنگاو بە هەنگاو جار لەدوای جار چارەسەری نەخۆشیو ناساغیەکانی بکات، تا بەرچاو روون بێتو کاریگەریو ئاسەواری لەسەر دابنێت، بۆیە بەیەك شێواز و یەك ئاراستە بۆی نادوێ..

هەر بۆیە بەرنامەی قورئان بۆ چارەسەری دڵان شایستەیە کە خاوەن دڵانی زیندوو زۆر لە بەرانبەریدا بوەستن، تا لێکی بدەنەوەو هەوڵ بدەن پیادەی بکەن..

لەڕاستیدا ئایەتەکانی سەرەتای ئەم سورەتە ئەوەندە بەهێزو توندو تۆڵو ریزبەندن، کاریگەرییەکی وا جێدێڵن کە دڵانی وشكو ساردو سڕیش دێننە لەرزە، دڵانی رەق نەرم دەکەن، وایان لێ دەکەن کە زۆر هەستیار بن لەگەڵ ئەوەشدا هەر بەو شێوازە لە گوتار ناوەستێ، بەڵکو بانگی گوێ بیستان دەکات بۆلای باوەڕی بتەو ، هاوڕێ لەگەڵ بەخشینی ماڵ و ساماندا، هەرچەندە ئەوانەی کە گوتاریان ئاراستە دەکات موسڵمانن، کەچی بانگیان دەکات بۆ باوەڕهێنان بەخوا و پێغەمبەرەکەی، کەواتە خوای گەورە داوای حەقیقەتی ئیمانو باوەڕیان لێ دەکات لە ناخو کرۆکی دڵەکانیاندا، ئەمەش بێدارکردنەوەیەکی وردە و پەیوەستە لەگەڵ بانگ کردنیان بۆ بەخشین، لە

هەمان کاتدا بیریان دەخاتەوە کە ئەوەی دەیبەخشن هەندێکە لە بەخششەکانی خوای گەورە پێیان، ئەو زاتەی کە خاوەنی ئاسمانەکان و زەوی یە ، هەر ئەویش ئەوەکانی ئادەمی نیشتەجێ کردووە لەسەر زەویدا و ماڵ و سامانی پێبەخشیون، لە هەمان کاتدا ژیان و مردنیشی بەدەستەو هەر ئەویش ئەوە لە دوای ئەوە نیشتەجێ دەکات..

پاشان ئەو سەرەتایانە وا دەکات کە مرۆڤی ئیمانداری خاوەن هەست شەرم و حەیا بکات لە خوای گەورە ! خاوەنی راستەقینەیە و هەموو شتێکی پێبەخشیون ، باشە داخۆ ئەوان چ وەڵامێکیان هەیە بۆ بەخشینی هەندێ لەوەی کە پێیبەخشیون؟ بۆچی دەست نوقاون؟ خۆ ئەو زاتەی کە هەندێکی پێبەخشیون سامان و بەخشندەیی تەواو نابێت؟! . هەتا ببەخشن خوای گەورە زیاتریان پێ دەبەخشێت، جا خوای گەورە بەو هاندانە ناوەستی بەڵکو مژدەی پاداشتی زۆر و نەبڕاوەشیان دەداتێ لەو جیهان .. ئیتر چۆن ئیماندار لە بەخشین و بەرخۆدان کەمتەرخەمی دەکات ..

سەیر لەوەدایە کە قورئان نایانداتە دەست ئەو ڕێنمونی یە ئاسکانە، بەڵکو زیاتر کاریگەری دادەنێ لەسەر دڵ و دەروونیان ، دەیەوێت ئیمانێکی زیندوویان هەبێت و ئیمانیان ڕەنگدانەوەی هەبێت لەسەر واقعی ژیانیان بۆیە پێیان دەفەرموێت : باشە ئەوە ئێوە چیتانە و بۆچی باوەڕێکی زۆر بتەو و دامەزراوتان نیە بە خوای پەروەردگارتان، خۆ ئەوەتە بەردەوام پێغەمبەرەکەی داواتان لێدەکات و بانگتان دەکات تا باوەڕی دامەزراو و بتەوتان هەبێت بە پەروەردگارتان، بەڵێن و پەیمانیشی لێ وەرگرتوون بۆ ئەو مەبەستە، ئەگەر ئێوە

باوەڕدارن.. دڵنیاش بن ئەوە هەر ئەو زاتەیە کە بەڕوون و ئاشکرا ئایەتەکانی قورئان نازڵ دەکاتە سەر بەندەی ڕێزداری خۆی تا لە تاریکستانەکانی ژیان رزگارتان بکات و دەرتان بهێنێت و بتانخاتە نێو دەریای روون و رۆشنایی یەوە، دڵنیاش بن کە ئەو پەروەردگارەتان زۆر بەسۆز و میهرەبان و دلۆڤانە بۆتان. باشە ئیتر، چی هەیە ڕێگر بێت لە ئیمانی کامڵ و تێرو تەواو؛ ئەوە پێغەمبەری خوایە(ﷺ) بانگتان دەکات بۆ ئیمان، خۆ ئەوانیش پەیمان و بەڵێنی تەواویان داوەتێ و چی بۆتە کۆسپ و هۆی سارد و سڕیان،خۆ ئەوەتە بەردەوام ئایەتەکانی قورئان نازڵ دەبێ و لە تاریکستانەکان رزگاریان دەکات و لە گومڕایی و سەرگەردانی دەریان دەهێنێ، بەرەو نورو روناکی و دڵنیایی و دڵئارامی دەیانبات.

لەڕاستیدا ئەم گرنگیدانە لەلایەن خوای گەورەوە نیشانەی ئەوپەڕی دڵسۆزی و خەمخۆری و سۆزو میهرە بۆیان.

بەڕاستی بوونی پێغەمبەر(ﷺ)کاتی خۆی لەناو هاوەڵاندا نازو نیعمەتێکی زۆر بەنرخ بووە، بە گوتاری ئاسمان، خوای گەورە ئاخاوتنی بۆ کردوون، هۆکارێکی پیرۆزی پەیوەندی بووە لەنێوان خوای گەورە و هاوەڵاندا، کاریگەرییەکی پیرۆزو بەنرخی هەبووە لەسەر ناخ و دڵ و دەروونیان وە لە ئاراستەکردنیاندا.

بەڕاستی ئەوە نیعمەتێك بووە لە سەرو بۆچوونی ئێمە مانانەوەیە کاتێ کە لە دوورەوە سەرنجی دەدەین، چونکە ئەو سەردەمە پیرۆزەی نازڵبوونی وەحی و نیگای خوایی لە ژیانی پێغەمبەرو هاوەڵاندا سەردەمێکی سەیر بووە ، چونکە خوای گەورە بەو هەموو گەورەیی و شکۆمەندییەی خۆیەوە گفتوگۆ بۆ ئەم

مرۆڤەی دروستکاری خۆی دەکات لەسەر زاری پێغەمبەریدا(ﷺ) ، بەڕاستی ئەوە سۆز و میهرو رەحمەتێکی ناسکی تایبەت بوو کە لە بڵندی یەوە دەباری، پێی دەوتن : ئەوە بکەن و ئەمە مەکەن، ئەوە رێگەو رێبازی منە بیگرنەبەر! هەنگاوەکانتان نارێکە؛ رێکی بخەن، ئەوە رێسمانی منە دەستی پێوە بگرن!! لەو بیرو بۆچوون و کارەتاندا هەڵەتان کرد تەوبە بکەن چونکە دەروازەی لێخۆشبوونی من والآیە، وەرن، دوور مەکەونەوە، نائومێد مەبن لە سۆزو رەحمەت و میهری من چونکە هەموو شتێکی گرتۆتەوە، تۆ فلان کەس ئەوەت وت، ئەوە هەڵەیە، نیەتت وابوو، ئەوە گوناهە، ئەو کارەت کرد ، ئەوە تاوانە، وەرە بۆلای رەحمەتی من خۆت خاوێن بکەرەوە، بکەرێرەوە بۆلای میهری من .. تۆ ئەی فلان کەس . چارەسەری کێشەکەت ئەوەیە، پرسیارەکەت ئەوە وڵامەکەیەتی، کردەوەکەت ئەوە نرخێتی!

بەڕاستی دیاردەیەکی سەیرە، کاتێ زاتی خوا ، گفتوگۆ بۆ ئەو بەندانە دەکات کە هەمیشە لە خزمەتیدان، ئەوانیش بەردەوام هەست دەکەن لە سایەی میهری پەروەردگاری خۆیاندان، هەست دەکەن زۆر نزیکە لێیان، بە حەقیقەت و بە واقع و بەڕاستی ، ئەو زاتە بیسەری نزاو سکاڵا و داوایانە گەر لە نیوەی شەودا بێت، ئەوە چاکتر گیرای دەکات..ئەو زاتە چاودێریانە لە هەموو هەنگاوەکانیاندا و بەردەوام گرنگییان پێدەدات..

بەڕاستی ئەوە رووداوێکە بۆچوون لە ئاستیدا کۆڵە بۆ ئەوانەی کە لەو سەردەمەدا نەژیاون، بەڵام خۆ ئەو بەختەوەرانە لە سایەیدا ژیان ، کەچی پێویستیان بەو بێدارکردنەوانەش هەبووە، بێگومان ئەوە زیادە فەزڵ و

رەحمەتی خوای گەورە یە کە ئێمەمانانیش هەست پێدەکەین کە لەو سەردەمەدا نەژیاوین..

بوخاری دەگێڕێتەوە رۆژێکی پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوەڵانی فەرمووە : ئێوە بە کام دەستە لە باوەڕداران سەرسامن؟! ئەوانیش وتیان : بە فریشتەکان ..

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی : جا ئەوان چۆن باوەڕیان دامەزراو نابێت لەکاتێکدا ئەوان لە خزمەتی پەروەردگاریاندان.

وتیان : دەی کەواتە پێغەمبەران..

فەرمووی جا چۆن ئەوان باوەڕیان بتەو نابێت لە کاتێکدا کە وەحیو نیگایان پێدەگات..وتیان : دەی کەواتە ئێمەین!!

فەرمووی: جا چۆن ئێوە باوەڕ دامەزراو نابن لە کاتێکدا کە من لەنێوانتاندام!!

ئینجا فەرمووی: ئەو باوەڕدارانە جێگەی رێزوسەرسامین کە کەسانێکن دوای ئێوە دێن .. بە دیداری پەڕەکانی قورئان شاد دەبنو باوەڕی پێدەکەن!!

بێگومان پێغەمبەر(ﷺ) راستی فەرمووە، چونکە جیاوازی هەیە لە هۆکارەکانی ئیمان لای ئەوانەی کە باس کران زۆر گەورەو سەرسوڕهێنەرە، ئیتر چۆن باوەڕ ناکەن، کەچی خوای گەورە داوای دووپات کردنەوەی ئیمانیان لێدەکات، داوای رەنگدانەوەی ئیمانیان لێدەکات لە هەموو بیرو بۆچوونو هەڵسوکەوتیاندا ئەگەر باوەڕدارن !!

پاشان داوای بەخشینیان لێدەکاتو جەختی لەسەر دەکاتەوەو دەفەرموێت: ئەوە چیتانە بۆچی ماڵ و سامان نابەخشن لەپێناو ئاینی خوادا، خۆ هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدایە خوای گەورە خاوەنیەتی..

بەو شێوە دەیانگێڕێتەوە بۆ بیرکردنەوە لە ئایەتەکانی پێشتر کە هەر خوای گەورە خاوەنی ئاسمانەکانو زەوییە و هەمووشت بۆلای ئەو زاتە دەگەڕێتەوە..
چونکە هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە بەخودی خۆشیانەوە هەمووی موڵکی ئەوەو بۆ ئەو زاتە دەگەڕێتەوە..
باشە؛ داخۆ دوای ئەم گوتارە شیرینانە هیچ پاساوێك دەمێنێتەوە بۆ رەزیلی و دەست نوقاوی ..
لەڕاستیدا کاروانی هەڵبژاردەی یەکەم لە کۆچبەرانو پشتیوانان درێغیان نەکرد لە بەخشینی گیانو ماڵ و سامانیان، لە ساتەکانی تەنگانەو مەترسیدا، لە پێش فەتحی مەککەدا، لە حودەیبیەدا، بێگومان ئەو رۆژگارە موسڵمانان غەریبو نامۆ بوون، گەمارۆدراو و ئاوارە بوون، بێ پشتیوانو هاوکار بوون، لەوسەردەمەدا بەخشین لەوپەڕی دڵسۆزیدا بوو، کەس بەتەمای دەستکەوت نەبوو، کەس تەماعی دنیای نەبوو، لە ریاو ڕوپامایی یەوە زۆر دوور بوون، مەبەستیان تەنها دەستەبەرکردنی رەزامەندی خوای گەورە بوو، ئەوان خەباتو بەخشینیان هەڵقوڵاوی ئەو عەقیدەو بیروباوەڕە بوو کە لە هەمووشت لایان بەنرختر بوو، بەخشینی ئەوان لە رووی چەندێتی یەوە رەنگە کەم بووبێ، بەڵام پێوەری خوایی سەیری رێژەکە و پاڵنەرو ئیمانەکە دەکات..
بێگومان ئەو کەسەی کە دەبەخشێ و خەبات دەکات لەکاتێکدا کە لەسەر بیروباوەڕەکەی دەربەدەرە، لایەنگرو پشتیوانی کەمە، هیچ ئاسۆیەکی روناك بەدی ناکات، ئەوە پاداشتی جیاوازە لەو کەسەی کە خەبات دەکات پشتی قایمەو لایەنگران زۆربوون و سەرکەوتن نزیکە، ئەویان دڵو ناخی پەیوەستە

بەخوای گەورەوە، بەتەواوەتی لێبڕاوەو گومانی لەسەر نیە، چونکە باوەڕی بەخوای خۆی زۆر بتەوەو دڵدامەزراوە بەتەمانیە وازوو سەرکەوتن بەدەست بێت، هاوکاری کەمە، بەڵام ئەمیان ئەگەر بە تەواوەتیش لێبڕاو بێت، هاوکارو پشتیوانو لایەنگری زۆر بەدی دەکات ..

دەگێڕنەوە رۆژێکی (خالد) کوڕی (ولید) بە (عبدالرحمن) ی کوڕی (عوف) دەڵێت: ئێوە منەت دەکەن بەسەرمانا هەر لەبەر ئەوەی چەند رۆژێك پێش ئێمە ئەم رێبازەتان گرتۆتە بەر، دیارە پێغەمبەر(ﷺ) ئەو قسەیەی بیستۆتەوە بۆیە فەرمویەتی: واز لە هاوەڵەکانم بێنن، سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر بەقەدەر کێوی (أُحُد)، یاخود کێوەکان ئاڵتون ببەخشن ناگەن بەوان!!

پاشان خوای گەورە ئیماندارانی دوایین نائومێد ناکاتو دەفەرموێت: خوای گەورە بە هەردوولا بەڵێنی چاکی داوە، چونکە هەردوولا چاکیان کردووە هەرچەندە پلە و پایەیان جیاوازە. هەموو ئەو جیاوازیو دەرەنجامو پاداشتەش بۆ هەمووان ئامادەیە، خوای گەورە بە تەواوەتی ئاگادارە بە حاڵ و ئەحواڵیان، بە نیەتو ناخیان، بە حەقیقەتی کارو کردەوەیان..ئەمەش هۆکارێکی چاکە بۆ داچڵەکاندنی دڵ و دەروونەکان، کاتێ کە مرۆڤ هەست دەکات کە خوای گەورە بە تەواوەتی ئاگاداری ناخو نیەتو مەبەستەو دەزانێ چی لە پشتی کاروکردەوەکانەوەیە، پاداشتیش هەر لەسەر ئەوە دەبێتو بەوە پێوەرەکان سەنگین دەبن.

* * *

پاشان قۆناغێکی تر دەست پێدەکات بۆ هاندانی ئیمانداران بۆ بەخشین، وە بە شێوازێکی تر قورئان هەوڵ دەدات کە کاریگەری لەسەر دڵو دەرونەکان دابنێ بۆیە دەفەرموێت :

﴿ مَّن ذَا ٱلَّذِي يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥ وَلَهُۥٓ أَجْرٌ كَرِيمٌ ﴿١١﴾ يَوْمَ تَرَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَٰنِهِم بُشْرَىٰكُمُ ٱلْيَوْمَ جَنَّٰتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٢﴾ يَوْمَ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱنظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ قِيلَ ٱرْجِعُوا۟ وَرَآءَكُمْ فَٱلْتَمِسُوا۟ نُورًا فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُۥ بَابٌۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحْمَةُ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلْعَذَابُ ﴿١٣﴾ يُنَادُونَهُمْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ وَلَٰكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ وَتَرَبَّصْتُمْ وَٱرْتَبْتُمْ وَغَرَّتْكُمُ ٱلْأَمَانِىُّ حَتَّىٰ جَآءَ أَمْرُ ٱللَّهِ وَغَرَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿١٤﴾ فَٱلْيَوْمَ لَا يُؤْخَذُ مِنكُمْ فِدْيَةٌ وَلَا مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ مَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ ۖ هِىَ مَوْلَىٰكُمْ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٥﴾ ﴾

(١١) ئاخۆ کێ ئامادەیە بۆ ئەوەی قەرز بە چاکی و رێك پێکی و بێ منەت ببەخشێت بە خوای گەورە ، تا خوای گەورە پاداشتی بێ سنوری بداتەوە و چەند بەرانبەری بکات ، جگە لەوەش پاداشتی بە نرخ و رێزداری بۆ ئامادە کردووە. (سەیرە ، ماڵ و سامان ، بەخششی خوای گەورە خۆیەتی ، وەکو ئەمانەتێك بەخشیویەتی بە هەندێك لە بەندەکانی ، کەچی بەو شێوەیە ئەو زاتە بەخشندەیە هانمان دەدات بۆ بەخشین!!) .

(١٢) رۆژێك دێت پیاوان و ئافرەتانی ئیماندار دەبینرێن کە نورو روناکیەکی تایبەتیی خوایی بەردەم و لای راستیانی رۆشن کردۆتەوە ، جا پێیان دەوترێت: ئەمرۆ مژدەتان لێ بێت بە کۆمەڵە بەهەشتێك کە جۆگەو روبار بە ژێر درەختەکانیانداو بە بەردەم کۆشکەکانیاندا رەوان و جاری یەو بۆ هەمیشە و

هەتا هەتایی تیایدا دەمێننەوە بەڕاستی ئەوە سەرفرازییەکی زۆر گەورە و بێ سنورە .

(١٣) ئەو ڕۆژە دووڕووەکان لەپیاوان و ئافرەتان کاتێك ئەو نورو ڕۆشنایی یە دەبینن ، بەئیمانداران دەڵێن: داواکارین تەنها تەماشایەکمان بکەن با نەختێك لە نوری ڕوخسارتان بەهرەمەند ببین ، بەڵام پێیان دەوترێت بگەڕێنە دواوەو خۆتان نورو روناکیەك بۆخۆتان پەیدا بکەن، ئا لەو کاتەدا دیوارو بەربەستێك لەنێوانیاندا بەرپادەبێت، دەرگایەکیشی هەیە، دیوی ناوەوەی ڕەحمەت و ئاسودەیی یە بۆ ئیمانداران ، بەڵام دیوی دەرەوەی سزاو ئازاری لێ دەبارێت .

(١٤) لە دیوی دەرەوە دوو ڕووەکان هاوار لە ئیمانداران دەکەن و دەڵێن: باشە ئێمە لەگەڵ ئێوەدا نەبوین؟! ئیمانداران دەڵێن: بەڵێ ڕاستە ، بەڵام ئێوە خۆتان توشی لادان و پیلانگێڕیو دوو ڕوویی کرد ، خۆتان مەڵاسداو بۆ فرسەت دەگەران کە زەرەر بدەن لە ئیمانداران و هەمیشە لە گومان و دودڵیدا دەژیان و بڵاویشتان دەکردەوە ، هیواو ئاواتی بێ جێ سەری لێ تێك دابوون ، هەتا فەرمانی خوا یەخەی پێ گرتن ، شەیتانیش غەڕاو گومڕای کردبوون ، لە ڕەحمەت و میهرەبانی خوای گەورە نائومێدی کردبوون ، لە ڕێبازەکەشی وێڵی کردبوون .

(١٥) ئەمڕۆ ئیتر هیچ جۆرە پاکانەو بارمتەیەك لە ئێوەو لە وانەش کە کافرو بێباوەڕبوون وەرناگیرێت (ئەگەر هەشتان بێت) ، مەنزڵگای هەمووتان هەر ئاگری دۆزەخە ، هەر ئەو شوێنەش شایستەتانە ، ئای کە سەرئەنجامێکی خراپ و نالەبارە .

بەڕاستی ئەم ئایەتانە بانگەوازێکی کاریگەرەو دڵان کەمەند کێش دەکات . کاتێ ئەو پەروەردگارەی کە خۆی خاوەنی ئێمەش و هەرچی هەمانەو هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، بەڕاستی داوای قەرز لە بەندە هەژارو نەدارەکانی دەکات .. هەر ئەمەی کە خوای گەورە داوای قەرزیان لێدەکات، حەق وایە باوەڕدار لە خۆشیدا باڵ بگرێتەوە وهەرچی هەیەتی بیبەخشێ!

لە ناوەندی خەڵکیدا کاتێ دەوڵەمەندێك داوای قەرز دەکات، پێشبڕکێ دروست دەبێ بۆ پێدانی هەرچەندی بوێ!! چونکە دڵنیان لە وەرگرتنەوەی، رەنگە خۆشیانی پێوە هەڵکێشن کە قەرزیان داوە بە کابرای دەوڵەمەند! دەی ئەگەر قەرز بدەن بە زاتێ کە دەوڵەمەندی یەکەی رەهاو بێسنورەو هەردەم شایستەی سوپاسگوزاری یە!!

بەڵام خوای گەورە تەنها نایانداتە دەست ئەو هەستە پیرۆزەیان بەڵکو بە قەرزێکی چاك ناوزەدی دەکات، کە تایبەت بە خۆیەتی، تاخاوەنەکەی ئاوڕ لە کەسی تر نەداتەوە، بەڵێنی قازانجی چەند بەرانبەریشیان دەداتێ، لەگەڵ پاداشتی ڕێزداردا لەلای زاتی خۆی..

دواتر لاپەڕەیەکی پرشنگداری نوێیان لە پاداشتی بەنرخ لە دیمەنێك لە دیمەنەکانی ئەو ڕۆژەی کە ئەو پاداشتە بەنرخەی تێدا وەردەگرن بۆ دەخاتە ڕوو..

دیمەنەکە لێرەدا بە شێوەیەکی گشتی تازەو نوێ یە - لە نێو ئەو دیمەنانەدا کە قورئان باسیانی فەرمووە، ئەم دیمەنانە زیندوو ئاشکرا خۆیان نومایان دەکەن، دەڵێی هەر ئێستە دەیانبینین، ئەوەتە ئیمانداران دیارو ئاشکران، بەڵام نوریان

لێ دەبارێت، نورێکی تایبەت بەردەم و لای راستیانی روناك کردۆتەوە بە شێوازێکی سەیرو کەس نەدیو .. ئەو خەڵکە باوەڕدارە روخساریان گەشاوەتەوە، ئەو ناوەیان روناك کردۆتەوە، پێدەچێ ئەم نورە ئەو نورە بێت کە ئەوانی لە تاریکستانەکان رزگار کردو خستنیە دەریای نورەوە، ئەمە ئەو نورەیە کە رۆحیانی پێ گەشایەوە و لە تاریکی قوڕ رزگاری کردن ، یاخود ئەمە ئەو نورەیە کە ئاسمانەکان و زەوی لێ دروست کراوە، ئەوەتە ئێستە خۆی دەنوێنێ .. پاشان مژدە دەدرێ بە ئیمانداران کە بەهەشتی بەرین؛ بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەت چاوەڕێیانە کە جۆگەو روبار بە بەردەم کۆشکەکان و بەنێو باخەکانیدا رەوان و جاری یە، لەوێش بۆ هەمیشەو هەتا هەتایی ژیانی نەبڕاوەی پڕ لە شادی و کامەرانی و بەختەوەری دەبەنە سەر، بەڕاستی ئەوە دەست کەوت و سەرکەوتن و بەخششێکی زۆر گەورە و پیرۆزو مەزنە .

بەڵام سەیر لەوەدایە کە دیمەنە جوان و ناسکەکە لێرەدا کۆتایی نایەت.. چونکە لەولاوە دووڕووەکان لە پیاوان و لە ئافرەتان بەدی دەکرێن سەرگەردان و گومڕاو سەرلێشێواون، سەرشۆڕ و خەجاڵەت پشتگوێ خراون، دەستەو داماني ئیمانداران دەبن لە پیاوان و لە ئافرەتان دەپاڕێنەوە کە لایەکیان لێ بکەنەوەو تەماشایەکیان بکەن تا لە نوری روخساریان بەهرەمەند ببن، چونکە ئەوان سەیری هەر شوێنێك دەکەن ئەو نورە جوانە ناسکەی کە لێیان دەدرەوشێتەوە ئەو ناوە روناك دەکاتەوە .. بەڵام لەکوێ دووڕووەکان دەتوانن سود لەو نورە وەربگرن لە کاتێکدا ئەوان لە دنیادا لە تاریکاییدا دەژیان و ناخیان تاریك بوو!!

بەڵام دەنگێکی نەناسراو پێیان دەڵێ بگەڕێنەوە دواوەو لەوێ بەشوێن نورێکدا بگەڕێن، وا دیارە ئەو دەنگە بۆ گاڵتە پێکردن و سوکایەتی پێکردنە، ئەمەش

ئەوەیان بیردەخاتەوە کە کاتی خۆی لە دنیاداو لە تاریکیدا سەرگەرمی پیلانگێڕان و ئاشوب نانەوە بوون .. تا بگەڕێنەوە بۆ دنیا و بۆلای کاروکردەوە ناباشەکانیان، چونکە ئەم نورەی ئێرە لەوێوە دەستەبەر دەکرێت، ئەگەر لەوێ خەمی ئێرەتان نەبووبێ، ئەوە لێرە هیچتان دەست ناکەوێت!!

ئەوسا دەست بەجێ ئیمانداران و دووڕووەکان لە هەردوو رەگەز جیا دەکرێنەوە ، چونکە قیامەت رۆژی جیاکردنەوەیە، با لە دنیادا لە کۆمەڵگەدا تێکەڵ بووبن، لێرە یەکسەر شورایەك دروست دەکرێت ناوەوەی رەحمەت و سۆز و میهرە، بەڵام دەرەوەی سزاو ئازار دەبارێنێ بەسەر دووڕووەکاندا، وادیارە ئەو شورایە بەشێوازێکە کە یەکدی نابینن، بەڵام گوێ بیستی دەنگی یەکترن، بۆیە دووڕووەکان هاوار دەکەن لە ئیمانداران، باشە مەگەر ئێمە لەگەڵ ئێوە نەبووین؟! ئێستە بۆ جیاکراینەوە؟! مەگەر لە دنیادا پێکەوە لە یەك شوێندا پێکەوە نەبووین و هاوکاری یەکدی نەبووین؟ ئەوەتە ئێستەش لە یەك شوێندا کۆکراوینەتەوە!! ئیمانداران لە وەڵامیاندا دەڵێن: بەڵێ ئەوە ڕاستە، بەڵام ئێوە لەخۆتان تێکداو لە رێبازی هیدایەت لاتاندا، لەلایەکی ترەوە خۆتان مەڵاس داو بۆ فرسەت دەگەڕان کە زیان بە ئیمانداران بگەیەنن، هەمیشە لە دوودڵی و گوماندا دەژیان، هەر نەگەیشتنە دڵنیایی و خۆتان یەکلا نەکردەوە وئاوات و خەیاڵاتی پڕوپوچ لە خشتەی بردن و لە هەوڵدا بوون بەو حاڵەتەوە کە وەك دەستگرتن بە دارەوەیە لە هەردوو جەمسەریەوە؛ بەڵام ئێستە فەرمانی یەکلاکەرەوەی خوایی دەرچووە و کۆتایی بەو حاڵەتە هاتووە، ئیتر ئەو کاتە بەسەر چوو کە شەیتان و شەیتان سیفەتان لە فەرمانبەرداری خوای گەورەیان

کردن.. ئینجا ئیمانداران زیاتر دەدوێن و باسیان بۆ دەکەن هەروەکو ئەوان شت بەدەست بن لەوێ و پێیان دەڵێن: قوڕ بەسەرتان ئەمڕۆ هیچ بارمتەیەك نە لە ئێوە و نە لە کافران وەرناگیرێت، شوێنی نیشتەجێ بوونتان ئاگری دۆزەخە کەناخۆشترین جێگەیە، دەکرێ ئەوە فەرمایشی خوای گەورە یان فریشتەکان بێت ـ خوای گەورە ئەودیمەنانە بەروونی لە قورئاندا باس دەفەرموێت تا پێش ئەوەی ئەو حاڵەتە پێش بێت دووڕووەکان تەوبە بکەن و فریای خۆیان بکەون ـ ئەوەی جێگەی سەرنجە باسی دیمەنی نورە لەم دیمەن و پێشهاتەدا کە باس لە دووڕووەکان دەکات کە ئەوانە ناخ و نیەتی خۆیان دەشاردەوە و پێچەوانەکەیان نیشان دەدا و لە تاریکستانی پیلان و داڕشتنی نەخشەی نالەباردا، بێگومان ئێستە ئەو نورە تاریکی و شاراوەکان دەردەخات، داپۆشراوەکان دەخاتە روو.

هەروەها لێرەدا روخساری روناك و درەوشاوە بەرانبەرە لەگەڵ روخساری تاریك و شێواودا ، بۆیە شایستەترین شت ئەوەیە کە ئیمانداران بە نوری روخساریان ئەو دیمەنە بە تەواوەتی دەربخەن.. لەلایەکەوە نورە کەیان بەردەم و لای راستی باوەڕداران روناك دەکاتەوە لەولاشەوە با دووڕووەکان هەر لە تاریکیدا ژیانی کولەمەرگی ببەنە سەر..

ئینجا پاش ئەم باسانە کێ هەیە کە دڵی نەکوڵێ و ئاواتەخوازی بەدەست هێنانی ئەو نورە نەبێ لەو رۆژەدا؟

کێ هەیە لێنەبڕێ بۆ بەخشین و خێرکردن و ئەم هەموو باس و ئاماژە قوڵانە کاریگەری نەبێ لەسەری.

بەڕاستی دیارە ئەو قورئانە بەجوانی و رێکوپێکی باس لە رووداوەکانی ئەودیو مردن دەکات .. ئەو زاتەی تەواو زانا و ئاگایە بە پێچ و پەناکانی دڵ و دەروونی

دەیەوێت ئیمانداران بهەژێنێت، وە باس دەکات لەو شتانەی کە کاریگەری هەیە لەسەریان ..

* * *

﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَنْ تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ الْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا كَالَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ الْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِنْهُمْ فَاسِقُونَ ﴿١٦﴾ اعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١٧﴾﴾

(١٦) باشە ، ئێستە ئیتر کاتی ئەوە نەهاتووە کە ئیمانداران دڵەکانیان ملکەچ و روناك بێت بە نوری ئیمان ، خۆشەویستی خوا ، وایان لێ بکات کە بترسن لە رەنجاندنی ئەو زاتە ، هەروەها با یادی خوا زۆر بکەن تا دڵ و دەرونیان ساڕێژو پڕ لە نوری ئەو قورئانە بێت کە حەق و حەقیقەت و راستی یەو ئەو زاتە نازڵی کردووە ، با زۆر دەوری بکەنەوە ، ، با هەوڵبدەن وەکو ئەو جولەکەو گاورانە نەبن کە کتێبی ئاسمانییان بۆ رەوانە کرا ، بەڵام دوای تێپەڕبونی ماوەیەکی دوورو درێژ دڵیان رەق و رەش بوو ، زۆربەشیان سەرکەش و یاخی و نالەبار دەرچون (چونکە دەستکارییان کردو رویان کردە گوناهو تاوان و بەرەڵایی و نادروستی) .

(١٧) دڵنیا بن ئەوە هەر خوایە کە زەوی زیندو دەکاتەوە دوای مردنی ( بێگومان ئێوەش ئاوا بە ئاسانی زیندوو دەکاتەوە ، هەروەکو چۆن روەك و گژوگیا و دانەوێڵەو هەموو کشتوکاڵەکان ساڵانە زیندو دەکاتەوە و دەیبوژێنەوە ) ئێمە لە ڕاستیدا بەڵگەو نیشانەی دەسەڵاتداری خۆمانمان بۆ رون کردونەتەوە ، بۆ

ئەوەی عەقڵ و ژیریتان بخەنە کار (بە وردی سەرنجی سروشت بدەن لە وەرزی بەهاردا).

لەڕاستیدا پەروەردگاری ڕێزدار و نازدار و دلۆڤان گلەییەکی کاریگەر دەکات لە ئیمانداران و لەو کەسانەی لە فەزڵ و ڕێزی خۆی بەهرەمەندی کردوون، پێغەمبەرێکی لە نێو خۆیاندا هەڵبژاردووەو بانگیان دەکات بۆ ئیمان هێنان بە پەروەردگاریان، وە ئایەتی زۆری قورئانی بۆ نازڵ کردووە تا لە تاریکستانەکان ڕزگاریان بکات و بیانخاتە نێو دەریای نورەوە، هەروەها سەرنجی ڕاکێشاون بۆ ئایەت و نیشانەکانی دەستەڵاتداری خۆی لەم بونەوەر و گەردوونەدا، بۆ ئەوەی چاوەکانیان بکەنەوەو هۆشیار بن ..

خوای گەورە بە ناسکی و سۆز و ڕێزەوە گلەیی دەکات، هانیان دەدات بۆ ئەوەی هەست بکەن بە گەورەیی و شکۆمەندی ئەو زاتە، دڵیان ناسک و هەستیار و بێدار بێت کاتێ باسی دەکەن و ناوی پیرۆزی دێنن، هەروەها ئەو حەق و حەقیقەت و ڕاستیانەی کە باسی فەرمووە بە توندی و بە دڵگەرمی پەیڕەوی بکەن، هەرچەندە گلەیی یەکە بۆنی هەڕەشەشی لێدێت ! باشە؛ ئێستە ئیتر کاتی ئەوە نەهاتووە بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە کە دڵەکانیان پڕبێ لە سۆز و هەیبەت و سام و خۆشەویستی بەرانبەر زیکرو ناوهێنان و یادی خوا، بەرانبەر ئەو قورئانەی کە سەرتاپای حەق و حەقیقەت و ڕاستەقینەیە لەگەڵ ئەو هاندانەشدا هۆشدارییان دەداتێ لەسەر ئەنجامی پاشەکشە و خۆدزینەوە و گوێ نەدان، وە باسی دەرەنجامی ئەو ڕەفتارانەی کە دەبێتە هۆی ژەنگ هێنان و ڕۆڵی خراپی خۆی دەبینێ کە گوێی پێنەدرا و باوەڕدار ڕاهات لەسەری ، چونکە

دڵان ڕەق و سەخت دەکات، بە تایبەت کە ماوەیەکی زۆر تێپەڕی و یادی خوای گەورە بە کەمی ئەنجام درا، ئەوسا ئیتر هەق کاریگەری لە سەریان نامێنێت و کەس لە خەمیا نابێت، بەڵکو وەکو ئەوانەی لێ دێ کە پێشتر بەهرەمەند بوون لە تەورات و ئینجیل، بەڵام بە تێپەڕبوونی کات دڵیان ڕەق و زبر بوو، زۆربەیان فاسق و بێ دین دەرچوون . بێگومان کاتێ کە دڵان ڕەق دەبن ئیتر تاوان و گوناهو بێ دینی سەر هەڵدەدات، لەڕاستیدا دڵ و دەروونی مرۆڤ بە خێرایی ئەمدیو ئەودیو دەکات و گۆڕانی بەسەردا دێ، هەروەها زوو شتی لەبیردەچێت، جاری وا هەیە ناسک و پاک و بێگەرد دەبێ و نوری لێ دەبارێ، روناکی دەبەخشێ بەڵام بەتێپەڕبوونی کات گەر بێدار نەکرێتەوە ژەنگ لێی دەدات، وشک دەبێت، روناکییەکەی خامۆش دەبێت، تاریک و نوتەک دەبێت، بۆیە پێویستی بە بیرخستنەوە هەیە؛ هەتا دابچڵەکێت و ترس لە رەنجاندنی خواو هیوای دەستەبەرکردنی رەزامەندیی ئەو زاتەی بۆ بگەڕێتەوە، لەبەر ئەوە چار نیە دەبێ ناو بەناو پیامالرێ تا ناسک و تەنك ببێ، پێویستە بەردەوام بێدار بێت تا لە تەمەڵی و تەوەزەلی و رەقی و سەختی بەدوور بێت..

شایانی باسە نابێ نائومێدی هەبێت لە دڵە خامۆش و بەستوو رەقەکان، چونکە دوور نیە ژیانی بۆ بگەڕێتەوە، نور و روناکی تیا پەیدا ببێ، ملکەچ و فەرمان بەردار بێت بە دڵ و بە کوڵ یادی خوای گەورە بکات، چونکە خوای گەورە زەوی دوای مردنی زیندوو دەکاتەوە ، ژیانی بۆ دەگێڕێتەوە، بە گوڵ و گوڵزار دەیڕازێنێتەوە، بەرهەم و بەروبومی جۆراوجۆر پێشکەش دەکات..

دڵانیش هەر وایە گەر خوای گەورە بیەوێت و دڵەکان هەندێ ئامادەییان تێدا دروست ببێ وەکو زەوی دەیبوژێنێتەوە، لەم قورئانەشدا شتی زۆر باس کراوە کە هۆکارن بۆ زیندوکردنەوەی دڵان و باس لە خۆراك و ئاودان و گەرم بوونەوەی کراوە بۆ کەسانێك کە عەقڵ و بیرو هۆش و ژیری خۆیان دەخەنە کار .

* * *

دوای ئەو باسە گەرم و گوڕە زیندەگی بەخشە، دوای ئەو گلەیی یە شەرم ئاوەرە، وە ئەو بیرخستنەوە و بێدار کردنەوەیە، بە شێوازێکی نوێ هانی ئیمانداران دەدا بۆ بەخشین و فیداکاری..

﴿ إِنَّ ٱلْمُصَّدِّقِينَ وَٱلْمُصَّدِّقَٰتِ وَأَقْرَضُوا ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَٰعَفُ لَهُمْ وَلَهُمْ أَجْرٌ كَرِيمٌ ﴿١٨﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُولَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَ وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمْ لَهُمْ أَجْرُهُمْ وَنُورُهُمْ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِـَٔايَٰتِنَآ أُولَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٩﴾ ﴾

(١٨) بەڕاستی ئەوانەی کە خێرەوەمەندن لە پیاوان و ئافرەتان و قەرز دەدەن بە خوای گەورەو ماڵ و سامانیان لە پێناوی ئاینی خواداو بۆ ڕەزامەندی ئەو زاتە دەبەخشن (پەروەردگارێکی شکۆمەندو خاوەن کەرەم و لوتف کە خۆی خاوەنی خۆمان وهەموو ئەو شتانەیە کە پێی بەخشیوین ، بەو شێوازە هانمان دەدات بۆ بەخشین!!) ، مژدە دەدات و دەفەرموێت ئەوانە بە چەند بەرانبەر پاداشتیان دەدەینەوە ، بێگومان پاداشتی زۆر بەنرخ و بە ڕێز چاوەڕێیانە .

(١٩) بێگومان ئەوانەی کە ئیمان و باوەڕیان هەیە بە خوای گەورەو بە پێغەمبەرەکانی (وە پابەندن بەو سنورانەی کە ئیمان باوەڕەکەیان لێیان

دەخوازێت) ئا ئەوانە راست و راستگۆکانن ، شەهیدەکانیش لای پەروەردگاریان نورو روناکی تایبەتی خۆیان هەیە (شەهیدەکان ئەوانەش دەگرێتەوە کە ئاینی خوا بە جوانی دەگەیەنن و بە کردارو گوفتار دەبنە شایەت بەسەر خەلکەوە) بەلام ئەوانەی کە کافرو بێباوەڕن ، وە باوەڕیان بە فەرمان و ئایەتەکانی ئێمە نیە و بەڕاستی نازانن ، ئا ئەوانە نیشتەجێی ناو ئاگری دۆزەخن .

لەڕاستیدا خێرخوازان خاوەن فەزڵ نابن بەسەر ئەوانەدا کە ئاتاجن و خێرو خێرات وەردەگرن، چونکە ئەوان لەڕاستیدا مامەڵە لەگەڵ خەلکدا ناکەن، بەلکو قەرز دەدەن بەخوای گەورەو مامەڵەی یەکسەری لەگەڵ ئەو زاتەدا دەکەن .. بێگومان ئەمە هاندەرێکی زۆر قوڵ و کاریگەرە بۆ خاوەن سامانەکان، چونکە هەست دەکەن کە ئەوەی دەیبەخشن قەرزێکە لەلای ئەو زاتەی کە دەوڵەمەندییەکەی رەهایەو هەردەم شایستەی سوپاسە، ئەو کەسە مامەڵە دەکات لەگەڵ خاوەنی هەرچی بونەوەرە، ئەوەی دەیبەخشێ ئەو زاتە بۆی چەند بەرانبەر دەکات، پاداشتی بێ سنورو نەبڕاوەی بۆ ئامادە کردووە ..

دیارە پلەو پایەی راستان و چاکان؛ پلەو پایەیەکی زۆر بەرزو بلندە، هەروەکو لە چەند فەرمودەیەکدا هاتووە، جا هەرچەندە پلەو پایەکە زۆر بەرزو بلندە، بەلام ئاسان و گونجاوە بەهۆی فەزلی خواوە بۆ کەسێك کە بیەوێت، چونکە ئەم فەزڵە قۆرخ نەکراوە بۆ کەسانێك یان تیرەو تایەفەو بنەماڵەیەکی دیاریکراو.. هەرکەس ئیمانی بەخوای گەورەو پێغەمبەرانی هەبێت و رەنگی دابێتەوە لە هەڵسوکەوتیدا هیوای بەو پلەو پایە بەرزو بلندە هەیە، چونکە بەخشین و فەزلی خوای گەورە سنوردار نیە..

جا ئەوانەی کە ئیمانو باوەڕیان بەخواو پێغەمبەرانی هەیە ، ئا ئەوانە راستانو راستگۆیانن..

ئەمەش لە تایبەتمەندی ئەم ئاینەو روالەتە دیارییەکانیەتی، ڕێبازێکی کراوەیە بۆ هەموو خەڵکی، ئاسۆیەکە تا هەمووان تەماشای بکەن، قۆرخ نەکراوە بۆ کەس، شوێنو جێگەو ڕێگەی تایبەتی بۆ کەس دانەنراوە. تەنها کردەوەیە لەگەڵ نیەتی چاکدا باوەڕدار بەرزو بڵند دەکاتەوە، ئەم ئیسلامە ئاینێکە بواری نەهێشتۆتەوە بۆ کەسانێك کە بەشوێن پلەو پایەدا دەگەڕێنو مەبەستیان بەرژەوەندییە دنیاییەکانە.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: بەهەشتیەکان، نیشتەجێکانی بەهەشت دەبینن لە سەرو خۆیانەوە ، هەروەکو چۆن ئێوە هەسارە و ئەستێرەی دوور دەبینن لە ئاسۆدا، لە قوڵایی ئاسماندا لە رۆژهەڵات یان رۆژئاوادا، ئەوەندە جیاوازی نێوانیان هەیە..

هاوەڵان پرسیان : ئەی پێغەمبەری خوا رەنگە ئەو شوێنانە ماڵو مەنزڵی پێغەمبەران بێتو هەر بۆ ئەوان تەرخان کرابێت؟

فەرمووی : نەخێر سوێند بەو زاتەی کە گیانی منی بەدەستە ئەوە بەهەشتی ئەو کەسانەیە کە باوەڕیان بە خواو پێغەمبەرەکەی هێناوە[1].

ئەمەی کە باس کرا پاداشتی ئیمانە ، بەڵام پاداشتی گیان فیدایی و تێکۆشان دەبێ چی بێ؟!

---

[1] لەم سەردەمەدا زانایانی گەردووناسی سەلماندویانە کە هەندێ لەو ئەستێرانەی کە بە ئاستەم بەچاو دەبینرێن هەیانە ملیۆنەها ئەوەندەی خۆرە ، بەڵام لەمبەر دووری هەزاران ساڵ و ملیۆنان ساڵی روناکی لێمانەوە ئاوا دەبینرێن !!

دیارە شەهیدان و شاهیدان لەلای پەروەردگاریان پاداشتی تایبەتو نوری تایبەتیان پێشکەش دەکرێت..

بێگومان پلەو پایەی شەهید چەندەهاجار لە قورئاندا هاتووە و چەندەها فەرمودەی راستو دروستیش باسیان کردووە، چونکە ئەم دینە بەبێ پاسەوانو سەرباز پایەدار نابێ لەسەر زەویدا بەبێ جیهادو خەباتو تێکۆشان ـ لەژێر سایەی سەرکردایەتیەکی دیندارو خواناسو متمانە پێکراودا ـ ناتوانێ ئازادیو دادپەروەری دەستەبەر بکات، بۆیە پێویستی بە جیهادو خەبات هەیە بۆ پاراستنی عەقیدەو بانگەوازو شوێنکەوتووانی تا دەست درێژی نەکرێتە سەریانو شەریعەتی ئیسلام نەشێوێنرێت، هەر بۆیە شەهیدان لەپێناو پایەدارکردنی ئاینی خوادا پلەو پایەی تایبەتیان هەیە، هەر بەوانیش دەوترێت شەهید ـ هەرچەندە رایەکی تریش هەیە کە خەمخۆرانو تێکۆشەران لە پێناوی ئاینی خواداو ئەوانەی سەرلەنوێ هەوڵدەدەن بە شێوازی شارستانی و سەردەم پەیامی ئیسلام بگەیەنن، پلەی شەهیدیان دەبێت (ان شاء الله) ـ با لەسەر جێگەش بمرن ، هەرچەندە دوور نیە ناحەزان سنگیان خوێناوی بکەن ، لە کاتێکدا دڵنیاش بن کە ئەمان نایانەوێ دەستیان خوێناوی ببێت بە خوێنی کەس، ئیماندارانی تێگەیشتوو لەم سەردەمەدا کە نەفامی لە هەموو شوێنێك باڵی رەشی کێشاوە بەسەر وڵاتاندا، ئەمان هەڵوێستیان هەڵوێستی هابیلە کە قابیلی برای دەست درێژی کردو دەستی چووە خوێنی براکەی هابیل کاردانەوەی لەو شێوازە نەبوو، بەتایبەت لەم رۆژگارەدا کە لەژێر ناوی جهادا دەستەو گرۆی زۆر دروستکراوە کە کوشتنو برین و سەربرین وەکو

ئاوخواردنـەوە وایـە لایـان کـە ئەگـەر هەمووشـیان نـەبێ زۆربـەیان دەسـتی دەزگاکانی سیخوڕی لە پشتەوەیە، لەپڕ هەڵیان دەتۆقێنن یان هەڵیان دەپەڕێنن .. بە گەلێ مەبەست لەوانە:

١. وڵاتانی زلهێز چەکە کۆنەکانیان بە دەستەلاتدارە سەپێنراوەکانی جیهانی ئیسلامی ساغ دەکەنەوە.

٢. نرخی نەوت و غاز دەشکێننو زۆرجار لەباتی چەکە ژەنگاویەکانیان بەتاڵان دەیبەن .

٣. ئاینی ئیسلامی پێ ناشیرین دەکەن کە گوایە ئاینی توندو تیژی یە و بەرهەمیشی دەمێنێ و هەوڵ دەدەن بیرو بۆچوونی گەلانی جیهان بەگشتی وە جیهانی خۆرئاوا بەتایبەتی بەدین بکەن بەرانبەری.

٤. بەخەیاڵی خۆتان ، یاخود موسڵمانان نائومێد دەکەن لە پشتیوانی خوایی و سەرخستنی ئاینەکەی، هەرچەندە ئەو زاتە خۆی دەزانێ چۆن و لە کوێ و بەکێ سەرکەوتن دەبەخشێ.

* * *

لـە فەرمودەیەکیـدا هـاتووە کـە رۆحـی شـەهیدان لـە نێـو چیکڵدانی باڵنـدەی سەوزدان لە بەهەشتەکەیاندا گەشت دەکەن بە ئارەزووی خۆیـان، ئینجا دەچنە شـوێنێکی تایبـەت لـەژێر عەرشـدا پـەروەردگار تەماشـایەکیان دەکـات و دەفەرموێت: ئەوە چیتان دەوێت، ئەوانیش دەڵێن : حەزدەکەین بمانگێڕیتەوە بۆ دنیا تا لە پێناوی تۆدا جەنگ بکەین تا دەکوژرێینەوە وەکو جاری یەکەم ..

خوای گەورەش دەفەرموێت: من بڕیارم داوە کە گەڕانەوە بۆ دنیا جارێکی تر پێش نایەت.

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: کەس نیە بچێتە بەهەشتو حەز بکات بگەڕێتەوە دنیا، بەمەرجێ هیچ شتێکیشی لەسەر زەویدا نەبێ، جگە لە شەهید .. کە حەز دەکات بگەڕێتەوە بۆ دنیاو دەجار بکوژرێت، چونکە ئەوەندە قەدرو ڕێزی لێ دەگیرێت.

ئا بەو شێوەیە ژیان بێ نرخ بووە لەلای ئەو کەسانەی کە ئەم باسانە دراوە بە گوێیاندا.. چونکە دەیانزانی پلەی شەهیدی چەند بەنرخە لای خوای گەورە..

بۆ نموونە : ڕۆژێکی پێغەمبەر(ﷺ) هانی هاوەڵانی دا بۆ جیهاد و باسی بەهەشتی بۆ کردن ، پیاوێك لە پشتیوانان چەند دەنکە خورمایەکی لە دەستدا بوو دەیخواردن .. کوتوپڕ وتی: وادیارە من بەتەنگ دنیاوەمو لە خەمیدام گەر دانیشم هەتا هەمووی دەخۆم ! بۆیە ئەوەی مابوو لە دەستیدا فڕێی داو شمشێرەکەی هەڵگرت و هێرشی بردە سەر دوژمنانو جەنگی کرد هەتا کوژراو شەهید بوو..

لەلایەکی تریشەوە ڕاستانو ڕاستگۆیان، ئەوانیش مەقامو پلەو پایەو پێگەی خۆیان هەیە و لەڕیزی شەهیداندان ..

بەڵام ئەوانەی کە ڕێبازی کوفریان گرتە بەرو باوەڕیان بە ئایەتەکانی خوای گەورە لە قورئان و گەردووندا نەبوو .. دنیایان بە ڕێکەوت(صدفة)و خۆرسك ناوزەد کرد ئا ئەوانە نیشتەجێی نێو ئاگری دۆزەخن.

جا ئیتر خەڵکی ئازادن .. ئەوە کێ یە ئەوەندە نەفامە ڕێزو پلەو پایەو نازونیعمەتی نەبڕاوە واز لێ دێنێ و خۆی دەکاتە نیشتەجێی دۆزەخ؟!

پاشان دوای هاندان بۆ ئیمان هێنان و بەخشین لە هەموو بوارەکاندا، لە بواری بانگەوازو قوربانیدان و بەخشین دا ئایەتێك دێت کە دنیا زۆر کەم نرخ و بێ بەها باس دەفەرموێت کە خاوەن دەروونە زیندووەکان ئەوەندەی تر بەرزو بڵند دەکاتەوە ، پەیوەست و هۆگری قیامەت و بەهاکانیان دەکات :

﴿ ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا لَعِبٞ وَلَهۡوٞ وَزِينَةٞ وَتَفَاخُرُۢ بَيۡنَكُمۡ وَتَكَاثُرٞ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِۖ كَمَثَلِ غَيۡثٍ أَعۡجَبَ ٱلۡكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصۡفَرّٗا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمٗاۖ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٞ شَدِيدٞ وَمَغۡفِرَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٞۚ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ ﴿٢٠﴾ ﴾

(٢٠) خەڵکینە ، چاك بزانن کە ژیانی دنیا بریتیە لە یاری و گەمە (لەم سەردەمەدا ئەم هەموو گرنگیدانە بەیاریەکانی دوو گۆڵی و یاری تری هەمە جۆر و بڵاوکردنەوەی لە کەناڵەکانەوە و دابینکردنی ژمارەیەکی زۆر کەناڵی تایبەت بۆ پەخش کردنیان ، ئەو حاڵەتەی بەرجەستەکردووە) هەروەها رازاندنەوەی ماڵ و حاڵ و خۆ هەڵکێشان و فەخر فرۆشی لە نێویەکتریدا ، هەروەها زۆر کردنی ماڵ و سامان و ماڵ و منداڵ ، جا ئەوانە هەرهەموی ، وەك بارانێکی بە پیت وایە کە بباریێت بەسەر زەوییەکی کشتوکاڵیدا ، ببێتە هۆی بەدەستهێنانی بەرهەمێکی زۆر ، کە کشتیارەکان سەرسام بکات پاشان دوای چەند حەفتەیەك وشك ببێت و زەرد هەڵگەڕێت ، پاشان وردو خاش ببێت و بکەوێت ، بێگومان لە قیامەتیشدا سزای زۆر سەخت بۆ دنیا پەرستان ئامادەیە ، لەو لاشەوە لێخۆشبون و رەزامەندی لە لایەن خوای گەورەوە بۆ ئیماندارانی چاکەخواز ئامادەیە ، دڵنیاش بن کە ژیانی دنیا رابواردن و خۆشییەکی تەمەن کۆتایە و

زۆر کەسی پێ لە خشتە دەبرێت و خەڵکێکی زۆری پێ غەراو دەستخەڕۆ دەبێت ، ئەگەر دینداری و خواناسی فەرامۆش بکەن ...

کاتێ ژیانی دنیا بە پێوەرو کێشانەکانی خودی دنیا دەکێشرێت و دەپێورێت زۆر گەورەو مەزن دێتە بەرچاو، بەڵام کە بەراورد دەکرێت لەگەڵ تەمەنی بونەوەردا، یاخود بە پێوەری ئەو جیهان مەزنەندە دەکرێت زۆر بچوك و کەم و بی نرخ دێتە بەرچاو، ئەوەتە لەم ئایەتەدا بە یاری منداڵان پێناسەی دەکات کاتێ کە لەگەڵ قیامەتدا بەراورد دەکرێت، دوای تەواو بوونی یاری و گەمەکانی دنیا!!

دنیا بریتی یە لە یاری و گەمەو رازاوەیی و خۆهەڵکێشان و زۆرکردنی ماڵ و سامان و نەوە ... ئەمە هەموو ئەو شتانەیە کە خەڵکی سەرگەرم کردووە .. دوای ئەوە نمونەیەك دەهێنێتەوە لەو نمونە جوانانەی کە لە قورئاندا هەیە ئەویش بەوەی کە ژیانی دنیا دەچوێنێ بەو بارانەی کە دەبێتە هۆی گەشەکردنی روەك و کشتوکاڵ، تا ئەو ڕادەیەی کە جوتیاران سەرسام دەبن پێی، لێرەدا جوتیار بە کافر ناودەبات، چونکە کوفر بەواتای شاردنەوە دێت، جوتیاریش تۆوەکان دەکات بەژێر گڵەوە و دەیشارێتەوە، ئەمەش شوبهاندنێکی جێگەی سەرنجە کە قورئان وشەی کافر بۆ جوتیار دیاری دەکات، چونکە کافران لەنێو بیروباوەڕدا ئیمان دەشارنەوەو دژایەتی دەکەن و دنیا دەپەرستن، بەڵام چۆن بەروبومی جوتیاران دوای ماوەیەك زەرد هەڵدەگەڕێت و دەبێتە پوش و پەڵاش ، هەر بەو شێوەیە ئەم دنیایەی کە کافرو بێ دینەکانی سەرقاڵ کردووە دڕندانە دژایەتی ئاین و رەوشتە بەرزەکان دەکەن بۆ بەرژەوەندی خۆیان ئاشوب و فیتنەی گەورە

دەنێتەوە، ئەم دنیایە زۆر نابات وێران دەبێت، پێش ئەوەش تاکە تاکەی خەڵکی بێ دین و سەرجەم مرۆڤەکان لەکات و ساتی خۆیدا دەبێ بار بکەن!!

بەڵام ئەو جیهان شتێکی ترە، حەق وایە حسابی (جدی) بۆ بکرێت چاوەڕوان بکرێت و خۆی بۆ ئامادە بکرێت، چونکە سزایەکی زۆر سەخت ئامادە کراوە بۆ خوانەناسان، وەکو ژیانی دنیاش نیە کورت و کۆتا بێت، وەکو پوش و پەڵاشەکەی دنیا نیە؛ لەناو بچێت، هەروەها لێخۆشبوونی خوایی و ڕەزامەندی ئەو زاتە ئامادەکراوە بۆ دیندارو خواناسان ، ژیانی دنیا هەر ژیانێکە مرۆڤە ناحاڵی و بێ دینەکان غەڕاو سەرگەردان دەکات ..

ئەمەش حەقیقەتێکە کاتێ بە دڵ وە بە قوڵی بیری لێ دەکرێتەوە، چونکە قورئان دەیەوێت لەلایەکەوە مرۆڤ دانەبڕێت لە ژیانی دنیا و پشتگوێی نەخات و ئاوەدانی بکاتەوە، لەلایەکی ترەوە وای لێ بکات کە لە دنیادا بۆ قیامەت بژی و غرور نەیگرێت و پەیوەست نەبێ تەنها بە زەوی یەوە ، چونکە ئەم باوەڕە ئەوەندە مەزن و بەنرخە جاری وا هەیە ئیماندار ناچار دەبێ کە خۆی و هەرچی هەیەتی بەخت بکات لە پێناویدا ..

هەر بۆیە ئیمانداران هاندەدات بۆ پێشبڕکێ لە مەیدانی پێشبڕکێی راستەقینەدا، کە چارەنووسیان بەرەو ئەوێ دەچێت لە ژیانی نەبڕاوە و بەردەوامدا :

﴿سَابِقُوٓاْ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ أُعِدَّتْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢١﴾﴾

(٢١) دەی کەواتە خەڵکینە هەوڵبدەن و پێشبڕکێ بکەن بۆ بەدەست هێنانی لێخۆشبونی پەروەردگارتان و بە دەست هێنانی ئەو بەهەشتەی کە پانتاییەکەی

وەك پانتایی ئاسمان و زەوی فراوانە ، ئامادەکراوە بۆ ئەو کەسانەی کە باوەڕی دامەزراویان هەیە بە خوای گەورەو پێغەمبەرەکانی (وە بە کرداروو گوفتار پەیڕەویان دەکەن) ، ئەوەش خۆی

زیادە فەزڵ و ڕێزێکی تایبەتە لە لایەن خوای گەورەوە دەیبەخشێت بەو کەسانەی کە زاتی خۆی ویستی لە سەریەتی و ئەوانیش شایستەن ، هەر ئەو خوایەش خاوەنی بەخشش و بەخشندەیی بێ سنورە ، (لەبەهشتدا بە تەواوی دەردەکەوێت بۆ ئیمانداران).

کەواتە حەق نیە پێشبڕکێ بکرێت بۆ خۆ سەرگەرم کردن بە یاریو گەمەو خۆهەڵکێشانو زۆرکردنی سامان، چونکە ئەوە شایستەی ئەوان نیە کە کۆتو زنجیری دنیا پەرستیان لە گەردنی خۆیان داماڵیوە، بەڵکو حەق وایە پێشبڕکێی بۆ دەستەبەر کردنی بەهەشت بێ، چونکە ئیماندار دەڕوانێ بۆ جیهانی بەرزو بڵند؛ نەك جیهانی یاریو گەمەو گاڵتە کە منداڵانی بچوك پێوەی سەرگەرمن، ئەوان دەڕوانن بۆ ئەو بەهەشتەی کە پانتاییەکەی لە ئاسمانەکان و زەوی زیاترە ڕەنگە کاتی خۆی بۆچوونی مرۆڤەکان دەربارەی فراوانی ئاسمان زۆر سنوردار بووبێت،بەڵام ئێستە کە مرۆڤ لە هەندێ زانیاری بەهرەمەند بووە و بە تەلسکۆبە بچوکەکانی دەتوانێ مەودایەکی فراوان ببینێ، دەردەکەوێت کە موڵکی خوای گەورە زۆر زۆر فراوانەو عەقڵی مرۆڤ دەرکی ناکات .. جا بەهەشتێك ئاوا فراوان بێت، لە هەمان کاتدا لەوپەڕی جوانیو ڕازاوەییدا بێت، ژیان تیایدا لەگەڵ کەمالی تەندروستیو لاوێتیو کامەرانیدا .. حەق نیە پێشبڕکێو کێ بڕکێی بۆ بکەین؟ نەك لەسەر دنیایەکی فانی و تەمەن کۆتا و سنوردار کە بەردەوام کێشەو ململانێی خوێن ڕشتنو باڵی ڕەشی بەسەردا کێشاوە، کە ئەگەر تەمەن

نـەختێ درێـژە بکێشـێ پـیری و نەخۆشـی و کەفتـەکاری و زەمیـنگیری بـەشمان دەبێت!!

بەهەشتیش بە ئیمانی دامەزراو بە خواو پێغەمبەرەکەی - وە بە ئەنجامدانی کاروکردەوەی چاکە دەستەبەر دەکرێت -

بۆیە دەبێ خاوەنی عەقیدە هەست بکات کە لە بونەوەرێکی فراواندا ژیان دەباتە سەرو نابێ خۆی قەتیس بکات لە چوارچێوەی دنیایەکی بچوکدا، نابێ تەماشا و بۆچـوون و گرنگـی و هەسـتەکانی سنوردار بکـات.. بـەڵکو دەبـێ رۆڵێکـی شایستە ببینـێ وەکـو خـاوەن عەقیـدەو بیروبـاوەڕێکی رەسـەن، ئـەو رۆڵـەی کـە بەرەنگاری خواروخێچی خەڵکی و تەماعیان دەبێتەوە، هەروەها بەرەنگاری دڵ و دەروونی تاریك و پێچ و پەناکانی ناخیان و ئەو کێشانەی کە بەتاڵ و ناحـەقی و نـاڕەوا دروسـتی دەکـەن، کـە کـەس بەرگـەی نـاگرێ مەگـەر کەسـێك کـە لەگـەڵ واقعێکدا بژی کە زۆر گەورەترە لەم ژیانەو فراوانترە لـەم زەوی یەو بەدوورە لـە فەوتان و کۆتایی هاتن.

پێوەرەکانی زەوی و هەڵسەنگاندنەکانی ئەو حەقیقەتە ناچەسپێنن کە پێویستە لە ناخ و ویژدانی خاوەن حەقدا جێی خۆی بکاتەوە، ئەوەندە حەقیقەتە نومایان دەکات بەڕێژەی زەوی بەرانبەر گەردوون!! یاخود تەمەنی دنیا لە بەرانبـەر هـەتا هەتایی و بێ کۆتایی یەوە!! جیاوازی یەکە زۆر زۆر گەورە و فراوانە، هـەرگیز پێوەرەکانی زەوی ناتوانێ چوارچێوەی بۆ دابنێ، یاخود ئاماژەی بۆ بکات!!

هەر بۆیـە خـاوەنی عەقیـدەو بیروباوەڕی دروست لـە ئاسـۆیەکی گـەورە و بڵنـدو بەرزو رەهاوە بۆ زەوی دەڕوانێ و بە واقعی ئـەم زەوی و دنیا بچوکە ناخەڵەتێ،

چەندە واقعەکە گەورە و گرنگ و مەزن بێتە بەرچاو، فو بکاتە خۆی و خۆی بنوێنێ ، ئەو بەردەوام لەگەڵ واقعی گەورە و شکۆدا مامەڵە دەکات و رەهایە لە کۆت و بەندی ئەم واقعە بچوکە، چونکە ئەو لەگەڵ بونەوەرێکی نەبڕاوە و کۆتا نەهاتوودا کە هەمیشە و بەردەوامە مامەڵە دەکات، ئەو لەگەڵ موڵکی ئەو جیهاندا دەژی کە زۆر فراوان و پان و بەرینە، ئەو لەگەڵ پێوەرە ئیمانی یە نەگۆڕەکاندا مامەڵە دەکات کە توشی هەژان و ناتەواوی نابێت، چونکە پێوەرەکانی وەکو پێوەرەکانی دنیا بچوك و خەڵەتێنەر نیە..

هەر ئەمەش کار و بەرەکەتی ئیمانە لە ژیانی خاوەن عەقیدە دروستەکاندا کە هەڵبژاردەی خوای گەورەن بۆ راستکردنەوەی بەهاکانی ژیانی ئەم دنیا تەمەن کۆتایە ، تا خەڵکی نەبنە بەندەی دنیا وملکەچ بن بۆ داخوازیەکانی :

﴿ ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ... ﴿٣٢﴾ ﴾ فاطر .

* * *

ئینجا قۆناغی چوارەم دەست پێدەکات و بە قوڵی و رۆچوون باس لە قەدەر و بڕیار دادەکانی خوای گەورە دەکات کە هەر بەخۆی نەبێت بە کەس ناکرێت :

﴿ مَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَا ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٢٢﴾ لِّكَيْلَا تَأْسَوْا عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ ۗ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿٢٣﴾ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ وَيَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبُخْلِ ۗ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ ﴿٢٤﴾ ﴾

(٢٢) هیچ بەڵاو روداوێك لە زەویدا بۆتان پێش نایەت کە لە (لوح المحفوظ) دا تۆمار نەکرابێت ، پێش ئەوەی روداوەکە پێش بێت، ئەو تۆمارکردن و زانینەش

بۆ خـوای گـەورە زۆر ئاسـانە (چـونکە زانسـتی ئـەو زاتـە داهـاتوو رابـردووی لاچـونیەکە، روداوەکـانیش خۆشـی بـن یـان ناخۆشـی ، بـۆ ئیمانـدار بـەخێر دەگەڕێت و هەمووی بە قازانجی ئەو تەواو دەبێت) .

(٢٣) ئەمەش بۆ ئەوەی کە خەم و خەفەت نەخۆن بۆ ئەوەی کە لە دەستتان چووە ، وە بەوەش غەراو دڵخۆش نەبن کە پێمان بەخشیون (واتە لە سنور دەرنەچن و رونەکەنە گوناهو نافەرمانی) چونکە خوای گەورە کەسانی خۆ بە گەورەزان و خۆهەڵکێش و فەخر فرۆشی خۆش ناوێت ، ئەوانەی بە بوون و بەخشینی بەهرەو نازو نیعمەتەکان غەڕا دەبن و خۆبادەدەن و فیز دەکەن ...

(٢٤) ئەوانەی کە ڕەزیلی دەکەن و هانی کەسانی تریش دەدەن بۆ ڕەزیلی و نەبەخشین (بۆ بەرژەوەندییە گشتی یەکان، یان بۆ هەژاران و لێقەوماوان) جا ئەوەی پشت بکات لە فەرمانەکانی خوای گەورەو دەست نوقاو بێت، ئەوە باچاك بزانێت کە خوای گەورە بێ نیازە لە بەخششی ئەو خەڵکە و پێویستی بەکەس نیە ، لە حاڵێکدا هەر ئەو زاتە خۆی شایستەی سوپاسە لەسەر بەخششە بێ سنورەکانی.

لەڕاستیدا ئەم بونەوەرو گەردوونە ئەوەندە وردەکاری و ئەندازەگیری تیادا کراوە، کە هیچ شتێك روونەدات کە پێشتر هەر لە خودی خۆیدا ئەو پێشهاتە کاری بۆ نەکرابێ، لەم گەردوونەدا جێگەی ڕێکەوتی شەلو کوێر نابێتەوە، هیچ شتێك بە هەوانتە دروست نەکراوە.

پێش ئەوەی خوای گەورە زەوی دروست بکات، دروستکراوان بەدی بێنێت، هەمووشت لە دەریای زانستی بێ پایانی خوای گەورەدا روون و ئاشکرایە و

ئەندازەگیری بۆ کراوە لە کەیداو چۆن روو بدات، لە دەریای زانستی خوادا ئێستاو رابوردوو داهاتوو نیە، ئەوەی بۆ ئێمە بەدی هاتووە، ئێمە کە ماوەیەك لەسەر زەوی یەکەیدا چەند ساڵێك ژیان بەسەر دەبەین، تا کاروبارمان رێکبخەین، چونکە ئێمە بەهۆی سنوردانان بۆ شوێنو شتەکان وە کاتو تەمەنیان شتێك تێدەگەین!!

ئێمە لە پەروەردگار؛ خاوەنی سیفاتی (جلال و جمال و کمال)ی رەها تێناگەین مەگەر جاروبار لەو چرکەساتانەدا کە رۆحمان پەیوەست دەبێت بەو زاتە هەر بوەوە .. ئەویش بە شێوازێکی جیا لەوەی کە لە سەری راهاتووین، چونکە زاتی خوای پاكو بێگەرد حەقیقەتێکی رەهاو بێ سنورە و ئاگادارە لە سەرجەم دروستکراوانی لەم بونەوەرەدا کە هەر خۆی بەدیهێناوە و بەرپای کردووە، هیچ بەربەستو سنورێك بۆ ئەو زاتە نیە، بۆیە هەرچی لە گەردوونەدا روودەدات ، هەرچی گۆڕانکارییەك پێش دێت لەو کاتەوە کە دروستی کردووە، هەتا کۆتایی پێدێت؛ خوای گەورە زانست و زانیاری تەواوی دەربارەی وردو درشتی هەیەو هەرگیز کات و شوێن نابنە کۆسپ لەبەردەم ئەو زانستەیدا.

جا هەر شتێك روو بدات لە نەخشەی گشتیدا تۆمارە، چونکە پێش روودانی خوای گەورە زانیویەتی کە روودەدات لە کات و شوێنی خۆیدا، جا خێر بووبێ یان شەڕ، شایانی باسە رووداوەکان لە خودی خۆیاندا نە شەڕن نە خێر، بەڵکو هەڵوێستی مرۆڤەکانە کە دەیخات بە باری خێر، یان شەڕدا!! چ ئەوەی کە توشی تاکە تاکەی خەڵك دەبێت بە درێژایی زەمان و پانتایی زەمین، یاخود ئەوەی کە کاتی خۆی تووشی کۆمەڵگەو وڵاتان بووەو دەبێ لە ئێچستەو داهاتودا، هەموو

ئەو شتانە لەلای پەروەردگار لە تۆمارگەی تایبەتدا تۆمارەو ئەو شتانە بۆ خوای گەورە زۆر ئاسانە..

جا بەنرخی بڕوابوون بەو حەقیقەتە ـ کە یەکێکە لە کۆڵەکەکانی ئیمان ـ دەرکی ناکات جگە لە خاوەنی عەقیدەو بیروباوەڕی دامەزراو کە لە کاتی ڕووداوی ناخۆشدا خۆدەگری و ڕازی یە بە قەدەری خواو ناشڵەژێ‌و ئەم مژدەیەی لە یادە کە دەفەرموێت: ﴿ ...إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ۝١٠ ﴾ الزمر.

واتە : بەڕاستی پاداشتی ئارامگرو خۆگران بێ سنورو ڕەهایە ..

هەروەها لە کاتی بوون‌و خۆشیدا هاوسەنگی خۆی لەدەست نادات‌و هەڵسوکەوتێك ئەنجام نادات کە خوای گەورەی لێ بڕەنجێ، چونکە بەرچاوی ڕوونە، ئەو مامەڵە لەگەڵ بونەوەری فراوانی خوای خۆی دەکات، بیردەکاتەوە لەوەی کە بەرەو ژیانێکی هەمیشەو بەردەوام لەسایەی ڕەحمەتی خوادا دەچێت.. ئیتر دڵنیایە لەوەی کە ئەو ڕوداوانەی ئەو زاتە پێشی دەهێنێ هەمووی خێردارەو بڕیاردادەکانی هەمووی بۆ ئیماندار خێرەو بەخێر کۆتایی دێت، ئەوسا ئیتر دڵ و دەروونی دامەزراو و فراوان دەبێت، لە کاتی ڕوودانی سەخت‌و پێشهاتی سەنگیندا ڕەوتی ناشێوێت، چونکە دڵنیایە لەوەی هەرچی لای خواوەبێ خێردارە بۆی ..

مرۆڤی دابڕاو لە عەقیدەو بیروباوەڕی دروست بە سادەترین ڕووداو تێکدەچێت‌و توشی خەمۆکی دەبێت، کۆسپ‌و لەمپەرەکان لە ڕێگەیدا بە دژایەتی و دوژمنایەتی دەزانێت!! بەڵام کاتێ کە باوەڕدار دڵنیا دەبێت کە هەمووشت بە قەدەرو ویستی خوای گەورەیەو بەقەدەر ئەتۆم و بچوکتریش لە

رووداوو پێشهاتەکان بەدەر نیە لە ئیرادەو ویستی ئەو زاتە، هەمووشت لە جێی خۆی و لە کاتی خۆیدا دانراوە و هەموویشی سنوردارو تەمەن کۆتایەو لە زانستە نهێنی و شاراوەکانی خوای گەورەدایە کاتێ کە مرۆڤ دەبێتە خاوەن بیروباوەڕێکی ئاوا ، ئیتر ئاسودەیە ودڵئارامە، خەفەت ناخوات بۆ ئەو شتانەی کە لەدەستی چووە ، بە شێوازێکی نارەوا دڵخۆش نابێ لەکاتی خۆشی و بووندا کە نافەرمانی خوای گەورە بکات و ئەو زاتە لەخۆی برەنجێنێ ..

رەزامەندی ئیماندار لە پێشهاتەکان رەزامەندیی کەسێکی خواناسە کە چاك تێگەیشتووە لەوەی کە ئەوەی روویداوە دەبێت هەر بەو شێوازە بێت کە روویداوە!

ئەمەش پلەیەکە رەنگە کەم کەس جوان لێی تێبگات .. جا ئیمانداران بە گشتی دەبێ ناخۆشی و لێقەومان و پێشهاتەکان یان خۆشی و بوون و دەستکەوتەکان وایان لێ نەکات کە کارێك، یان هەڵوێستێك بنوێنن کە دواتر لە دنیادا ، یان لە قیامەتدا لێی پەشیمان ببنەوە و خوای گەورە لەخۆیان برەنجێنن..

لەڕاستیدا پێوەرو تەرازوەکانی زەوی ئەو حەقیقەتە وێنا ناکات کە پێویستە لە ویژدان و ناخی ئیمانداردا جێگیر بێت، چونکە تەرازوو پێوەرەکانی ئێرە ئارەزوو حەز و بەرژەوەندی یەکان کاری تێدەکەن، بەڵام پێوەری خوایی ئەوپەڕی دادپەروەری بۆ مرۆڤ بەرپا دەکات، کاتێ کە بەها ئیمانیەکان دێنە مەیدان و بە دنیای فانی و تەمەن کۆتا ناخەڵەتێن و ناخلیسکێن، هەر ئەمەش کاری سەرەکی کەسانی خاوەن ئیمانە کە هەڵبژاردەن بۆ راستکردنەوەی ژیان و پێوەرەکانی ؛ نەك ملکەچ بوون و تەسلیم بوون بۆ داخوازی یەکانی..

خوای گەورە ئەوەندە ئەم گەردوون و بونەوەرەی بە رێکوپێکی دروستکردووە هیچ شتێك تیایدا رووناداتك کە دیزاین و کات و ساتی خۆی بۆ دیاری نەکرابێت، شوێنی رێکە وبێ سەرو بەریی تێدا نابێتەوە، چونکە هەموو شتێك لە زانستی بێ پایانو گشتگیری خواییدا تۆمارە پێش دروستکردنی زەوی و خەڵکیی ، هەمووشت لە کاتی خۆیدا سەر هەڵدەدات و روودەدات . چونکە بە نیسبەت خوای گەورەوە شتێك نیە رابوردوو؛ یان داهاتوو بێت، چونکە خۆی بەدیهێنەری شوێنو زەمانە بۆ خزمەتکردنو کارئاسانی بۆ ئێمە چونکە گەر کات و شوێن نەبێ ، ئێمە لە کوێدا دەبین و چۆن دەژین. ئێمە مەگەر لە هەندێ چرکەساتدا کە رۆحمان پەیوەست دەبێت بەو پەروەردگارە شکۆمەندەوە شتێك لە زاتی رەهاو بێ سنور حاڵی ببین، ئەویش بە شێوازێکی جیا لەوەی کە شتومەکی پێ دەبینین و هەستی پێدەکەین ..

دیارە خوای گەورەو پاكو بێگەرد حەقیقەتێکی رەهاو بێ سنورە؛ بە تەواویش ئاگادارە بە هەر هەموو بونەوەرەکەی، هەرچی لەم گەردووونەدا روویداوە و روودەدات هەتا قیامەت و هەتا هەتایە، هەر هەمووی شارەزایە، کات و شوێن؛ کاریگەریی نیە لەسەری، چونکە خۆی بەدیهێنەری کاتو شوێنو هەموو شتێکەو ئەو زاتە پێش دروستکردنی دنیاو مرۆڤ هەموو شتێکی لە دۆسیەی تایبەتدا تۆمار کردووە، ئەوەش بۆخوای گەورە کارێکی زۆر ئاسانە ..

جا بڕوابوون بەو حەقیقەتانەو بە قەدەری خوای گەورە ئارام بەخشە بە دڵ و دەروون کاتێ مرۆڤ توشی هەر خێرێك ، یان هەر ناخۆشیەك دەبێت، لەبەر ئەوە لە کاتی ناخۆشیدا سەری دنیای لێ نایەتەوە یەکو نائومێد نابێت لە سۆزو

میهری خوایی و بەخێر مەزەندەی دەکات بۆ دنیا و قیامەتی؛ هەر وایشە، کاتێ کە توشی خۆشی و شادیەکیش بوو لە خۆشیدا باڵ ناگرێتەوە و نا فەرمانی خوای گەورە ناکات و بەڵکو بە دڵ و بە گیان سوپاسگوزارە. لەبەر ئەوە خەفەت و مەخابنی نیە بۆ ئەو شتانەی کە لە دەستی چووە، بەوەش کە هەیەتی غەڕا نابێت، خۆشیەکانی لە سنوری دەستەبەرکردنی رەزامەندی خوای گەورە دەری ناکات ..

بێگومان باوەڕبوون بە قەدەر؛ مەودای بینینی مرۆڤی ئیماندار فراوان دەکات، ئەو مامەڵە لەگەڵ ئەم بونەوەرە گەورە و فراوانەدا دەکات .. بیرکردنەوە لە هەربوو، لە هەتا هەتایی، لە زانستی بێ پایانی خوای گەورە کە لە دیزاینی ئەم گەردوونەدا نومایانە؛ هەموو ئەو شتانە؛ دەروون دامەزراو و فراوان دەکات، خۆگر و مەحکەم دەبێت لە بەرانبەر رووداوەکانەوە، بەتایبەت کاتێ کە بیردەکاتەوە ئەم لەگەڵ چەرخی گەردووندا هاوتەریبە ..

مرۆڤ کاتێ کە لەم جۆرە بیروباوەڕەوە دوورە بە هەموو شتێك تێك دەچێت، لە هەموو پێشهات و رووداوێك بێزارە ، وا دەزانێ هەمووشت دژیەتی، بەڵام کە بیردەکاتەوە لەوەی کە هەرچی روودەدات بە سەر خۆی ، کەس وکاری و دنیادا هەمووی لەگەڵ ئیماندا بەخێر کۆتایی دێت، رووداوەکات لە کات و شوێنی خۆیدا پێش دێت، هەموو شتەکان نەخشە بۆداڕێژراوە، ئیتر پەژارە و خەم و خەفەت دایناگرێ، هەروەها خۆشی و شادیش بە شێوازێك دەرنابڕێت کە خوای گەورە لە خۆی بڕەنجێنێت، بەڵکو لەگەڵ قەدەری خواییدا رێدەکات بە رەزامەندییەوە، رەزامەندی کەسێك کە دڵنیایە لەوەی کە هەرچی روویداوە دەبوا روو بدات.. جا ئەم پلەیە لە قەناعەت و رازی بوون کەم کەس دەتوانێ پەیڕەوی بکات. ئیمانداران بەگشتی داوایان لێ کراوە کە ناخۆشی و ئێش و ئازار

وایان لێ نەکات دەست بکەن بە رەخنە لە خوای گەورە و لە قەدەری، هەروەها خۆشی و شادی نابێ خوای گەورەیان لەبیر بباتەوە، پێویستە باوەڕدار هاوسەنگ بێت لە خۆشی و ناخۆشیدا..

(عکرمة) (ﷺ) وتویەتی : هیچ کەس نیە کە دڵخۆش یان غەمبار نەبێ، بەڵام هەوڵبدەن لە دڵخۆشیدا سوپاسگوزار بن ، لە کاتی خەفەت و ناخۆشیدا خۆگر بن ..

ئا ئەمەیە ئەو میانەڕەوییەی ئیسلام دەیەوێت و ئاسانیشە بۆ کەسانی ژیرو تێگەیشتوو..

بێگومان خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆش ناوێت کە خۆهەڵکێش و فەخر فرۆشن و بە ماڵ و سامانیانەوە دەنازن، لە هەمان کاتدا بەخیل و دەست نوقاون و هانی خەڵکیش دەدەن بۆ رەزیلی و دەست نوقاوی.

جا پەیوەندی نێوان حاڵەتی پێشوو ، وە ئەم حاڵەتەی دوایی، وە فەرماندان و هاندانی خەڵکی بۆی ئەوەیە کە ئیماندار کاتێ خوای گەورە دەوڵەمەندی کرد، خۆی هەڵناکێشی و فەخر فرۆشی ناکات و خۆی لێ ناگۆڕێ، نە ڕەزیل و دەست نوقاوە و نە هانی خەڵکیش دەدا بۆ رەزیلی و دەست نوقاوی .. بەڵام ئەو کەسەی کە هەست و شعوری بەو شێوەیە نیە و وا دەزانێ هەرچی دەست دەکەوێ ئازایەتی خۆیەتی، فیزو فەخر فرۆشی دەکات و لەنجەولارو فیز دەکات، ئەوە کەسێکە رەزاقورسە لە دنیا ولێپرسینەوەی سەختیشی لەگەڵ دەکرێ لە قیامەتدا، جا ئەوەی رەفتاری وا بێ با چاك بزانێ کە خوای گەورە دەوڵەمەند و بێ نیازەو هەر خۆی شایستەی سوپاسگوزارییە ، چونکە ئەوەی دەبەخشی

ئەوە بۆخۆی دەبەخشێ و بە قازانجی خۆی تەواو دەبێ لە هەردوو جیهاندا ، ئەوەش دەست نوقاوە هەر زیان لەخۆی ئەدا لە هەردوو جیهاندا.

* * *

لە کۆتاییدا ڕێڕەوی پەیامەکە باس دەفەرموێت و مێژووی ئەم عەقیدەیە لە سەردەمی (نوح) و (ابراهیم)ەوە باس دەفەرموێت تا دەگاتە باسی شوێنکەوتووانی (عیسی) سلاوی خوایان لێ بێت .

﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ ۖ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ ۚ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴿٢٥﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا وَإِبْرَاهِيمَ وَجَعَلْنَا فِي ذُرِّيَّتِهِمَا النُّبُوَّةَ وَالْكِتَابَ ۖ فَمِنْهُم مُّهْتَدٍ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ ﴿٢٦﴾ ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَىٰ آثَارِهِم بِرُسُلِنَا وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَآتَيْنَاهُ الْإِنجِيلَ وَجَعَلْنَا فِي قُلُوبِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً وَرَهْبَانِيَّةً ابْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ابْتِغَاءَ رِضْوَانِ اللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا ۖ فَآتَيْنَا الَّذِينَ آمَنُوا مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ ﴿٢٧﴾﴾

(٢٥) خەڵکینە دڵنیابن کە ئێمە پێغەمبەرانی خۆمان ڕەوانە کردووە هاوڕێ لەگەڵ بەڵگەو نیشانەو موعجیزەی ڕوون و ئاشکرادا ، کتێبی ئاسمانیشمان ناردووە بۆ ئەو پێغەمبەرانە هاوڕێ لەگەڵ پێوەری شەرعی و دادپەروەرانەدا تاخەڵکی بە عەدالەت و دادپەروەری ڕەفتار بکەن ، هەروەها ئاسنیشمان دروستکردووە کە مادەیەکی سەخت و ڕەق و سودبەخشە بۆ خەڵکی ، تا ئەوەی خوای گەورە دەیزانێت لە جیهانی واقعیشدا دەربکەوێت کە کێ پشتگیرو

لایەنگری خواو پێغەمبەرو ئاینەکەیەتی لە کاتی پەنهانیدا، دڵنیاش بن کە خوای گەورە خۆی هێزو دەسەڵاتی بێ سنورەو هەر خۆیشی باڵا دەستە (پێویستی بە یارمەتی کەس نیە ، دەیەوێت ئاسن و دەسەڵات لەخزمەتی بەرپاکردنی دادپەروەریدابن ).

(٢٦) لە ڕاستیدا هەر ئێمە نوح و ئیبراهیم مان ڕەوانە کرد بە پێغەمبەرایەتی ، بۆ نەوەکانیشیان پێغەمبەرایەتی و کتێبی ئاسمانیمان نازڵ کرد جا لە نەوەکانیاندا کەسانێك هەبوون کە ڕێگەو ڕێبازی هیدایەت و خواناسیان گرتەبەر ، لەهەمان کاتدا زۆربەیان کەسانێکی خوا نەناس و لارو وێر و یاخی دەرچوون .

(٢٧) لەوەو دوا بە شوێن ئەو پێغەمبەرانەدا پێغەمبەرانی ترمان ڕەوانە کرد (کۆتایی زنجیرەی ئیسحاقمان هێنا) بە عیسای کوڕی مەریەم ، ئینجیلیشمان پێ بەخشی ، سۆزو میهرەبانیمان خستە نێو دڵی ئەوانەوە کە شوێنی کەوتبون، کەچی ئەوان ڕەهبانیەت و گۆشەگیریان کردە پیشەیان ، لە حاڵێکدا ئێمە ئەوەمان لەسەر فەرز نەکردبوون بەڵکو بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوامان لێ داوا کردبوون ، کەچی ئەوان ئەو ڕەهبانیەت و گۆشەگیری یەیان بە چاکی پەیڕەو نەکرد ، ئێمەش پاداشتی ئەوانەمان دایەوە کە باوەڕی ڕاست و دروستیان هەبوو ، ئەوانەش کەزۆرینەیەکی لارو وێرو خوانەناس و یاخی دەرچوون (سزادەدرێن).

ئاشکرایە کە پەیامەکە لە کرۆکیدا یەکێکە ؛ سەرجەم پێغەمبەران هێناریانە، زۆربەیان موعجیزە و شتی نامۆ و سەرسوڕهێنەریان بۆ سەلماندنی ڕاستی و ڕاستگۆیی خۆیان نیشانی خەڵکی داوە ، هەندێکیشیان پەیامی نوسراویان بۆ

هاتووە ، ناوەرۆکی کتێبەکانیش لە یەکچوو بوون بۆیە بە تاك ئاماژەی پێ دەکات، چونکە پەیامیان بۆ خەڵکی چوونیەك بووە ..

هەروەها خوای گەورە لەگەڵ کتێبە پیرۆزەکانیدا پێوەری تایبەتیشی فێری پێغەمبەران کردووە تا دادپەروەری فێری خەڵکی بکەن و پێوەرێکی دامەزراو لەسەر زەویدا بەرپا بکەن تا خەڵکی بۆی بگەڕێنەوە. تا بتوانن کارو کردەوەو رووداوو شتەکان و مرۆڤەکان هەڵسەنگێنن، وە خەڵك بە دوور بن لە بەڵای ئارەزووی ناجێگیرو حەزە ناشەرعیەکان، لە بەرکەوتن و پێکدادانی بەرژەوەندی و سود و قازانجە قۆرخ کراوەکان، چونکە خوای گەورە پێوەرێکی بە پێغەمبەراندا رەوانە کردووە کە لایەنی کەس ناگرێت، چونکە بە پێوەرێکی یەکسانی دەڕوانێ بۆ سەرجەم بەندەکانی، بەلای کەسدا داناتاشێ چونکە ئەو زاتە پەروەردگاری هەمووانە.

لە ڕاستیدا ئەو پێوەرانەی کە خوای گەورە لە پەیامەکەیدا دایبەزاندووە تاکە زامنە بۆ مرۆڤایەتی، چونکە زریان و رەشەبا و زەوی لەرزەو کێشەو ناکۆکی و ناڕێکی کە دەورەی داوە لەنێو جەنجاڵی ژیانیدا و لە نێو سۆز و کێبەکێ و خۆپەرستیدا کاری تێناکات..

بۆیە بوونی پێوەرێکی دروست و دامەزراو پێویستە تا خەڵکی پەنای بۆ بەرن و لە دەوری کۆ ببنەوە، تا لە پەنایدا حەق و دادو ویژدان بەبی لایەنگیری هەست پێبکەن، چونکە بەبێ ئەو پێوەرە خوایی یە دامەزراوو بتەوە کە لە بەرنامە و شەریعەتی ئەو زاتەدا هەیە خەڵکی رێیان لە داد ناکەوێت، خۆ ئەگەر دەستیشیان کەوت ، ئەگەر نەفامی و ئارەزوو پەرستی تێکەڵ بوو ئەوە لاسەنگی دەکات و تێکی دەدات..

هەروەها خوای گەورە ئاسنی دابەزاندووە و جێگیری کردووە لە سەر زەویدا بە ویستو ئەندازەیەك کە هەر خۆی دیاری کردووە، کە بەکار دەهێنرێ بۆ نواندنی توندوتیژیو وێرانکاری، هەروەها بۆ سودی خەڵکی ـ لەم سەردەمەدا ئاشکرایە کە ئاسن چ رۆڵێکی هەیە لە دروستکردنی چەکی قورسدا کە زیاتر بۆ کاولکاری بەکار دەهێنرێت، هەروەها ئەو هەموو ئۆتۆمبێلو ئامێرو کەرەستانەی کە بۆ ئاوەدانی بەکار دەهێنرێت لەگەڵ بەکارهێنانی لە دروستکردنی تاوەرو خانووبەرەدا سودێکی بێ شوماری لێ دەبینرێ ـ بوونی بەرنامەی خوای گەورە و بوونی ئاسن بۆ ئەوەیە کە شەریعەتی خوای پێ پیادە بکرێت، کە سەرتاپای خێرو داد پەروەری یە بۆ مرۆڤایەتی ، چونکە خەباتی چەکداری لە ئیسلامدا بۆ نەهێشتنی زوڵمو ستەمە، نەك بۆ ستەم کردن و خوێن ڕشتن جا چونکە لەم سەردەمەدا دەستەڵات لای ستەمکارانە بە چاوی خۆمان دەبینین لە شاشەکانەوە چۆن کاولکاری لە وڵاتاندا ئەنجام دەدەن ..

خەبات کردن بە ماڵ و گیان بۆ سەرخستنی ئاینی خوا لە ژێر سایەی دەوڵەتێکی خواناس و دینداردا بۆ رزگارکردنی گەلانی ستەمدیدە کارو ئەرکێکی پیرۆزە ـ نەك گروپو دەستەیەکی بێ ئەزموون پێی هەستن و دەست بکەن بە ستەم کردن و دوژمنانو ناحەزانی ئەم دینە بیانکەنە دەستکەلاو یاریان پێ بکەنو ببنە هۆکارێك بە دەست پیلانگێرانەوە تا ئاینی ئیسلام بە ناشیرینی نیشانی خەڵکی بدەن وئیسلام بە سەرچاوەی ستەم و خوێن ڕێژی ناوزەد بکەن!! ـ

جا دەبێ ئیمانداران ئەوەش بزانن کە مەبەستی خوای گەورە لە سەرخستنی زاتی خۆی و پێغەمبەرەکەی ؛ سەرخستنی شەریعەت و بەرنامەکەیەتی نەك خودی خۆی، چونکە ئەو زاتە هەمیشەو بەردەوام بەهێزەو توانای بێ سنورە لە هەمان کاتدا بالادەست و دەستەلاتداریشە..

شایانی باسە کاتێ کە باسی لە وێکچونی ناوەرۆکی پەیامەکانی فەرموو، ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی کە پێغەمبەران، هەڵگرانی پەیامەکەی لە نەوی (نوح) و (ابراهیم)ن، ئەوانە درەختێکی پیرۆزن لق و پۆپیان بلاوبۆتەوە، پەیامی خوای گەورەیان بۆ هاتووە، هەر لە بەرە بەیانی پەیدابوونی مرۆڤەوە هاتوون لە (نوح)ەوە تا دەگاتە (ابراهیم)، پاشان زۆربەی پێغەمبەرانی تر لە کوڕانی (ابراهیم، اسماعیل، اسحاق) سلاوی خوایان لێ بێ پەیدا بوون، پێغەمبەری ئیسلام(ﷺ) لە نەوەی (اسماعیل)ە زۆربەی پێغەمبەرانی تریش تا دەگاتە (عیسی) لە نەوەی (اسحاق)ن، جا لە نەوەکانی تری ئەو کەسایەتیە بەرێزانە جگە لەوانەیان کە خوای گەورە کردوونی بە پێغەمبەر کەسانی خواناس و چاك هەڵکەوتوون، لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە کەسانی فاسق و گوناهکارو تاوانبار و لە سنور دەرچوو!!

هەروەها لەم ئایەتانەدا سیفەتێکی ئاشکراو دەرکەوتە لە سیفاتی شوێنکەوتووانی راستەقینەی (عیسی) باس دەفەرموێت کە بوونی ئەویش سۆز و بەزەیی و دڵسۆزی یە کە دەری دەبڕن بۆ خەڵکی و پێیانەوە دیارە، کە ئەمەش بەرهەمێکی سروشتی پەیامی (مسیح)ە سلاوی خوای لێ بێت، چونکە شوێنکەوتووانی فێری لێبوردەیی و پاکژکردنەوەی رۆح و دڵ و دەروون کردبوو..

هەروەها ئاشکرایە لە شوێنکەوتووانی راستەقینەدا ـ هەرکاتێ بە جوانی ڕێیان لە ئیسلامی راستەقینە دەکەوێت ، لە ڕێگەی موتالاو بەدواداچووندا یاخود لە ڕێگەی دیتنی موسڵمانانی جوان ڕەفتاری پابەند بە دین و دینداری یەوە، ئەوانەی کە بە کردارو گوفتار دەیگەیەنن کاریگەرییان لەسەریان دەبێت و موسڵمان دەبن.. بۆ نموونە مێژوو باسی نەجاشیمان بۆ دەکات کە چۆن موسڵمانانی کۆچبەری گرتە خۆ و دواجاریش موسڵمان بوو، هەروەها ئەو وەفدەی کە لە یەمەنەوە هاتن و بە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتن و زۆربەیان موسڵمان بوون، چونکە بەشوێن حەقدا دەگەڕان و پێشتریش شوێنی حەق کەوتبوون.

هەروەها قورئان باس لەوەش دەکات کە هەندێ لەوانە (رهبانیە)تیان داهێنا و تەرکی دنیایان هەڵبژارد، لە حاڵێکدا پەیامی ئێمە ئەوەی نەدەویست لێیان ، بەڵکو تەنها دەستەبەر کردنی ڕەزامەندی خوای گەورەی دەویست لێیان..

پێدەچێت(رهبانیە)ت و گۆشەگیری بۆ یەکلایی بونەوە بووبێت بۆ خواپەرستی، حاڵەتێکی خۆبەخش بوو لەلایەن هەندێ لە شوێنکەوتووانی (عیسی)وە سڵاوی خوای لێ بێ، ئەو حاڵەتەیان بە مەبەستی دەستەبەرکردن و مسۆگەرکردنی ڕەزامەندی خوای گەورە ئەنجام دەدا، خوای گەورە لەسەری فەرز نەکردوون ، بەڵام ئەمان خۆیان حەزیان کردووە لە کەنارگیری وگۆشەگیری و دوورە پەرێزی لە جەنجاڵی دنیا .. جا کاتێ خۆیان ئەو بژاردەیەیان هەڵبژارد و فەرزیان کرد لەسەر خۆیان، بەوە ئیتر خۆیان کردە بەرپرسیار لای خوای گەورە کە دەبێ پابەندی بن و مەرجەکانی ئەنجام بدەن، لە پاکێتی و نەفس بەرزی و قەناعەت و پاکداوێنی و زیکر و نوێژی زۆر .. تا دەربکەوێت کە ئەوانە بۆ خوا لێبڕاون ..

بەڵام بە زۆری؛ وە بە تێپەڕبوونی کات بوو بە چەند سروت و دروشمێکی بێ ڕۆح و رواڵەتێکی بێ ناوەڕۆك، خوای گەورەش دیمەن و رواڵەتی ئەو خەڵکەی ناوێت ، سروت و جوڵەی دەستی ناوێت، یاخود دەست هێنان بە سەری خەڵکدا، بەڵکو مەبەستی کارو کردەوە و نیەتە، لە هەست و نەست و ڕەفتار دەپرسێتەوە، هەر خۆیشی شاراوەکانی نێو ناخ و دڵ و دەروون و سینەکان دەزانێت .

* * *

ئێستە ئیتر خوای گەورە کۆتا گوتار روو بە ئیمانداران دەفەرموێت لە ئەڵقەی کۆتایی زنجیرەی پەیامەکانیدا چونکە ئەمان، واتە ئوممەتی ئیسلام هەڵگری ئەو پەیامەن تا کۆتایی دنیا ..

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَءَامِنُوا۟ بِرَسُولِهِۦ يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِن رَّحْمَتِهِۦ وَيَجْعَل لَّكُمْ نُورًا تَمْشُونَ بِهِۦ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٨﴾ لِّئَلَّا يَعْلَمَ أَهْلُ ٱلْكِتَـٰبِ أَلَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَىْءٍ مِّن فَضْلِ ٱللَّهِ ۙ وَأَنَّ ٱلْفَضْلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢٩﴾ ﴾

(٢٨) ئەی ئەو کەسانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە ، لە خوابترسن و پارێزکار بن ، وە ئیمانی دامەزراو بهێنن بە پێغەمبەرانی ، ئەوسا خوای گەورە ، دوو بەرانبەر پاداشت و ڕەحمەتتان پێشکەش دەکات ، هەروەها نورو روناکیەکتان پێ دەبەخشێت کە لەبەر ڕوناکیەکەیدا چالاکی بنوێنن و ڕێبازی ژیان بەدینداری یەوە بگرنەبەر ، ئەو کاتە ئیتر لیتان خۆش دەبێت ، چونکە ئەو خوایە تەواو لێخۆشبوو میهرەبانە .

(٢٩) جاکەواتە ئیتر با خاوەنانی کتێب (جولەکەو دیانەکان) بزانن کە ناتوان رەحمەت و بەخشندەیی خوا قۆرخ بکەن (وا بزانن کە پێغەمبەرایەتی هەر دەبێت لە نەوەی ئیسرائیل بێت ، گوایە ئەوان هەڵبژاردەی خوان!!) چونکە بەخشش و فەزڵ هەر بە دەست خوایەو دەیبەخشێت بە وانەی کە خۆی دەیەوێت و شایستەن ، ئەو خوایەش خاوەنی بەخشش و رێزو میهرەبانی فراوان و بێ سنورە .

ئەڵبەتە بانگکردنی باوەڕداران بە ناوی ئیمانەوە کاریگەریی خۆی هەیە لەسەر دڵ و دەروونیان، هەروەها ژیانەوەی واتای ئیمانە، بیرخستنەوەی باوەڕدارانە تا بە چاکی چاودێری پرۆسەی ئیمان بکەن و بەردەوام لە خەمیدا بن، هەروەها ئەو پەیوەندی یە دەخرۆشێنێ کە دەیانبەستێ بە پەروەردگاریانەوە؛ وە بەو شێوازە ناسك و جوانە فەرمانیان پێدەدات، هەر بە بۆنەی ئەو پەیوەندی یەوە داوای تەقواو دینداریو باوەڕی بتەوو بەردەوامیان لێ دەکات بە خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی.

شایانی باسە لێرەدا کە ئەوان ئیماندارن و داوای باوەڕ هێنانیان لێ دەکات بە خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی جێگەی سەرنج و تێڕامانە، دیارە ئەو زاتە باوەڕی تایبەتیو ئیمانی زیندو و بزوێنەری لێیان دەوێت کە ئاسەواری لە ژیانیاندا بە چاکی رەنگ بداتەوە ..

بەڵێ ! گەر تەقوادارو دیندارو باوەڕدار بن ئەوە خوای گەورە دوو بەرانبەر رەحمەت و سۆزی خۆیتان بەسەردا دەڕژێنێ، ئەمەش دەستەواژەیەکی سەیرە ، خۆ رەحمەتی خوای گەورە دابەش نابێت، کەمێکی روو بکاتە هەر کەسێك؛

بەهرەمەندی دەکات، بەڵام لێرەدا خوای گەورە مەبەستی رەحمەت و سۆزی زۆرو بەردەوامە.

هەروەها ئیمانداران بەهرەمەند دەکات لە نوری تایبەت کە لە ناخ و دڵ و دەروونیاندا گەشە دەکات و هەست بە سۆز و خۆشەویستی ئەو زاتە دەکەن، بەهۆی ئەو نورەوە پێش بینی رووداو و پێشهاتەکان دەکەن، چونکە بەرچاویان روونە و لەو نورە بەهرەمەندن ..

هەروەها خوای گەورە دەزانێ لەگەڵ ئەو ئیمان و باوەڕەشدا مرۆڤ هەڵە دەکات بۆیە مژدەی رەحمەت و بەزەیی و لێخۆشبوونیشیان پێدەدات چونکە ئەو زاتە هەمیشەو بەردەوام بۆ بڕواداران تەواو لێخۆشبووە و تەواویش میهرەبانە ..

پاشان خوای گەورە دوای باسی ئەم سۆزو رەحمەتەی بە ئیمانداران روو بە خاوەن کتێبەکان لە جولەکە و گاور کە خۆیان بە هەڵبژاردەی خوای گەورە دەزانن ، دەفەرموێت : ئەوانە با چاك بزانن کە ناتوانن فەزڵ و بەخششی خوای گەورە سنوردار بکەن، بە تایبەت بۆ ئیماندارانی ئوممەتی پێغەمبەری ئاخر زەمان .. (( کە ئاینەکەی ئاینی جولەکە و نەسرانیەکانیش لە ئامێز گرتووە، بۆ نموونە ئەوەندە قورئان بەسەرهاتی موسا و هارون و پێغەمبەرەکانی نەوەی ئیسرائیلی تێدایە خەریکە سێ یەکی قورئان بگرێتەوە، هەروەکو پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی پێدەکات .. لەلایەکی ترەوە باسی کۆتا پێغەمبەری نەوەی ئیسرائیل (عیسی) (علیه السلام) زیاتر لە بیست جار هاتووە، جگە لە سورەتێك بە ناوی دایکی بەڕێزیەوە .. لەبەر ئەوە گەر گاور و جوو کەمێك ویژدانیان هەبێ و بە بێ رق ئەستوری سەرنجی قورئان بدەن هەموویان موسڵمان دەبن، چونکە ئەم ئاینەو ئەم قورئانە رێزی تەواوی بۆ پێغەمبەرانی ئەوان داناوە و باوەڕ پێیان یەکێکە لە بنچینەکانی دین.. هەروەها بۆیە ژیرەکانیان کە موسڵمان دەبن دەڵێن

: ئێمە محمدمان دەست کەوت و مەسیحیشمان لە دەست نەچوو، جووە باوەڕدارەکانیش دەڵێن: محمد و عیسامان دەست کەوت و موسا و پێغەمبەرانی نەوەی ئیسرائیلمان لە دەست نەچوو.

حەق وایە بەم بانگەوازە کە لێرە و لە چەندەها شوێنی تری قورئاندا هاتووە. لەلایەن خواوەندی خاوەن فەزڵەوە ، جولەکە و نەسرانیەکان بە خۆیاندا بێنەوە وچاو و گوێ بکەنەوە بەتایبەت کە قورئان تەفسیرو تەرجومە کراوە بۆ دەیان زمان ، هەروەها هەوڵبدەن دڵنیا بن کە ئەم ئاینە ئاینی سۆزو بەزەیی و پێکەوە ژیان و شارستانی یە ، ئازادی بۆ سەرجەم خەڵکی دەستەبەر دەکات لە سنوری پاراستنی مافی مرۆڤدا))

لە کۆتاییدا ماوەتەوە بڵێین کە ئەم سورەتە نموونەیەکی روونە لە چۆنیەتی دواندنی دڵی مرۆڤ ، وە وروژاندنی بە شێوازێك کە کاریگەریی قوڵی لەسەر دابنێت.

سەرەتا و ڕێڕەوو کۆتاییەکەی، سەداو وێنەکانی؛ سایە و سێبەرەکانی؛ چۆنیەتی و شێوازی باسەکانی؛ قۆناغ دوای قۆناغ وانەی کاریگەر دەڵێتەوە بە بانگخوازانی ئەم ئاینە، فێریان دەکات گوتاریان لەگەڵ خەڵکی چۆن بێت، چۆن فیترەت لە خەوی غەفڵەت هەڵسێنن، چۆن دڵان ببوژێننەوە!

بەڕاستی ئەم سورەتە وانەیەکی ئەو پەروەردگارەیە کە دروستکاری دڵەکانە، نازڵکاری قورئانە، کە هەموو شتێکی بە پێوەرێکی ورد و دروست کردووە ..

بێگومان لەم قوتابخانە و دانشگا و زانکۆیەدا بانگخوازانی گوێ رایەڵ و سەرکەوتوو بڕوانامە بە دەست دەهێنن وبە سەرکەوتویی دەست بەکار دەبن !!

# پاشكۆی زانستی تایبەت بەم جوزئە

✍ـ لەگەڵ ڕێزو سوپاس و پێزانین و نزای خێرا ـ

✍ـ ناوەندی كوردستان بۆ ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا ..

✍ـ ئەم پاشكۆ زانستییەیان بۆ ئامادە كردین دەربارەی هەندێ لە ئیعجازە زانستییەكانی ئەم جوزئە ..

... خوا پاداشتی خێریان بداتەوە ...

﴿ سورەتی (ق) ﴾

﴿أَفَلَمْ يَنظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ﴾ (ق:٦) واتە: ئایا ورد نەبوونەتەوە لەو ئاسمانەی کە لە سەروویانەوەیە، چۆن بینامانکردووە و ڕازاندومانەتەوە و هیچ کەلێن و درزێکی تێدا نیە!؟

## لەم ئایەتە پیرۆزەدا سێ ڕاستی زانستیی هەیە کە ئەمانەن:

١/ وشەی (بَنَيْنَاهَا) ئەوە دەگەیەنێت کە ئاسمان وەك بینایەك وایە، ئەوەش زانست دەیچەسپێنێت و دەریخستووە کە هەسارۆکە و هەسارە و ئەستێرەکان و مەجەڕەکان و گەلە مەجەڕەکان بە هەموویان بینایەکی قەشەنگ و جوان پێکدەهێنن. چونکە وزە و مادده هەموو شوێنێکی ئاسمانیان پڕکردووە، لە کاتێکدا وشەی بۆشایی (فەزا) کە پێشتر زانایان بۆ گەردوونیان بەکاردەهێنا بوونی نیە، هەروەها توانییان بینای گەردوونی لە شێوەی چنراوێکی پتەوی پێکەوەبەستراو ببینن لەمەشەوە زاراوەی (بینا) لەلایەن زانایانەوە بۆ گەردوون بەکارهێنرا، مەجەڕەکان و ماددەی نێوانیان بە هەموویان ئەو بینا زۆر مەحکەمە پێکدێنن، لە ئێستاشدا زانایان زاراوەی وا بەکاردەهێنن کە گوزارشت لە بەشەکانی ئەم بینا گەردوونییە دەکەن وەك پردی گەردوونی، دیواری گەردوونی، ماددەی نەبینراو کە ناویان ناوە ماددەی تاریك و گەردوونی پڕکردووە و دەستی بەسەر دابەشکردنی مەجەڕەکاندا گرتووە و پرد لە نێو ئەو مەجەڕانەدا دروستدەکات کە پێکیانەوە دەبەستێت. هەروەها ئەو وێنانەی کە لە ڕێگای سوپەر کۆمپیوتەرەوە گیراون دەریانخستووە کە مەجەڕەکانی گەردوون

هەر وەك سورەیاکانی سەقفی مالآن ئاسمانیان ڕازاندۆتەوە.

٢/ وتەی ( وَزَيَّنَّاهَا ) باس لە جوانی ئاسمان دەکات کە چۆن بە ئەستێرە و مەجەڕەکان ڕازێنراوەتەوە، بە جۆرێك هێشووە مەجەڕەی وا هەیە کە ئاسمانیان بە ڕەنگە دڵرفێنەکانیان ڕازاندۆتەوە. زانایان باس لە چواندنێکی نوێ دەکەن ئەویش ئەوەیە کە کۆمەڵەی مەجەڕەکان و دیمەنێکی زۆر جوان بە ڕەنگە جیاوازەکانی وەك شین و زەرد و سەوز وەك مرواری ڕیزکراو بە دەزوو دەبینن کە گەردوونی بینایەکی ڕازاندۆتەوە.

٣/ پێشتر وا دەزانرا لە ئاسماندا بۆشایی و کون هەیە بەڵام ئەوەش بۆچوونێکی هەڵەیە کە پێویستی بە ڕاستکردنەوەیە چونکە هەندێك جار لە نێو زاراوەکانی زانایاندا زاراوەی هەڵەش دەبێت کە پاش ماوەیەك ڕاست دەکرێتەوە بەڵام زاراوەکە هەر دەمێنێت.

کاتێك زانایان هەندێك تەنی ئاسمانی وایان دۆزییەوە کە لە ئاسماندا مەلە دەکەن و هەندێکیان بە هەزاران جار گەورەتر و قورسترن لە خۆرەکەی خۆمان، ڕاستەوخۆ و یەکسەر لە نهێنی ئەو تەنانە تێنەگەیشتن و ئەوان تاریکاییەکیان دی لە نێوان ئەستێرەکاندا بۆیە ناوی (کونی ڕەش)یان لێنا، هەرچەندە ئەو ناولێنانە لە ڕووی زانستیەوە ڕاست نەبوو، بەڵام قورئان ناوی (الخنس) لەو تەنانە دەنێت کە بە مانای ئەو تەنانە دێت کە خۆیان دەشارنەوە، ئەو ناولێنانەش لە ڕووی زانستیەوە وردترە. هەروەها کاتێك زانا گەردوونیەکان ماددەی ڕەشیان لە گەردووندا دۆزییەوە وای بۆ چوون کە ئەو ماددانە کون، یان بۆشایی، یان درز پێکدەهێنن، بەڵام دەرکەوت کە بە تەواوی پڕن بە ماددەی

ڕەش، ئەو ماددە ڕەشەی کە ڕۆڵی لە دابەشکردنی مەجەڕەکاندا هەیە لە گەردووندا و، ئەو ماددەیە بە ڕێژەی ٩٥٪ ی گەردوونی پڕکردووە. ئەمڕۆش بۆ زانایان ڕوون بۆتەوە کە گەردوون بە تەواوی پڕە لە ماددە و وزە، ماددەی ئاسایی بینراو هەیە و ماددەی تاریکی نەبینراویش هەیە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَنَزَّلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً مُبَارَكًا فَأَنْبَتْنَا بِهِ جَنَّاتٍ وَحَبَّ الْحَصِيدِ ﴿٩﴾ وَالنَّخْلَ بَاسِقَاتٍ لَهَا طَلْعٌ نَضِيدٌ ﴿١٠﴾ رِزْقًا لِلْعِبَادِ وَأَحْيَيْنَا بِهِ بَلْدَةً مَيْتًا كَذَلِكَ الْخُرُوجُ ﴿١١﴾ ﴾ ( سورة ق )

واتە: (٩) هەروەها سەرنج بدەن ، هەر ئێمە لە ئاسمانەوە بارانی بە پیت و بەرەکەت ( بەو یاسایانەی کە هەر ئێمە ڕێکمان خستووە ) دادەبارێنین و بەهۆیەوە باخ و باخات و بێستانەکان دەبوژێنینەوەو دانەوێڵەی هەمەجۆریش بەرهەم دەهێنین ....

(١٠) هەروەها دارخورمای قەشەنگ و قەد بڵندو بەرزیش دەبینن چۆن هێشووە خورمای نەرم و شیرین و بەتام و جوان و لەسەریەك ڕیزکراو دەگرێت...

(١١) هەمو ئەوانە دەبنە ڕزق و ڕۆزی بۆ بەندەکانمان ، ئێمە بەردەوام بەو ئاوی بارانە زەوی یە مردووەکان زیندوو دەکەینەوەو ( هەمو ساڵێك لە وەرزی بەهاردا دیاردەی بوژاندنەوەی ڕووەکەکان دەبینن ) جا هەر بەو شێوەیە لە زەوی دەرتان دێنینەوەو زیندوتان دەکەینەوە . (وەك گژوگیاکانی بەهار) .

لەم ئایەتە پیرۆزانەدا خوای گەورە بۆمان ڕوونەکاتەوە کە ئاوی بە پیت لە ئاسمانەوە دەبارێت، دەبێتە هۆی چەکەرەپێکردنی ڕووەك، ئایەتەکە ئاو

پەیوەست دەکات بە چەکەرەکردنەوە. هەر وەکو دەزانین کە ئاو مەرجێکی بنچینەییە بۆ چەکەرەکردن، کە ئەگەر ئاو نەبێت هیچ ڕووەکێکی سەر زەوی گەشە ناکات، تۆ و دانەوێڵە لە خاکدا بە بێ ئاو چەکەرە ناکات، بەڵام کە ئاومان کرد بەسەریدا و ئاویان خواردەوە، بە شێوەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەر دەستدەکەن بە چەکەرەکردن.. ڕاستەوخۆ ڕۆیشتنی ئاو بۆ ناو پێکهاتەکانی ناوەوە لە تۆو، یان دانەوێڵە، یەکسەر دەست دەکات بە کرداره زیندە کیمیاوییەکان بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر، پاشان ئەنزیماتی کۆرپەلەیی دەردەدرێت کە ئەم دەردراوە ماددەی خۆراکی دەگۆڕێت لە ماددەی نازیندووی پێکهاتە ئاڵۆزە کە چونکە خۆراك ناتوانێ بە ناو پەردەی خانەدا تێپەڕێت و کۆرپەلە ناتوانێت بیمژێت، بۆ ماددەی نازیندووی پێکهاتە سادە کە کۆرپەلە توانای مژینی هەیە و بە پەردەی خانەدا تێدەپەڕێت. ڕاستەوخۆ دوای چوونە ناوەوە کۆرپەلە ژیانی تێدا دروست دەبێت، پاشان کۆرپەلە دەست دەکات بە گەشە و ئەندامەکانی دەردەکەوێت کە ڕەگ و ڕیشاڵە، ئاڕاستەی ڕەگ ئاسایی بۆ ناو زەوییە، بە ئاڕاستەی هێزی کێشکردنی زەوی و ڕیشاڵیش بەرز دەبێتەوە بۆ سەر زەوی بە پێچەوانەی هێزی کێشکردنی زەوی، پاشان زیاتر گەشە دەکات و گەڵای سەوز دروست دەکات، دەست دەکات بە کرداری ڕۆشنە پێکهاتن و بە جێگیرکردنی گەڵاکان و بە وەرگرتنی وزەی ڕوناکی کە ماددەی کاربۆهێدراتی یەکەمیی دروست دەکات!!

هەر بەو جۆرەش خوای گەورە مردووەکان لە گۆڕەکانیان دەردەهێنێت، کاتێك لە ڕۆژی دواییدا باران بەسەر مردووەکاندا دەبارێت بەشە

شیبووەوەکانیان دەست دەکات بە کۆبوونەوە و ژیانیان بۆ دەگەڕێتەوە و مرۆڤ دووبارە درووست دەبێتەوە، وەك چۆن ڕووەك دروستدەبێت لە کرداری چەکەرەکردندا، چۆن مادده خۆراکییەکان لەناو ڕووەکدا دەگۆڕێت بۆ زیندە ئەندام، کە دواتر گەشە دەکات و هەناسە دەدات و دەخوات و کۆپکە و گەڵا درووست دەکات و گوڵ و بەر دەگرێت و هەڵدەسێت بە کردارەکانی درووست بوون و لە ناوچوون کە هیچ کام لەمانە بوونیان نەبوو لە تۆوێکدا، یان لە دانەوێڵەیەکدا پێش چەکەرەکردن.

هەر ئەو دەسەڵات و توانایەی کە ئەو گوڵە قەشەنگ و جوانەی دەرکرد، کە توانای پەڕین و پیتاندنی پێداو ئەو بەرە جوانەی درووست کرد کە تام و بۆنی خۆش و بە سوودی هەیە، ئەو توانا و دەسەڵاتەشە کە مرۆڤ درووست دەکاتەوە و دەیژێنێتەوە لە دوای مردنی. بەم جۆرە خوای گەورە باوەڕی زیندووبوونەوە لە دوای مردن، لەگەڵ دەرهێنانی ڕووەکەکان بەهۆی ئاوەوە دەبەستێتەوە بە یەکەوە، بۆ فێرکردنی مرۆڤەکان و هەستکردنیان بەوەی کە چۆن باوەڕ بە نادیارەکان بکەن.

## ﴿ سورەتی ( الذاریات ) ﴾

﴿وَالذَّارِيَاتِ ذَرْوًا ① فَالْحَامِلَاتِ وِقْرًا ② فَالْجَارِيَاتِ يُسْرًا ③ فَالْمُقَسِّمَاتِ أَمْرًا ④﴾

ئەم ئایەتانە چەندین ئیعجازی جوڵەی بایەكان دەردەخەن، كە قۆناغ دوای قۆناغ دێـن و، بەهۆیـەوە هـەورەكان دروستدەبن و بـاران دەبارێـت و ژیـان بـەردەوام دەبێت، لەبەرئـەوە ئـەم سـوێندانەی پـەروەردگار گـەورەیی و گرنگیـەكی زۆریـان هەیە، وەك پێمان بفەرموێت: بیر لەم دیاردە گەردونییە مەزنانە بكەنەوە، ئەگەر ئەمانە نەبونایە و بەو جۆرە بەرنامەڕێژ نەكرانایە، ژیانتـان بەردەوام نـەدەبوو، هـەموو ئەمانـە بەخششـن و شایسـتەی سوپاسـگوزاریین ، بەڵگـەی توانـایی و دانایی و زانایی و ڕێكوپێكی كارەكانی خواوەندن، ئایەتی یەكەم دەفەرموێت:

﴿وَالذَّارِيَاتِ ذَرْوًا﴾ واتـە: سـوێند بـە بڵاوكـەرەوەی تـۆز و گـەردەكان، ( ذرو) بڵاوكردنـەوەی تـۆز و گـەردی هـەر شـتێكە لـە بۆشـاییەكی فراوانـدا ، وەك بڵاوكردنەوەی تۆز و دەنكۆڵەكانی ئاو یان هـەڵمی ئاو، یان دەنكە هەڵاڵەكانی ڕووەك و دابەشكردنی بەسەر درەخت و بەروبووم و گوڵەكاندا.

ئاشكرایە لە دیاردە گەردونیەكان، بایەكان هۆكاری ئەم بڵاوكردنەوانەن، لەبەرئـەوە وشـەی (الـذاریات) وەسـفە بـۆ بایـەكان، كـە بـە سیسـتەمێكی بەرنامەداڕێـژراو، هەڵدەستن بە بڵاوكردنـەوەی گەردە ورد و دەنكۆڵـەكانی ئـاو هـەوا، هـەتا دەنكە بارانـەكان لـە هەورەكانـدا دروست بـن و بپیتێنـرێن و بـاران ببارێـت، چـونكە هـەر دەنكـە بارانێـك پێویسـتی بـە دەنكۆڵەیـەك هەیـە لـە ناوكەكەیدا، هەروەها هەتا ڕووەك و بەروبومەكانیش بپیتێنرێن بە گەیاندنی نێر و مێیـەكان (هێلكۆكـە و دەنكەهەڵاڵـە). هـەروەك لـە ئایـەتێكی تـردا بایـەكان بـە پیتێنەر وەسف دەكات و دەفەرموێت:

﴿ وَأَرْسَلْنَا الرِّيَاحَ لَوَاقِحَ ...﴿٢٢﴾ ﴾ (الحجر) واتە: بایەکانمان ناردوە کە پیتێنەرن.

پاشان دەفەرموێت: ( فَالْحَامِلَاتِ وِقْرًا ) واتە: سوێند بە هەڵگرانی باری گران، ئەم ئایەتەی بە ( فاء العطف ) لەگەڵ ئایەتی پێش خۆی بەستەوە، لەبەرئەوە نزیکترە مەبەست پێی هەر بایەکان بێت، کە هەڵگری بارە قورسەکانن ئەویش هەورەکانە، هەروەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿ وَهُوَ الَّذِي يُرْسِلُ الرِّيَاحَ بُشْرًا بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ حَتَّىٰ إِذَا أَقَلَّتْ سَحَابًا ثِقَالًا ...﴿٥٧﴾ ﴾ (الأعراف)

واتە: هەر ئەو خوایەیە کە بایەکان دەنێرێت لە کاتێکدا مژدەیە (بۆ خەڵك) لە نێوان دوودەستی ڕەحمەتی پەروەردگاردا، هەتا وای لێدێت کە ئەو بایە هەوری سەنگین هەڵدەگرێت، ئەمەش وەسفێکی ئیعجازییە چونکە ئەگەر هەورەکان بە سانایی بە هەوادا دەڕۆن و بە تەنێکی سوك دێنە پێش چاومان، بەڵام زانایانی ئەمڕۆ سەلماندویانە ئەو هەورە باراناویانە کێشیان هێجگار زۆرە کە ڕەنگە خەیاڵمان بۆی نەچێت، بۆ نموونە پارچە هەورێکی یەك کیلۆمەتری کێشەکەی لە پێنج سەد هەزار کیلۆگرام زیاترە!!، بایەکان جاری وایە هێندە توانا و خێراییان زۆر دەبێت، تەنە قورسەکانی سەر زەویش هەڵدەگرن و بە هەوادا دەیفرێنن، ئەگەر ببینین کرێنێکی بینا بەرزەکان ١٠٠ تەنی بەرزکردبێتەوە، سەرسام دەبین، ئەی بەرامبەر ئەو بایانە کە زۆر لەوان زیاتر بەرزدەکەنەوە ئەوکاتە سەرسامیت بەرامبەر توانا و دەسەڵاتی بەدیهێنەری ئەو بەدیهێنراوە چۆن دەبێت!؟

پاشان دەفەرموێت: ( فَالْجَارِيَاتِ يُسْرًا ) واتە: سوێند بەوانەی بە ئاسانی هاتوچۆ دەکەن. ئەم وەسفە دەگونجێت بۆ بایەکان بێت کە بە ئاسانی

وەك نیعمەتێكی پەروەردگار گوزەر دەكەن، دەشگونجێت بۆ كەشتیەكان بێت كە بایەكان پاڵیان دەنێن. پاشان دەفەرموێت:

( فَالْمُقَسِّمَاتِ أَمْرًا ) واتە: سوێند بەوانەی كار دابەشكەرن، دەگونجێت ئەم وەسفەش بایەكان بگرێتەوە كە دەنكە هەڵاڵەكانی ڕووەك دابەشدەكەن هەتا بەرووبووم و گوڵەكان پێك بێن، هەروەها تۆز و دەنكۆڵەكان لە ناو هەورەكان بڵاودەكەنەوە هەتا دەنكە بارانەكان پێك بێن و ببارێن. یان هەورەكان دابەش بكەن بەسەر وڵاتاندا. هەروەها دابەشكردنی خێر و بێر و سوود و زیانەكان بەسەر خەڵكیدا كە بە وشەی (امرا) گوزارشتی لێ كردووە.

﴿وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْحُبُكِ ﴿٧﴾﴾ .... واتە سوێند بە ئاسمانی چنراو.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنَزَّلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً مُّبَارَكًا فَأَنبَتْنَا بِهِ جَنَّاتٍ وَحَبَّ الْحَصِيدِ ﴿٩﴾ وَالنَّخْلَ بَاسِقَاتٍ لَّهَا طَلْعٌ نَّضِيدٌ ﴿١٠﴾ رِّزْقًا لِّلْعِبَادِ وَأَحْيَيْنَا بِهِ بَلْدَةً مَّيْتًا كَذَٰلِكَ الْخُرُوجُ ﴿١١﴾﴾ ق.

لەم دواییانەدا دەركەوت، كە گەردوون لە مەجەرە و كۆمەڵەكانیان شانەیەكی پێكەوەبەستراوی توند و تۆڵ هەروەك ڕستێكی چنراو لە دەزوو پێكدێنن كە لە سەر تاڵی جوان و ڕێكوپێك دانراون ...

وشەی (حبك) لە زمانەوانیدا واتای چنینی توندوتۆڵ و ڕوون و كراوە و چاك و جوانە.

قورئانی پیرۆز لەم ئایەتەدا باسی چنراوی گەردوونیمان بۆدەكات زانایان لە سەدەی بیستویەكدا هەڵسان بە گەورەترین كردەی كۆمپیوتەری بە مەبەستی كێشانی وێنەیەكی بچوككراوەی گەردوون، ئەوەی سەرنجڕاكێش بوو،

شێوەی گەردوون وەك شێوەی چنراوی جاڵجاڵۆكە وایە. لە میانەی مانای زمانەوانی وشەكەوە دەركەوت شێوەی ئەو چنراوە گەردوونیە وەك دەزووی تێهەڵكێشراو و پێكەوە بەستراون ، وێنەكەشی ئەو چنراوە گەردوونیە نایابە لە لایەن گەورەترین سوپەر كۆمپیوتەرەوە دەكێشرێت، بە تەواوی بریتی بوو لەو شێوە دەزووە چنراوە جوان و قەشەنگانەی كە واتای وشەكە دەیگەیەنێت.

لە میانەی وێنە نوێیەكانی چنراوی گەردوونی كە سوپەر كۆمپیوتەرەكان بۆ یەكەم جار لە سەدەی ٢١ هەمدا دروستیان كردوون كە سەدان بلیۆن مەجەڕە دەگرێتەوە و هەر مەجەڕەیەكیش بە سەدان بلیۆن ئەستێرەی تێدایە و پنتە ڕووناكەكان كۆمەڵگای مەجەڕەكان دەنوێنن كە هەموویان لە لایەن خوای گەورەوە بە جوانترین شێوە ڕستراون و سوێندیشیان پێ دەخوات لەبەر گەورەییان

دوای سەلماندنی ئەم تۆڕە گەردوونیە بە ڕێگای سوپەر كۆمپوتەرەكان و دواتریش بە كرداریی توانرا بەشێك لەو چنراوە ببینرێت، لە تۆژینەوەیەكدا كە گۆڤاری زانستی(nature) ی ئەمەریكی لە ڕۆژی (٢٠١٤/٠١/١٩)دا بڵاویكردەوە" و زانایانی سەرسام كرد، بینیان چۆن چنراوی گەردوونی بە توند تۆڵی و بەوپەڕی وردی و ئاڵۆزیەوە مەجەڕەكانی پێكەوە بەستووە، وێنەكە گەورەترین پەڵە هەوری گەردوونیی نیشان دەدات كە تا ئێستا بینرابێت.زانایان دەڵێن ئەوان توانییان وێنەیەكی ڕاستیی و بۆ یەكەم جار بۆ بەشێك لەو چنراوە گەردوونییە ببینن كە مەجەڕەكانی پێكەوە بەستووە، لەگەڵ ئەوەی كە ماوەی زۆر دوور لەو چنراوە گەردوونییەمان جیادەكاتەوە بەڵام توانرا وێنەی ئەو چنراوە گەردوونییە بگیرێت، بە بوونی ئەستێرەیەكی پرشنگدار لە نزیكی ئەو چنراوانە، بووە هۆی ئەوەی زانایان بتوانن بەشێك لەو چنراوە سەرسوڕهێنەرە ببینن.

زانایان دەڵێن لە گەردووندا ملیۆنان دەزوولەی گەردوونیی هەیە و، هەر دەزوولەیەكیش ملیۆنان ساڵی ڕووناكی درێژ دەبێتەوە.!!

لەو تۆژینەوەدا باس لە بیناكردنی ڕاستەقینەی گەردوون دەكەن كە بە تەقینەوەیەكی هەرەمەكی بە دیهاتووە.. بە دروستبوونی ئەستێرە كۆنەكان دەستپێكردووە و ئەوانیش كۆبوونەتەوە بۆ پێكهێنانی مەجەرەكان و، دەستیانكردووە بە بڵاوكردنەوەی ڕووناكی، ئینجا پەڵە هەورییە گەردوونییەكان دروستبوون لە گازی هایدرۆجین و پردی گەردوونیی لە نێوان مەجەرەكاندا پێكهێناوە. ئینجا سیماكانی دەزوولە دەستیان بە دروستبوون كردووە بۆ پێكەوەبەستنی پێكهێنەرە گەردوونییەكان.. تۆژینەوەكە باس لە دەزوولە و چنراوی گەردوونیی دەكات و وێنەی تاڵێك لەو دەزوولەی نیشاندراین، بەمەش ئیعجازە قورئانیەكە زیاتر چەسپا.

﴿ وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْيدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾ واتە: ئێمە ئاسمانمان بە هێزو توانای خۆمان بەدی هێناوەو بەردەوامیش فراوانی دەكەین ( لەم سەردەمەدا ئەو ئاماژە قورئانیە وەك حەقیقەتێكی زانستی سەلمێنراوە ) .

﴿ وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْيدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾ ( الذاريات ) واتە: ئاسمانمان بیناكردووە بە هێزێكی مەزن و هەر خۆشمان فراوانی دەكەین. لە قورئانی پیرۆزدا تێبینی دەكەین هەمیشە وشەی (بناء) بەستراوەتەوە بە وشەی (السماء)ە وە، بەڵام لێرەدا بەستراوە بە فراوان بوونیەوە، شایانی باسە زۆربەی ئەو تۆژینەوانەی باس لە بیناكردنی گەردوون دەكەن باس لە فراوانبوونیشی دەكەن!! ئەمەش ئەوەیە كە قورئان زۆر بە وردی ئاماژەی بۆ كردووە بە دوور

وشەی (بَنَيْنَاهَا) و (لَمُوسِعُونَ). ئینجا ئەو پرسیارە دووبارە دەکەینەوە کە مانای چییە زانایان هەمان گوزارش و وشەی قورئانی بەکار دەهێنن؟ ئەوە مانای ئەوەیە بۆ ئەوانەی گومانیان لە قورئان هەیە هەرچەندە هەوڵ بدەن دەبێت لە کۆتاییدا هەر هەمان وشە قورئانیەکان بەکاربێننەوە!!!

زانایان دەڵێن لەگەڵ هەبوونی ئەو هەموو جۆرە جیاوازانەی جوڵەی هەسارە و ئەستێرە و مەجەڕەکاندا، بەڵام گەردوون جێگیر نییە و بەردەوام فراوان دەبێت.

(موسع) لە زمانی عەرەبیدا (إسم فاعل)ە و ، ئاماژەیە بە ڕابردوو و ئێستا و داهاتوو واتە لە ڕابردوودا ئاسمانمان فراوان کردووە و لە ئێستا و لە داهاتووشدا فراوانی دەکەین. ئەم فراوان بوونەش بەردەوام دەبێت تا ئەستێرە و مەجەڕەکان کۆدەکرێنەوە و بە پێچەوانەی ئاراستەوە دەگەڕێنەوە، وەك دەفەرموێت: ﴿ يَوْمَ نَطْوِي ٱلسَّمَآءَ كَطَيِّ ٱلسِّجِلِّ لِلْكُتُبِ كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ وَعْدًا عَلَيْنَآ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿١٠٤﴾ ﴾ الأنبياء.

ئەم فراوان بوونی گەردوونە یەکێك لە کەڵە زانایانی فیزیای نوێی خستە هەڵەوە کە ئەویش (ئاینشتاین) بوو، کە ڕای وابوو گەردوون وەستاوە، بەڵام زانایانی ئیماندار بە پشت بەستن بە ئایەتەکانی قورئان باوەڕیان وابوو کە نابێت و ناکرێت گەردوون وەستاو بێت، تاوەکو یەکێکی تر لە زانا ناسراوەکانی گەردووونناسی بەناوی (ئەدوین هابڵ) لە کۆتایی بیستەکانی سەدەی ڕابوردوودا گەیشتە ئەو ڕاستییەی کە ئەستێرە و مەجەڕەکان لە گەردووندا هەموویان لێمان دوور دەکەونەوە، واتە گەردوون لە کشاندایە، ئەم زانایە بانگهێشتی ئاینشتاینی کرد بۆ سەردانی(مرصد) ڕوانگەکەی، توانی بیروباوەڕی بگۆڕێت، و لە کۆتایی ژیانیدا دەیووت: یەکێك لەو هەڵانەی کە لە ژیانمدا تێی کەوتم ئەوە بوو کە گەردوونم بە وەستاو دەزانی .

﴿ وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾ الذاريات

واتە : لە هەمو شتێکیش ئێمە جوتمان بەدی هێناوە (لە جیهانی ئادەمیزادو گیاندارو ڕووەك و بێ گیانەکاندا لە هەموو شتێکی ماددی و مەعنەویدا) بۆ ئەوەی تێفکرن و یاداوەری وەربگرن .

ئەم ئایەتە بە تەنیا بەسە بۆ ڕاستێتی پەیامی قورئان کە وتەی خوای گەورەیە، چونکە تەحەدایەکی هێندە گەورەی تێدایە لە توانای مرۆڤدا نیە، ئەوەی ئەم وتەیە دەڵێت پێویستە ئاگاداری پێکهاتە و وردەکاری هەموو دروستکراوان بێت و لە تەنیا دانەیەکیان بێ ئاگا نەبێت، چونکە ئەگەر یەکێك شارەزای هەموو دروستکراوان نەبێت، هەر کاتێك لەو ملیاران ملیاران دروستکراوانە، یەك دانەیان دۆزرایەوە جووتی تێیدا نیە، بانگەشەکەی هەڵدەوەشێتەوە. خوای گەورە لەم ئایەتەدا ئاگادارمان دەکاتەوە کە سیستەمی جوتێتی تەنیا تایبەت نیە بە ئادەمیزاد یان زیندەوەرانی تر، بەڵکو هەموو شتەکانی تریشی گرتۆتەوە، کە ئێمە لێی بێئاگاین. ئایەتە قورئانیەکە نافەرموێت لە هەموو شتێك نێر و مێمان دروستکردوە، وەك هەندێك لە گومانکاران بڵاوی دەکەنەوە و بە هەڵەی قورئانی دەزانن، بێگومان بێباوەڕان زۆر جار لە بڵاوکردنەوەی گومانەکاندا بیر ناکەنەوە، چونکە لای ئەوان وشەی جووت (زوج) تەنیا نێر و مێ دەگرێتەوە؟!! ئەگەر لێشیان بپرسیت ئایا ژمارە جوتەکان مەبەست پێی نێر و مێیە؟ ڕاستەخۆ گومانەکەیان پوچەڵ دەبێتەوە، تەفسیری ئیبن کەسیر لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا دەڵێت: خودای گەورە لە هەموو دروستکراوەکان جوتێکی داهێناوە وەك ئاسمان و زەوی، شەو و ڕۆژ، خۆر و

مانگ، وشکانی و دەریا، ڕوناکی و تاریکی، باوەڕدار و بێباوەڕ، مردن و ژیان، بەدبەختی و خۆشبەختی، بەهەشت و دۆزەخ، هەر لەبەرئەمەشە خوای گەورە لە کۆتایدا فەرمووی: " لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ" هەتا بیربکەنەوە و بزانن دروستکەری ئەم جووتانە تەنها خوای تاك و تەنهایە و هاوبەشی نیە.

لە فەرهەنگەکانی زماندا بەم جۆرە مانای (زوج) کراوە " کل ما یقترن باخر مضادا لە او مشابە لە ولا یطلق علي الفرد الواحد ) واتا: (هەر شتێك پەیوەندیداربێت بە دانەیەکی هاوشێوە یان دژی خۆی، و بۆ تاك بەکارنایەت)، تەفسیری قورتوبی دەڵێت: ﴿ وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ... ﴿٤٩﴾ ﴾ الذاریات " اي: صنفین و نوعین مختلفین واتە: دوو پۆل و دوو جۆری جیاواز. لێکۆڵینەوە نوێیەکانیش سەلماندیان سیستەمی جوتێتی هەموو گەردوونی گرتۆتەوە چونکە هەموو بینای گەردوون لە گەردیلە پێك هاتووە، کە گەردیلەش لە جوتێکی کارەبایی پێکهاتووە کە ناوکی بارگە موجەب و ئەلکترۆنی بارگە سالبە کە بە دەوری ناوکدا دەخولێتەوە.

لە ڕوویەکی ترەوە زانایان سەلماندیان هەموو ماددەیەك بەرامبەرەکەی هەیە و پێی دەڵێن دژە ماددە، هەر کاتێك بەریەك کەوتن، یەکیان ئەوەی تریان لەناو دەبات و دەبێتە وزە، هەروەها هەموو تەنۆلکە سەرەتاییەکانی ماددە دژەکەیان هەیە. کە ئەویش (پۆزیترۆن)ە و بە دژە تەنی (ئەلکترۆن) ناودەبرێت و لە هەموو سیفات و تایبەتمەندیە فیزیاییەکان لە ئەلکترۆن دەچێت تەنها لە بارگەی کارەبایی نەبێت چونکە پۆزیترۆن بارگەی موجەبی هەیە بە پێچەوانەی ئەلکترۆن کە سالبە.

## ﴿ سورەتی ( الطور ) ﴾

﴿ وَٱلْبَحْرِ ٱلْمَسْجُورِ ۝٦ ﴾.... واتە: سوێند بە دەریای داگیرساو.

لەکاتی دابەزینی قورئاندا نەدەتوانرا ڕاستیی ئەم سوێندە ببینرێت، چونکە ئاو و ئاگر دژن، ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوە و ئاگریش ئاو دەکاتە هەڵم، چۆن دەتوانرا ئەم دیاردەیە بهێنرێتە پێش چاو؟! بە تایبەتی ئەو ئاوە زۆرەی دەریاکان نەتوانێت ئاگرێك کە لە ناویدا بێت بیکوژێنێتەوە؟! یان ئەگەر ئاگرەکە هێندە گەورەیە و بە ئاوی دەریا و زەریاکان ناکوژێتەوە بۆچی لە سەردەمی پێغەمبەردا و بەڵکو دوای ئەو بە چەندین سەدە نەیان بینیوە.

ئەمەش وای لە هەندێك لە تەفسیرزانان کردووە، واتای ئەم سوێندە ببەنەوە بۆ کاروبارەکانی ڕۆژی دوایی، پاڵپشت بە ئایەتی (٦)ی سوورەتی (التکویر) کە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا ٱلْبِحَارُ سُجِّرَتْ ۝٦ ﴾ واتە: کاتێك دەریاکان لە ڕۆژی دواییدا هەموویان سووتێنران، بەڵام گەر تێبینی بکەین لەپێش ئەم ئایەتەدا (پێنج) سوێندی ترە بە ڕووداوەکانی ڕۆژی دوایی وەك دەفەرموێت:

﴿إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ ۝١ وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتْ ۝٢ وَإِذَا ٱلْجِبَالُ سُيِّرَتْ ۝٣ وَإِذَا ٱلْعِشَارُ عُطِّلَتْ ۝٤ وَإِذَا ٱلْوُحُوشُ حُشِرَتْ ۝٥ وَإِذَا ٱلْبِحَارُ سُجِّرَتْ ۝٦ ﴾ ،لەکاتێکدا پێنج ئایەتی پێش ئایەتی: ﴿وَالْبَحْرِ الْمَسْجُورِ﴾ هەموویان سوێندن بە شتانی ئێستا نەك بە ڕووداوەکانی ڕۆژی دوایی، کەواتە بۆ ئەوەی ئەم ئایەتەش لەگەڵ واتای ئایەتەکانی پێشویدا بێت، دەبێت بە دروستکراوێکی دونیا لێکی بدەینەوە.

وشەی المسجور لە زمانەوانیدا دوو واتای هەیە یەکەم لێوان لێو لە ئاو کە لێی نەڕژێت، دووەم واتای سەرەکی وشەکەیە، بە مانای گڕدراو و

بلێسەدراو. واتای وشەی المسجور بە (المملؤ بالماء والمكفوف عن اليابسة):
زانایان دەڵێن ئەو بەستەڵەکانەی کۆبوونەتەوە لە هەردوو جەمسەرەکان و لوتکە چیاکانی زەویدا کە بەرێژەی (٢.٠٥٢ ٪ تا ٢.١٥٪)ی ئاوی سەر زەوییان لای خۆیان بەند کردووە، گەر بتوێنەوە (کە ئەوەش پێویستی بە بەرزبوونەوەی تەنها ٥ پلە پلەی گەرما هەیە تەنها بە ڕادەی پێنج پلە لە هاوینی ئەو ناوچانەدا) گەر ئەوە ڕوویدا، ئەوا بڕی ئاوی دەرچوو دەبێتە هۆی بەرزبونەوەی ئاستی ڕووی دەریا و زەریاکان بۆ زیاتر لە (١٠٠) سەد مەتر!! ئەو کاتەش زۆرینەی ناوچە دانیشتوانییەکان نوقم و نغرۆ دەکات، بێگومان ئەوەش لە ڕوانگەی خەیاڵی زانستییەوە نیە چونکە زەوی چەند جارێک ئەم حاڵەتەی بەسەردا هاتووە، هەروەها چەند جارێک بە پێچەوانەوە ئاستی ئاوی دەریا و زەریاکان لە ئاستی ئێستای نزمتر بۆتەوە، بەوەش وشکانی زیادی کردووە، بەڵام ڕێکخەر لە هەردوو حاڵەتەکەدا بڕی بەستەڵەکی کۆبووەوەی سەر وشکانییە، چونکە هەر کات بڕی بەستەڵەك زیادی کرد ئاستی ئاوی دەریا و زەریاکان کەم دەکات و ڕووبەری وشکانی زیاد دەکات، بەپێچەوانەوە هەرکات بڕی بەستەڵەك کەمی کرد ئاستی ئاوی دەریا و زەریاکان بەرز دەبێتەوە و ڕووبەری وشکانی کەم دەکات، لێرەوە واتای ئەم سوێندە قورئانییە تێدەگەین، بەوەی کە خوای گەورە منەت و بەخششی کردووە بەسەرماندا بە پڕکردنی نزمایییەکانی زەوی بە ئاوی دەریا و زەریاکان و بەربەستێکی لەبەردەم ئەو ئاوەدا داناوە تا سەرکەشیی بۆ وشکانی نەکات، ئەوەش بە بەندکردنی بڕێك لەو ئاوە لە چەندەها شێوەدا کە گرنگترینیان ئەو ئەستوورییە زۆرانەی بەستەڵەکە کۆبووەوەکانی سەر جەمسەرەکانی زەوی و لوتکە چیاکانە، کە دەگاتە (٤) کیلۆمەتر لە جەمسەری باشووری زەوی و (٣٨٠٠) مەتر لە جەمسەری باکووردا.

واتای وشەی (المسجور) بە (تهییج النار): یان (المحروق) یان (الموقد)، واتە: دەریای داگیرساو و سووتێنراو بە ئاگر، پاڵپشت بۆ ئەم واتایەش فەرموودەی پێغەمبەرە (ﷺ) کە دەفەرموێت: ( لا یَرْکَبِ البَحرَ إلا حاجٌّ أو مُعْتَمِرٌ أو غازٍ في سبیل اللهِ فَإنَّ تَحتَ البَحرِ ناراً وَتَحتَ النَّارِ بَحْراً ) ، واتە: کەس بە دەریادا سەفەر نەکات تەنها بۆ حەج یان عەمرە یان غەزا لە پێناوی خوادا نەبێت، چونکە ژێری دەریا ئاگرە و ژێر ئاگرەکەش دەریایە، هەروەها لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: ( إنَّ تَحْتَ البحرِ ناراً، ثمَّ ماءاً، ثمَّ نارا) ، واتە: ژێر دەریا ئاگرە، پاشان ئاوە، پاشان ئاگرە، (ئیبن حەجەر) ئەم فەرموودەیەی بە پلەی (حسن) داناوە

لەدوای جەنگی جیهانی دووەمیش زانایان بە مەبەستی گەڕان بە دوای سامانی کانزاییدا بۆ قوڵایی دەریا و زەریاکان دابەزین، لە ناکاو گەشتن بە زنجیرە بەرزاییەکی گڕکانی و بینییان لە ناوەندی هەموو زەریاکاندا بە درێژایی دەیەها هەزار کیلۆمەتر درێژبوونەتەوە، بۆیە ناویان نا چیاکانی ناوەندی زەریاکان، بە لێکۆڵینەوەشیان دەرکەوت لە ئەنجامی دەرپەڕینی فوارەی توندی گڕکانیدا دروست بوون و، لە نێوان تۆڕێکی بەرفراوانی قڵیشی گەورەی توێکڵی زەوییەوە دەردەپەڕن، کە درێژی ئەو تۆڕانە دەگاتە ٦٤٠٠٠ کیلۆمەتر و قووڵییان ٦٥کیلۆمەترە، واتە توێکڵی بەردینی زەوی دەبڕن و دەگەنە پشتێنەی لاوازی زەوی، کە لەویادا بەردەکان لە شێوەی نیمچە تواوە و چڕی بەرز و توانای بەیەکدانووسانی زۆردان و تەوژمی هەڵگرتووی گەرم بەملیۆنەها تەنی بۆ بنکی زەریاکان و هەندێ لە بنکی دەریاکان (وەك دەریای سوور) لە سەروو هەزار پلەی

سەدییەوە بۆ تەنیشتی زەریاکە بە ڕاست و چەپدا پاڵ دەنێت، ئەویش لە دیاردەیەکدا دەبێت کە زانایان بە فراوان بوون و لاربوونەوەی بنکی دەریا و زەریاکانی ناو دەبەن، بەوەش پلێتەکانی توێکڵی زەوی لە لایەکەوە دووردەکەونەوە و لە لایەکی دیکەوە دەکێشن بە یەکداو بە ڕووی یەکتریدا بەرز دەبنەوە و زنجیرە چیا پێك دێنن، ئەو قڵیشانەی زەوی ژێر ئاوەکەش کە لە ئەنجامی دوورکەوتنەوەوە دروست بوون، بە تەواوەی بەردینی دەرپەڕیو لە شێوەی فوارەی گڕکانیدا پڕدەبن و بنکی زەریاکان دەسوتێنن.

لەبەرامبەردا پلێتەکانی توێکڵی زەوی لە ناوچە سنوورییەکانی فراوان بوونی دەریا و زەریاکاندا بەیەکدا دەکێشن، ئەوەش دەبێتە هۆی دەرپەڕینی بنکی زەریاکان لە ژێر بارستە کیشوەرییەکاندا و وردە وردە دەتوێنەوە ئەمەش هۆکاری دروست بوونی چاڵی گەورەیە لە شوێنی بەیەك گەیشتنی بنکی زەریاکان بە بارستە کیشوەرییەکان، کە لەویادا بڕێکی زۆر لە بەردی (نیشتەنی و ئاگری و گۆڕاو) تیایدا کۆ دەبێتەوە، هەتا بەرز دەبێتەوە لە شێوەی زنجیرە چیا لە سنووری کیشوەرەکاندا، وەك: زنجیرە چیاکانی (ئیندێن) لە خۆرئاوای ئەمریکای باشوور، لەوێشدا بنکی زەریاکان وردە وردە لە ژێر بارستە کیشوەرییەکاندا ورددەبن و نامێنن، هەرکات کرداری فراوانبوونی بنکی زەریاکان وەستا، مانای ئەوەیە ئەو بنکە بە تەواوی لە ژێر دەریاکاندا کاربووە، ئەمەش دەبێتە هۆی بە یەکدا کێشانی دوو کیشوەر بە یەکتریدا، لەو بە یەکدا کێشانانەشدا بەرزترین زنجیرە چیا پێکدێن وەك: زنجیرە چیاکانی هیمالایا، کە لە ئەنجامی بە یەکدا کێشانی هیند بە کیشوەری ئاسیادا پاش ئەوەی بنکی ئەو زەریایەی نێوانیان کە جیای کردبوونەوە بە تەواوی نەماوە" دروست بووە،

جێگای باسە لەگەڵ هەموو فراوان بوونێك یان بەیەكدا كێشانێك چەندین زەمین لەرزە و كڵپە و فوارەی گڕكانی لەگەڵ خۆیدا دێنێت .

درێژی زنجیرە چیاكانی ناوەڕاستی زەریاكان دەگاتە زیاتر لە شەست و چوار هەزار كیلۆمەتر، لە كاتێكدا درێژی ئەو كەلێن و قڵیشە قووڵانەی كە گڕكانەكانی لێ‌دەرپەڕیوە بۆ پێك هێنانی زنجیرە چیاكانی ناو دەریاكان دوو هێندەی ئەو ژمارەیەیە.

هەردوو زانای ڕووسی (ئەناتۆل سجابڤیتش)ی جیۆلۆجی و (یۆری بجدانوف)ی زیندەوەرزانی و جیۆلوجی، بە هاوبەشی لەگەڵ زانای ئەمریكی ناسراو (رونا كلنت) هەڵسان بەژێر كەوتن بۆ بینینی گرنگترین قلیشە گەورەكانی توێكڵی زەوی لە نزیكەوە، پاش ئەوەی بە ژێر دەریایەكی تایبەتی نوێ بە ناوی (میرا) ژێرئاو كەوتن و گەشتنە خاڵی ئامانج لە دووری (١٧٥٠) كیلۆمەتر لە كەناری میامی (لە وڵاتە یەككگرتووەكانی ئەمریكا) هەتا لە ڕووی زەریاكەوە دوو میل چوونە خوارەوە تا گەیشتنە ئاوێكی كوڵاتوو لە (٢٣١) پلەی سەدیدا، كە لەویادا تەنها بەربەستێك لە (ئەكریلیك) جیای كردبوونەوە، بینییان لە خوارووییانەوە چەندین سەرچاوەی ئاگرین دەتەقێتەوە و ئاوی ساردی ڕووی زەریاكە بە قووڵایی یەك میل بەرەو خوار پاڵدەنرێت و لە كڵپە گڕكانییەكانەوە نزیك دەبێتەوە و پاشان گەرم دەبێت و كانزای گڕاوی هەڵدەگرێت، هەروەها تێبینییان كرد ئەم دیاردەیە لە هەندێ شوێنی دەریا و زەریاكاندا زۆرە و لە هەندێ شوێنی تریاندا كەم دەبێتەوە.

ئەم دیاردەیە لە بنكی زەریاكاندا ڕوودەدەن و بە چاوی ئاسایی نابینرێن، تەنیا لە چەند شوێنێكی كەمی جیهاندا نەبێت كە لەم دە ساڵەی دواییدا بینراون ئەو ئاگرانە سەریان لە ڕووی دەریاكانەوە دەركردووە و ئەم تەقینەوانە هەر لە بنی ئاوەكەدا نابن و هەندێ جار دەگەنە ڕووی ئاوەكە و دەتەقنەوە، بۆ نموونە

ئەمەش تەنها لە ناوچەکانی ئەلاسکا و جەمسەری باکوردا بینراوە. پاک و بێگەردی بۆ خوای گەورە دوای ئەوەی ئەو سوێندە ئیعجازیەی فەرموو ئینجا باسی سزاکەی کرد و فەرمووی: ﴿ وَٱلْبَحْرِ ٱلْمَسْجُورِ ۝٦ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَٰقِعٌ ۝٧ ﴾ الطور، لەبەرئەوەی ئەی بێباوەڕ هەروەک چۆن لە دونیادا ئەم دۆزەخە دەبینیت، ئەگەر باوەڕ نەهێنیت لە دواڕۆژیشدا دەیبینیت.

﴿ وَإِن يَرَوْا۟ كِسْفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ سَاقِطًا يَقُولُوا۟ سَحَابٌ مَّرْكُومٌ ۝٤٤ ﴾ الطور

واتە : خۆ ئەگەر لە سەر ئەنجامی یاخی بون و لادانیاندا خوای گەورە بەڵایەکیان بۆ بنێرێت لە ئاسمانەوەو ڕوو بە زەوی بێت ، نەفامان دەڵێن: هیچ نیە ، پەڵە هەورەو نیشتۆتە سەریەک!!

ئەم ئایەتە دیاردەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەر باس دەکات، کاتێک خەڵکە بێ دینەکە بەردێك دەبینن لە ئاسمان بەردەبێتەوە دەڵێن هەورە چونکە وەکو هەورێکی سەریەک نیشتوو دەیبینن و نازانن بەردە.

ئەم ئایەتە قورئانیە ئیعجازێکی ڕۆشنی تێدایە کە بە هۆی کەوتنە خوارەوەی نەیزەکەکەی روسیا لە ٢٠١٣دا دەرکەوت، کاتێك بەردێکی گەورە لە ناوچەی باشوری ئۆرالی ڕوسیا، کەوتە خوارەوە بە خێرایی (١٨کم/چرکە)یەکدا، بارستاییەکەی (١٠) هەزار تەن بوو، لە ئاسماندا دوو هەوری سەریەکی لوولپێچیی دوکەڵی لەسەر شاری شیلابینسك دروستکرد، دواتر لە بەرزی (١٠کم) تەقیەوە، کە (٣٠) هێندەی بۆمبی ئەتۆمی وەك ئەوەی هێرۆشیما بەهێز بوو، ئاسمانی ئەو ناوچەیەی تەواو درەوشاندەوە، دەنگی تەقینەوەکە پەنجەرەی خانووەکانی شاری شیلابینسکی شکاند و لە ئەنجامدا زیاتر لە هەزار کەس بریندار بوون، هەروەها زیان بە نزیکەی سێ هەزار خانوو

کەوت، ئاشکرایە ڕووداوێکی لەم جۆرە بۆ خەڵکی ڕوسیا و هەموو جیهانیش ڕووداوێکی تەواو نامۆ بوو، چوونکە لە ڕۆژدا و لەسەردەمی تازەدا مرۆڤ نەیزەکی وای نەدیبوو، کە ڕووناکیەکەی بەسەر تیشکی خۆردا زاڵ بوو، دەنگی زۆر گەورە بوو هەوری سپیی دوکەڵیی دروست کرد، ڕووداوێکی یەکجار دەگمەن بوو.

لە ڕاستیدا کەوتنە خوارەوەی ئەو نەیزەکەی ڕوسیا ئیعجازێکی ڕۆشنی قورئانی پیشانداین، چونکە وەك لە ڤیدیۆکاندا دیارە سەرەتا خەڵکی نەیزەکەکەی نەبینی، بەڵکو تەنیا ئەو دوو هەورە لوولپێچیە سەریەکەیان بینی کە دیمەنێکی ناوازە بوو پێشتر شتی وا نەبینرابوو، هەتا زیاتر لە خولەکێك بەو شێوەیە بەردەوام بوو، ئنجا تەقیەوە و لە ئەنجامدا ڕووناکییەکی گەورەیان بەدیکرد، کە دەنگی تەقینەوەکە هێند بەرز بوو، بووە هۆی شکاندنی پەنجەرەکانیان و کەوتنە خوارەوەی بەردەکە لە شوێنێکی تا ڕاددەیەك دوور لە بیناکان.

ئەم ئایەتە سەدان ساڵە دەخوێنرێتەوە بەڵام نەدەزانرا بۆچی بەردێکی ڕەق یان گەلە بەردێك لە کاتی کەوتنە خوارەوەیدا، دیمەنی هەوری لەسەریەك دروست دەکات!! ئەم دووانە چەند لێك دوور و جیاوازن، بەڵام وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْـَٔافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ...﴿٥٣﴾﴾ فصلت، واتە: لە داهاتوودا نیشانە و بەڵگەکانمانیان لە گەردوون و خودی خۆشیاندا نیشاندەدەین، تا بۆیان ڕوون ببێتەوە قورئان وتەی خوای گەورەیە. بۆیە ئەمەش بووە یەکێکی تر لەو سەدان موعجیزە زانستیانەی قورئانی پیرۆز، خوای گەورە ویستی وا بوو لە ڕۆژدا نەك لە شەودا و کاتێك ئاسمان ساف و سایەقە بێت و هەوری تری پێوە نەبێت، ئەم موعجیزەیە دەرکەوێت، تا ڕاستێتی پەیامەکەی ببینن. لەوانەیە یەکێك بڵێت لە سەردەمی

زووشدا بەردیان بینیوە کەوتۆتە خوارەوە و شێوە هەوری دروستکردووە، بۆیە پێغەمبەر باسی کردووە، لە وەڵامی ئەمەدا دەڵێین، بێگومان ئەگەر پێغەمبەر و هاوەڵان شتی وایان بینیبێت و ڕویدابێت، ئەوا تۆمار دەکرا، بەڵام دەبینین هیچ ڕوداوێکی وا لە ژیانی ئەو و لە پێش و دوای سەردەمی ئەویش باس نەکراوە و تۆمارنەکراوە، بۆ نموونە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ڕاڤەکارێکی قورئان نابینیت کە ئاماژەی دابێت بەم دیاردەیە، بە پێچەوانەوە لەبەر ئەوەی بەلایانەوە قورس بووە کە کەوتنە خوارەوەی بەردێك لە ئاسمان شێوەی هەور دروستبکات، بەڵکو وتویانە: بێباوەڕان ئەوەندە عیناد و نکوڵیکارن کە هەتا بەرد بکەوێتە خوارەوە دەڵێن هەوری لەسەر یەکە!! واتە کەس پێشتر نەیزانیوە کە ئەمە لە واقیع و بینیی چاودا خۆی بەو شێوەیەیە .

کەواتە کێ هەواڵی ئەم ڕووداوەی لە سەدەی حەوتەمدا بە پێغەمبەر (ﷺ) دا؟ هەتا لەسەدەی بیست و یەکدا و لە ڕۆژی ڕووناکدا ببینرێت و وێنە بگیرێت؟ دیارە بۆ بینینی ئەم ئیعجازە دەبێت لە ڕۆژی ڕووناکدا ڕوو بدات، تا هەورە کە ببینرێت، چونکە لە ساڵی (١٩٠٨)ز لە سیبریا نەیزەکێك کەوتە خوارەوە و شەوی ئەو ناوچانەی ڕووناك کردەوە و ناوچەیەکی فراوانی سوتاند، دەنگی تەقینەوەکەی گەیشتە هەزاران کیلۆمەتر، و چاڵێکی بە تیرەی (١٠)کم دروستکرد و بە پانتایی (٣٠)کم چواردەوری خۆی وێرانکرد و دارەکانی هەموو هەڵکەند! بەڵام چونکە لە شەودا بوو هەورە دوکەڵیەکەی نەبینرا.




## ﴿ سورەتی ( النجم ) ﴾

﴿وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰ ۝٤٥ مِن نُّطْفَةٍ إِذَا تُمْنَىٰ ۝٤٦﴾

(٤٥) هەرئەویش دوو جۆر ڕەگەزی دروست کردووە ، نێرو مێی لە هەموو گیانداراندا بەڵکو لە بێ گیانەکانیشدا بەدی هێناوەو لە هەمو شت جوت و دوو شێوازی جیاوازی تەواوکاری یەکتری بەدی هێناوە.

(٤٦) بە تایبەت ئادەمیزادی بەدی هێناوە لە نوتفەیەك ، خاڵێکی زۆر بچوك ئەویش ئەو کاتەی کە بواری پیتاندنی بۆ بڕەخسێت و لە منداڵداندا خۆی هەڵبواسێت (جا لەو خاڵە زۆر بچوکەدا سیفاتەکانی بۆ ماوەیی ، مادی و مەعنەوی دایك و باوك و باوو باپیران هەموی ئاخنراوە!!) .

واتە: پەروەدگارت دوو جۆری دروستکردووە کە نێر و مێیە، لە نوتفەیەك کاتێك لەجێی خۆیدا دادەنرێت و بەرنامەڕێژی بۆ دەکرێت. ( إذا تمني) : واتە: کاتی دەرچوونی نوتفەکە و ئەندازەکردنی. ئاشکرایە هەتا سەردەمی تازە نەهات مرۆۃ نەیدەزانی نێر و مێ لە سەرەتای پیتاندندا دروستدەبێت، ئەویش دروست بوونی نێر بە یەککگرتنی دوو کرۆمۆسۆمی (XY) و دروست بوونی مێ بە یەکگرتنی دووکرۆمۆسۆمی(XX) ، بەڵکو وا دەزانرا کە لەسەر ئاستی ئەندامی زاوزێی مرۆۃ نێر و مێ جیا دەکرێتەوە، بەڵام قورئانی پیرۆز دروست بوونی نێر و مێی گەڕاندۆتەوە بۆ یەکەم ساتی پیتاندن.

وشەی (تمني) دوو واتای هەیە:

١- تخرج: دەرچوون، ئەم واتایە ئەوە دەگەیەنێت كە كاتی دەرچوونی نوتفەكە و پیتاندنی، نێر و مێ دروست دەكرێت.

٢- تقدر: (بەرنامەدانان و ئەندازەكردن) دەوترێت (معني المعاني) أي (قدر المقدر). ئەم واتایە ئەوە دەگەیەنێت كە لە كاتی دەرچوونی نوتفەكە، بەرنامەی كۆرپەكە دادەرێژرێت، كە ئەمەش زانستێكی فراوانی بۆماوەزانییە. واتە جگە لە دیاریكردنی رەگەز لە سەرەتادا هەموو پرۆگرامی داهاتووی ئەو كۆرپەیە دادەرێژرێت (شێوە، رەنگی چاو و پێست، دەنگ، باڵا...) و هتد.

## ﴿ سورەتی (القمر) ﴾

﴿اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ ۝١ وَإِن يَرَوْا آيَةً يُعْرِضُوا وَيَقُولُوا سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ ۝٢ وَكَذَّبُوا وَاتَّبَعُوا أَهْوَاءَهُمْ وَكُلُّ أَمْرٍ مُّسْتَقِرٌّ ۝٣﴾

ڕوودانی لەت بوونی مانگ وەك لە چەندین فەرمودەدا هاتووە لە سەردەمی پێغەمبەردا ڕویداوە یەکێکە لە موعجیزە دیار و بەرچاوەکان، خەڵکی مەککە داوای موعجیزەیەکیان لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد، ئەویش مانگی بە دوو کەرتی نیشان دان، تا لە نێوان دووکەرتەکەدا ئەشکەوتی حەرایان بینی هەروەها لە چەندین ڕیوایەتی تر ئەم کەرت بوونە هاتووە کە هەر یەك بە پێی ئەو شوێنەی لێی بووە کەرت بوونی مانگی بینیوە، هەیانە دەڵێت: بینیم کەرتێکی چووە سەر ئەو چیایە و کەرتەکەی تری چووە سەر چیاکەی تر، کاتێك کافران بینیان وتیان محمد جادووی لێکردین، بەڵام هەندێك لە ژیرەکانیان وتیان: ئەگەر جادووی لە ئێمە کردبێت خۆ ناتوانێت جادوو لە هەموو خەڵکی بکات، بۆیە وتیان: چاوەڕوانی کاروانچیان بکەن و بزانن ئەوانیش بینیویانە، خۆ ئەگەر ئەوانیش بینیبێتیان ئەوە محمد ڕاست دەکات، ئەگەر نەشیان بینیبێت جادووی کردووە، هەتا کاروانیەکان لە هەموو لایەك هاتنەوە پرسیاریان لێکردن و ئەوانیش وتیان ئێمەش بینیومانە، بەمەش هەندێك موسوڵمان بوون.

تۆمارکردنی ئەم ڕووداوە گەورەیە لە قورئانی پیرۆزدا بەڵگەیە بۆ هەموو خەڵکی بە باوەڕدار و بێباوەڕیشەوە هەتا ڕۆژی دوایی کە دڵنیا بن ئەم ڕووداوە ڕوویداوە، چونکە ئەگەر ڕووینەدایە و قورئانی پیرۆز تۆماری بکردایە، چی

دەبوو؟ ئایا نەیاران نەیان دەکردە هەلاّ و بە درۆخستنەوە، کە چۆن قورئان ئەم ڕووداوە باس دەکات و دەڵێت مانگ دووکەرت بووە و شتی واش نەبووە؟ لەلایەکی تریش باوەڕدارانیش دەکەوتنە گومانەوە، لە دوای تۆمارکردنی قورئان بۆ ئەم ڕوداوە بێباوەڕە بە ویژدانەکان موسوڵمان بوون و باوەڕدارانیش هێندەی تر لەسەر ئاینەکەیان جێگیر بوون.

مێژووی هیند ناوی پاشایەکی خۆی تۆمار کردووە بەناوی ( جاکروانی فرمان )، ئەم پادشایە ڕووداوی لەت بوونەکەی مانگ دەبینێت، یەکێك لە دەستنوسە مێژوویەکانی هندیش بەم جۆرەی نوسیوە ، پاشا ماجبار ( مالابار ) لە هیند( جاکروانی فرماس )، لەت بوونی مانگی بینی، کەبە دەستی محمد ڕوویدا ، کاتێك هەواڵ هات کە پێغەمبەرێك لە دورگەی عەرەبی هاتووەو بە ئامارەی دەستی ئەو لەت بوونە کە ڕویداوە ، زۆر بە پەرۆش بوو بۆ بینینی پێغەمبەرو، کوڕەکەی لە شوێنی خۆی داناو بەرەو دورگەی عەرەبی بۆ لای پێغەمبەر بەڕێکەوت ، کاتێك پێغەمبەری بینی موسوڵمان بوو ، لەسەر داوای پێغەمبەر بۆ نیشتیمانی خۆی گەڕایەوەو لە مینای ڤفار وەفاتی کرد، ئەم زانیاریانە لە دەستنوسێکی هندی لە مەکتەبەی دائیرەی هیند هەیە، کەبە درێژتر باسی ( جاکروانی فرماس )ی تیاکراوە . ( دەستنوسە هندییەکە لە کتێبخانەی بەشی هیندستان لە لەندەن هەیە، ژمارەی ( ٢٨٠٧ ، ١٥٢ هەتا ١٧٣ )ی پێدراوەو، (حميدالله) لە کتێبی ( محمد رسول الله ) دەریهێناوە .

وەکالەتی ناسای ئەمریکی بە بەڵگەی زانستی لەت بوونی مانگی سەلماندووە و لە دیوە نادیارەکەی مانگدا ئاسەواری لەت بوونەکە ئاشکرایەو وێنەی گیراوە، ڕەنگە لەبەر ئەوەی زیاتر پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ) دەسەلمێنێ زۆر زەقی نەکەنەوە!!

## ﴿ سورەتی ( الرحمن ) ﴾

﴿الرَّحْمَنُ ۝١ عَلَّمَ الْقُرْآنَ ۝٢ خَلَقَ الْإِنسَانَ ۝٣ عَلَّمَهُ الْبَيَانَ ۝٤﴾

واتــە: "خــوای بەخشــندەی بــە بــەزەیی، قورئــانی فێركــردووە، مرۆڤــی دروستكردووە، ئاخاوتنی فێركردووە."

ئەم ئایەتانە فێرمان دەكات چۆن خوای گەورە منەت دەكات بەسەر مرۆڤدا بە بەهرەی ئاخاوتن (البیان)، خوای گەورە نەیفەرمووە (علمه الكلام) لەبەرئەوەی فێركردنی مرۆڤ بە زمان، یان بە قسەكردن بەس نییە، بەڵكو پێویستە وشەكان پێكەوە ببەستێتەوە و لە كاتی پێویستدا بیانگێڕێتەوە، واتە بە شێوەیەكی ڕێكوپێك و لە شوێنی خۆیدا بەكاریان بهێنێت.

قسەكردن ئەو موعجیزە سەرسوڕهێنەرەیە، كە تا ئێستا زاناكان لە ئاستیدا سەرسامن ولێكدانەوەیەكی زانستییانەیان بۆ ئەو دیاردە سەرسوڕهێنەرە نەدۆزیوەتەوە، بەڵام قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ ئەو موعجیزە سەرسوڕهێنەرە كردووە،زانایان دەڵێن: مرۆڤ تەنها بوونەوەرە كە دەتوانێت قسە بكات، مرۆڤ بە پرۆگرامو هۆكارو ئامێری زیندوو سازكراوە، بە هۆیەوە دەتوانێت زۆر بە ئاسانی قسە بكات، لەبەرئەوە ئەم كردەیە بۆ تیۆری پەرەسەندنی گوماناویی ملكەچ ناكات، ئەگەر قسەكردنو فێربوونی زمان، لە ڕێگەی پەرەسەندنەوە بێت، هەندێك لە گیانداران توانای قسەكردنیان دەبوو، وەكو مەیموون!

هەروەها زانایان تێبینیان كردووە، مرۆڤ خاوەنی توانایەكی سروشتییە بۆ پەرەپێدانی زمان، ئەوان هەستان بە ئەنجامدانی تاقیكردنەوەیەك، هەوڵیاندا

چەند خوێندکارێك فێری زمانێکی نویێ بکەن بە شێوازێکی هەڕەمەکی، واتە بە شێوەیەکی هەڕەمەکیانە دارشتنی وشە لە پیتەکان، کە هیچ واتایەك نەدەن و پەیوەندییەك نەبێت لە نێوانیاندا، بینیان خوێندکارەکان ناتوانن فێری هەر یەکێك لەو وشانە بن.

بەڵام دوای تێپەڕبوونی چەند مانگێك خوێندکارەکان توانیان ئەو وشە هەڕەمەکییە داڕێژراوانە بگۆڕن، توانیان بە شێوەیەك ڕێکیان بخەن بە ئاسانی لەبەر بکرێن، دوای ماوەیەك ئەو وشانە گوێزرانەوە بۆ چەند خوێندکارێکی دیکە (گروپێکی تر)، هەر یەك لەو گروپانە چەند ڕاستکردنەوەیەکیان لەسەر ئەو وشانە کرد، تا وشەکان وایان لێهات بوونە مەنتیقی و بە ئاسانی لەبەر کران . ئەم کردارەش بە شێوەیەکی خۆنەویستانە ئەنجامدرا.

هەروەها زانایان ئەوەیان دەرخست کە مرۆڤ ڕژێمێکی تایبەتی پێبەخشراوە، کە توانای پەرەپێدانی زمانی لە نێوان چەند نەوەیەکدا هەیە، ئەمەش نهێنی لێکدانەوەی جیاوازیی زمانە، بە شێوەیەك ئەمڕۆ لە جیهاندا زیاتر لە ٤٠٠٠ هەزار زمان هەیە.

زانایان بە درێژایی سەد ساڵ هەوڵیاندا مەیموونی (شەمبانزی) فێری هەندێك لە پیتەکان بکەن، بەڵام هەوڵەکانیان بە تەواوی شکستی هێنا، هەرچەندە مۆخی ئەم گیاندارە گەورەیە، قەبارەکەشی گونجاوەو زۆرباشە بۆ فێربوون، لەگەڵ ئەوەشدا مەیموون توانای قسەکردنی نییە، تەنانەت ناتوانێت لاسایی قسەکردنیش بکاتەوە.

لە ئاژەڵەکاندا ئامێری دەنگ هەیە، مرۆڤ قوڕقوڕاگەی هەیە، ئاژەڵەکانیش قوڕقوڕاگەیان هەیە، بۆ وێنە، سەگ، قوڕقوڕاگەی سەگ بە هەمان شێوازو

ئالیـەتی قوڕقوڕاگـەی مـرۆڤ کاردەکـات، بـەڵام مـرۆڤ دەتوانێـت بـە کردارێکـی خۆنەویستانە بە ئاسانی قسـەبکات، لـەو نێوەنـدەدا گیانداران دەستەوسانن و ناتوانن ئەو کارە ئەنجام بدەن. واتە ناتوانن قسە بکەن.

تاقیکردنـەوەکانی پرۆفیسـۆر (ولیـام فـایفر)، دەریـان خسـتووە منـداڵی تـازە لـە دایکبوو، مۆخی چالاکدەبێت لـەو کاتـەی گوێی لـە دەنگی دایکی دەبێت! ئەم پرۆفیسـۆرە هەستا بـە تاقیکردنەوەیـەك لەسـەر ئـەو منداڵانـەی تەمـەنیان تـەنها چەند ڕۆژێکە، لـەو تاقیکردنەوەیـەدا هەستا بە چاودێری مـۆخی منـداڵو ئـەو چـالاکییە کارەباییـەی لـە مۆخـدا ڕوودەدات، لـە ئـەنجامی کـارلێکی لەگـەڵ دەنگەکانـدا، هـەروەها هەسـتا بـە گوێگرتن لـە دەنگـی کۆمەڵـە کەسانێکی نـامۆ، دەرکەوت کە مۆخی منداڵ هیچ وەڵامدانەوەیەکی بۆ ئەو دەنگانە نییە.

بەڵام هەمان منـداڵ تـەنها بە بیستی دەنگی دایکی (بەبێ ئەوەی ببینێت)، بە شێوەیەکی بەرچاوو مێشکی چالاك بوو، کارلێکی لەگەڵ دەنگەکەدا کرد، پاکو بێگەردیی بۆ خودا! شوێنەواری ئەم ئەزموونو تاقیکردنەوانە زانایـانی هەژاند، دەبێت ڕاستیی ئەم کارە چی بێت؟

لە سەرەتای ساڵی ٢٠١٠ توێژەرەوانی ئەڵمانیا ڕایانگەیاند، کۆرپەلە لەو کاتـەی لە منداڵدانی دایکیدایە دەست بە فێربوونی دەنگی دایكو باوکی دەکات، دوای لێکۆڵینەوەیەك کە ٦٠ منداڵی تازە لە دایکبووی گرتـەوە، زانکۆی (ورز بورج)ی ئـەڵمانی، پێـی هەسـتا، لـە گۆڤـاری (علـم البیولوجیـا المعاصـر) بڵاوکرایـەوە، ڕوونیانکردەوە منداڵی ساوا هەوڵدەدات لـە ڕێگای لاساییکردنەوەی دایکییـەوە پەیوەندیی لەگەڵدا ببەستێت.

لێکۆڵینەوە نوێیەکە ئاماژە بەوە دەکات، دەنگەکان کاردەکەنە سەر کۆرپەلەو یەکەم زمانن دیواری منداڵدان دەبڕن، (کاپلین فرمیکە) لێکۆڵەرەوەیەکی ئافرەتە، دەڵێت: ئەوەی لێکۆڵینەوە نوێیەکان پێی گەیشتوون، نەسەلماوە کۆرپەلە لە توانایدا هەبێت دەنگ دەربکات بە شێوەی جیاواز، بەڵام ئەوەی سەلماوە چەند دەنگێك دەردەچێت هاوێنەی ئەو دەنگانەیە کە منداڵ لەو کاتەدا بیستوویەتی کە لە سکی دایکیدا بووە!

هەروەها ئەوەی زانراوە ئەوەیە کە کۆرپەلە لە توانایدایە لەسەر بیرهاتنەوەی ئەو دەنگانەی کە بیستوویەتی لە سێ مانگی کۆتایی قۆناغی سکپڕیدا، هەروەها بە شێوەیەکی کاریگەر ئاوازی مۆسیقا و دەنگی مرۆڤ لەو تەمەنەدا بە شێوەیەکی تایبەت کاردەکاتە سەر کۆرپەلە.

ئێمەش دەڵێین: دەنگی قورئان باشترین دەنگە، دەگونجێت کۆرپەلە بیبیستێت، ئامۆژگاری هەموو دایکێك دەکەین، هەموو ڕۆژێك کەمێك بە دەنگی بەرز قورئان بخوێنێت، بە تایبەت لە مانگەکانی کۆتایی سکپڕیدا.

لێکۆڵینەوەیەکی نوێ (بە پێچەوانەی لێکدانەوە چەقبەستووەکان)، جەختدەکاتەوە قۆناغی بوونی کۆرپەلە لە منداڵداندا و ئەوەی پەیوەستە بە پەرەپێدانی زمانەوە، منداڵە ساواکان هەوڵدەدەن لاسایی دایکیان بکەنەوە بۆ مەبەستی گرنگیدان و بە هێزبوونی پەیوەندییان پێیانەوە، لە ڕێگای لاساییکردنەوەی ئاوازی دەنگیان، لەبەرئەوەی منداڵەساواکان جگە لەوە خاوەنی هۆکارێکی دیکە نین، ئەمەش بە لێکدانەوەی لاساییکردنەوەی ئاوازی دەنگی دایکیان دادەنرێت، لە سەرەتای قۆناغی تەمەنیان.

پرۆفیسۆر (نوام چۆمسکی) زانای زمانەوانی بە ناوبانگ جەختدەكاتەوە كە منداڵ بەرنامەڕێژ كراوە بۆ ئەوەی فێری زمان ببێتو قسەی پێبكات، لەو كاتەی دلۆپە ئاوێك بووە، بۆ ئەو مەبەستە ئامادەكراوە، بۆ ئەم مەبەستەش لە زیرەكییەكی سروشتی بەهرە وەردەگرێت.

گریان یەكەم زمانە منداڵ فێری دەبێت، بۆ دەربڕینی پێداویستییەكانی، زانایان دەڵێن: منداڵ لە ماوەی پێنج ساڵی یەكەمی تەمەنیدا ٥٠٠٠ وشە فێر دەبێت، منداڵ خاوەنی توانایەكی سروشتییە، لەسەر ڕێكخستنی وشە هەرەمەكییەكان، پاكوبێگەردی بۆ ئەو دروستكارە گەورەیەی بەم شێوەیە ڕێزی لە مرۆڤ گرتووەو ئەو تواناییانەی پێ بەخشیوە، بەڵام زۆر بەداخەوە كاتێك گەورە دەبێت وشەكان بە كاردەهێنێت بۆ دژایەتیكردنی دروستكارەكەی‌و تێكدانی زەوی‌و نكوڵی خودای بە دەسەڵاتو كاربەجێ‌و زانا دەكات! هەروەكو دەفەرموێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلۡكَرِيمِ ۝٦ ٱلَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ ۝٧ فِيٓ أَيِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ۝٨ ﴾ الانفطار

واتە: ( ئەی ئادەمیزاد!! تۆ چی وای لێكردویت سەركەش بیت بەرامبەر پەروەردگاری میهرەبانو بەڕێزت؟! چی وای لێكردویت وەكو پێویست قەدری نەزانیت؟ (نا فەرمانو یاخی بیت؟)- ئەو پەروەردگارەی تۆی دروستكردووە، بە ڕێكوپێكترین شێوە، بە جوانترین شێواز، (هەموو ئەندامەكان لە شوێنی تایبەتی خۆیان دانراون، تا بتوانن كارو فەرمانی خۆیان بە چالاكی ئەنجامبدەنو ئەو ئەندامانەش كە جووتن قەبارەو درێژی‌و شێوەیان چوونیەكە، جگە لەوەی كە یارمەتی و تەباییەكی تەواو هەیە لە نێوانیانداو هەمووان هاوكارن) – لە هەر شێوەو شێوازێكدا ویستوویەتی تۆی ڕێكخستووەو ئەندامەكانتی بە یەكەوە لكاندووە ).

زانایـان هەسـتان بـە تاقیكردنەوەیـەكی چـڕوپڕ كـە بریتیبـوو لـە دابـڕینی بالندەیەكی خۆشخوێن و جیاكردنەوەی لە دایك و باوكی، ئەم بالندەیەیان خستە ژوورێكەوە تا بە تەواوی لە دایك و باوكی دابڕێن، سەرەنجام دەركەوت بالندەكە فێری خوێنـدن نـەبوو، بـەڵكو فێـری دەنگێكـی ناسـاز بـوو، كـە لـە قیرەقـیڕی قەلەباچكە دەچوو، بەڵام ئەم تاقیكردنەوەیە كۆتا تاقیكردنەوە نەبوو، بەڵكو بەردەوامبوو، زاناكان ڕێگەیاندا هەمان ئەو بالندەیە لەگەڵ مێیەیەكدا كردەی زۆربوون ئەنجامبدات، پاشان هێلكەكانیان برد بۆ ئەو شوێنەی باوكەكەی لێبوو، تا لەوێ بتروكێن، سەرەنجام بالندە تازەكان دەنگی باوكیان فێربوون، كە لە قیرەقیڕ دەچوو، كەمێكیش لە دەنگی باوكیان دەچوو، بەڵام زاناكان بالندە تازەكانیان وەرگرت و ڕێگەیاندا تا دووجار كردەی زۆربوون ئەنجامبدەن، واتە دوو وەچەیان لێكەوتەوە، لە ناكاو شتێكی چاوەڕواننەكراو ڕوویدا، ئەوەی چوارەمیان فێری خوێندن بوو!

ئایا ئەم كردارە چۆن لێكدەدرێتەوە؟ لێكدانەوەی زانستی ئەوەیە: غەریزەی خوێندن لە نێو بالندەكاندا بوونی هەیەو لەگەڵیدا دروستبووە، دەگونجێت بە شێوەیەكی كاتی پەكی بكەوێت، بەڵام بە خێرایی ئەو چالاكییەی بۆ دەگەڕێتەوە، ئەمەش پێچەوانەی تیۆری پەرەسەندنەوە .

دوای لێكۆڵینەوەیەكی چڕوپڕ، زانایان ڕوونیانكردەوە لە ڕێگای ئەو تاقیكردنەوانەی لەسەر مرۆڤ ئەنجامیانداوە، لەسەر ئەو كەسانەی بە هۆی ڕووداوێكەوە توانای قسەكردنیان پەكیكەوتووە، تاقیكردنەوەیەكی تر لەسەر ئەو كەسانەی لە قسەكردندا كێشەی بۆ ماوەییان هەیە، دەركەوت زمان شتێكی

شاراوەیە لە شریتێکی بۆ ماوەییدا، بە ناوی DNA دیاریکراوە لە (بۆهێڵ)دا پێی دەوترێت FOXP ۲ئەم (بۆهێڵ)ە لای زۆربەی زیندەوەران بوونی هەیە، بەڵام لە مرۆڤدا شێوەیەکی جیاوازی هەیە، زاناکان دەڵێن: ئەو شێوە (بۆهێڵ)ە جیاکارەی مرۆڤ هەیهتی، لەگەڵ دەرکەوتنی مرۆڤ لەسەر زەوی دەرکەوتووە!!.

﴿...وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ حُسْبَانًا...﴿٩٦﴾﴾ الأنعام ، واتە: خۆر و هەیڤ بە حسابن. خۆر و مانگ بە کۆمەڵە حسابێکدا دەڕۆن بۆ نمونە مانگ حسابێکی پێویستە بۆ خولانەوەی بە دەوری خۆیدا، حسابێکی تر بۆ سوڕانەوەی بە دەوری زەویشدا حسابێکی تر لەگەڵ زەویدا بە دەوری خۆردا و بە دەوری گەلەئەستێرەکەدا و لەگەڵ گەلەئەستێرەکە و گەلەئەستێرەی ئەندرۆمیدا بە دەوری هێشووە گەلە ئەستێرەدا و... بەو جۆرە ..تاد، کەواتە ئێمە لەبەردەم تەنها یەك حسابدا نین، بەڵکو لەبەردەم گەلە حسابێکداین، واتە لەبەردەم وشەی (الحسبان)داین، چونکە لە زمانی عەرەبیدا وشەی (الحسبان) کۆی وشەی (الحساب)ە. بۆیە فەرموی:

﴿الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ ﴿٥﴾﴾ الرحمن، یان دەفەرموێت: ﴿...وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ حُسْبَانًا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ ﴿٩٦﴾﴾ الأنعام .

مانگ ڕۆژانە بەدەوری زەویدا چەندین دووری دەبڕێت، بەڵام لەگەڵ ئەم سوڕانەوەیەشدا، لەگەڵ جوڵەی زەوی و جوڵەی خۆر و گەلەئەستێرەکەشماندا دەڕوا هیچیان بەجێی ناهێڵن، پرسیارەکە ئەوەیە ئایا کێ ئەم هەموو جوڵانەی مانگ ڕێك دەخات؟ مانگ لە سوڕانەوە هێلکەیەکەیدا لە دوو شوێن لە زەوی نزیك دەبێتەوە، ئەمەش بەهۆی کێشکردنی زەویەوە مەترسی کێشانی بە زەویدا

زۆر دەبێت، بەڵام ئەمە ڕوونادات! چونکە هەر کات مانگ نزیک کەوتەوە خێراییەکەی زیاد دەکات! هەرکاتیش دوور کەوتەوە خێراییەکەی کەم دەبێتەوە، تا لە زەوی جیا نەبێتەوە!! دەپرسین دەبێت کێ مانگ بەو ڕێکخستنە وردانە لە کات و دوری و ئاڕاستە و خێرایی دیاریکراودا لە هەموو خولەك و چرکەیەکدا ڕێك دەخات؟ ئایا ئەمانە حساباتیان ناوێت؟ خوای کارزان دەفەرموێت: (والشمس والقمر بحسبان) واتە: خۆرو مانگ بە چەندین حساباتدا دەڕۆن.

ئێمە پێویستیمان بە کۆمەڵە حسابێکی زۆر ورد و بەردەوام و جۆراوجۆر هەیە لە هەموو ڕویەك و ئاڕاستەیەك و خێراییەك و گۆشەیەك بۆ هەموو هەسارەیەك و ئەستێرەیەك و گەلەئەستێرەیەك، ئایا کێ هەموو ئەمانە ڕێك دەخات، هەموو ئەم حساباتانە بە بەردەوام ئەندازە دەکات؟ هەتا ئەنجام هاوسەنگی دروست ببێت، وەك دەفەرموێت: ﴿وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ ٱلۡمِيزَانَ ۝٧﴾ الرحمن، واتە: ئاسمانی بەرز کردەوە و هاوسەنگی و تەرازوی بۆ دانا. بێگومان ئەمانە بەڵگەن لەسەر ئەندازەکاری، ئەندازەکاریش بەڵگەیە لەسەر ویست و ئیرادە، ویست و ئیرادەش بەڵگەیە لەسەر مەبەست، خاوەنی ئەم ویست و مەبەستانە کێیە؟ سروشتە؟ ئایا سروشت ویست و ئیرادە و مەبەستی هەیە؟ ئایا سروشت زانیاریی و شارەزایی هەیە تا حسابەکان ڕێك بخات؟!

پێشتر وا دەزانرا کە خۆر وەستاوە و زەوی بە دەوریدا دەسوڕێتەوە و مانگیش بە دەوری زەویدا دەسوڕێتەوە، بەڵام ئێستا واز لەو بیرە هێنراوە و ئەوە سەلماوە کە هەر هەموویان لە جوڵەدان .

﴿ وَٱلۡحَبُّ ذُو ٱلۡعَصۡفِ وَٱلرَّيۡحَانُ ۝١٢ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ۝١٣ ﴾ الرحمن

(١٢) جگە لە جۆرەها دانەوێڵەی جیاواز ، کە بە توێکڵ و پوش و بەرگ ڕازێنراوەتەوە و بە بۆنی خۆش بۆنخۆش کراون.

(١٣) جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزاد و پەری ، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندو چاك نیە (کاتێ پەری و جنۆکە ئیماندارەکان گوێ بیستی ئەم ئایەتە بون هەموو جارێك دەیانوت: ئێمە باوەڕمان بە هەموی هەیە ئەی خوای میهرەبان) .( شایەنی باسە ئەم ئایەتە ٣١جار لەم سورەتەدا هاتووە هەشت جاری لە دوای باسی بەدیهێنراوەکانەوەیە حەوت جاری دوای ئایەتەکانی دۆزەخە ، هەشت جاری لە دوای نازو نیعمەتەکانی بەهەشتی پلە یەکە ، هەشت جاری تریش دوای نازو نیعمەتەکانی بەهەشتی پلە دووە ، دۆزەخ حەوت دەرگای هەیە ، بەڵام بەهەشت هەشت دەروازەی فراوانی هەیە!!) .

لەم ئایەتە گرنگی بەخششی دانەوێڵە و بەرگ و توێکڵەکەی دەردەخات ، لە ئێستادا چەندین لێکۆڵینەوەی زانستی لەسەر توێکڵی دانەوێڵە کراوە، ئاشکراشە کە لە ڕابردوودا مرۆڤ سوودی لە توێکڵی دانەویڵە و پوشوپەڵاشی بۆ عەلەفی گیانلەبەران وەرگرتووە، لە کاتێکدا خوای گەورە بە نیعمەتێکی تایبەت و گەورە بەسەر مرۆڤەوە باسی دەکات، بەڵام زانستی نوێ دەریخستووە کە (بەرگی دانەوێڵە) شیفای زۆرێك لە نەخۆشییە زەحمەت و مەترسیدارەکانی تێدایە. بۆنموونە تەنها توێکڵی تۆوی (قطونة) کە بە ڕێگای بێژانەوە لە تۆوەکەی جیادەکرێتەوە و، بە (گیا موعجیزەکە) بەناوبانگە ناودەبرێت، بە

دەیان لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە و چەندین سوودی بۆ تەندروستی مرۆڤ تیایدا دەرخراوە، لەوانە: کەمکردنەوەی کۆلیسترۆلی خوێن، کەمکردنەوەی ڕێژەی شەکر لە خوێندا، ئازار و هەڵئاوسانی سک و سکچوون و کەمکردنەوەی کێش و برینی کۆڵۆن و کۆکەی درێژخایەن و ڕەبو و مایەسیری و هەوکردنی پێست و سوودی بۆ کۆئەندامی هەرس و ڕێکخستنی جوڵەی کۆڵۆن و کەمکردنەوەی ئازار و، گرژبوون و هەڵاوسانی کۆڵۆن و، نەهێشتنی غازاتی گەدە و قەبزی، هەروەها بۆ چارەسەری نەخۆشی ئەمیبیی ڕیخۆڵەیی. لە ئێستاشدا دەرمان و کەپسولی لێ دروستکراوە وەك چارەسەرێکی پزیشکی بەکاردەهێنرێت، سەبارەت بە ڕووەکی ڕێحانیش کە ئایەتەکە باسیکردووە و تایبەتمەندییەکی جیای لە ناو ڕووەکەکانی تردا پێ بەخشیوە، چەندین سوودی دەرخراوە و چارەسەرێکی جیهانییە بۆ زۆرێك لە نەخۆشییەکان لەوانە: بەهێزکردنی گەدە و مێشك و بیرکردنەوە و زیادکردنی ئارەزووی خواردن، چارەسەری هەوکردنی گەروو و هەوکردنی گورچیلە و هۆکاری ڕزگار بوونیشە لەبەردی گورچیلە، بۆ چارەسەری سکچوون و ڕشانەوە و چارەسەری ماندوویەتی و هێوربونەوەی سەر ئێشە و شەقیقە بەکاردێت، هەروەها بۆ دابەزینی ڕێژەی شەکر لە خوێندا، بۆ پێستیش زۆر بەسوودە بە مەساجکردنی پێست بە گەڵای ڕێحانە چرچی پێست کەمدەکاتەوە و جوانی دەکات و، زیپکە ناهیلێت و چارەسەری هەندێك نەخۆشی پێست دەکات و مرۆڤ لە مەترسی زیانەکانی تیشك دەپارێزێت چونکە پێکهاتەی فلافۆنۆیدی تێدایە کە دژە ئۆکسانە کە پێکهاتەی خانە و کرۆمۆسۆمەکان لە ئۆکسان بوون دەپارێزێت. هەروەها بۆ وەستانی قژ هەڵوەرین و کەمکردنەوەی کێش بەسوودە، سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندیشە بە ڤیتامین A و C کە سەرچاوەی سەرەکی دژە ئۆکسانن، بەوەش بینین بەهێز دەکات.. هەروەها

برێکی زۆر ئاسن و کالسیۆمی تێدایە کە هۆکاری سەرەکی بەهێزکردنی ئێسك و خوێنە. هەروەها بۆ کەمکردنەوەی ئازار و نەهێشتن و کەم کردنەوەی ژەهری پێوەدانی مێروو، هەروەها تەمبەڵی ناهێلێت و مرۆڤ چالاك دەکات، هەروەها بۆ پاککردنەوەی ددانەکان و بەهێزکردنی پوك بەکار دێت، چونکە دژە بەکتریایە و بۆ چارەسەری کۆئەندامی هەناسەدان و نەخۆشیەکانی دڵ و پاککردنەوە خوێن و رزگار بوون لە ژەهر بە سودە، چونکە ماددەی ئۆجینۆڵی تێدایە کە دژە ئۆکسانە و کۆلیسترۆڵی خوێن و شەکر نزم دەکاتەوە، لەبەرئەوە مەترسی جەڵتەی دڵ و نەخۆشیەکانی کەم دەکاتەوە لەبەرئەوەی خوێن لە ژەهر دەپارێزێت و کاریگەیەکی باشیشی هەیە لە چارەسەری شێرپەنجە و بەهێزکردنی کۆئەندامی بەرگری.

هەموو ئەم سوودە زۆرانەی ڕێحانە بەڵگەن لەسەرئەوەی کە دروستکەری ئەم ڕووەکە بە گرنگی و هەموو سوودەکانی ئاگادارە، هەر بۆیە لە ناو ڕووەکەکانی تردا هەڵیبژارد و وەك بەخششێکی گەورە بەسەر مرۆڤەکانەوە .

﴿ مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ ﴿١٩﴾ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ ﴿٢٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢١﴾ يَخْرُجُ مِنْهُمَا ٱللُّؤْلُؤُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٢٢﴾ ﴾ الرحمن

(١٩) ئاوی هەردوو دەریای ڕەها کردووەو بە یەکی گەیاندون ، کەچی لە هەمان کاتدا تێکەڵیش نابن (ئەم دیاردەیە لە تەنگەبەری چیای (طارق) و (باب المندب) دا ئاشکرایە کە ئاوی دەریای سپی تێکەڵ بە زەریای ئەتڵەسی نابێت ، هەروەها ئاوی دەریای سور تێکەڵ بە دەریای عەرەب نابێت ، ئەو دیاردەیە بو بە هۆی موسوڵمان بوونی کاپتن کۆستۆی فەرەنسی ، زانای دەریاناس) ...

(٢٠) چونکە لە نێوانیاندا بەربەستێك لە تەوژمی ئاو هەیە نایەڵێت تێکەڵ بن .

(٢١) جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزاد و پەری ، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندوچاك نیە .

(٢٢) لەو دوو جۆر دەریایە مرواری و مەرجان دەردەهێنرێت ( کە دوو جۆر گەوهەری بەنرخن) .

ئەم ئایەتە پیرۆزانە باس لە دوو دەریای سوێری هاوسێ و چووبەیەکدا دەکەن کە هەریەکەیان بە هۆی بوونی بەربەستێك لە نێوانیاندا تایبەتمەندی خۆیان دەپارێزن، هیچ کامیان زاڵ نابن بەسەر ئەوی تریاندا.باسکردنی مرواری و مەرجان لە ئایەتەکەدا بەڵگەیە کە هەردوو دەریاکە سوێرن، چونکە تەنیا لە دەریا سوێرەکاندا دەردەهێنرێن. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئاوی دەریا و ئۆقیانوسە سوێرەکان کە بە یەك ئاو و تایبەتمەندی دەبینرێن، لە ڕاستیدا بارستەی جیاوازن و هەریەکەیان تایبەتمەندی خۆی هەیە و لە چڕی و سوێری و پلەی گەرمیدا جیاوازن، ئەمەش نەزانراوە هەتا تەکنیکی نوێ بە کارنەهات، کەواتە ئەمە بەڵگەیەکی ڕۆشنە لەسەر ئەوەی کە قورئانی پیرۆز فەرمودەی خوای گەورەیە؟! هەتا ساڵی ١٨٧٢ز کەشتی چالینجەر کە سێ ساڵ بە دەریاکاندا گەڕان و توێژینەوەیان کرد، نەزانرا دەریا سوێرەکانیش لە نێو خۆیاندا پێکهاتەیان جیاوازە.

لە ساڵی ١٩٤٢ز بۆ یەکەمجار لە ئەنجامی توێژینەوەیەکی زۆرەوە بە دانانی سەدان وێستگەی دەریایی دەرکەوت بۆ نموونە ئۆقیانوسی ئەتڵەسی لە یەك دەریا پێکنەهاتووە بەڵکو لە چەندین دەریای جیاواز پێکهاتووە کە هەر

دەریایەکیان لە چڕی و سوێرێتی و توانای تواناوەی بۆ ئۆکسجین و گیاندارانی ئاوی و پلەی گەرمیەکەیشی جیاوازە. ئەمە لە یەک ئۆقیانوسدا چ جای بە یەکگەیشتنی دەریا و ئۆقیانوسەکانی وەکو دەریای ناوەڕاست و زەریای ئەتڵەسی، یان بە یەکگەیشتنی دەریاکان وەك کەنداوی عەرەبی و کەنداوی عومان و دەریای سوێر. یان دەریای ناوەڕاست و دەریای سوور.

**لە زمانی عەرەبیدا وشەی مرج دوو واتای هەیە:**

١- الخلط واتە: تێکەڵ بوون

٢- اضطراب:

واتە جوڵە و شڵەقان، ئەم دوو واتایەش ئیعجازی ئایەتەکە زیاتر دەردەخەن، چونکە لەگەڵ بوونی ئەو بەربەستە ئاویەدا هەردوو ئاوی دەریاکە بە هێواشی تێکەڵ یەك دەبن و بەهۆکاری دیاردەی هەڵکشان و داکشانی مانگ و شەپۆلەکانیش لە جوڵە و بەیەکدا چوون و شڵەژانێکی بەردەوامدان، کە ئەمانەش هۆکاری چوونیەك بوون و زاڵ بوونی دەریا گەورەکەیانە بەسەر بچوکەکەدا، بەڵام ئەم بەربەستە هەڵدەستێت بە پاراستنی سنوورەکە و بوار نادات هیچیان بەسەر ئەوی تریاندا زاڵ بێت، ئەویش بەوەی کاتێك ئاوی دەریایەکیان دەچێتە دەریاکەی ترەوە تایبەتمەندیەکانی دەگۆڕێتە سەر ئەو دەریایەی کە بۆی چووە. دەریاناسەکان بەربەستی ئاوی نێوان دەریاکان بە ڕووبەرە ئاوییە تێکەڵبووەکان ناودەبن (Mixed-Water Area) ئەویش لەبەر ئەوەی ئەم ناوچەیە وەك لە ئایەتەکەدا بە وشەی (مرج) گوزارشتی کرد تێکەڵ

بـوون تێیـدا ڕوودەدات و ئـاوی بەربەستەكە تێكەڵێكە لـە هـەردوو ئـاوی دەریـا هاوسێكە.

﴿ يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ إِنِ ٱسۡتَطَعۡتُمۡ أَن تَنفُذُواْ مِنۡ أَقۡطَارِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ فَٱنفُذُواْۚ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلۡطَٰنٖ ﴿٣٣﴾ ﴾ الرحمن

واتە: ئەی گرۆی جنۆكەو ئادەمیزاد ئەگەر توانیتان بە مەملەكەتی ئاسمانـەكان و زەویـدا بگـەڕێن و لـە بۆشـایی ئاسمانـدا بسـوڕێنەوەو بـە نـاخی زەویـدا بڕۆنـە خـوارەوە ، ئـەوە ئـازادن و هەوڵبـدەن ، بـەڵام دڵنیـابن كـە دەزگـای مـاددی پێشكەوتوو ، وە توانای مەعنەوی بەهێزی دەوێت (وەكو كەشتیە ئاسمانیەكانی ئەم سەردەمە ، وە كەسانی مەشق پێكراو) .

(نفـذ) لـە زمـانی عەرەبیـدا بـە مانـای دەرچـوون و بـڕین دێـت وەك لـە ئایەتەكەدا هاتووە ( إن استطعتم ان تنفذوا مـن اقطـار السـماوات والأرض ) واتـە ئەگەر توانیتان (اقطار)ی ئاسمانەكان و زەوی ببڕن لێرەدا اقطار كۆی (قطر)ە كە بە مانای تیرەی بازنە دێت واتە لەم سەری بازنەیەكەوە بۆ ئەو سەری بە مەرجێك بە چەقدا بڕوات. (الشواظ) بە مانای ئاگرێكی بێ دوكەڵ دێت، بەڵام نحاس لە بنەڕەتدا بە مانای مس" یان ئاگری بێ دوكەڵ دێـت هـەروەها نـاوی توخمێكیشـە كە ڕەنگی مەیلە و سورە و توانای پێداكێشان و ڕاكێشـانی هەیـە و گەیەنـەرێكی باشـە بۆ كارەبا و گـەرمی و دژی داخوراندنـە، بەو نـاوەوە نـاونراوە چـونكە لـە ئاگرێكی بێ دوكەڵ دەچێت.

لەو ئایەتانەدا خوای گەورە ڕووی وتاری دەكاتە هـەردوو دەسـتەی مرۆڤ و جنۆكـە و لاوازییـان دەردەخـات كـە ئەگـەر بتـوانن لـە چوارچێوەكانی زەوی و

ئاسمانەکان دەربچن، کە لێرەدا مەبەستە توانا و دەسەڵاتی بێ سنوری خوا دەربکەوێت بەرامبەر بێ دەسەڵاتی مرۆڤ و جنۆکە ، هاوڕێ لەگەڵ دەرخستنی چەند ڕاستیەکی گەردوونی کە مرۆڤ نەیتوانیوە لێی تێبگات تا ئەو چەند دەیەیەی دوایی کۆتایی سەدەی بیستەم و لەو ڕاستیە گەردوونیە زانستیانەش تێبگات!!

* دەرچوون لە تیرەی زەوی: بە پێی زانستی نوێ گۆی زەوی خڕی تەواو نیە و لە جەمسەرەکانیەوە داتەپیوە و تێکڕایی تیرەی زەوی دەگاتە ١٢٧١٣کم و لە لای هێڵی یەکسانیەوە تێکڕایی تیرەی دەگاتە ١٢٧٥٦کم، زۆر ستەمیشە کە مرۆڤ بتوانێت زەوی ببڕێت. لەو لایانەیەوە لە بەر زۆری پەستان و پلەی گەرمی و بە بەردەوامی بەرەو چەقی زەوی هەرچەندە ئەمڕۆ پێشکەوتنی زۆر لە تەکنیکی هەڵکەندن و چاڵکردنا هەیە بە مەبەستی گەڕان بە دوای نەوت و گاز و کانزاکاندا بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ نەیتوانیوە لە ١٤کم زیاتر بچێتە خوارەوە بۆ ناو جەرگەی زەوی کە ئەوەش کەمترە لە ٢ر٠٪ ی درێژی نیوە تیرەی زەوی!!.
ئا لەو قوڵاییانەدا ئامێرەکان لە کار دەکەون بەهۆی زۆری پەستان و بەرزی پلەی گەرمیەوە. تا بەرەو چەقی زەوی بڕۆین پلەی گەرمی زیاتر بەرزتر دەبێتەوە تا نزیك دەبێتەوە لە پلەی گەرمی سەر ڕووی خۆر بۆیە مرۆڤ هەرگیز ناتوانێت تیرەکانی زەوی ببڕێت.

* دەرچوون لە تیرەی ئاسمانەکان: دووریەکان یان ماوەکانی ئەو بەشە بینراوەی ئاسمانی دونیا لە گەورەیی و فراوانیدا دەگاتە ڕادەیەکی وا کە بەهەموو تواناییەکانی مرۆڤ و جن ناتوانن ئەو ماوانە ببڕن ئیتر چۆن دەتوانن

لێی دەربچن یان لێی ڕابکەن. تیرەی گەورەی مەجەرەکەی خۆمان دەگاتە ١٠٠ هەزار سالی ڕووناکی، تیرەی بچووکی مەجەرەکەمان دەگاتە ١٠ هەزار سالی ڕووناکی، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەگەر کەسێك بیەوێت تیرەی بچووکی مەجەرەکەمان ببڕێت دەبێت بە خێرایی ڕووناکی بۆ ماوەی ١٠ هەزار ساڵ بڕوات ئینجا دەتوانێت ئەو تیرەیە ببڕێت، ئەوەش کارێکی زۆر ئەستەمە و هەرگیز جێبەجێ نابێت چونکە نەهۆیەکی وا هەیە و نە دەشبێت کە بە خێرایی ڕووناکی بڕوات و مرۆڤ هەڵگرێت، نە تەمەنی مرۆڤ ئەوەندە هەیە تا مۆڵەتی ئەوەی بداتێ لە کاتێکدا ئەوپەڕی تەمەنی لە ٦٠ تا ٧٠ ساڵ تێپەڕ ناکات. هەموو توانای مرۆڤ لەم گەردوونە بینراوەدا ئەوەیە کە مرۆڤ توانیویەتی تەنها چەند چرکەیەکی ڕووناکی ببڕێت ئەوەیش گەیشتنیەتی بۆ سەر مانگ. کۆمەڵەی خۆرەکەی خۆمان کە دەکەوێتە مەجەرەی ڕێگای شیرییەوە و ماوەی ٣٠ هەزار سالی ڕووناکی لە چەقی مەجەرەکەوە دوورە، ٢٠ هەزار سالی ڕووناکیش لە نزیکترین لایەوە دوورە، ئەگەر مرۆڤێك ویستی لەو نزیکترین لایەوە واتە لە یەکێك لە نزیکترین تیرەکانی مەجەرەکەمانەوە دەربچێت ئەوا پێویستی بە ٢٠ هەزار سالی ڕووناکی دەبێت!!! ئایا ئەوە لە توانای مرۆڤدایە؟ بێگومان نەخێر ئاخۆ مرۆڤ دەتوانێت بە خێرایی ڕووناکی بڕوات؟ بێگومان نەخێر. ئەوەی بە سەر مرۆڤدا دەسەپێت بە سەر جنیشدا دەسەپێت. مەجەرەکەی ئێمە بەشێکە لە کۆمەڵێك مەجەرەی تر کە بە کۆمەڵەی لۆکالی دەناسرێت و تیرەکەی (٣٢٦١٥٠٠) سالی ڕووناکیە، ئەویش بەشێکە لە کۆمەڵە مەجەرەیەکی دی کە تیرەکەی بە (٦٥٢٢٠٠٠) سالی ڕووناکیە و ئەویش بەشێکە لە کۆمەڵە

مەجەڕەیەکی زۆر گەورەتر کە تیرەکەی بە (١٠٠) ملیۆن ساڵی ڕووناکی مەزەندە کراوە!!!. لەم دوواییانەدا زیاد لە ١٠٠ لەو گەلە مەجەڕانە دۆزراونەتەوە، تا بە هەموویان گەلە مەجەڕەیەکی زەبەلاح پێکبێنن بە شێوەی پەپکەیەك کە تیرەکەی دەگاتە ٢ بلیۆن ساڵی ڕووناکی!!!!! ئەوانە هەموو بەشێکن لە ئاسمانی بینراو کە تیرەکەی بە ٢٠ بلیۆن ساڵی ڕووناکی دادەنرێت، ئەوە ئەو بەشەیە کە خوا دەربارەی دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلْنَٰهَا رُجُومًا لِّلشَّيَٰطِينِ ۖ وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ ٱلسَّعِيرِ ﴿٥﴾﴾الملك، ئیتر توانا و دەسەڵاتی مرۆڤ و جن لە کوێی ئەو گەرەییەدایە؟

سەبارەت بە ناردنی (شواظ من نار و نحاس): ئەگەر هەریەکە لە مرۆڤ و جن بیانەوێت لە چوارچێوەکانی زەوی ئاسمان دەربچن بە بێ دەسەڵات لە خواوە ئەوا تووشی ئاگری بێ دوکەڵ دەبن. وەك لە ئایەتەکەدا دەفەرموێت: ﴿يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا شُوَاظٌ مِّن نَّارٍ وَنُحَاسٌ فَلَا تَنتَصِرَانِ ﴿٣٥﴾﴾ الرحمن. هەموو ڕاڤەکاران بە کۆن و نوێیانەوە لە سەر ئەوە کۆکن کە (شواظ من نار) بە مانای ئاگری بێ دوکەڵ و (نحاس) بە مانای دوکەڵی بێ ئاگر دێن و وشەی (نحاس) مانای کانزای مسیش دەگرێتەوە کە پلەی توانەوەی (١٠٨٣) پلەی سیلیزیە و پلەی کوڵانی (٢٥٦٧) پلەی سیلیزیە. لە ڕووی زانستیەوە ئەوە سەلمێندراوە کە توخمە زانراوەکان لە ناو ئەستێرەکاندا بەرهەمی کرداری یەکبوونی ناووکین، گەردیلەکانی هایدرۆجین دەبنە یەك تا وردە وردە ناوکرۆکی ئەستێرەکان دەبنە ئاسن، لە کرداری یەکبوونی ناوکیدا پلەیەکی گەرمی زۆر بەرز پێویستە تا ئەو ڕادەیەی

ئەستێرەکە دەتەقێتەوە و پارچەکانی و لەوانەش ئاسنەکەی بە هەموو لاکادا پەرش و بڵاو دەبێتەوە، بەڵام ئەو توخمانەی کە لە ئاسن قورسترن لە میانەی هەوێنی سەرەتایی مادده و ئەو گەردە ئاسنیانەی بە ئاسماندا بڵاو بونەتەوە دروستدەبن. ئەوە لە هەموو لاکانی ئاسمان ڕوودەدات و بە هەموو ئەو لایانەدا بە حسابێکی دیاریکراوی ورد پەرش و بڵاو دەبنەوە. لە بەرئەوەی مس لە ڕووی ژمارەی گەردیلەیی و کێشی گەردیلەییەوە بەرزترە لە ئاسن، لەبەرئەوە توخمی مس لە ڕووپەڕی ئاسماندا لە یەکبوونی ناوکی گەردەکانی ئاسن لەگەڵ هەوێنە سەرەتاییەکانی ماددەدا دروستدەبێت، بۆیە دەتوانین بڵێین کە وشەی (نحاس) لە ئایەتەکەدا مەبەست لە توخمی مس دەبێت، کە بە شێوەی تواوەی کوڵاو دەبێت ڕێگری دەکات لە هەر هەوڵێکی مرۆڤ و جن بۆ بڕینی سنووری زەوی و ئاسمانەکان.

﴿ فَإِذَا ٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتْ وَرْدَةً كَٱلدِّهَانِ ﴿٣٧﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٨﴾ ﴾ الرحمن

واتە:

(٣٧) ڕۆژێك دێت کە ئاسمان سور هەڵدەگەڕێت وەکو گوڵی سور لە ڕەنگدا ، وەکو ڕۆنی قرچاو لە ڕواڵەت و گەرمی و تواوەییدا ( کە ئەمەش قۆناغێکە لە قۆناغەکانی تێکچونی لە سەرەتای قیامەتدا) .

(٣٨) جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزاد و پەری ، بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن و ، کامەیتان لا پەسەندو چاك نیە.

ئاژانسی (ناسا) توانی وێنەی تەقینەوەی ئەستێرەیەك بگرێت کە لە شێوەی گوڵەباخی سووردایە. ئەگەر بەراووردی بکەین بە وێنەی گوڵەباخی سوور،

دەبینین زۆر لە یەك دەچن. شایانی باسە زانایانی گەردوون بەم ئەستێرەیە دەڵێن : "گوڵی سووری ئاگرین"، واتە بە هەمان وشەکانی قورئان گوزارشت لە ڕاستییەکانی گەردوون دەکەن.

"لەبەرواری (٣١ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٩٠) بەهێزترین ئاژانسی ئاسمانی لە جیهاندا دیمەنێکی لە ئاسمانەوە گواستەوە ئەوەی دەیبینی وای دەزانی وێنەی گوڵەباخە و لە ناو ڕۆندایە، پەڕەکانی سووری تۆخ گەڵای سەوز و لە ناوەڕاستیدا کاسەیەکی شین هەبوو، بەڵام لە حەقیقەتدا گوڵ نەبوو بەڵکو دیمەنی تەقینەوەی ئەستێرەیەك بوو لە دووری سێ هەزار ساڵی تیشکی لەزەوییەوە، بەناوی چاوە پشیلە."

ئەم دیمەنە تەفسیری هەمان ئایەتی سەرەوەیە و پاش دابەزینی ئەو ئایەتە بە هەزار و چوار سەد ساڵ زیاتر بە ڕوونی لە بوونەوەردا دەبینرێ، ئایا تەنها شتێکی ئاوا بەس نییە بۆ متمانەکردن بەوەی لە قورئاندا هاتووە؟؟

کەواتە چەندەها دیمەنی لەو شێوە دەبینرێ پێش هاتنی قیامەت، ئیتر ئایا ئەوەی لە ساڵی (١٩٩٠)دا بینراوە نموونەیەکی بچووکە و کاتێك ئەستێرە نزیکەکانیش وەك ئەوانە دەتەقنەوە ئیتر ئاماژەکانی کۆتایی دونیا بەدیار دەکەون .

﴿ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ رَفۡرَفٍ خُضۡرٖ وَعَبۡقَرِيٍّ حِسَانٖ ۝٧٦ ﴾ الرحمن

واتە: ئەو بەختەوەرانە لە جێگەو ڕێگەی خۆش و ڕازاوەدا شانیان داداوە ، کە بە پشتی و سەرینی سەوزباوی جوان و دۆشەکی نایاب و تایبەت نەخشێنراوە ، هەموو شوێنێکی بە فەرش و رایەخی تایبەت داپۆشراوە .

جیاکردنەوەی ڕەنگی سەوز لە ناو هەموو ڕەنگەکانی تردا بۆ بەهەشتیەکان، دەریدەخات کە ڕەنگی سەوز لەهەموو ڕەنگەکانی تر بۆ چاو، بۆ لایەنی دەروونی باشترە، هەروەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿ عَٰلِيَهُمۡ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضۡرٞ وَإِسۡتَبۡرَقٞ ...۝٢١﴾ الإنسان، واتا:(پۆشاكی بەختەوەران ئاوریشمی سەوزی تەنکە کە بەسەر پۆشاکی ئاوریشمی ئەستووردا لەبەریان کردووە) .

لە ئێستادا زانایان دەریانخستوە کە ڕەنگی سەوز باشترینی هەموو ڕەنگەکانە ئەویش لەبەرئەوەی دەرکەوتوە ڕەنگی سەوز بۆ دڵ بەسوودە و یارمەتی هەناسەدانی قوڵ و گەڕاندنەوەی هاوسەنگی خانەکانی لەش دەدات و، ئەو ڕەنگەیە کە خۆشی و شادمانی بە مرۆڤ دەبەخشێت، هەر لەبەرئەمە پزیشکان لە کاتی نەشتەرگەریدا جلوبەرگی سەوز دەپۆشن، هەتا ئازاری نەخۆشەکان کەم بکەنەوە و هەستکردن بە خۆشی و شادمانیان پێ ببەخشن، ڕەنگی سەوز دەکەوێتە ناوەڕاستی حەوت ڕەنگەکەی ڕووناکی کە لەسوورەوە دەستپێدەکات هەتا وەنەوشەیی، لەبەرئەوە باشترین ڕەنگە بۆ چاوی مرۆڤ ، جۆرێك لە حەوانەوە بە مرۆڤ دەبەخشێت، تەنانەت بۆ هەندێ حاڵەتی خەمۆکی بەکاری دەهێنرێت.

## ﴿ سورەتی (الواقعة) ﴾

﴿ يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُخَلَّدُونَ ﴿١٧﴾ بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِنْ مَعِينٍ ﴿١٨﴾ لَا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنْزِفُونَ ﴿١٩﴾ وَفَاكِهَةٍ مِمَّا يَتَخَيَّرُونَ ﴿٢٠﴾ وَلَحْمِ طَيْرٍ مِمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٢١﴾ ﴾

(١٧) لاوان و جەوانانی ئێسک سوک و نەمر بە دەوریاندا دێن و دەچن و خزمەتیان دەکەن و دڵخۆشیان دەکەن ...

(١٨) بە کوپ و سوراحی و دۆلکەی جوانەوە دەگەڕێن و پەرداخ و کاسە تایبەتیەکان پڕ دەکەن لە شەرابی تام خۆش و بۆن خۆش و ڕەنگ جوان ، کە هەمویان لەسەرچاوەی ڕەوان و هەمیشە جاری یەوە پڕ دەکرێن .

(١٩) خواردنەوەی ئەو شەرابانەش نە سەرئێشەیان بۆ پێش دەهێنێت ، نە پێی سەرخۆش دەبن و دەکەونە ئێڵنجدان ، بەڵکو چەندە بخۆنەوە هەر دڵخۆش و شادمان و لەسەر حاڵ دەبن ...

(٢٠) جۆرەها میوەی تام خۆش و بۆنخۆش و ڕەنگ جوان و شێواز قەشەنگیان بۆ دەگێڕن کە بە ئارەزوی خۆیان لێی هەڵدەبژێرن .

(٢١) گۆشتی هەر باڵندەیەکیش کە ئارەزوی بکەن و بە هەر شێوازێك کە حەزی لێ بکەن لەسەر دەفرو سینی ئاڵتون و زیو ، بۆیان ئامادەیە

هەروەها لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿ وَأَمْدَدْنَاهُم بِفَاكِهَةٍ وَلَحْمٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾ الطور، وشەی (امددناهم) بە واتای: میوەیەکی زۆر و زیادیان پێش کەش دەکەین لە بەهەشتدا و گۆشتیش بەوەی کە حەز و ئارەزووی بکەن.

شارەزایانی خۆراك دووپاتیدەکەنەوە کە باشترین ڕێگای خواردن، یەکەمجار ئاو خواردنەوەیە پاشان دوای نیوکاتژمێر میوە خواردن، ئینجا کاتژمێرێك دوای ئەوە دەتوانین ژەمە خواردن بخۆین.. ئەم ڕێگەیە مرۆڤ لە زۆر نەخۆشی دەپارێزێت، لێکۆڵینەوەکان دەریانخستووە کە خواردنەوەی دوو کوپ ئاو لە پێش ژەمەخواردن یارمەتی سوتاندنی زیادەی چەوری و ڕزگاربوون لە کێشی زیاد دەدات. کەواتە ئامۆژگاری شارەزایان لە پێناو تەندروستییەکی باشتردا ئەوەیە کە یەکەم جار ئاو بخۆیتەوە پاشان میوە بخۆیت پاشان ژەمێك خواردن بخۆیت، بە تایبەتی ئەگەر ژەمە خواردنەکە چەور یان گۆشتی لەگەڵ بوو.

پزیشکان دەڵێن پێویستە میوە پێش گۆشت بخورێت، جا ئەو میوەیە بە شێوەی شەربەت پێشکەش بکرێت، یاخود میوەیەکی تازە بێت، هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە میوە شەکری سادە (تاك)ی تێدایە کە بە ئاسانی هەرس دەکرێت و دەمژرێت لە ڕیخۆڵەدا، لەبەرئەوە گەدە و ڕیخۆڵەکان ئامادە دەبن بۆ پێشوازیکردنی خواردنی قورس کە بە ئاسانی هەرس ناکرێن -بۆ نموونە گۆشت- بەو شێوەیە گەدە ئاماژە دەنێرێت بۆ مێشك کەوا ئامادەباشی تێدا بێت بۆ وەرگرتنی خواردنی قورس. ڕیخۆڵەکان شەکرە تاکەکان (وەك گلوکۆز و فرکتۆز) دەمژن و لەش هەست دەکات کەوا برسێتی یەکەی نەماوە و ئارەزوومەندیی زۆر ناکات بۆ ئەوەی داوای خواردنی قورس بکات، بۆیە گەدە و ڕیخۆڵەکان ڕزگاریان دەبێت لەو بار قورسییە.

ئەوانەی بەپێچەوانەوە ژەمی خواردنەکانیان دەخۆن لە پێشدا گەدەی خۆیان پڕ دەکەن بە خواردنی قورس و ئینجا میوەیەکی زۆر دەکەن بەسەریا،

دەبینین بار قورسییەکی زۆر دەکەوێتە سەر گەدەیان و سوودێکی ئەوتۆش لەو خواردنە نابینن و توانای بیر و عەقڵ و تەرکیزیان نامێنێت، بەتایبەتی ئەوانەی کە قوتابی و خوێندکارن، یان ئەوانەی ڕۆشنفکر و زۆر دەخوێننەوە، ئەمەش کاریگەرییەکی زۆر دەکاتە سەر بیر و مێشکیان، چونکە مێشک (دەماغ) سەرقاڵ دەبێت بە خواردنەوە و ناتوانێت تەرکیز بکات.

- توێژینەوەیەکی سویدی کە لەسەر (تەندروستی گشتی و بەرگری) کراوە ئەوەی دەرخستووە کە خواردنی میوە دوای نان ڕاستەوخۆ هاوشێوەی خواردنی ژەمێکی ژەهرە، کە دەبێتە هۆی لەناوبردنی ڕژێنی (بتیالین) کە ڕژێنێکی بنەڕەتی گرنگە بۆ هەرسکردنی کاربۆهیدرات و شیرنیەکان.

- کاتێك میوە دەگات بە گۆشتی سوور لە گەدەدا، خواردنەکە دەترشێت، چونکە گۆشتی سوور کاتێکی زۆرتری دەوێت تاوەکو هەرس بێت، لەوکاتەشدا میوەکە دەترشێت، کحول و ماددەی ژەهر دروست دەبێت، کە ئەم مادانە دەبنە ڕێگر لە کرداری هەرسکردنی خواردندا، میوەکەش هەموو بەها بە سوودەکانی لە دەست دەدات وەکو ڤیتامینەکان و دەبێتە هۆی تێکچوونی پێکهاتەی خۆراکی پرۆتین و هەڵوەشانەوەیەکی نائاسایی لەپرۆتینەکاندا دەبێتە هۆی هەلاوسانی گەدە.

﴿ أَفَرَءَيْتُم مَّا تُمْنُونَ (٥٨) ءَأَنتُمْ تَخْلُقُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلْخَٰلِقُونَ (٥٩) نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ ٱلْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ (٦٠) عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَٰلَكُمْ وَنُنشِئَكُمْ فِى مَا لَا تَعْلَمُونَ (٦١) وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْأُولَىٰ فَلَوْلَا تَذَكَّرُونَ (٦٢) ﴾ الواقعة

(٥٨) ئایا سەرنجی ئەو مەنی یەتان نەداوە کە لە بەشێکی نۆر نۆر کەم و بچوکی ، ئێوە دروست دەبن (لە نێوان ملیونەها سەرەمێکوتەدا بە ویستی خوا یەك دانەی خۆی دەگەیەنێتە هێلکۆکەو هەزاران سیفاتی بۆ ماوەیی لە باو باپیرانی هەردوو ڕەگەزەوە لە خۆ گرتووە !!) ...

(٥٩) باشە ، بیر ناکەنەوە ، ئایا ئێوە ئەو وردەکاریانە دروست دەکەن؟! یان ئێمە بەدیهێنەری ئێوەو هەموو شتێکین؟!

(٦٠) پاشان ئاشکرایە کە هەر ئێمە نەخشەی مردنتان دەکێشین و دانە دانەتان بە بەرچاوی ئەوانی ترتانەوە دەبێ شەرابی مەرگ بنۆشێت ، کەسیش ناتوانێت دەستەڵاتی پێش دەسەڵاتی ئێمە بکەوێت ...

(٦١) پاشانیش لە شوێنی ئێوە کەسانی تر دەهێنینە مەیدانی بونەوەو لە شوێن و جێیەکەوەو بە شێوازێك بەدیتان دەهێنین کە ئێوە زۆر کەم دەرکی دەکەن و پێی دەزانن ، یاخود ئێوە زانیاریتان نیە دەربارەی دروستبونەوەی دوبارەتان و زیندووکردنەوەتان لە قیامەتدا بۆ لێپرسینەوە ...

(٦٢) دیارە ئێوە لە پەیدابونی یەکەمجارتانِ هەندێك زانیاریتان هەیە ، کە چۆن لە نەبون خوای گەورە ئێوەی هێناوەتە مەیدانی بونەوە ، باشە ئێوە تێنافکرن؟! ئەگەر کەسێك شتێك دروست بکات لە نەبوون ، دوبارە دروستکردنەوەی ئەو شتە بۆ جارێکی تر زۆر لای ئاسان نیە؟!!

لەم ئایەتە پیرۆزانەدا باس لە مردنێکی تایبەتکراوە کە مردنی ئەندازەکراو و بەرنامەڕێژکراوە (الموت المقدر) Programmed cell death (Apoptosis) کە بریتییە لە بەرنامەڕێژکردنی مردنی خانەکان لە

کاتی پێویست و دیاریکراوی داهاتوودا کە لە کاتی گەشەکردنی یەکەمیی مرۆڤدا ڕوودەدات، ئەندازەکردنی مردنی خانانەش ڕۆڵی بنەڕەتییان هەیە لە گەشەکردن و هاوسەنگی بایۆلۆجی گیاندارە فرە خانەکان، زانایان چەند نیشانەیەکی شانەییان دیاریکردووە بۆ جیاکردنەوەی مردنی بەرنامەڕێژکراوی خانەکان لە مردنەکانی تری خانە بەهۆکارە دەرەکییەکان، بۆ نموونە ئەو خانانەی بە بەرنامەڕێژکراوی دەمرن پێش مردنیان دەچنەوەیەك و لە دراوسێکەیان دەکشێنەوە و، بە خێرایی وەك ئەوەی بکوڵێت بڵقیان لەسەر دەردەکەوێت، بەڵام خانەیەك بە هۆکاری بەرکەوتن و هۆکاری دەرەکی وەك نەمانی ئۆکسجین یان کەمی خۆراکەوە بمرێت خانەکە هەڵدەئاوسێت و پارچەپارچە دەبێت. هەروەها ناوکی ئەو خانانەی بە بەرنامە دەمرن گۆڕانکاری جێگیر و دراماییان تێدا ڕوودەدات لەوانە کرۆماتینی ناوك (DNA) چڕ دەبێتەوە و بارستەیەك یان زیاتر لە نزیك پەردەی خانەکە دروست دەکات. لەمەوە بە ڕوونی دەردەکەوێت کە مردنێکی تر هەیە و جیایە لە مردنی گشتی زیندەوەرەکە، دەگونجێت ئەم ئایەتە قورئانیە پیرۆزە بیگرێتەوە کە دەفەرموێت:

﴿ نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ ٱلْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ ﴿٦٠﴾ عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَٰلَكُمْ وَنُنشِئَكُمْ فِى مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾ ﴾ الواقعة

بایۆلۆجیەکان دەڵێن ئەم جۆرە مردنە هەڵدەستێت بە ڕۆڵی سەرەکی گەشەکردنی جینی گیاندارە فرەخانەکان و یارمەتیدانی ڕێکخستن و گەشەکردنی گیاندارەکە، ئەم بەرنامەیەش کاتێك دادەنرێت کە کۆرپەلەیە و لە سەرەتای دروستبونیدایە.

دوو خێزانی جینەکان کۆنترۆڵی بەرنامەی مردنەکە دەکەن کە بریتین لە:

(BCL-٢) و (ICE) كۆمەڵەی یەكەمیان كرداری مردنەكە بە پێی پێویستی ڕێك دەخەن. كۆمەڵەی دووەمیش هەڵدەستن بەسەرپەرشتیكردن و دروستكردنی پرۆتینی مردن كە بە ICE (ICE like proteases) ناودەبرێت.

ڕێكخستنی ئەم جۆرە مردنە بە شێوەیەكی ئەندازەبۆكراو و ڕێكخراو لە بەرزترین ئاستی خانە بەرگریكارەكان لە كاتی گەشەكردنی مرۆڤدا لە قۆناغە جیاوازەكاندا دەردەكەوێت، بۆ نموونە خانە (T)یەكان بە مردنی خانە بەرنامەڕێژكراوەكان ئەوانیش دەمرن، چونكە ئەگەر بمێننەوە و نەمرن بونیادی مرۆڤایەتی تێكدەدەن، هەروەها ئەو خانانەی كە ناتوانن لە گەڵ تەنە دەرەكیەكاندا كارلێك بكەن و سوودیان بۆ لاشە نەماوە، بە ڕێكخراوی و بە بەرنامە دەمرن.

تازەكردنەوەی بەردەوامی خانەكانی لەش بە ڕێكوپێكی بە پێی چەند یاسایەكی قەشەنگ كە پەروەردگار لە هەموو كۆئەندامەكانی مرۆڤدا دایناوە، دەریدەخات جۆرێكی تر مردنی ئەندازەكراو هەیە.

سستەم و هۆكارەكانی مردنی ئەندازەكراو هەر لە ساتەكانی یەكەمی پێكهاتنی نوتفەی ئەمشاج (هێلكەی پیتێنراو) ، بە تایبەتی لە قۆناغی تەقدیر كە سیفاتە بۆماوەییەكان ڕێكدەخرێن و خەلق دەكرێن، ئەو جینانەش كە هەڵدەستن بەم جۆرە مردنە ناسراون بە (ICE) (BCL -٢)، لەبەرئەوە ئەم جۆرە مردنە تەقدیركراوە، دیاردەیەكی پێویستە بۆ مرۆڤ بە تایبەتی لە قۆناغەكانی گەشەكردنی سەرەتای سەرسوڕمان لەوەدایە ئەوەیە كاتێك ئەم ئایەتە قورئانیانە دەخوێنینەوە كە باسی لە مردنی ئەندازەكراو دەكات، ئایەتی دوای ئەوە باس لە

گەشەکردنی یەکەمیی ( النشأة الاولى )ی کۆرپەلە دەکات و دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدۡ عَلِمۡتُمُ ٱلنَّشۡأَةَ ٱلۡأُولَىٰ فَلَوۡلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾ الواقعة، بۆیە دەکرێت لەمەوە تێبگەین کە ئەم ئایەتە پیرۆزانە ئاماژەن بۆ ئەم جۆرە مردنە کە پەیوەستن بە گەشەکردنی یەکەمیی مرۆڤ. کە ئەم جۆرەش یارمەتی پێکهێنان و ڕێکخستنی کۆرپەلەکە دەدات.

ئایا مردن دروستکراوە؟

لە ئێستادا لای بایلۆجیەکان ڕوون بۆتەوە کە مردن دروستکراوە، ئەم ڕاستیەش بە تەواوی نەزانراوە هەتا دوای ناوەڕاستی سەدەی بیستەم بە تایبەتیش دوای حەفتاکان بەڵام قورئانی پیرۆز چواردە سەدەیە ئاماژەی داوە کە مردن دروستکراوە لە ئایەتی: ﴿ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفُورُ ﴿٢﴾ ﴾.. الملك، جێگای سەرسامییە کە هۆکارەکانی مردن لە ڕووی بایۆلۆجیەوە بەهێزترن لە قۆناغەکانی گەشەکردنی یەکەمیی گیانداران، چونکە ٩٠٪ی خانەکانی کۆئەندامی بەرگری بە مردنێکی بەرنامەداڕێژراو دەمرن و، بۆ سووڕی خوێن دەرناچن تەنیا ١٠٪ یان نەبێت، هەروەها ژمارەیکی بێ شومار لە دەمارۆچکەکان کاتی پێکهاتنی دەمارەکان دەمرن، لەمەشەوە ئیعجازێکی تری قورئانی پیرۆز ڕووندەبێتەوە بەوەی کە مردنی پێش ژیان باسکردووە و دەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ ...﴿٢﴾ ﴾ هەروەها لەم ئایەتانەدا ئاماژەیەك هەیە بە گۆڕانکاریەکی داهاتوو لە مرۆڤدا لە ڕێگەی جینەکانی مردنی خانەکان




و بەرنامەدانانی سەرەتای کرۆمۆسۆمەکان. کە لە ئایەتەکەدا دەفەرموێت ئێستا نایزانن و لە داهاتوودا دەردەکەوێت.

﴿ أَفَرَءَيْتُمُ الْمَاءَ الَّذِي تَشْرَبُونَ ﴿٦٨﴾ ءَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ الْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ الْمُنزِلُونَ ﴿٦٩﴾ لَوْ نَشَاءُ جَعَلْنَاهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ ﴿٧٠﴾ ﴾ الواقعة .

**واتە:**

(٦٨) ئەی باشە سەرنجی ئەو ئاوە نادەن کە دەیخۆنەوە (چۆن لە ئۆکسجین و هایدرۆجین پێکمان هێناوە ، بە مەرجێ ئۆکسجین یارمەتی سوتان دەدات و هایدرۆجینیش بە خێرایی دەسوتێ ، کە چی کەدەبێتە ئاو زۆرێك لەئاگرەکان دەکوژێنێتەوە !!)

(٦٩) مەگەر ئێوە داتانبارندووە لە هەورەکانەوە یان ئێمە دایدەبارێنین (بەهۆی یاسای سوڕی ئاو لە سروشتدا ) ...

(٧٠) خۆ ئەگەر بمانەوێت دەیکەینە خوێیاوێکی تاڵ و سوێر و بێ سود ، باشە ئەوە ئێوە سوپاسی خوا ناکەن لەسەر ئەو هەموو ئاوە سازگارەی کە لەسەر زەوی و ناخی زەویدا بۆی دابین کردوون ؟!

چڕیی خوێیەکان لە ئاوی دەریا و ئۆقیانووسەکاندا لە نێوان (٣٢٠٠٠-٤٢٠٠٠) بەشی ملیۆنێکدان. ئاوی بەفر و بارانیش کە لە ئاسمانەوە دادەبارن بە پوخت ترین ئاوی سروشتی دادەنرێن، لەگەڵ ئەوەی کە بڕێك لە خوێیە تواوەکانی تێدایە کە لە ٢٠ بەشی ملیۆنێك تێپەڕ ناکات و وای لێدەکات شیرین و خاوێن بێت، کاتێکیش دەگاتە زەوی و بە ڕووەکەیدا دەڕوات ئەو خوێیانە کە توانای توانەوەیان هەیە لە ئاودا و لە

بەردەکـــانی توێکــڵی زەویـدا هـــەن تیایـدا دەتـــوێنەوە و بـەوەش ڕاددەی خوێدارییەکـــەی بە پلـــەبەندی زیاد دەکات تا دەگاتە هـەزار بەش لە ملیۆن بـــەش. ئـەمـــەش پـیێ دەووترێـت ئـــاوی شیرین، (١٠هـەزار) لـە ملیۆنێک بـەش پیێ دەووتـرێت ئـاوی سوێر (خوێدارێتی کــەم) و بۆ ١٠٠هـــەزار لـە ملیۆنێك یان زیاتر دەووترێت (ماء الاجاج – ئاوی سوێر) یان خوێدار.

ئـەگـــەر خـــوێی ئـــاوی دەریـا بیتوانیـــایە لەگـــەڵ هـەڵمی ئـــاودا بـە ڕێژەیـــەکی زیـــاتر لـەوەی ئێستا بـەرز ببێتـەوە، یان ئـەگەر کەمێك گۆڕان لە پێکهاتەی بەرگەهەوادا ڕووبدات ئەوا ئـاوی بـــاران بـــە سوێری دەبـاریێ و ڕوەکی نەدەبوژانەوە و زەوی پـیێ تینووی پـیێ تێراو نـەدەبوو، بەڕاستی ئاوی شیرین پارێزەری ژیانە.

﴿ أَفَرَءَيۡتُمُ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي تُورُونَ ﴿٧١﴾ ءَأَنتُمۡ أَنشَأۡتُمۡ شَجَرَتَهَآ أَمۡ نَحۡنُ ٱلۡمُنشِـُٔونَ ﴿٧٢﴾ ﴾ الواقعة

واتـە: ئـەی سـەرنجی ئـەو ئاگرەتـان نـەداوە کـە لـە جۆرەهـا سەرچاوەوە پێمـان بەخشیون؟! دایدەگیرسێنن و جۆرەها سودی لیێ وەردەگرن؟!

ئایـا ئێـوە ئـەو دارو درەختـەتان بـەرپا کـردووە ، یـان ئێمـە بـەرپامان کـردووە (ئەمەش ئامـاژەیەکە بۆ ئەو نەوتەی کە لەم سەردەمەدا سەرچاوەی سوتەمەنی و وزەیە کە لە دەرئەنجامی ژێرەو ژوور بونی دارستانەکاندا بەدی هاتووە ، هەروەك زاناکان دەڵێن ..)

لەسـەردەمانی زوودا هەردوو داری مەرخ و عەفاریان لەیەك دەخست و ئاگریـان پـیێ دەکـردەوە، زانسـتی ئـەمڕۆ سـەلماندویەتی کـە هـەموو ئـەو ئاگر و سـووتەمەنیانەی ئــەمڕۆ بــەکاریان دەهێــنین بنــەڕەت و سەرچــاوەکەیان لـــە

ڕووەکەوەیە لەوانە داری وشك و زەیتی ڕووەکی و ئاژەڵی و خەڵوزی دار و خەڵوزی بەردین و پترۆڵ و پێکهاتەکانی و گازی سروشتی، کە هەموو ئەم جۆرە سوتەمەنیانە سەرچاوەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ ڕووەك، کە بە پێی بارودۆخ و تیپەڕبوونی کات شیبونەوە و گۆڕانکاریان بەسەردا هاتووە.

ئەم سوتەمەنیانە بە کرداری بە هەوێن بوونی نیمچەیی دروست دەبن، ئەویش بەهۆی بەکتریای زەوییەوە لە بارودۆخیکدا کە لە کاریگەری هەوا و ئۆکسجین دەپیارێزێت، بەوەش هەندێك گاز و ئاو ون دەکات و ماددە کاربۆنیەکە چڕ دەبێتەوە و یان دەبنە خەڵوزی بەردین یان دەبنە نەوت و گازی ژێر زەوی بەوەش هەموو جۆرە سوتەمەنیەکان بە تێپەڕبونی کات لە ڕووەکەوە دروست دەبن.

﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾﴾ الواقعة

واتە: با سوێند نەخۆم بە شوێنی ئەستێرەکان (کە بەردەوام لە خولگەی خۆیاندا لە چەرخ و خولدان هەندێکیان بە هەزاران ، بە ملیۆنان ساڵی ڕوناکی لێمانەوە دوورن ، کاتێك ئێمە دەیانبینین ، دەمێکە لەو شوێنەی خۆیاندا نەماون، یان هەر نەماون!!) .

دوای پێشکەوتنی زانستی، زانایان دەریانخست شوێنی ئەستێرەکان هێندە دوورن، کە مرۆڤ نەیتوانیوە دەرکیان بکات و بەو شێوەیە نین کە چاوی ئاسایی دەیانبینن، دووریان هێندە زۆرە بە کیلۆمەتر و میل ناتوانرێت بپێورێن، پێویستە پێوانەیەکی تر بەکار بهێنرێت کە ساڵی ڕووناکییە کە لە چرکەیەکدا ٣٠٠,٠٠٠کم دەبڕێت، نزیکترین ئەستێرە لێمانەوە چوارساڵ و پێنج مانگی ڕووناکی دوورە، واتە ئەوەی ئێستا دەیبینین، ئەستێرەکە خۆی نیە،

بەڵكو تیشك و شوێنەكەیەتی پێش چوار ساڵ و پێنج مانگ لە كاتێكدا ئەستێرەی تر هەن هەزاران و ملیۆنان و ملیاران ساڵی ڕووناكی لێمانەوە دوورە، واتە ئەوەی دەیبینین شوێنی ئەستێرەكانە پێش هەزاران و ملیۆنان ساڵ، زانایان دەڵێن ئەستێرە هەن كە ئێستا دەیان بینین بەڵام ملیۆنان ساڵ بەر لە ئێستا نەماون و ئێمە ئێستا تەنها شوێنەكانیان دەبینین، لەبەرئەوە ئایەتەكە سوێند بە شوێنی ئەستێرەكان دەخوات، وەك ئەوەی پێمان بفەرموێت ئەوەی ئێوە دەیبینن ئەستێرەكان خۆیان نین، بەڵكو شوێنەكانیانە، بێگومان ئەمە دەریدەخات خاوەنی ئەم سوێندە ئاگاداری ئەو هەموو دوورییە زۆرانە و شوێن و جوڵەی ئەستێرەكانە، هەر بۆیە لە ئایەتی دواتردا فەرمووی: ﴿ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ ﴿٧٦﴾ ﴾ الواقعة .

بێگومان بێ ئەوە سوێندێكە ئەگەر بیزانن، گەلێك گەورە و مەزنە.

واتە: بەوانەی لەو سەردەمەدا ئایەتەكەیان بیستووە دەفەرموێت: ئێوە لە ئێستادا حەقیقەتی ئەم سوێندە نازانن، ئەگەر بتانزانیایە بۆتان دەردەكەوت ئەم سوێندە چەندە گەورەیە. سوپاس بۆ خوای گەورە كە لەسەردەمی ئێمەدا لە گەورەیی ئەم سوێندە گەیشتین ، ئەو دوورییە خەیاڵیانە ژیریی مرۆڤ لە ئاستیاندا سەرسامە ، گەورەیی و شكۆمەندیی ودەسەڵاتی خواوەندی بەدیهێنەر زیاتر ئاشكرا بووە.

﴿ سورەتی ( الحدید ) ﴾

﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ ۖ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ ۚ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ (٢٥)﴾

واتــە: خەڵكینـە دڵنیابن كە ئێمـە پێغەمبـەرانی خۆمـان ڕەوانـە كـردووە هـاوڕێ لەگـەڵ بەڵگـەو نیشـانەو مـوعجیزەی ڕون ئاشـكرادا ، كتێبـی ئاسمانیشـمان ناردووە بۆ ئەو پێغەمبەرانە هـاوڕێ لەگـەڵ پێـوەری شـەرعی و دادپەروەرانـەدا تاخـەڵكی بـە عەدالـەت و دادپـەروەری ڕەفتـار بكـەن ، هـەروەها ئاسنیشـمان دروستكردووە كە مادەیەكی سەخت و ڕەق و سودبەخشە بۆ خەڵكی ، تا ئەوەی خـوای گـەورە دەیزانێـت لـە جیهـانی واقعیشـدا دەربكـەوێت كـە كـێ پشـتگیرو لایـەنگری خـواو پێغەمبـەرو ئاینەكەیـەتی لـە كـاتی پەنهانیـدا ، دڵنیـاش بـن كـە خـوای گـەورە خـۆی هێـزو دەسـەڵاتی بـێ سـنورەو هـەر خۆیشـی بـاڵا دەسـتە (پێویسـتی بـە یارمـەتی كـەس نیـە، دەیـەوێت ئاسـن و دەسـەڵات لەخزمـەتی بەرپاكردنی دادپەروەریدابن ).

دەووترێت: ئاسـن لـە زەوی دەردەهێنرێـت و لـە ئاسمانـەوە نایەتـە خـوارەوە تـا بووترێت: ( أنْزَلْنا ).. ئەی بۆچی قورئانی پیرۆز نەیفەرموو: "اخْرَجْنـا" لـە بری: ( أنْزَلْنا) كە بە ڕواڵەت لەگەڵ واقیعدا یەك ناگرێتەوە؟!

ماملۆسـتا سـەعیدی نوورسـی لـە وەڵامـدا دەڵێـت: مەبەسـتی ئەوەیـە كـە دەریبخات: ئەو نیعمەتە مەزنە پێكەوە لەگەڵ گۆی زەوی‌دا لە گەنجینەی مەزنی

گەردوونەوە نازڵ کراوە، بۆ ئەوەی ئاشکرای بکات کە ئاسن لە هەموو شتێك پێویستترە بۆ گەنجینەی زەوی، بە ڕادەیەك کە بەدیهێنەری شکۆمەند کاتێ زەویی لە خۆر جیا کردەوە ئاسنیشی لەگەڵدا ناردە خوارەوە تاکو زۆربەی پێداویستییەکانی مرۆڤ دابین بکات و بیانهێنێتەدی. کەواتە قورئانی حەکیم، لە ڕێی ئیعجازەکەیەوە، ئەم واتایە بە مرۆڤ ڕادەگەیەنێت کە: کارەکانتان بەم ئاسنە ڕابپەڕێنن و، هەوڵ بدەن بە دەرهێنانی لەناو زەوی داو سوودی لێ وەربگرن.

زانایانی گەردوون توێژینەوەیان کرد کە ئایا ئاسن لەسەر زەوی هی خودی زەوی خۆیەتی یاخود لە شوێنێ ترەوە بۆی هاتووە؟ ئەو توێژینەوانەی لەم بوارەدا کران ئەوەیان ڕوون کردەوە کە هیچ وزەیەك نیە لە کۆمەڵەی خۆردا بە وزەی خۆریشەوە بتوانێت ئاسن دروست بکات، دەبێت هەر لە دەرەوەی کۆمەڵەی خۆریشەوە هاتبێت، با بزانین چۆن؟

ئەستێرەکان قۆناغی ژیانیان هەیە وەك مرۆڤ چۆن لە ژیانیدا بە قۆناغەکانی (منداڵی، لاوێتی، کامڵ بوون، پیریی و مردن)دا دەڕوات، ئەستێرەکانی گەردوونیش هەمان حاڵەتیان بەسەردا دێت، کاتێك دەڵێین ئەستێرەیەك گەنجە یان لە لاوێتیدایە ئەوە مانای ئەوەیە کە زوربەی زۆری ئەو ئەستێرەیە لە گازی هایدرۆجین پێك هاتووە، بۆ نموونە خۆری خۆمان ئەستێرەیەکی گەنجە، هایدرۆجین ماددەی سەرەکییەتی بۆ دروست بوونی ئەو وزە و ڕووناکییەی کە پێمان دەگات، لە خۆردا لە هەر چرکەیەکدا ٦١٦ملیۆن تەن لە ماددەی خۆر کە هایدرۆجینە دەگۆڕدرێت بۆ ٦١٢ملیۆن تەن لە گازی هیلیۆم، واتە لە هەر چرکەیەکدا ٤ ملیۆن تەن لە ماددەی خۆر نامێنێت لە کردارێکدا کە پێی دەووترێت کرداری ناووکە یەکبوون، ئەم ماددەیە نامێنێت و

دەگۆڕێت بۆ ڕووناكی و گەرمیی و ووزە، بەشی زەوی خۆمان لەو گەرمییە تەنها بریتی یە لە یەك بەش لە ٢ملیۆن بەش!!

كەواتە كاتێك ئەستێرەكە لە قۆناغێكەوە دەچێتە قۆناغێكی ترەوە، وردە وردە هادرۆجینەكەی سەرف دەكات و دەبێت بە هیلیۆم، پاشان ئەویش سەرف دەكات و دەبێت بە ماددەیەكی قورستر (وەك كاربۆن)، دواتر ئەویش سەرف دەكات تا دەگاتە قۆناغێك ماددەی ناوی دەبێت بە ئاسن، كە بوو بە ئاسن ئەو ئاسنە وزەیەكی یەكجار زۆری دەوێت بۆ ئەوەی بتوێتەوە، كە ئەم كردارە ئەو كرداری تواندنەوە ئاساییە نیە كە لەسەر زەویدا هەمانە، ئەبێت ئەو كردارە بگاتە ناوكی ئەتۆمی ئاسنەكە و كرداری ناوكە یەكبوونی بەسەردا بهێنێت و وزەی لێبدات، بەڵام هیچ ئەستێرەیەك نیە ئەمە بكات.

چونكە كاتێك ئەو ئاسنە بەسەر ناوكی ئەستێرەكەدا كەڵەكە دەبێت، ئیتر گۆڕانی بەسەردا نایەت و ئەو ئەستێرەیە دەگاتە قۆناغی كوژانەوە و مردن و فەوتان، لێرەدا دەبینین خوای گەرە لە قورئانەكەیدا ئاماژەی بەم ڕاستییە داوە لەسوورەتی (التكویر)دا كە دەفەرموێت: ﴿إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ ۝١﴾، واتە: ڕۆژێك دێت كە خۆر دەپێچرێتەوە و ڕووناكی نامێنێت، ئەم (تكویر) یان كوژانەوەیەی لە ئایەتەكەدا هاتووە كاتێك ڕوودەدات كە ماددەی ناو ئەستێرەكە دەگۆڕێت بۆ هیلیۆم و كاربۆن و دواتر دەبێت بە ئاسن، ئیتر كوژانەوە و مردن و فەوتان لە ئەستێرەكەدا ڕوودەدات.

ئەم كەڵەكە بوونی ئاسنە ئیتر توانای ئەو ئەستێرەیە نایەڵێت و دیاردەیەكی لێ دروست دەكات كە بە نۆڤا (Nova) و سوپەر نۆڤا ( Super Nova ) ناودەبرێت، ئەمیش بەپێی بارستەی ئەستێرەكە، كە ئەم دیاردانە

بریتییە لە تەقینەوەی ئەستێرەکە ماددەکەی ناوی فڕێ دەداتە دەرێ، ئەو ئەسارە و کۆمەڵانەی لە نزیکیدان (وەك زەوی) بەهۆی هێزی کێش کردنەوە ئاسنەکەی دەگاتێ، زانایان زۆر بە چڕ وپڕی لەم مەسەلەیەیان کۆڵییەوە و بۆیان دەرکەوت کە ئەو ئاسنە لە دەرەوەی زەوی خۆمانەوە هاتووە

ئیعجازێکی تری ئەم ئایەتە ئەوەیە کە خوای گەورە فەرمووی ( فیە باس شدید) کە ئەمەش زانستی ئەمڕۆ سەلماندویەتی کە ناوکی گەردیلەی ئاسن توندوتۆڵترین ناوکی توخمە. بە واتای توندی یەکگرتنی پێکهاتە سەرەتاییەکانی ماددەی ئاسن. ئەمەش وای کردووە کە تایبەتمەندی (الباس الشدید)ی پێ ببەخشێت. هەروەها سەبارەت بە سوودەکانی ئاسن دادەنرێت بە پێویست ترین توخم لەسەر زەویدا کە ژیانی پێوە بەستراوە چونکە ماددەی ئاسن کە لە ٪٩٠ی کرۆکی زەوی پێك دەهێنێت چڕی زەوی ڕاگرتووە و بواری موگناتیسی بە دەوری زەویدا دروستکردووە کە هۆکاری دروست بوونی بەرگە هەوایە بە دەوری زەویدا و لە زۆربەی تیشکە زیان بەخشەکان زەوی دەپارێزێت لە ڕوویەکی ترەوە ئاسن بە پێکهاتەی سەرەکی لە دروست بوونی هیمۆگلۆبینی خوێن دادەنرێت. لەبەرئەوە ئەگەر ئاسن نەبوایە نە بەرگی ئاوی و نە بەرگە هەوا و نە خوێنیش لە مرۆڤدا دروست نەدەبوو!! کە ئەمەش واتای (منافع للناس) زیاتر ڕووندەکاتەوە. بەڵێ: ئاسن مایەی سەرهەڵدانی گشت تەکنۆلۆژیای گرۆی مرۆڤ و، سەرچاوەی هەموو پێشکەوتن و تەوەرەی سەرجەم هێزەکانیەتی.




## خوێندنەوەی ئەم جوزئە:

» باوەڕت پتەوتر دەکات بە پەروەردگاری مەزن.

» دڵنیات دەکات لەکۆتایی هاتنی ئەم دونیایەو بەرپابونی قیامەت.

» قورئانت لا گەورەو شکۆمەندو پیرۆزتر دەکات.

» بەهەشتت لا خۆشەویست دەکات، دۆزەخیش سامناکو ترسناک، تاهەوڵەکانت چڕبکەیتەوە بۆ دەستە بەرکردنی بەهەشتو دورەپەرێزی لەدۆزەخ.

» دونیا فرسەتێکی گەورەو زێڕینە، بەغەفڵەتو ئارەزو پەرستی بەهەدەری مەدە.